بوارەشدا بۆماوەی دەساڵ نەحەسایەوە, بەلاَم لەناوەڕاستی ئەم کارە گرنگەیدا چەرخی ژیانی کۆتایی پێهات.

***

ئەوەمەی بای شۆڕشگێری دای بەسەر ئەورووپادا نەمسا پوکایەوە. بەلاَم ئەم شۆڕشە بەهۆی دۆخی کۆمەلاَیەتی یان پێکدادانی چینەکانەوە نەبوو بەڵکو زێدەتر بەهۆی ململانێ نەتەوەچێتیە دژبەرەکانەوە بووە.

بەڵێ شۆڕشی ١٨٤٨ ی خەباتی نێوان چینەکان گڕ و زمانەکەی گەیشتە هەموو وڵاتان جگە لە نەمسا کە شۆڕش تێیدا لەسەر بنەمای نەتەوەچێتی بوو.

بەلاَم نەمساییە ئەڵمانەکان کە سەرچاوەی شۆڕشەکەیان لەبیرکردبوو یان نەیان دەزانی بۆچی بەشداری ئەم شۆڕشەشەیان کردووە, بەو پەڕی توانایانەوە هەوڵی بەدیهێنانی دیمۆکراتی ڕۆژئاوییان دەدا لە وڵاتدا , کەزۆری نەبرد تابە دژبەری خۆیان شکایەوە.

پێش لە گرنگی دان بە زمانی هاوبەش پەرلەمان دامەزرا بەمەبەستی لێدانی ئەڵمانی زمانەکانی وڵات, لەو کاتەش بەدواوە وڵات بەرەو پوکانەوە دەڕۆیشت. بەلاَم زۆرینەی نەمساییەکان نەیان دەتوانی لەبەریەك هەڵوەشانەوەی هەرێمەکان ببینن.

ناچمە نێو شیکاریەکانی بەدەر لەچوارچێوەی ئەم پەرتووکەم , بەلاَم ئەو هۆکارانەی کە هەبوون و هەن و بەردەوامیش دیارکەوتوون لە هەرەس پێهێنانی وڵات و لەناوبردنی گەلەکانی دەخەمەڕوو.

# ٢

# پەیڕەوی پەرلەمانی

لە لوتکەی ئەو چەرخەی کە ڕێخۆشکاری دەکرد بۆ خێرا هەڵوەشاندنەوەی نەمسای یەککگرتوو بریتی بوو لە پەرلەمان، یاخوود بە بێژە نەمسایەکەی ((ڕایخستراتت)). خـەڵکانی نەمسـا ئـەم پـەیڕەوەیان لـە بـەریتانیاوە وەرگرتـووە، نیشـتمانی دیمۆکراتیـەتی کۆن، بەبێ ئەوەی هیچ شێوە چاکسازییەکی ناوکرۆکی بـۆ ئـەنجام بـدەن. لـە ڤیـەننادا دوو ئەنجومـەنی پەرلـەمانی دامـەزرا: ئەنجومـەنی نوێنـەران و ئەنجومـەنی پـیران، کەلەشـێوەی هـەمان دوو ئەنجومـەنی پەرلـەمانی ئینگلیـزین: ئەنجومـەنی گشـتی و ئەنجومـەنی لۆردەکـان دامـەزرێنرابوون، جیـاوازی نێـوان ئـەم دووجـۆرە پەرلەمانـە تـەنها لەشـێوازی چۆنێتی ڕازاندنـەوەی هۆڵـەکانی کۆبونـەوەدا بووە. لەبـەریتانیادا باری ئەندازیار هەستا بە ڕازاندنـەوەی پەرلـەمان بە زەغرەفـەی بەشـان پیاهەڵدەری ئەمپراتۆریـەتی بـەریتانی، بـەڵام ئەنـدازیاری دانیمـارکی هانسن پشـتی بـە شـوێنەوار بەسـتبوو بـۆ ڕازاندنـەوەی خانـەی پەرلـەمانی نەمسـا، هـۆڵی کۆبوونەوەشی بە پەیکـەری گـەورەپیاوانی دەوڵـەت و فەیلەسـوفانی ئـەغریق و ڕۆمـان ڕازاندبۆوە.

ئەوکاتەی بۆیەکەمین جار ڕۆشتمە نێو کۆشکی فرانز نسرغ (خانـەی پەرلـەمان)ەوە بەمەبەستی ئامادەبوون لە کۆبونەوەیەکی پەرلەماندا تەمەنم نۆزدە ساڵان بوو، لـەکاتی بەدواداچـونم بـۆ تاوتوێکاریـەکان هەسـتێکی نـامۆم لا پەیـدابوو بـەوەی پـەیڕەو یـان سیستمی پەرلەمانی لە نەمسادا بەمانای وشە پووچ و هەڵوەشاوەیە.

لـەدژی پـەیڕەوی پەرلـەمانی نـەبووم وەکـو دامـەزراوە، هـەر لەسـەرەتای ژیانمـەوە پارلـەمانم وەکـو دامەزراوەیـەکی پێشـیاو دەزانـی بـۆ وڵاتێکـی وەك نەمسـای پـڕ لـە

کێشـەکێش و نەهامـەتی، بـڕوام بـە بـوونی دیکتاتۆریـەت هـەبوو لـەپاڵ کورسـی دەستەلاَتی هابسبۆرگ لەدژی ئازادی و لۆجیکدا.

نـاتوانم ئـەوە بشـارمەوە کـە بـڕوادارێم لـە پـەیڕەوی پەرلـەمانی لـە پارلـەمانی ئینگلیزیـەوە سەرچاوەی گرتـووە، ئـەم پێخۆشبونەم لـە مێشـکمدا چەسپا بەتایبـەت ئەوکاتەی سەرقاڵی بەدواداچوون بووم لە تاوتوێ کردنی ئەنجومەنی گشتی لەڕێگەی ڕۆژنامەکانەوە، بەلاَم بەهۆی ئامادەبوونم لە کۆبوونـەوەکانی پارلـەمانی نەمسادا ئـەم بڕوایـەم پـووچ بوویـەوە، لێـرەوەش جیـاوازی تـەواوم بـۆ دیارکـەوت لـەنێوان ئـاوەزی ئینگلیـزی و نەمسـایی، لەگـەڵ دیارکـەوتنی زیانـە کلاسـیکە کـوێر ئاسـاکانی ئـەم پەیڕەوی لاسایی کارییە.

بۆم دیارکەوت لە پەرلەماندا لەسایەی ئەم دەستەلاَتە نوێیەوە بەشداریێتی ڕەگەزی ئەڵمانی بەرەو کەمبوونەوە ڕۆیشتووە. تائەم کاتەش ئەوساتەی هەڵبژاردنی نهێنـی لـە پەرلەمانـدا ئەنجامـدرا زۆرینـەی ئـەڵمانی بـوو، بـەلاَم لـە هەڵبـژاردنی گشـتی دا ئـەم زۆرینەیە پووکایەوە و بووەهۆی ئەوەی نەمسا سروشتە ئەڵمانیەکەی لەدەست بدات.

پاش لـە هەسـتکردنم بـەم ڕاسـتیە ئازاراویە ڕقم لـە ئەنجومـەنی نوێنـەران دەبوەوە لەبەر ئەوەی بە دوژمنی هەموو ئەڵمانییەکم دەزانی، لەسـەر ئـەم بنەمایـەش پەرلـەمانم دەبینـی و گوێگری وتـە و بڕیارەکان نـەدەبووم و هیچیشـم وەرنـەدەگرت تـەنها ئەوانـە نەبێت کە ڕقی زیادتریان لەم بارەیەوە لەناخمدا دەچێنا و دەبوونە هاندەرم.

ئەو کاتەی بۆجاری یەکەم ئامادەی دانیشتنێکی پەرلەمانی بووم، سەدان کـەس لـە نوێنـەرانی گـەل تـاوتوێی بـاری ئابوری وڵاتیـان دەکرد، بـۆم دیارکـەوت ئـەو وتارانـەی لێرەدا پێشـکەش دەکرێـت هـیچ بەهایـەکی هـزری نییـە، چونکە بـە سـلاَڤی و زمـان و شـێوە زاری جیـاواز دەدوان. دواتـر دیمـەنێکی پێکـەنیناویم بینـی لـەوەی پـاش لـە قسەکان مقۆمقۆیەکی توند هاتەئاراوە و دیتم ژمارەیەک لە نوێنەران بە بۆکس لە مێز و کورسیەکان دەدەن و سەرۆکی پەرلەمانیش بە تورەییەوە بە چەکوشی ئاگادارکردنەوە زەنگی بۆ لێدەدان، داوای لە ئەندام پەرلەمانەکان دەکرد پابەندی ڕێساکانی نێو هۆڵی پەرلەمان بن و ڕێزی پەرلەمان نەشکێنن!

بە چەند هەفتەیـەک پاشـتر جارێکی دی ئامادەی کۆبونەوەیـەکی دیکـەی پەرلـەمان بووم، لـەم کاتـەدا پـتر لـە سـێ لـە سـەدی نوێنـەرانی گـەل ئامـادەی نـەبوو، نیوەیـان

خەوتبوون، نیوەکەی دیکە گوێیان بۆ قسەی ئەندامەکانی دیکە ڕادێرابوو. جاربەجاریش باوێشکیان ئەدا، سەرۆکی پەرلەمانیش چاوی بەهەموو سوچەکانی هۆڵەکەدا گێرەدا و توڕەیی پێوەدیاربوو.

بەردەوام بووم لەسەردانی کردنی پەرلەمان و هەرکاتێك ئەهاتمە سەری کەسایەتییەکم وەرئەگرت و بەتێپەڕوونی کات بۆچوونم لەبارەی پەرلەمان وەکو دامەزراوەی شیاو گۆڕدرا و بەتەنها ڕقم ئەدەبووە لە ڕژێمی پەرلەمانی ئەمسایی بەڵکو ڕەتی ئەم شێوازی فەرمانڕەوایەتیەشم ئەکردەوە بە ڕەهایی. ئەوکاتەی هەستم بەخراپی دۆخی پەرلەمانی پووچ لە زۆرینە ئەڵمانی ئەکرد، بەدووی بنچینەی دیارکەوتنی ئەم نەخۆشیەدا ئەگەڕام لەوەی بەشێوەی دامەزراوە لێی بنواڕم.

لێرەوەش کەمەکەمە بیرۆکەی ڕاستەقینەم لەبارەی پەیڕەوی پەرلەمانییەوە کەبەباشترین شێوازی حوکمڕانی هاوچەرخ دائەنرێت بۆ دیارکەوت، ئەم پەیڕەوە شێوەیەکی تایبەتی وەرگرت لە مێشکمدا و دواتر بەهۆیەوە ناواخنم گۆڕدرا، بەلاّم ئەو هیچ نەگۆڕا.

بۆم دیارکەوت کە دیموکراتیەتی ئەوروپای ڕۆژئاوا پڕەلە لە بیرۆکەی مارکسیەت. کە بەبێ پەیڕەوی پەرلەمانی ناتوانرێت بەرجەستەبکرێت. بەڵێ دیموکراتی ئەو خاکەیە کە زیندەزیانی مارکسیەتی تێدا ئەش و ئمائەکات، ئەم نەخۆشیە جیهانییە لەم ڕێگەیەوە بلاّو ئەبێتەوە. مارکسیەت و پەرلەمانی دوو هاوتای پێکەوە گرێدراون.

سوپاسی ڕۆژگار و چارەنوسم کرد لەوەی توانیم ئەم کێشەیە لە ڤیەننادا ئاشنابم. ئەگەر لەئەڵمانیادا ئاشنای بوومایە ڕەنگە ئەم بڕیارەی ئێستام نەدایە.، واتە گەر خەوشیەکانی پەیڕەوی پەرلەمانی لە ئەڵمانیادا پێش لە ڤییەنا بۆم دیارکەوتبایە ئەوا ڕەنگە بۆچوونی جیاواز لە ئێستام هەبایە و بەدەم هەمان ئاراستەی باوە بڕۆیشتمایە لەوەی کە: چارەنووسی گەلی ڕایخ بەستراوەتەوە بە بەهێزکردنی ناوەندێتی ئیمپراتۆرەوە.

لە ئەمسادا هیچ مەترسیدار نەبوو بۆئەوەی ئەم بڕیارە بدەم ؛ چونکە بڕوام وابوو کە بنەماڵەی هابسبۆرگ لە پەرلەمان چاکتر نین، کەواتە هیچ جیاوازییەك نابێت لەنێوان ماڵی پاشا و پەرلەماندا و هەردووکیان هاوتا و یەکن. ئەوەشم هەست

پێدەکرد ئەمانی پەیڕەوی پەرلەمانی مانای پێدانی دەسەڵاتی تەواوە بە بنەماڵەی هابسبۆرگ و ئەمەش فەتارەت و نەهامەتی تەواو بەدووی خۆیدا دێنێت.

هەرچەندە من لەو کاتەدا بەتەمەن منداڵ بووم، بەڵام بەدووی چارەسەری ئەم کێشەیەشدا بووم، ئەمەش وای لێکردم بە درێژی بیر لە گرانی دیاری کردنی بەپرسیارێتی ئەم دۆخە بکەمەوە و بەزوویش بۆم دیارەکەوێ ئەم نەهامەتیانە بەهۆی دانانی کەسی نابەرپرسەوەیە لەپۆست و پێگە گرنگەکانی دەوڵەتدا و ئەم کەسانە هیچ بەرژەوەندی کۆمەڵانی خەڵکیان لەپێش چاو نییە. ئەو کاتەی پەرلەمان بڕیارێکی دروست دەدات و بەهەڵە پەیڕەو دەکرێت ئەو کات کەسێك نابینێت ببێتە بەرپرسیاری ئەم هەڵانە و دواتریش ناتوانی هیچ کەس بەمە تۆمەتبار بکەیت، بەڵام ئایا بەرپرسیارێتی هەڵەکردنەکان لەرێگەی دەست لەکارکێشانەوەی وەرزیرێك یان هەڵوەشاندنەوەی پەرلەمانەوە چارەسەر دەبێت؟ ئایا دەبێت زۆرینەی نارێك بە بەرپرسیاری پەسەندکردنی ئەم بڕیارە هەڵە پەیڕەوکراوە دابنرێت ؟

کەواتە گەر هیچ کەسێك بەرپرسیارێتی هەڵنەگرت ئەوکات بەرپرسیارێتی چ مانایەکی دەبێت؟ چۆنیش دەبێت سەرۆکی حکومەت یان کۆمەڵە کەسێك بەبەرپرسی ئەو کێشانە دابنرێت کە لەناکاو هاتۆتەبوونی؟

ئەوکاتەی کەسێك لە پەیڕەوی زۆرینەی پەرلەمان لایدا ،کە پەسترین نەخۆشی باوی دامەزراوەی پەرلەمانییە، کەواتە ئایا دەگونجێت بەم کەسە بگوترێت نەشیاو ؟

یان ژیرێتی ڕەنگدانەوەی ئاکارەکانی نەبێت وەکو ئەوە وایە کە هێرشی زۆرینەی بێدەنگ بکات؟ کەواتە ئەوکاتەی جەماوەری پرۆژەکەی کەم دەبێتەوە کام چەشنە ڕێباز پێویستە کەسی سیاسی پەیڕەوی لێ بکات ؟

ئایا دەبێت دوای بخات؟ یان بۆچوونی هاوڵاتیەکانی دیکەی وڵاتەکەی بەگەمژانە دەزانێت و چاوپۆشی لەو کارانە دەکات کە بە پێویستی زیندەیی دەزانێت؟ ئایا دەست هەڵدەگرێت یان بەردەوام دەبێت ؟

کەسی ئەتواردار چۆن دەتوانێت ڕێکخستنێك ئەنجام بدات لە نێوان ئەم دۆخە ناوازەیە و ئەوەشی بە پێویستی دەزانێت بەڵکو بەکارێکی نابڕوومەندانەی دەزانێت ؟

سنوری جیاکاری نێوان ئەرکداری لەبەرامبەر کۆمەڵ و نێوان ئەوەی پێی دەڵێن پێویستیەکانی نابڕوومەندی چی دەبێ ؟

ئایـا بەڕاسـت ئـەوە ئـەركی سـەركردەی ڕاسـتەقینەیە كـە ئـەو شـێوازە فەرمانڕەوایەتیانـە پـەیڕەوبكات كـە نزمـی دەكەنـەوە بـۆ ئاسـتی هەسـتكردن بـە شارەزایانی سیاسەت ؟

ئەو كاتەی ئەم سەركردەیە دابەزییە ئەم ئاستە و هەستی كرد ئەو كات دەبێتە یاری دەستی دەستەیەك, بۆچوونیان پەیڕەودەكات و بەرژەوەندیەكانیان بەدی دێنێت, ئایا بەڕاست بنەمای زۆرینەی پەرلەمانیش ناوەستێتەسەر گەمارۆدانی بەرپرسیارێتیەی لەدەوری سەرۆكی پەرلەمان؟ ئایا بەڕاست تاوەكو ئێستاش بڕوا وایە كە فاكتەری بەرەو پێشچوونی مرۆڤایەتی مێشكی زۆرینەیە نەوەك تاكە كەسێك؟

ئـەو كاتـەی بنـەمای پەرلـەمانی زۆرینـە بەسـەر كەمینـەدا دەسـەپێت و سـەرۆكیش ناچاری هەژماردن دەبێت, ئـەو كات بنـەمای ئەرەستۆكراتی سروشتی دەپۆشێت كە دۆخـەكان دەخاتـە ئەستۆی بژاردە. سـەبارەت بـەو فەتارەتانـەی كـە ئـەم دامـەزراوە هاوچـەرخییە دەینێتـەوە, دامـەزراوەی سـەركردایەتی پەرلـەمانی, ئـەوا خوێنـەری ڕۆژنامە جولەكە خوازەكان بەئاسانی ناتوانێت ئاشنایان بێت و بیرۆكەیـەكی لـەبارەوە بۆ دروست بێت, تەنها مەگەر بەباشی ئەو كەسە خۆی لەم بوارەدا پێگەیاندبێت و نەكەوێتە ژێر كاریگەری هیچ كەس و بۆ چوونێكی دیكەوە!

پـەیڕەوی پەرلـەمانی كەشێكی گونجاوی وەهـا بـۆ شـارەزایانی بـواری سیاسـەت دەرەخسێنێت كـە ڕووداوە سیاسیە گـەورەكان بەشـێوەی ڕووداوی بچـووك و هیچی پیشـانبدەن. ئـەم دۆخـەش زیـادتر لـە سـەركردەیەكی ڕامیـاری هـانی دەسـت لەكاركێشـانەوە دەدات لـە سیاسـەت كـردن؛ چـونكە سیاسـەت یەكسـانی و نـاكۆكی لەنێوان دەستەلآتدار و زۆرینەدا بەجوانی پیشـان داوەو دەدات, سروشـتی ئـەم شێوە سیاسـەتە دگـەل ئـەو سـەركردە بەناوبانگـە سیاسـیانەدا گونجـاوە كـە خـاوەنی مێشكێكی پوچن و بەمە هەڵخەڵەتاو و كاریگەرن.

ڕامیـاری كارێك خـاوەنی ئـەم بۆچـوونە پوچگـەراییەبێت ئـەوا هـیچ خـۆی ناكاتـە خاوەنی بەرپرسیارێتی كارە نەشیاوەكانی, ئەم كەسانە باش دەزانن ئـەمڕۆبێت یان سبەی هـەر لەناودەچن بۆیە بەباشـی گرنگی بـە داپۆشـینی ئـەم هەڵانـەیان دەدەن و ناهێڵن بەئاسانی دیاربكەوێت.

بەڕاستی ئەو زۆرینەی پەرلەمانییەی کە خۆ لە ژمارەیەك چەنەچەن کاری زیادەڕۆدا دەبیننەوە ڕەت دەکرێتەوە بەزیادتر لەوەی کەسێکی دەموشاوە ڕەتی بکاتەوە. بوونی ئەنجومەنێکی نوێنەرانی پووچ لە کەسی شیاو یارمەتی دەرکەوتنی سەرکردەی ئاسایی دەدات بەوەی ببێتە ڕابەر و هەموان شوێنی بکەون, لەم ڕێگەیەوەش هەموو ئەندام پەرلەمانەکان ئاواتی ئەوە دەخوازن ڕۆژێك بێت بگەنە پلەیەکی بالأتر لەم دۆخەی ئێستایان.

دیاردەیەکی دیکەش لەنێو پەرلەماندا باوە ئەویش ترسە کەلەزۆرێك لە ڕەفتار و کردارەکانی دەستەیەکی گەورەی سەرکردە ترساوەکاندا ڕەنگی داوەتەوە. ئەو سەرکردەیە بەختەوارە کە پرۆژەیەك پێشکەش بکات و بەزۆرینە پەیڕەوبکرێت و خەوشیەکانی بۆ داپۆشن. ئەو کاتەی چاو دەخرێتە سەر دزێکی سیاسەت و نیگەرانی دایدەگرێت پێش لە بڕیاردان ئەوکات دەتوانی بڕیاری گەندەڵبوونی ئەو سیستمی پەرلەمانییە بدەی, بەوەی لەم کاتەدا بەتەنها پشت بە زۆرینە هاوبەشەکانی دەبەستێت کە ئەو تەنانەت ئەگەر پرۆژەکەشی تاوتوێ بکرێت ئەوا خۆی لەهەموو بەر پرسیارێتییەك بێبەری دەکات.

ئەو پیاوەی لە بەرپرسیارێتی کارەکانی ڕابکات بەوەی ئەو کەسانەبدۆزێتەوە کە ئەم خەوشانەی بۆ داپۆشن ئەوا جگە لە ناو هیچی دیکەی نییە و بەس پیاو نییە و هیچی تر, بەڕاستی ترسنۆك و خوێڕیشە. ئەو نەتەوەیەی سەرکردەکانی لەم چەشنە کەسانەبن ئەوا جگە لە نەهامەتی و بەدبەختی هیچی دیکە بۆ نەتەوە ناهێنن. بەجۆرێك لەم کاتەدا لە وڵات کەسێك نابینیتەوە ئامادەی گیان بەخشینی خۆی بێت لەپێناو یەکخستنەوەی نەتەوەو ڕزگارکردنی لەو کێشانەی لەم کاتەدا بەرۆکی دەگرن.

هاویشتنی ئەم هەنگاوە بەجەرگە لە زۆرینەی دانیشتوانی وڵات ناچاوەڕوان کراوە؛ چونکە زۆرینەی وڵات تەنها گەمژە و ترسنۆکەکان و بەسەد کەسیانەوە ناتوانن ببنە کەسێکی ژیر و کاڵفیامیشیان زۆرە و ناتوانن بڕیارێکی تەندروست و پاڵەوانانە بدەن. ئەمە و جگە لە خۆدزینەوەی سەرۆکی حکومەت لە ڕووبەڕووبوونەوەی بەرپرسیارێتیەکان هانی ژمارەیەکی زۆری ئەندامانی پەرلەمان دەدات تەنانەت بێهێز و نەزانەکانیشیان بەوەی چاو ببڕنە ئەم پۆستە و گەیشتن بەم پۆستە بەچەند کاتژمێرێك لەدووری بزانن. ئەو کاتەی یەکێك لەمان و پێچەوانە بۆچوون گەیشتە ئەم

پۆسته و كورسی دەستەلاتی دەست كەوت ئەوكات هاوڕێكانی دوێنێی سەرو خوار وەری دەچەرخێنن و گێتی لەسەری ژێر و ژور دەكەن. بەلام گەر پۆستێكی نزمتری وەرگرت ئەوكات ڕێزی دەگیرێت و دەیخەنەڕیزی خۆیانەوە لە ڕیزی چاودێر و چاوەڕوان كاران.

كەواتە بەم شێوەیەبێت ئەوا چاو تەنها لەسەر پێگە و پۆستە گرنگەكانی ولاتە و ئەوكاتەی كەسێكی ژێر دێتە سەر دەستەلات و دەیەوێت چاكسازیی بكات ئەوا لەڕێگەیدا بەربەستی گەورە دروست دەبێت و گەندەڵكاران دژی دەوەستنەوە؟ چونكە سنوریان بۆ دادەنێت و نوكی قامچی زۆرداریان دەشكێنێت.

بەڵێ خاوەن كورسی بە هەستیارییەوە وەزیرەكانی هەڵدەبژێرێت، بەلام دیسان لەم كارەشیدا پشت بەڕاوێژی زۆرینەی پەرلەمان دەبەستێت. سەبارەت بەبازاری ڕێككەوتنە سیاسیەكانی لای وەزیرەكان و دابەشكردنی جانتاكان ئەوا قسەكردن لەم بارەیەوە شەرمی ناوێت؛ دیمەنی پەیوەستی دیموكراتیەتی ڕۆژئاوایە، ئەنجامەكەشی جیاوازتر نابێت لە بەهای بنەمای پشت پێبەستراوی.

لەكاتی دانان و پێكهێنانی وەزارەتەكانی حكومەتدا بەرپرسەكان دووپاتی ناولێنانی وزیر و جێنشینەكانی دەكەنەوە بەوەی ئەوكاتەی فلان وەزیر بڕوات دەبێت فیساركەس جێگەی بگرێتەوە و ئەو دێت و ئەم دەڕوات، بەم شێوەیەش هەموو تەماحكاران قایل دەكرێن، لەم كاتەشدا ئاژاوەگێڕان هانی بەرپاكردن و نانەوەی ئاژەوە دەدەن و بەم شێوەیەش گۆچانەكەیان دەخەنە سەر پشتی ئامرازی فەرمانڕەوایی كار، ئەمەش بەهۆی ئەوەوەیە كە یان ئەوەتا بەشداری حكومەت نەكراون یام دەوڵەت بەپێی خواز ویست و بەرژەوەندیەكانیان ناجوڵێتەوە و هەنگاونانێت.

## ٣

# ڕای گشتی

بە تەنها باسی شێوازی هەڵبژاردنی نوێنەرانی گەل ناکەم یان ئەو ڕێگەیەی کە لەسایەیدا دەتوانن ئەوکورسیانەی پێبەدەست بێنن کە زۆر گرنگە بەلایانەوە. ئەو خەڵکەی خاوەنی هۆشیاری سیاسی نییە چاوەڕوانی جیاکردنەوەی باش و خراپی ئەم کەسانەی لێناکرێت, ئەو کەسانەشی دیسانەوە خۆیان هەڵدەبژێرن گەر خاوەنی هۆشیاری سیاسی نەبن ئەوا نازانن چۆن بۆچوون و حەز و سپاردەکانیان بەخەڵکی بەگەیەنن.

ڕای گشتی تەنها ناوەستێتە سەر ئەزمونی تایبەتی و زانستی خودییەوە؛بەڵکو زۆرکات کەوتۆتە ژێر کاریگەری بانگەشەی بەلاوە پەسەند و بەبێ هەستکردن ژەهرەکانی ئەم بۆچوونە لەنێو خوێنی جەماوەردا بلاو دەبێتەوە لەکاتێکدا خۆیشی هیچ هەستی پێناکات. ئەوە ڕۆژنامەوانییە خەڵکی پێدەگەیەنێت لەڕێی بابەتی بلاوکراوەیەوە, ولاتیش زۆرجار دەستی نییە لەئاراستەکانی ڕۆژنامەکاندا, ئەم خوێندگەیەی کە ڕۆژانە خەڵکی وانەی لێوە وەردەگرن, ڕۆژنامە لەدەستی کەسانی بەهێزدایە و فەتارەتی لێوە دەئافرێنن. ئەو کاتەی لە ڤییەنابووم بۆم لوا تێکەڵی خاوەن بڕیار و بۆچوونەکان و بلاوکارەکەشیان بووم , زۆرم بەلاوە سەیربوو ئەم کەسانە دەتوانن بەئاسانی بۆچوونێکی وەها لەناخی جەماوەردا بچەسپێنن کە زۆرجار لەدژی خوودی جەماوەریشە. لەماوەی چەند هەفتەیەکدا ڕۆژنامەکان دەتوانن ڕووداوێك پووچ بکەنەوە یان ڕووداوێکی پووچ ئەوەندە گەورەبکەنەوە کورسی دەستەلاتی ولاتی پێ بهێننە لەرزە, دیسانیش دەتوانن لەم ڕێگەیەوە پەردە پۆشی کێشە زیندەییەکان بکەن و جەماوەریش هیچ هەستێکی پێناکات.

بەم شێوەیە بانگەشەی گەورە لەکەسانی نادیار و ونەوە دیاردەکەوت و ڕای گشتی بۆلای خۆی کێش دەکرد و ببوونە هیوای نەتەوەو خاوەنی جەماوەرێکی زۆریش. ئەگەر ئابڕووی یەکێك لەم بانگەشە کارە بەمێزانە پێشتر لەکەداربووە ئەوا بەم ڕێگەیە دەتوانێت خۆی پاقژبکاتەوە و ئەو ناوبانگ خراپیەی نەمێڵێت. بەڵام ئەگەریش بیانەوێت دژایەتی کەسێکی ئابڕوومەندی پێبکەن ئەوا جوولەکەکان، بە خوێڕێتیە بەڵێن لەسەر دراوەکەیان، لەهیچ شتێك ناترسن و پەنا بەهەموو شتێك دەگرن و ڕۆژنامەکان دەکەنە دوانگەی خۆیان و هێرشی کەسی ئابڕووداری پێدەکەن و تەنانەت ڕەخنەش لەژیانی تایبەتی دەگرن و ئابڕووچوونەکانی ئەندامانی خێزانەکەشی بڵاودەکەنەوە و بەتەواوەتی دەیبەنە ناخی زەویەوە. بەڵام ئەگەر هیچ شتێکیان لەسەر ئەم کەسە نەدیتەوە کە خزمەتیان بکات لەم ڕێڕەوتەیاندا ئەوا دەست دەکەن بەدرۆ هەڵبەستن و لەڕێگەی دەیان ڕۆژنامەوە هێرشی دەکەنەسەر بەو هیوایەی شتێك یان یەکێك لەم بابەتانە بەرگوێی جەماوەر بکەوێت و لە مێشکیاندا بچەسپێت و ئەم کەسەی پێ سووك و بێ ئابڕوو بکەن.

ئەمانە ئەو جەردانەن کە ڕای گشتی بۆ خۆیان دەقۆزنەوە و ئاراستەی دەکەن، لەم ڕای گشتیەوە ئەندام پەرلەمانان هەڵدەقوڵێن وەکو چۆن فینۆسیش لە کەفی دەریاوە هەڵدەقوڵێت.

بێگومانین لەوەی باسکردنی ئامرازی پەرلەمانی بەتەواوەتی و خستنەڕووی بنەما خەیاڵیە لەسەر وەستاوەکانی ناتوانین بە چەند بەرگێکیش بیخەینەڕوو. بەڵام دەتوانین بڕیاری نەزۆکی ئەم جۆرە پەیڕەوە دەربکەین لەگەڵ کەمی پێویستیمان پێی گەر بەجوانی لە سوود و قازانجەکانی بنوارین، لەگەڵ ئەو هەوڵە زۆرانەی بۆی دەدرێن.

### لەسێبەری پەرلەماندا چی دەگوزەرێت ؟

خەڵکانی وڵات چەند پاڵێوراوێکی دیاری کراو لە پیاگ (لەهەندێك وڵات ئافرەتیش) هەڵدەبژێرن ،کە ژمارەیان دەگاتە پێنج سەد کەس. پاش لەهەڵبژاردنی ئەم کەسانە ئەوا ئەمانە دواتر دەبنە بڕیاردەر و یاساداڕێژەری هەموو بابەتێك کەواتە ئەمانەن دادوەر و دەستەڵاتدرانی ڕاستەقینە؛ چونکە ئەوا پەرلەمانە ناو لەحکومەتی وڵات

دەمێنێت، بەرووکەش، و کاروباری وڵاتیش دەست نیشان دەکات، بەڵام پێش لە قایل بوونی ئەنجومەن حکومەت ناتوانێت هیچ هەنگاوێك بنێت. کەواتە لەم کاتەدا حکومەتی باڵای وڵات چۆن دەتوانێت بەرپرسیاریتی کارەخراپەکانی وڵات و کەندەڵییەکان لەئەستۆ بگرێت لەکاتێکدا دوا بڕیار لای پەرلەمانەوە نەوەك حکومەت، حکومەت تەنها جێبەجێکارە و هیچی تر.

حکومەت جێبەجێ کاری سەر ڕاستانەی بڕیارەکانی زۆرینەی ئەندامانی پەرلەمانە. حکومەت لێرەدا ناچاری جێبەجێ کردنی بڕیاری زۆرینەی ئەندامانی پەرلەمانە بەبێ گەڕانەوە بۆئەوەی کە ئەو ئەندامانەی بەزۆرینە بڕیاریان داوە ئایا بەڕاستی شارەزای ئەو بوارەن کە بڕیاریان لەسەرداوە یان هەر بەشێوەیەکی لەناکاو بڕیاریان لەسەرداوەو بوونەتە پاڵەوانی بڕیاردان؛ خۆئەگەر حکومەت ئامادەی جێبەجێ کردنی بڕیارەکانی پەرلەمان نەکات ئەوا دەرئەنجامی باشی نابێت.

لێرەوە ناچونیەکی ئەم پەیڕەوەمان بۆ دیاردەکەوێت: ئەم پێنج سەد ئەندامە کۆمەڵی بۆچوون جیاواز و دژیەرن، پڕن لە سۆز و حەز و خواستی تایبەتی، پاڵپشتن بەهێزێك بۆ جوڵاندنیان، بەڵام ئەوەی هەیە بەرپرسیار نابن لە هەر ڕووداوێکی نەخوازراو کەلە ئەنجامی بڕیارلەسەردانەکانی ئەمانەوە بێتە بونەوە!

ئەم پێنج سەد نوێنەرەی گەل لەپەرلەمان مانای ئەوە نییە کەئەمانە باشترین و ژیرترین و بژاردەترین کەسانی وڵات بن؛ کەمژەترین مرۆڤی وڵات بەشەووڕۆژێك لەڕێگەی سنوقی دەنگدانەوە دەبێتە دیارترین کەسی وڵات، لەگەڵ ئەمەشدا هەڵبژێردراوان ڕەنگە هەمووشتێك بن تەنها ئەوە نەبێت کە ژیر نەبن.

نەتەوەکان تەنها لەڕۆژی بومارەکدا پیاوانی دەوڵەت دروستدەکەن، دەبێت ئەوەش بزانین کە جەماوەر تەنها نازانێت نوێنەری ڕاستەقینەی خۆی دیاری بکات؛ چونکە لەژێر کاریگەری هەست و سۆزە وروژێندراوەکەیدا بڕیاری داوە دەنگ بداتە کێ، هەڵبژاردنی کەسی ڕاستەقینە لەلایەن جەماوەرەوە لەوە گرانترە کە وشترێك بە کونی دەرزییەکدا بڕوات، هەرگیز ناتوانرێت لەڕێگەی هەڵبژاردنەوە کەسی ژیر دیاری بکرێت بۆ پەرلەمان. بێگومانین لەوەی هەموو داهێنانەکانی ئەم جهانە بەتاك کەسی هاتۆتە بونێ نەوەك بە کۆمەڵ. لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا پەیڕەوی پەرلەمانی وا پیشانی دەدات کە ئەم پێنج سەد کەسە ئاساییە لەبژاردەترین کەسانی کۆمەڵگەن و

ئەمانە مافی دیاری کردنی چارەنووسی خەڵکیان هەیە و بەتوانان بۆبڕیاردانی زیندەیی و یەکلاکارەوە، حکومەتیش ناچارە بۆ هەر پێنگاڤێکی پرسی پەرلەمان بکات.

کەواتە لەم کاتەدا لغاوی سیاسەت بەدەستی پێنج سەد کەسەوە دەبێت نەوەك یەك کەس!

ناموێت سنورێك بۆ نوێنەرانی گەل دابنێم، بەڵام با وایدەبنێین پێنج سەد کەس لەبارەی بابەتێکەوە قسەدەکەن لەکاتێکدا زۆرێکیان لەدوور و نزیکەوە هیچ ئاشنای ئەم بابەت و کێشەیەش نین، بەڵام قسەی لەسەر دەکەن و ناشزانن مەترسیەکانی دواتری ئەم بابەتە چییە ، کەواتە چۆن گەل دەتوانێت تاوتوێ کردنی داهاتی خۆی بە پێنج سەد کەس بسپێرێت کە ژمارەیەکی زۆر کەمیان هەڵگر و خاوەنی بڕوانامەی ئابوری سیاسین؟! ئەم زۆرینە نەزانە خۆیان وەکو گەورە زانست خوازان پیشان دەدەن و لەهەموو بابەتێکدا قسەدەکەن و دەنگ دەدەن. ئایا ئەوە گاڵتەجاڕی نییە کە دەنگی زۆرینەی نەزان وەربگیرێت و کەمینەی بزانیش پشت گوێ بخرێت لەبابەتێکی سیاسی یەکلاکارەوەو مەترسیداردا ؟ ئایا ئەوە گەمژەیەتی نییە چارەنووسی گەل بخرێتە ژێر دەستەڵاتی ئەم کۆمەڵە نەزان و کاڵفامانەوەی کە وەکو چۆن یاری کۆنکان بکەن ئاوهاش یاری بەچارەنووسی گەل دەکەن ؟!

ڕەنگە کەسێك بێژێت: ئەگەر هەموو ئەندام پەرلەمانێك لە بابەتی شیکراوە تێبگات ئەوا دیسانەوە پشت بەست بە بەرژەوەندی پارتەکەی دەتوانێت بڕیاربدات. و لە پەرلەماندا هەر پارتێك کۆمەڵێك لیژنەی تایبەتی هەیە کە هەریەکەیان تایبەت بە کاروبارێکەوە.

ڕەنگە ئەمە تێبینیەکی جوان بێت، بەڵام دیسانەوە منیش دەڵێم: سوودی هەڵبژاردنی پێنج سەد کەس چییە لەکاتێکدا تەنها چەند ئەندام پەرلەمانێکیان ژیر و زانابن و بزانن دوائەنجامی ئەم بڕیارەیان بەرەو کوێ میللەت ئاراستە دەکات ؟

پەیڕەوی پەرلەمانیمان بەم دۆخەی ئێستایەوە ئەوەی بەلایەوە گرنگە کۆکردنەوەی ژمارەیەك کەسی مەڕناسای ئاسان ئاراستەکراوە نەوەك کۆمەڵێك کەسی ژیری خۆ بڕیاردەر. ئەو کەسانەی لغاوی ئەم ئەندام پەرلەمانانەیان بەدەستەوەیە لە پشتی پەردەوەن و هیچ کاردانەوەیەکیان ناکەوێتە ئەستۆ.

له سێبەری ئەم پەرلەمانەماندا هەموو بەرپرسیارێتییەك لە نەبووندایە، چونکە هەرگیز کەسێکی دیاریکراو ناتوانێت دەرئەنجامەکانی لەئەستۆ بگرێت. ئەم سیستەمە تەنها شیاوی ئەو کەسانەیە کە دەترسێن لەوەی بەرۆژ ئەرك و کارەکانیان ئەنجامبدەن. ناشبێت هیچ کەسێکی ئازاد متمانە بەم کەسانە بکات.

کەواتە هیچ نامۆییەك نییە لەوەی ئەم پەیڕەوە دیموکراتیە لەمەناوی گەلەوە ئەخشەگەلێکی نهێنی وەها پاش کێشانی پەیڕەوبکات کە هیچ بەرژەوەندییەکی گەلی پێوەدیارنەبێت ، نەلە دوور و نەش لەنزیك.

ئەوەی دەبینێت جگە لە دامەزراوەیەکی دەست بەسەرداگیراوی جولەکەیی ڤێزەوەن هیچی دیکە نییە و دەیهەوێت لەسایەو سێبەری ئەم دەزگایەدا خواستەکانی جولەکەبەدی بهێنێت.

***

**گەورەترین جیاوازی لەنێوان پەرلەمانی دیموکراتی ئەڵمانی و ئەمسادا چییە ؟**

لەئەڵمانیادا سەرۆك بەر پرسیارێتی کارەکانی هەڵدەگرێت، دیموکراتیەتی ئەڵمانی ماف ئەوە بەزۆرینە نادات کە کێشەکان بشارنەوە و بەجوان و هیچی پیشانبدەن، بەڵکو بڕیارەکان دەخاتە دەستی یەك کەسەوە و هەرئەویشە بڕیارلێدەر و بەرپرسیاری هەموو دۆخەکان، هەر هەڵەیەکیش بکرێت خۆی دەبێتە بەرپرسی.

لەم کاتەشدا ناوەندەکانی بڕیاردان پووچن لە کەسانی ترسنۆك و نەشیاوی بواری سیاسەت ، لەم کاتەدا ناتوانیت بڵێیت دۆزینەوەی کەسێکی بەهێز بۆ هەڵگرتنی بەرپرسیارێتیەکان نەبوونە، ئەمەیە دیموکراتیەتی ئەڵمانی.

بەڵام ئەگەر کەسێکی ترسنۆك توانی بەفێڵ و تەڵەکەوە بگاتە دەستەڵاتداری، ئەوا لەم کاتەدا هاواری لێدەکرێت : برۆ ئەی ناکەسی ترسنۆك ئێرە جێگەی تۆ نییە.

کەواتە تەنها پاڵەوانان بۆیان هەیە ناویان بچێتە نێو مێژووەوە، بەڵام ترسنۆك و دەستەکەلایان لەدەرەوەی ئەم جهانەوە دەهێڵرێنەوە.

***

ئەمە دەرئەنجامی دووساڵی هاتوچۆکردن بووە بۆ نێو هۆڵ و کۆبوونەوەکانی پەرلەمانی ئەمسا لەڤییەنا ،دواتر و چیتر ڕووم نەکردەوە لە کۆشکی ڕایخسترات.

پەیڕەوی پەرلەمانی هۆکاری خێرا هەڵوەشانەوەو لەناوبردنی دەوڵەتی هابسبۆرگی پڕ بوو. بە لاوازکردنی ڕەگەزی ئەڵمانی ململانێی نێوان چینەکان سەری هەڵدا, بەڵام ئەم ململانێیە بووە هۆی گێرەوکێشەی مەترسیداری پەرلەمانی نێوان ئەندامە ئەڵمانی و ڕەگەزەکانی دیکەدا, ئەمەش مانای دروستکردنی هاوپەیمانی بوو لەدژی خوودی ئیمپراتۆریەتەکە؛ چونکە ئەم پاشانشینە بەبێ ئەڵمانییە نەمساییەکان نەی دەتوانی ڕووبەڕووی شاڵاوە جوداخوازیەکانی نێو وڵات بێتەوە.

لەو کاتەدا, واتە لەسەرەتاکانی ئەم سەدەیەدا,لاوازبوونی وڵات بەشاراوەیی نەما و بەجوانی دیارکەوت. هەرێمە سلاڤی و هەنگاریەکان بەم دۆخە زۆر خۆشحاڵ بوون؟ چونکە لەبەدی هێنانی ئامانجە نەتەوەییەکانیان نزیکی دەکردنەوە. ئەم دۆخە لە پەرلەماندا گەیشتە ئاستێکی وەها مەترسیدار کە نەدەتوانرا پشت گوێ بخرێت, هەوڵی کەمکردنەوەی ئەم مەترسیانە درا لەڕێگەی دەست لێهەڵگرتنی نەشیاوەوە لەبەرامبەر هەڵمەتەکانی(شانتاج)دا پەرلەمان کشانەوەی زۆری بەخۆوە دیت, هەموو ئەم کێشانەش لەڕێگەی لێدانی بەرژەوەندی ئەڵمانە نەمسا نشینەکان چارەسەر دەکرا, بۆیە ناقایل مەندی گەلانی دیکە بە کەمکردنەوەی دەستەڵاتی ئەڵمانەکانی نەمسا کۆتایی پێهات.

ئەو کاتەی ئەرشیدۆك فرانسوا فەردینان بووبە جێنشین, دەستی لەهەموو کاروبارێکی وڵات وەردەدا, پەنای گرتە سیاسەتی قایلکردنی هەنگاری و سلاڤیەکان و لەدژی ئەڵمانەکان وەستایەوە, سیاسەتی (وروژاندنی چیك) ڕوون بوویەوە و ڕێڕەوی خۆی گرت, ئەم پاشایە دواتر بە ڕوونی دەستی دایە لەناوبردن و هەوڵدان بۆ ڕیشەکێشکردنی ئەڵمانیەکانی وڵات, لەڕێگەی دەرکردنی ئەڵمانەکان لەسەر ئیش و کار و چۆڵکردنی گوندە ئەڵمان نشینەکان یان لکاندنیان بەناوچەگەلێکی نائەڵمانییەوە. بەخێرایی ڕەگەزانی سلاڤی لە نەمسای خواروودا دەستیان دایە تاوانکردن و لەڤییەناشدا کە چیکەکان بە شاری گەورەی خۆیانیان دەزانی.

لە مێشکی فردیناندا تەنها یەك بیرۆکە هەبوو کەلەلایەن ژنەکەیەوە( کە چیکی بوو هانی دژایەتی کردنی ڕەگەزی ئەڵمانی دەدا) بۆی داڕێژرابوو, ئەم بیرۆکەیە مەبەست لێی پونێت نانی دەوڵەتی سلاڤی بوو لە ئەورووپای ناوەڕاستدا, کە پشت بەستبوو بە ڕێبازی کاسۆلیکی بۆئەوەی لە دژی ڕووسیای ئەرسەدۆکسی بوەستێتەوە. بەم

شێوەیە خێزانی هابسبۆرگ ئاینیان بۆ خزمەتی بەرژەوەندیە تایبەتیەکانیان بەکارهێنا.

بەڵام ئەم بیرۆکەیە نەهاتەدی و لەسایەیدا خێزانی هابسبۆرگ کورسی دەستەڵاتیان لەدەستدا و کەنیسەی کاسۆلیکیش وڵاتێکی گەورەی لەدەستدا. ئەمەش بەهۆی ئەوەوە بوو کە تاج بە ئامارژەی ئاینی دەستەمۆکراوە و لەبەرژەوەندی سیاسیدا بەکارهێنرابوو، ئەمەش بووە هۆی دیارکەوتنی بزوتنەوەی دژە بوونی. لەسایەی ئەم سیاسەتە هەڵەیەوەی کە دەیویست ڕەگەزی ئەڵمانی لە وڵاتدا پاکتاوبکات بزوتنەوەی ئەڵمانی لە نەمسادا ڕەنگی گرت و بووەهۆی دیارکەوتنی ئاشکرای بانگەشەی یەکخستنەوەی هەردوو وڵاتی ئەڵمانی.

ئەوکاتەی سوپای ڕایخ لە سەیدان (١٨٧٠-١٨٧١ن) توانی سوپای فەرەنسا بشێلێت و لەناوبەرێت خێزانی هابسبۆرك تاڕادەیەك بەخۆیاندا چوونەوە، بەوەی ئەم کارەیان لەکۆتادا دەبێتەوە هۆی زیندووکردنەوەی سەرکەوتنەکانی ڕەگەزی ئەڵمانی. بەڵام بەخێرایی لەبیریان کرد و گەڕانەوە بۆ پەیڕەوکردنی هەمان ڕێچکەی جارانیان، لەم کاتەدا ئەڵمانەکانی نەمسا بەشانازی کردن بە سەرکەوتنەکەی سیدانەوە ورەی زیادتریان بەخۆیان دەدا و بڕوایان پتەوتر بوو، بەوەی داهاتوویەکی گەش چاوەنواریانە لەسایەی ئەمپراتۆریەتێکی یەککگرتوو لەژێر سەرپەرەشتی (تاج ڕاین)دا.

بەڵێ بەخێرایی بنەماڵەی هابسبۆرگ پەندەکەی سیدانیان لەبیرچوویەوە و بەکوێرانەوە هەنگاویان هاڕووت بۆ لەناوبردنی ڕەگەزی ئەڵمانی لە نەمسادا. بەڵام شۆڕش و ڕاپەڕینی ئەڵمانەکانی نەمسا زۆر بەهێز بەڕوویاندا بەرپابوو و دیارکەوت.

بەم شێوەیە بینیمان ئەو پیاوانەی دڵسۆزیشن بۆ نیشتمانەکەیان هەرگیز بە کوتەکی زۆردارنی وڵاتەکەیان قایل نابن و لەدژی دەوەستنەوە.

گۆچانی ملمەچی و گوێڕایەڵییان درزتێخست نەوەك بۆ نەتەوە و خوودی وڵات بەڵکو لەبەرامبەر شێوازی پەیڕەوکراوی سیاسەت بەمەبەستی لەناوبردنیان.

لە باشیەکانی ڕاپەڕینی ئەڵمانیە نەمسانشینەکان (١٨٩٠-١٩٠٠) بەڕوونی دیارخستنی ئارەزووی جیاخوازی نێوان گەلەکانی وڵات بوو، دەستەڵاتدارانیشی تێگەیاند بەوەی بۆیان نییە ڕێزی خۆیان بەسەر گەلدا بسەپێنن گەر یاری بەبەرژەوەندیەکانیان بکەن، ئەمەش لای خۆیەوە مانای گاڵتەکردن و ئازاردانی گەلانی

دەگەیاند لەلایەن دەستەڵاتدرانەوە، بوونی دەستەلات لەولاتدا نابێت ببێتە تاکە ئامانج ئەگینا پەیرەوکردنی زوڵم و زۆر دەبێتە کارێکی باو.

ئەوکاتەی حکومەت گەل بەرەو هەلدێری لەناوبردن دەبات ئەوجا مافی هەموو تاکێکە یاخی بێت،بەڵکو یاخی بوون لەم کاتەدا دەبێتە ئەرکێکی نیشتمانی.

بەلام سەبارەت بەو پرسیارەی کە دەڵێت: گەل چۆن دەتوانێت خۆی خۆی دور کەرت بکات؟ ئەوا وەلامی ئەم پرسیارە نە لە دەقی یاسایی نەش لە کۆمەڵناسیدا دەست دەکەوێت، ئەمە ململانێی نێوان گەلێکی ستەم دیدە و دەستەلاتدارانی ستەمکارە و تەنها جیاکارەوەی ئەم دوانەش بەکارهێنانی هێزە.

لەبەرئەوەی هەموو حکومەتێك هەرچیەك بێت خۆی بەدادپەروەر دەزانێت و زوڵمەکەشی هەرچەندەبێت بە بەرژەوەندی نیشتمانی دادەنێت و خۆی بەبەرپرسیاری مانەوەی دەستەلاتی ولات دادەنێت، کەواتە لەم کاتەدا هیچ ڕێگرێکیش نابێت لەپێش ڕەگەزێکی زوڵم لێکراودا بۆ پەناگرتن بە چەك کە دوژمنەکەشی پەنای بۆدەبات بەمەبەستی خۆپاراستن و پاراستنی دەستەلاتەکەی، ئەمەش لە خەبات و تێکۆشانە بەردەوامەکانیدا دیار دەکەوێت لە بۆ بەدەست هێنانی ئازادی و سەربەخۆیی خۆی.

دەبێت خەبات کاران لە چوارچێوەیەکی ڕێگەپێدراودا تێبکۆشن، لەبەرئەوەی نەستێرەی دەستەلات بەرەو نەمان دەڕوات، بەلام گەر دەستەلاتی خوێن مژ پەنای گرتە ئامرازی نەشیاو بۆ بەهێزکردنی خۆی، ئەوا مانەوەی خەباتی نیشتمانی لەم کاتەدا لەچوارچێوەی ئابڕووداری و ڕێپێدراویدا مانای خۆکوشتنە.

بەلامانەوە سەیر نەبێت کە ئامانجی مرۆڤ لە تێکۆشانەکانیاندا هێشتنەوەی مرۆڤایەتیە نەوەك دەوڵەت. ئەو کاتەی گەلێك یان نەتەوەیەك مەترسی لەناوچوونی کەوتەسەر ئەوا بابەتی ڕێپێدراوی بەرگری لەم کاتەدا بوونێکی نامێنێت و لەبەرامبەردا بەرگری کردن لەخوود دێتەبوونی و لەم کاتەشدا مافی خۆیانە پەنابگرنە هەموو جۆرە کەرەستەیەك بەمەبەستی لەخۆبەرگری کردن.

بەلام گەر گەل لە گۆڕەپانی جەنگدا بە دەوڵەت شکای‌ئەوا مانای وایە چارەنوس ئەم گەلەی بەشیاوی مانەوەو چێژ وەرگرتن لە پیت و فەڕەیەکانی ئەم زەوینەی نەزانیوە؛ جیهان بەو فراوانییە بۆ گەلی لاواز تەنگەبەرە.

***

ئەمسا لەڕێگەی وشەی ڕێگەپێدراوی دەستەڵاتەوە زوڵمەکانی خۆی دەرهەق بە گەلی ئەڵمانی ئەمسانشین خستەڕوو. دەستەڵاتی ڕێگەپێدراو لەپەرلەماندا زۆرینە ئەڵمانی بوو لەگەڵ خانەی پاشای دژبەردا کە بەزۆرینە ئەڵمانی بوو. کارێکی زۆر ساویلکانە دەبوو گەر پشت بەست بەم دوو دەزگایە هەوڵی ڕزگارکردنی گەلی ئەڵمانی ئەمسا نشین بدرایە، یان لەڕێگەی بەکارهێنانی شێوازی ڕێگەپێدراو یان شەرعییەوە، ئەگەر ئەڵمانیەکان لەڕێگەی یاسای باوەوە دژبەری دوژمنەکانی نێو ئەمسایان بکردایەتەوە ئەوا بەچەند ساڵێکی کەم خاکی ئەمسا بەتاڵ دەبۆوە لە ئەڵمانی ڕەگەز.

خاوەنی بیرۆدۆز و بیرۆکەکان بەگیانەوە هەوڵی سەرخستنی بۆچوونەکانیان دەدەن بەڵام گەر پەیوەست بوو بە گەلەکەیەوە ئەوەندی تر سوردەبێت لەسەر باشی سەرکەوتنی هەنگاوەکانی.

مرۆڤەکان خۆیان بۆخۆیان یاساکان دادەڕێژنەوەو بڕوایان وایە کەلەپێناو یاسادانان و جێبەجێکرندا ئافرێنراون. یەکێك لە باشیەکانی بزوتنەوەی ئەڵمانی ئەمسانشین ئەوەبوو کۆتایی بەم بۆچوونە پووچە هێنا و سنورێکی بۆ هەڵخەڵەتێنەرانی خەڵك و فەلسەفەلێدەران دانا.

لەکاتێکدا بنەماڵەی هابسبۆرگ بەبەکارهێنانی هەموو ڕێگەیەك هەوڵی تەسککردنەوەی کاریگەری ئەڵمانەکانیان دەدا لەوڵاتدا، ئەمانە یەکەم جار پەلاماری خانەی پاشا یان دا، ئەمانە دەیانویست خوێ بخەنە سەر زامەکان لەم وڵاتە داڕزاوەدا، بەم کارەشیان ڕووی ڕاستەقینەی خۆیان بۆ هەزاران هاوڵاتی پیشان دا،لێرەوەش نیشتمان پەروەری ئەڵمانی لە ئەمساوە سەری هەڵدا.

هەرلەگەڵ سەرهەڵدانیدا پارتێکی ئەڵمانی دا دەیان هەزار خەڵك لەدەوری کۆبوونەوە بەجۆرێك ببوە باهۆزێك و وەخت بوو هەموو شتێك لە وڵاتدا ڕابماڵێت، بەڵام ئەم سەرکەوتنە زۆری نەخایاند. لەکاتی گەیشتنم بۆ ڤیەنا بزوتنەوەی یەکێتی ئەڵمانی شوێنی بۆ پارتی مەسیحی سۆسیالیستی چۆڵ کرد، کە ئەم پارتە دواتر دەستەڵاتی وڵاتیشی گرتە دەست.

فراوانی لەناکاوی بزوتنەوەی یەکێتی ئەڵمانی و دواتریش چوونەوەیەکی و شوێن چۆڵکردن بۆ پارتی مەسیحی سۆسیالیستی بەڕاستی لە شۆکاوی ترین ڕووداوەکانی ئەوکاتەبوو و خەڵکی ڤیەنا هەمووی پێی حەپەسابوون، بەکورتی من ئاراستە و

سۆزم ڕووله بزوتنەوەی یەکێتی ئەڵمانی بوو، زۆرم هەست بەشانازی دەکرد بەوەی لەپەرلەماندا دروشمی گێڕانەوەی نەمسا بۆ نێو باوشی ئیمپرتۆریەتی گەورەی ئەڵمان دەوترایەوەو بەشان و باڵی بنەماڵەی هوهنزولرنیان هەڵدەدا، بەوەی: ئەم دیوارە دەستکردەی ڕێگر لە بڵاَبوونەوەی یەکێتی ئەڵمانی لابەرن و هەموان بگەڕێنەوە باوشی ئەڵمانیای گەورە و دایك.

بەڵام بۆچی لەناکاو ئەم پارتە پوکایەوەو پارتی مەسیحی سۆسیالیستی شوێنی گرتەوە؟

توێژینەوەی من بۆ ئەم دووپارتە لەسەرکردەکانیانەوە سەرچاوە دەگرێت کە ئەوانیش: جۆرج فۆن شونرر و دکتۆر کارل لۆجر بوون.

ئەمانە لەپەرمانەدا ناوبانگی باشیان هەبووەو هیچ جۆرە خەوشێکی تایبەتی مەترسیداریان نەبووە، خەڵکیش بە دوو هاوڕێی بەهێزی بواری سیاسەتی یاخیانەیان دادەنان لەهەمبەر ئەو ڕامیارێتیەی کە ڕژێمەکانیانی لەقوڕی گەندەڵیدا چەقاندبوو. سەرکردەی بزوتنەوە ئەڵمانیەکەم زۆر خۆش دەویست، بەڵام نەشم دەتوانی خۆشەویستی خۆم بۆ دکتۆر لۆجەر دەرنەبڕم. لەبەراوردکردنی ئەم دوو سەرکردەیەدا بۆم دەرکەوت فۆن شونرر لەڕووی بیرکردنەوەوە قوڵترە و پێشبینی هەموو ڕووداوێکی کردووە کەبەسەر نەمسادا دێت ، سەرباری ئەم فرمزانی و باش پێشبینی کردنەی بەڵام سروشتی دەروونی مرۆڤی بەتەواوەتی لەبیرکردبوو.

بەڵام دکتۆر کارل لۆجر باش خەڵکانی دەناسی.

لۆجر زۆر بەباشی هاوڵەکانی خۆی هەڵدەبژارد و زیادەڕۆیی نەدەکرد لە باش و خراپ گومان بردن بەخەڵك، بەجۆرێك زیادتر لە باری کەتواری خۆیانی نەدەبینی، بەم کارەشی دەیتوانی پێگە دروستەکانی ژیان هەڵبژێرێت، بەپێچەوانەی شونرەوە کە بە خەیاڵ و ئەندێشەوە لەشتەکانی دەنواڕی.

ئەوەی بەمێشکی سەرکردەی بزوتنەوە ئەڵمانیەکەدا دەهات دەتوانین بڵێین: هەمووی ڕاست بوو، بەڵام هێزی قایلکردنی لاوازبوو، توانی بووی بۆچوونەکانی خۆی لەناخی جەماوەرێکی بەهرە دیاری کراودا بچەسپێنێت. بەم شێوەیەش کەوتە هەڵەی چۆنێتی گەیاندنی بۆچوونەکانی لەگەڵ شێوازی جێبەجێکردن و چەسپاندنی بۆچوونەکانی بەشێوەیەکی کردارەکی.

شونر بەمەڵە سروشتی مرۆڤی لێکدابۆوە ئەمەش وای لێکردبوو بکەوێتە هەڵەی بەرجەستەوە لە دیاریکردنی هێزی بزوتنەوە جەماوەرییەکاندا، لەگەڵ خەملاندنی بەهای دامەزراوە ڕەسەنەکانی پێشووتر، لەشێوەی کڵیسا.

لەکۆتاییدا سەرکردە ئەڵمانیەکە تێگەیشت لەوەی کە پێویستە بۆچوونەکانی بەشێوەیەك دابڕێژێتەوەو دەریبڕێت کە دگەڵ چەمکی تێگەیشتنی کۆمەڵدا بگونجێت، بەڵام دیسانەوە هەستی بەوە نەکردبوو کە ئەندامەکانی گەل تواناداری بۆ پاڵپشتی کردنی تەواوی ئەو بۆچوونەی بەدڵیانە و دەستەڵاتی بەرەی ناسراو بە بورژوازی بۆ خەباتگێران سنورداره و لەهەر هەنگاوێکیاندا بۆ پێشەوە هێڵی گەڕانەوەشیان دیاری دەکەن و لەتێکۆشاندا زۆر ناپۆن بۆئەوەی کارنەکەنە سەر خراپکردنی باری ئابووری وڵات.

هیچ جۆرە بیرۆکە و بنەمایەك بە سەرکەوتوو نازانرێت گەر زۆرینەی گەل بەدووی نەکەون و ئامادەی تێکۆشان نەبن لەپێناو سەرخستنیدا. شۆنرر هەرگیز نەی توانی بوو بەجوانی لەم بابەتە تێبگات، بەڵام دکتۆر کارل لۆجر بەباشی ئاشنای سروشتی مرۆڤ ببوو، دەیتوانی هێزە جیاوازەکان بە کێشانەیەکی تەندروست بکێشێت و نەکەوێتە هەمان هەڵەی سەرکردە ئەڵمانیەکەوە لە پشت بەستن بە دامەزراوە سنوردارەکان، لەشێوەی چینی بۆرژوا. ئەم کەسایەتیە توانی بەبەکارهێنانی ئەم ڕەگەزە بگاتە ترۆپکی دەستەڵات.

دکتۆر لۆجر باش هەستی بەوەکردبوو کە توانای بورجوازیەکان بۆ تێکۆشانی سیاسی شتێك نییە بە تەواوەتی پشتی پێببەسترێت و ناشتوانێت سەرکەوتنی بزوتنەوەیەکی تازەدامەزراو مسۆگربکات. لەم کاتەدا دکتۆر لۆجر هەوڵەکانی خۆی چڕکردەوە بۆ ڕاکێشانی چینی مافخوراوی کەم درامەت و دیسانەوەش لەهەمان کاتدا هەوڵی خۆنزیککردنەوەی دەدا لە دامەزراوە ڕەسەنەکان بە ئومێدی قۆستنەوەو بەکارهێنانیان لەبۆ بەهێزکردنی بزوتنەوەکەی.

ئەو چینانەی لۆجر پشت پێبەستبوو لەو کەسانە پێکهاتبوو کە ئامادەی تێکۆشان بوون لەبۆ بەدی هێنانی ژیانێکی باشتر و بۆئەمەش ئامادەی ئەنجامدانی هەموو ئیش و کارێك بوون. بە هەڵوێستە دانایانەکەی لە کەنیسەی کاسۆلیکەوە توانی ئەوە بە

پارتی ئیکلیریکی کۆن ڕابگەیەنێت کە یان ئەوەتا دێتە پاڵ ئەم پارتەی و پێکەوە خەبات دەکەن یام ئەوەیە دەبێت دەست لەسیاسەت کردن هەڵبگرێت!

لۆجر تەنها پیاوێکی پلانڕێژکار نەبووە بەتەنها، بەڵکو پیاوێکی زیرەک زیرو و فرمزانیش بووە، ئەم بەمێژیەشی توانی بووی هەموو لاوازیەکانی بپۆشێت.

لۆجەر چاوی بڕیبووە ڕاکێشانی جێ نیشتوانی ڤییەنای پایتەخت، چون لێرەوە چارەسەر بۆ جەستەنەخۆشەکەی وڵات دەکرێت، ئەم سەرکردەیە وای پیشان دا ڕزگارکردنی دڵ مانای ڕزگارکردنی جەستەی وڵاتە. ئەوەی لۆجر وەکو پارێزگاری ڤییەنا ئەنجامی دا تادواساتی ژیان بەنەمری دەمێنێتەوە. بەڵام خزمەتەکانی بۆ پایتەخت نەتەنیەوە بەهەموو وڵاتدا؛ چونکە پاش لەدەست دەرچوونی دۆخەکان ئەم هاتەسەر دەستەڵات.

لەم ڕوانگەیەوە شۆنرر دووربین تر بوو لە هاوڕێکەی.

پرۆژەکانی لۆجر لە ڕوانگەی کرداریی‌یەوە سەرکەوتوو بوو، بەڕاستی سەرکەوتنێکی شیاوی بەدەست هێنا، بەڵام نەیتوانی بەم سەرکەوتنەی هیچ بگۆڕێت.

بەڵام شۆنرر کورتبین بوو لەگەیشتن بەئامانجەکەی ، بەڵام ئەوەی لێی ترسابوو ڕوویدا.

ئەم هەردووک پیاوە نەیان توانی بگەنە ئامانجی کۆتایی، لۆجر نەیتوانی نەمسا ڕزگاربکات و شونرریش نەیتوانی گەلی ئەڵمانی لە فەتارەتەکە بەدووربخات.

# ٤

# هۆکارەکانی شکست

بائێستاش هۆکارەکانی شکست هێنانی ئەم بزوتنەوەیە ڕوون بکەینەوە! چونکە ئەم وانەیە بێ کەڵك نییە بەتایبەت بۆئەوکاتانەی کە هەمان دۆخمان دووچار دەبێتەوە، دەترسین بکەوینە هەمان هەڵەی سەرکردەکانی ئەم دوو بزوتنەوەیەوە.

دەتوانین فاکتەری شکستی بزوتنەوە ئەڵمانیەکە بەسەرکردایەتی شۆنرر بۆ سێ خاڵ کورت بکەینەوە:

شونرر بەهەڵە کێشەی کۆمەڵایەتی خەڵکی لێکدابوویەوە بۆ پارتێکی شۆڕشگێڕی تازە دەرکەوتووی دژ، ئەم پیاوە خۆی و داردەستەکانی ڕوویان لە بۆرژواکان بوو کە هیچ هیوایەکیان لێ بەدی ناکرێت بۆ بەهێزکردنی شۆڕشەکان.

چینی بورژوازیەتی ئەڵمانی و بەتایبەت چینی بالآی زۆر سەلامەت و دوورەپەرێزە تاناستی نکوڵی کردن لەخورد، تائەوکاتەی کێشەیەکی نەتەوەیی لە وڵاتدا دروست نەبووە بێگومان ئەم چەشنە بۆچوونەی بوارجوازیەکان خزمەتی دەستەڵات دەکات و لەبەرمبەر ڕێگەدانی حکومەت بە ئەنجامدانی کار و کردەوەکانیان کۆمەکی دەوڵەت دەکەن، بەڵام ئەوکاتەی دەوڵەت لەدۆڵێك دەبێت و میللەتیش لەدۆڵێك ئەوا دوورە پەرێزی چینی بورجوازیەت لەبۆ پاڵپشتی کردنی گەل مانای کۆمەککردنی ڕاستەوخۆی دەوڵەتە بۆ لەناوبردنی نەرایان و زوڵم لێکراوانی دەوڵەت.

کەواتە شکستی پارتی یەکێتی ئەڵمانی بەهۆی پشت گوێ خستنی تواناکانی جەماوەرەوە بووە، ئەمەش وای لێکرد وەکو پارتێکی بورجوازی، ڕادیکاڵی ناوەندی دیاربکەوێت، ئەمە ئەو هەڵەیە بوو کە فاکتەری دووەمی هێنایە ئاراوە.

لەکاتی دیارکەوتنی ئەم بزوتنەوەیەدا دۆخی ئەڵمانییە نەمسا نشینەکان زۆر خراپ بوو، پەرلەمان ببووە فاکتەرێك کە لێیەوە بڕیاری دژە ئەڵمانی سەسەند دەکرا و

دواتریش بەرەو جێبەجێکردن ئاراستە دەکرا. هیچ جۆرە هەنگاوێك بۆ ڕزگارکردنی ئەم ڕەگەزە مانای سەرکەوتن نەبووە گەر پێشووتر هەوڵی هەڵوەشاندنەوەی پەرلەمانی نەدابایە.

لەم کاتەشدا ئەم بزوتنەوە ئەڵمانیە خۆی لەپێشی کێشەیەکی زۆر ورددا دیتەوە:

ئایا بەڕاست دەبێت بڕواتە پەرلەمانەوەو دواتر بەرگری لێبکات، یان ئەوەتا لەدەرەوە دەمێنێتەوەو دژبەری دەکات ؟

بزوتنەوەکە تەقلبونە نێو پەرلەمانی پێباشتربوو، بەلاّم بەدۆڕاوی لەم شەڕە هاتەدەرێ.

بزوتنەوەی ئەڵمانی هیچ ڕێگە و هەڵبژاردنێکی دیکەی نەبوو جگە لە تەقلبوونە نێو پەرلەمان؛چونکە دژبەری کردنی ئەم دامەزراوەیە لەدەرەوەدا پێویستی بە قوربانی دانی زۆری گیانی و دەروونیش دەبوو. ئەوکەسەی شاخی گایەك دەگرێت بۆ ئەوەی بیدات بەزەویدا ئەوا دەبێت خۆی بۆئەوە ئامادەکردبێت چەند قۆچێکی لێبدات، و زیادتر لەجارێك بیکێشێت بەزەویدا و دواتریش لا خۆیەوە هەستێتەوە و چەند ئێسقانێکیشی لەم کاتەدا ڕەنگە بشکێت، بەلاّم بەردەوام دەبێت لە تێکۆشان تاوەکو سەرکەوتن بەدەست دێنێت.

گەورەیی قوربانییەکانە بەتەنیا پاڵەوان بۆ کێشەکان دروست دەکات کە سڵ لەهیچ ناکەنەوە و خۆیان لەهیچ نابوێرن و چی بێتە ڕێگەیان لێی ناترسن.

ئەم کەسە بلیمەتانە دەبێت لەڕیزی گەلدا بۆیان بگەڕێین، وەچەکانی گەل، ڕەگەز و توخمی تێکۆشەری ڕاستەقینە لەناو ئەواندایە، ئەو کەسە سەرکێش و ژیرانەی بەردەوام دەبن لەجەنگکردن تاکۆتایی لەنێو گەلدان بە دەرنەکەوتوویی.

ئەم ڕەگەزە یارمەتی بەهێزبوونی بزوتنەوەی ئەڵمانی دا و جگە لە چوونە نێو پەرلەمان و تێکشکاندنی ئەم دامەزراوەیە لەناوەڕۆکەوە هیچ ڕێگەیەکی دیکەی لەپێش نەمابۆوە.

ڕاستیە گەر بێژین: ئەم بڕیارە پاش لە تاوتوێکردن و دڵەڕاوکێیەکی ماوە درێژەوە دەرکراوە. ئەم پارتە لەسەر بنەمایەکی لێڵ بڕیاری تەقل بوونە نێو پرلەمانی دا بە پشت بەستن بەوەی دەتوانێت لەپەرمانـدا ڕۆڵێکی کارای هەبێت بۆ پیشاندانی نەبەردیی خۆی. ئەم پارتە بڕیار ڕیشەکێشکردنی ئەو نەخۆشیە سیاسیەی دابوو کەلە

ولاتدا بلاْبوەوە، ئەمەش تەنها لەڕێگەی پەلاماردانیەوە دەبێت لەنێو پەرلەمانەوە ئەوەك لەدەری. بڕوایان وابوو كە ئەوكاتەی دەچنە سەر دوانگەی قسەكردن لەپەرمان ئەوكات هەموو كەس دەیبینن. بەلاَم ئەندێشەی ئەوەیان لاڕوست نەبووبوو كە ئەوە ڕۆژنامەكانن قسە و گوتەكانی ئەمان بەگەل و لایەنگرانیان دەگەیەنن ئەوەك بەشێوەی ڕاستەوخۆ گەل بیانبینێت. جا ئیتر ڕۆژنامەكان بەمەوەسی خۆیان چییان بوێت ئەوە بەخەلك دەگەیەنن.

ئەو كەسە ئاسایانەی ئامادەی كۆبوونەوەكانی پەرلەمان دەبن ژمارەیان لەدووسەد كەس پتر نییە و زۆرینەشیان تەنها بۆ كات كوشتن ڕوو لەپەرلەمان دەكەن ئەوەك بۆ سوود وەرگرتن لەقسەكانی نوێنەرانی گەل. بەلكو باشترین شوێن بۆ وتاردان بریتیە: لە ڕێكخستنی ئاهەنگ لەگۆڕەپانەكاندا و دواتریش وتاردان بە حەماس و ڕەوانبێژییەوە و ئەوەك لە نێو پەرلەماندا مش و فش بكەی.

كارێكی زۆر گێلانەیە گەر بڕوا بەوە بكرێت: بوونی باوەڕێكی سەلاٌمەت بەرەدەستی سەرمنج ڕاكێشانی هەموو ئەندامانی پەرلەمانە یان هەندێكیان. ئەگەر كەسێكیانیشی كێش كرد ئەوا ئەم كارە بەتەنها لەبەر خاتر و بەرژەوەندی خۆی ئەنجام دەدات بەوەی بەلكو جاری داهاتوو هەلٌ ببژێردرێتەوە.ئەوكاتەی ئەندام پەرلەمان هەست بە لاواز بوونی ئاست و پێگەی جەماوەری پارتەكەیان دەكەن ئەوكات دەست دەكەن بە خۆ كشانەوە لە پارتەكە و ڕووكردنە پارتێكی دیكە . لەشێوەی : **مشكەكانی نێو پەرلەمان هەركاتێك هەستیان بە نغرۆبوونی كەشتی پارتەكەیان كرد لەوكات هەولٌی لێدابەزینی دەدەن بەمەرجی سەلاٌمەتی ڕزگاربوون.**

ئەو وتارانەی ئەندام پەرلەمانە ئەلمانیەكان لە پەرلەماندا خستیانەڕوو وەكو ئەوە وابوو خواردنی ناوپوچ بدرێت بەئاژەلٌ و چییان دەگووت هەمووی بابردی. چونكە زۆرینەیان دەستیان نابووە گوێیان و نەیان دەویست هیچ ببیستن.

ڕۆژنامەكانیش هەرگیز وتاری ئەندام پەرلەمانەكانیان وەكو خۆی بلاٌو نەدەكردەوەو هەرچیەكیان بەباش و شیاو بۆ بەرژەوەندی خۆیان بزانیبایە ئەوەیات وەردەگرت و ئەو دەقەكانی دیكەیان هەلدەوەشاندەوەو هیسابیان بۆ نەدەكرد و زۆرجاریش بەم كارەیان گومانیان لەمەرامی پارتەكەدا دەخستەڕوو.

بەلاٌم شتێكی زۆر لەمە گرنگتر هەبوو كەلەبیر كرابوو

پێویست بوو لەسەر بزوتنەوەی یەکێتی ئەڵمانی هەر لەسەرەتاوە بیزانیبایە کە دیارکەوتنی بەشێوەی پارتی نوێ ڕەنگە ببێتەهۆی دوورخستنەوەی لەسەرکەوتن. سەرکەوتنیشی تەنها ئەوکاتە مسۆگەر دەبێت کە بتوانێت دەست بگرێت بەسەر بڕوا فەلسەفیە کاریگەرەکاندا. بۆئەمەش هەموو بزوتنەوەیەکی نیشتمانی نەتەوەیی پێویستی بە هێزێکی تەواوەتیە بۆ مانەوەی و ئەم هێزەش هەمیشە پشت ئەستورە بە فەلسەفەی جولانەوە.

بڕوای فەلسەفی بەتەنها ناتوانێت ڕێگە پڕ لەدڕك و هەڵدێرەکەی ببڕێت گەر خاوەنی بڕوا کەسێکی بەهێز و بەتوانا و ئامادە بۆ خۆبەکوشتدان نەبێت. ئەگەر کەسێکی لەم شێوەیە سەرکردەی بزوتنەوەکە نەبێت ئەوا هەرکەس گیانی خۆی ببەخشێت لەپێناویدا تەنها خۆی کوشتوەو هیچی تر.

پێش لەدارشتنەوەو بەرجەستەکردنی بڕواکان پێویستە هەموان بەباشی لەوە تێبگەیەنرێت کە ئامانجی ئەم بزوتنەوەیە لەم کاتەدا تەنها خەبات و تێکۆشانە لەپێناو خۆشکردنی ژیانی وەچەکانی داهاتووی وڵات. بەڵام لەئێستادا بەرهەمێکی ئەوتۆی نابێت؛ چونکە هەر بزوتنەوەیەك ڕەنگە دەیان کەسی مشەخۆری تێکەڵاوبێت و گەر لەسەرەتاوە هەموو شتێکیان پێببەخشێت ئەوا دواتر دەست دەگرن بەسەر بزوتنەوەکەدا و ئاراستەکەی دەگۆڕن. لەم کاتەشدا ئەو کەسەی بەڕاستی خەباتی کردووە لای ئەوانە نامۆدەبێت و لەبزوتنەوەکەدا جێگەی نابێتەوە.

بەم شێوەیە بزوتنەوە ئەڵمانیەکە کارەکانی خۆی بۆ چوونە نێو پەرلەمان کورت کردەوە و چەندین ئەندام پەرلەمانی فڕێدایە نێو پەرلەمانەوە لەبری دروستکردنی چەند سەرکردەیەکی تێکۆشەر. دواتریش کارەکانی بۆ هەستێکی سیاسی پارتچێتی نزم بوویەوە و نەیتوانی دژیەری هێزی بەرامبەر بکات. لەبری تێکۆشان فێری هونەری دانوستان و و قسەکردن بوون.

لایەنگرانی پارتەئەڵمانی خوازەکە داوای تەقل بوونە نێو پەرلەمانیان لە دەنگ پێدراوەکانیان دەکرد و بەباشترین ڕێگەچارەی یەکلایی کردنەوەی کێشەکانیان دەزانی. چارەنوازی هاتنەئارای پەرچوویەکی لەناکاویان دەکرد کەهەرگیز ڕووینەدا؛ بەخێرایی دووچار دارووخانی دەماری بوونەوە؛ چونکە ئەوەی دەنگ پێدراوەکان بەڵێنی لەسەر دابوو نەیان توانی بەدیبهێنن. ڕۆژنامەکانیش لای خۆیەوە

ڕۆڵی کارایان هەبوو لە دوورخستنەوەی خەڵك لەم پارتە ئەڵمانیە,ئەندامانی باڵای ئەم پارتە کەمە کەمە بەستیان لە وتاردان بۆ خەڵك هەڵگرت, ئەمەش هۆکارێکی دیکەی لاوازبوونی ئەم بزوتنەوەیە بوو.

بەم شێوەیە بزوتنەوە ئەڵمانیەکە حەزە گەلیەکەی لەدەستدا. هەموو بنەماکانی تاوتوێ کردنی سەروژێر کردەوە و گفتوگۆکانی نێو یانە و ئەکادیمیاکان و گوند و شارەکانی نەهێشت و هەمووی گواستەوە بۆ کوشکی ڕایخسترات و ڕۆژنامەکانیش لەم کاتەدا پشتیان بەستبوو بە شێواندنی ناوبانگی ئەندام پەرلەمانەکانی ئەڵمانی نیشتەجێی نەمسا, وتەکانیان تێکدەدا و بەهۆی ئامادە نەبوونی ڕاستەوخۆی ئەم کەسانەوە لەنێو جەماوەری دەنگ پێدەریان یارمەتی زۆری ڕۆژنامەکانی دەدا لەبۆ یاری کردن بە هەست و سۆزی کەسانی دەنگ پێدەر و هەڵگەڕانەوەیان لەو پارتەی دەنگیان پێدابوو, دیسانیش ڕق لێبوونەوەی گەل بۆ ئەم بزوتنەوە ئەڵمانیە یارمەتی زیادتر بەرەو پێشچوون و پرفرۆشبوونی ڕۆژنامەکانی دەدا.

دەبێت پاڵەوانانی خامە بە دەستی ئەمڕۆمان باش ئەوە بزانن کە هیچ شۆڕشێکی گەورە و بەهێز لەژێر دروشمەکانی بە پەڕی قاز نوسراو بەتەنها سەرناگرێت, بەڵکو ڕۆڵی قەڵەم کورتکراوە لە پێدانی شۆڕش بە بیانووەکانی و دیاری کردنی بیردۆزی پەیڕەوکراو, بەلأم ئەوە فاکتەری سیاسی و ئاینییە کە دەتوانن شۆڕش سەربخەن, تا دواساتیش ئەم دوو فاکتەرە وەکو هۆکاری شۆڕش هەڵایسێن دەمێننەوە.

پاڵەوانانی خامە بە دەست پێویستە باش بزانن کە بۆ ڕامکردنی کۆمەڵگە پێویستمان بە هێزی وشەیە, ئەگەر بتوانرێت ئەو نەهامەتی و خەفەتەی لە هەناوی خەڵکدا گیری خواردووە بقۆزرێتەو لەڕێگەی وتاردانی بەهێزەوە ئەوا دەتوانی ڕاپەڕینێك هەڵایسێنێت...ئەمەش لە کەسان و پاڵەوانەکانی نێو هۆڵەکان ناوەشێتەوە تەنها لەو کەسانەدا نەبێت کەلەهیچ شتێك سڵ ناکەنەوەو ناترسێن و هەموو شتێك دەکەن بەمەبەستی بەدی هێنانی ئامانجە باڵاکانیان.

چارەنووسی گەل ناگۆڕێت تەنها بە گێژەڵوکەیەکی هەست و سۆز وروژێنەر نەبێت, ئەمەش تەنها لەڕێگەی ئەو کەسانەوە دەتوانرێت ئەنجام بدرێت کە لەڕێگەی وشە بەهێزەکانیانەوە بڕیاری چارەکردنی ئەم کێشانە دەدەن و دڵەکان بۆ لای خۆیان کێش و ئاراستە دەکەن.

کەواتە با هەموو نوسەرێك لەپێش دەواتەکانیدا بوەستێت و یاری بە بیردۆزەکانەوە بکات, گەر بەتەنها ئەم بیردۆزانە پێویستیان بە زانیاریەکانی نێو مێشك هەبێت,واتە ئەم کەسە بۆ ئەوە دروست نەکراوە ببێتە سەرکردە و سەردار.

گووتم و دەشیلێمەوە: هەموو بزوتنەوەیەك پێویستی بە ئامانجی دوورمەودای وەهایە پشت بەستووبێت بە هێشتنەوەی پەیوەندی نێوان بزوتنەوەکە و جەماوەر, لەسایەی ئەم ڕاستیەشەوە هەموو دۆخ و کێشەیەك تاوتوێ بکات, بەپێی ئەم ئاراستەیەش بۆچوونەکانی ئاراستەبکات, خۆی بەدووریش بگرێت لەهەموو ئەو کردارانەی لەئاست جەماوەردا نزمی دەکەنەوە, بڕوای وابێت کەهیچ پرۆژەیەکی بەبێ یارمەتی جەماوەر ناتوانێت بەدی بهێنێت.

بزوتنەوە ئەڵمانیەکە ڕێگەی خەباتی ساکاری هەڵبژارد لەسایەی تەڤلبونە نێو پەرلەمانەوە؛ چونکە ئەو تێکۆشانەی بەئاسانی ئەنجام بدرێت بە زوویی لە ئامانجەکەی لادەدات.

***

فاکتەری سێیەم و کاریگەر لەبۆ شکست هێنانی بزوتنەوەی یەکێتی ئەڵمانی بێ ئاگایی جەمسەرەکانی بزوتنەوەکەبوو لە دەروونی گەل. ئەمەش لە دژایەتی کردنی پارتی کەنیسەی کاسۆلیکیدا دیارکەوت.

ئەو کاتەی بنەماڵەی هابسبۆرگ هاتنەسەر دەستەلآت و هەوڵی پێدانی سروشتێکی سلآڤیان دابە نەمسا دەستیان دایە خۆ تێکەلآوکردن لەگەڵ دامەزراوە ئاینیەکاندا و بەتەواوەتی لەمەدا ڕۆچوون. ئەم دامەزراوانە خانەی پاشاشی بۆ خۆی ڕام کردبوو, ئەبرەشیە چیکیەکان و قەشەکانی چیك هەستان بە لەبەرکردنی نەمسا بەم پۆشاکە نوێ یە , واتە تێکەلآوکردنی دەستەلآت و ئاین پێکەوە لەبەرژەوەندی سیاسەتدا, دەستەلآت هەستا بە دامەزراندنی قەشەی چیکی لەناوچە ئەڵمان نشینەکانی نەمسادا و دەستی پۆلآیینی کڵێساش بەکارهێنرا بۆ دژایەتی کردنی ئەڵمانیەکان و لەناوبردنی هەرجۆرە بانگەشەیەکی نوێ.

بەلآم ئیکلیرۆسە ئەڵمانەکان لەم ڕوانگەیەوە زۆر لاوازبوون؛ چونکە نەیتوانی بەرپەرچی دوژمنانی ئەڵمانی بداتەوە. فۆن شۆنرر هانی دوورە پەرێزگرتنی کەنیسەی کاسۆلیکی ئەڵمانی دا, ئەمەش بووە هاندەری هابسبۆرگیەکان بۆ قۆستنەوەی

دهسته‌لاتی کڵێسا و بەکارهێنانی لەرزایەتی کردنی گەلدا. گەلی ئەڵمانی. لەم کاتەش بەدواوەوە جەنگ لەدژی ئەڵمانەکان هەڵایسا بەناوی جیابوونەوە لەرۆما. لەکاتێکدا بەئاشکرایی دەزانین کە بنچینەی هەموو کێشەکان دەگەڕێتەوە بۆ کەنیسەی دەرەوەی خاکی ئەڵمانیا. بۆیە پێویستە لەسەر ئەڵمانەکان . قەشە و نائاینیەکان. دەبێت بزانن کە پێویستیان بە کڵێسایەکی نیشتمانی هەیە.

بەڵام هەڵمەتەکەی شۆنرر سەرکەوتنی بۆ نەنوسرابوو؛ چونکە لەسەر بنەمای هەڵە بونیێت نرابوو. زۆرینەی بۆچوونەکانی پشت بەست بوو بە ئەمەکداری ئیکلیرۆسە ئەڵمانیەکان بۆ بیرۆکەی ئەڵمان خوازی . بەڵام ئەم ئیکلیرۆسانە پێش لە نیشتمان بۆ کڵێسا ئەمەکداربوون. واتە بۆچوونەکەی مەبەستی نەپێکابوو.

ئەمـــە تـــەنها تایبـــەت نـــەبوو بـــە ئەکلیرۆســـە کاســـۆلیکیەکان . تەنانـــەت پرۆتستانتیەکانیش بەدەم ئەم راپەرینە ئەڵمانیەوە نەچوون کە وەخت بوو دەخنکا و لەناودەچوو. بەبیانووی ئەوەی بەدەست هێنانی مافەکان پێویستی بە گرتنەبەری رێوشوێنی تەندروست و شیاو هەیە.

بابگەڕێینەوە بۆ هەڵمەتەکانی شۆنرر لەدژی کڵێسای کاسۆلیکی.

دەبوو پێش لەوەی بزوتنەوە ئەڵمانیەکە کڵێسا بە دوژمنی خۆی دابنێت لەخۆی بپرسیبایە: ئایا بەرژەوەندی گەلی ئەڵمانی لە ئەمسادا وەگەل کڵێسای کاسۆلیکیدا دەگونجێت یان دژبەرە ؟ ئەگەر وەڵامەکە گونجاو بوو ئەوا پێویست بوو لەسەر ئەم بزوتنەوە ئەڵمانیە خۆی بغلانایەتە نێو کڵێسا و دامەزراوە ئاینیەکانەوە. ئەگەریش دژبەرە ئەوا دەبوو چاکسازی ئاینی هەڵبژاردبایە ئەوەك پارتێکی سۆسیالیستی نائاینی.

**ئەوەی وابزانێت خۆی بەتەنها یان لەرێگەی پارتێکەوە دەتوانێت چاکسازیی ئاینی ئەنجام بدات ئەوا یان شێتە یان گەمژەیە, یان ئەوەتا هیچ شتێك لەبارەی گەشەی ئاین و بیروراکانەوە نازانێت. بڕوام وایە دامەزراندنی ئاینێك یان لەناوبردنی کۆڵەکە و پایەکانی لە دامەزراندن یان لەناوبردنی وڵاتێك زۆر گرانترە.**

رەنگە کەسێك بڵێت: شاڵاوەکانی پارتی یەکێتی ئەڵمانی وەکو دژە هێرش وابووە لە لەبەرامبەر کڵێسادا. بەڵام لێرەشدا نابێت ئەوەمان لەبیربچێتەوە کە خوودی ئاین دەستۆپاکبوو لە گلەییەکانی بزوتنەوە ئەڵمانیەکە. ناشبێت ئەوە لەیاد بکەین کە ئاین

و ڕێباز و مەزەب ئەستۆپاكن لەهەموو ئەو ناڕەسەن بەكارهێنانەیان لەلایەن كەسێك یان دەستەیەكەوە بەمەبەستی بەدی هێنانی ئامانجێكی سیاسی پۆخڵ. بەداخەوە ئەو كاتەی ئەم پارتە ئەڵمانیە دژایەتی خۆی بۆ كڵێسا دەربڕی خۆی بەدەستی خۆی چەكێكی كوشندە و كۆنی دابە دوژمنەكەی ، بەجۆرێك لەم ڕێگەیەوە چەندین كەسایەتی و ئەندام پەرلەمانی دژ بە پاڵەوان دیاركەوتن، لەم وڵاتەدا (ئەمسا)زۆرینەیەك هەبوون كە باوەڕیان بەئاین و ڕێبازە دژایەتی كراوەكە هەبوو، ئەمەش لای خۆیەوە هانی دروست بوونی دەمارگیری ڕەگەزی دا لە وڵاتدا.

بەم شێوەیە هەموو ئەوانەی ئەمەكداربوون بۆ ڕۆما لەم بزوتنەوەیە دووركەوتنەوە و ئەمەش لای خۆیەوە ئەم بزوتنەوەیەی بەرەو هەڵدێری لەناوچوون برد.

هەڵەیەكی دیكەی شۆنرر و هاوڵەكانی بریتی بوو لە پەرتكردنەوەی هێزی دژایەتی كردنیان بەوەی لەیەك كاتدا دوژمنایەتی چەندین بەرەو مەزەبی ئاینیان دەكرد، خۆنەگەر نەختێك لەمێژوویان ڕوانیبایە ئەو كات بۆیان دیاردەكەوت كە دەتوانرێت پشت بەست بەگەڵی لایەنگر یەك یەك دوژمنەكان لەناوببرێت نەوەك بەیەكجار هێرشی دەیان دوژمن بكرێت. ئەوكاتەی گەل هەست بەوەدەكات كە زیادتر لەیەك گۆڕەپانی مردنی لەپێشە دەترسێت و خۆی لەم بابەتە پیرۆزە دەدزێتەوە و هەڵدێت.

بزوتنەوەی ئەڵمانیش بە ئاشكراكردنی هەڵایسانی جەنگ لەدژی زیاد لەبەرەیەك بووەهۆی پەرتكردنی هەموو هێز و تواناكانی و هانی پشتیوانانی دا بپرسن : ئایا بەڕاست ئەم هەموو دوژمنە هەڵەن و ئێمە بەتەنها ڕاست ؟

بەكورتی دەتوانین بڵێین كە: پارتی ئەڵمانی نەمسایی ئامانجەكەی بەڕوونی دیاری كردبوو، بەڵام ڕێگەی گەیشتن بەئامانجەكەی هەڵەبوو. ئەمەش وەكو ئەوە وابوو كەسێك بیەوێت بگاتە لوتكەی چیایەك لوتكەكە دیار بكات، بەڵام ڕێگەی هەڵە بۆ گەیشتن بەو دوندەی شاخە هەڵبژێرێت ، ئەمەش ببێتە هۆی كەوتنە خوارەوەو شكست هێنانی لەم ڕێڕەوتەیدا.

***

پارتی مەسیحی سۆسیالیستی نەكەوتە هەمان هەڵەی بزوتنەوە ئەڵمانیەكەوە.

پێش لەهەنگاونان بە وردی ڕێگەی گەیشتن بەئامانجەكەی دیاری كردبوو، بەڵام ئامانجەكەی بەڕوونی پیشان نەدابوو.

پارتی مەسیحی سۆسیالیستی باش لە کاریگەری بزوتنەوەکانی گەل گەیشتبوو، توانی ئەمەش هەر لەیەکەم ڕۆژی دامەزراندنیەوە بەکاربهێنێت و بەم کارەی توانی ژمارەیەکی زۆری خۆبەخش ڕاکێشی نێو بزوتنەوەکەی بکات بۆمەبەستی بەرزکردنەوەی ئاستی جەماوەری ئەم پارتە بەکاریان بهێنێت. بە تەواوەتی خۆیشی بە دوور گرتبوو لە پێکدادان لەگەڵ دامەزراوە ئاینیەکاندا، ئەمەش بووە هۆی ئەوەی کڵێسا بەتەواوەتی پشتگیری بکات، ئەم بزوتنەوەیە وای لێهات ببووە ڕێکخراوەیەکی زۆر بەهێز و دەستەڵات فراوانی لەبن نەهاتوو.

ئەم پارتە هەرچەندە نەیتوانی بەئامانجە ڕاستەقینەکەی بگات کە ڕزگارکردنی وڵات بوو لە تیاچوون، بەڵام توانی بۆخۆی سەرکەوتنێکی گەورە بەدەست بهێنێت.

ئەم پارتە لەسەر بنەمای ئاین خوازی دامەزرابوو نەوەك ڕەگەزی و بنچینە، چونکە دامەزرێنەرانی ئەم پارتە بڕوایان وابوو ئەوەی هەموو دانیشتوانی نەمسا بەیەکەوە دەبەستێتەوە تەنها ئاینە و پشت بەستن بە ڕەگەز و بنچینە مانای هەڵوەشاندنەوەی پێش وەختی وڵاتە. لەم کاتەدا ژمارەیەکی زۆری خەڵك لە هەرێمەکانی دیکەوە ڕوویان لە نەمسا دەکرد، بەجۆرێك هەر دەستە و هەرێم نشینێك بۆ پارتێك یان باوەڕێك تێدەکۆشان، لەترسی ئەوەی ئەم دەستە دەستەکارییە لەدژی ئەڵمانەکان بەکارنەیات، دکتۆر لۆجر هەستا بە بەکارهێنانی دروشمی ( ڕزگارکردنی نەمسا لە جولەکە خراپ کارەکانی)، ئەمەش وای لەهەموو هاوڵاتیانی نەمسای بەڕەگەز ئەڵمان و چیکی و مەجەڕی کرد لەژێر یەك سێبەر و پارتدا کۆببنەوە و دژایەتی جووەکان بکەن، نەك لەبەر ئەوەی جولەکەکان ڕەگەزیان جیاوازە بەڵکو بەبیانووی ئەوەی ئاینیان جودایە.

بێگومان لەبەر ئەوەی ئەم هەڵمەتە پشت بەستووە بەئاین کەواتە کەمینەیەکی زۆر کەم ئازاری پێدەگات، بەڵام بەخێرایی لایەنگرانی ئەم پارتەش خۆی لێی کشانەوە بەتایبەت ئەوکاتەی بۆیان دیارکەوت کە ئامانجێکی ئەم پارتە بە مەسیحی کردنی جولەکەکانە و ئەمەش هەنگاوێکی منداڵانە و نەشیاوە بۆ پشتگیری کردن.

ئەم بزوتنەوەیە لەڕاستیدا هەوڵێکی نیوچە ئیفلیج بوو، بەوەی لە سامیەوە لەدژی سامیەت سەرچاوەی گرتبوو، لایەنگرانی ئەم پارتە بڕوایان وابوو کە توانیویانە گوێی دوژمن بگرن لەکاتێکدا دوژمن بەسەر لوت و تەوێڵ ئەمانی بە زەویدا ڕاکێش دەکرد. ئەم پارتە تەنانەت پاش لە لاوازبوونیشی نەیدەویست کێشەی نەتەوەکان بەکاربێنێت

بۆ ڕزگارکردنی وڵات بەڵکو بەتەنها پشتی بە ئاین بەستبوو؛ چونکە باش لەوە گەیشتبوو بەکارهێنانی ڕەگەز واتای پارچە پارچەکردنی وڵات دەگەیەنێت, بەڵام ئاین پێچەوانەی ئەو بۆچوونەیە و هاندەری بەهێزبوونی وڵات و توانەوەی هاوڵاتیانی وڵاتەکەیە لەژێر سێبەری ئایندا.

ئەو کاتەی تەرمەکەی دکتۆر لۆجر لە خانەی شارەوانیەوە بەرەو(ڕنفستراٹ) برا خۆم یەکێك بووم لەو هەزاران کەسەی ئامادەی بەخاك سپاردنی بوون. بۆم دەرکەوت کە هەموو هەوڵەکانی ئەم پیاوە بابردی و گەر لە ئەڵمانیا بژیایە ئەوکات دەبووە کەسایەتیەکی گەورە و لەڕیزی پێشەوەی دەستەلأتداراندا دەمایەوە, بەڵام ئەفسوس چارەنوس لەم وڵاتەدا دەری خست.

پاش لە مردنی بەڵقان گڕی تێبەربوو, چارەنووس وەهابوو پاش لەمردنی ئەوەی لێی دەترسا هاتەدی و وڵات بەرەو داڕووخان ڕۆشت.

***

پێم باشە بەخستنەڕووی هەڵەی شکست هێنانی هەردوو پارتی ئەڵمانی و مەسیحی سۆسیالیستی کۆتایی بەم بەشە بێنم:

پارتی ئەڵمانی(یان بزوتنەوەی یەکێتی ئەڵمانی) لەسەر بۆچوونی ڕاست بوو لەوەی پەنای گرتبوە زیندووکردنەوەی ڕەگەزی ئەڵمانی لەنەمسادا, بەڵام ئامرازەکان بەدیهێنانی ئەم ئامانجەی بەهەڵە دیاری کردبوو. پارتێکی نەتەوەیی بوو, بەڵام نەیتوانی گەل بۆلای خۆی کێش بکات؛ چونکە پشت بەستوو نەبوو بەکێشەی کۆمەڵایەتی بەهێز, بەڵام دژبەری کردنی سامیەت لە بابەتی ڕەگەز و بنچینە کاریگەرتر نەبوو؟ چونکە ئەمیش لەبنەڕەتدا تیشکی دەخستەسەر تێگەیشتن و گەڕانەوە بۆ بنچینە و ڕەگەزەکان, دواتر دیارکەوت ئەو جەنگەی لەدژی بەرەیەکی ئاینی بەرپای کرد جگە لە تاکتیکێکی هەڵە هیچی دیکە نەبوو.

پارتی مەسیحی سۆسیالیستی ئامانجێکی نەتەوەیی دیاری کراوی نەبوو, بەڵام وەکو پارت ئامرازەکانی باش هەڵبژاردبوو, بەباشی لە کێشەی کۆمەڵایەتی گەیشتبوو. بەڵام هەڵەمەتەکانی لەدژی جوولەکە بەشکست کۆتایی هات و نەشیتوانی نەمسا لە پەرت بوون ڕزگاربکات.

ئەگەر پارتی مەسیحی سۆسیالیستی لەگەڵ کێشەکۆمەڵایەتیەکانی وڵاتدا ببەسترایەتەوە ئەوا ئامانجی سەر خستنی ئەڵمانەکانی وڵات دەبوو بەسەر گەل و نەتەوەکانی دیکەی وڵاتدا,گەر بزوتنەوەی ئەڵمانیش بەباشی گرنگی بدایەتە کێشەی جوولەکە و نەتەوەکانی دیکە بە تێڕوانینێکی کۆمەڵایەتی ئەوکات دەبووە بەهێزترین پارتی ڕامیاری وڵات و چارەنووسی وڵاتی دیاری دەکرد...

ئەو بیرۆکانەی ڕۆژگار لەناخمدا سەلماندی لەهیچ کام لەم بزوتنەوانەدا نەم دیتەوە, بۆیە نەچوومە نێو هیچ کام لەم بزوتنەوانەوە؛چونکە ئەم دوو بزوتنەوەیە کەم توانان لە زیندووکردنەوەی هەستی ئەڵمان خوازی لە وڵاتێکدا کە لەسەرەتای دیارکەوتنیەوە بۆ گەشەی سلاڤیەت دروست بووە.

بەهۆی زیادبوونی گرنگی پێدانم بە کاروباری گشتی و کێشە سیاسیەکان تادەهات زیادتر ڕقم لە بنەماڵەی هابسبۆرگ دەهاتەوە, وام لەمێشکدا چەسپابوو کەئەم وڵاتە هەڵوەشاوەیە لەداهاتوودا دەبێتە بارگرانی بۆسەر شانی ئەڵمانەکانی وڵات, گەلی ئەڵمانیا چارەنوسیان لەم وڵاتەدا دیاری ناکرێت, بەڵکو لە ڕایخدا دەبێت چارەنوسی خۆیان دیاریبکەن, چونکە لەڕووی سیاسی و ئابوری و فەرهەنگیەوە بۆئەم مەبەستە گونجاوە.

لەهەمان کاتدا ڕقم لە خوودی وڵاتی نەمساش دەبویەوە بەوەی بووەتە مۆزەخانەی نەتەوە پەرتەکان, مێژووی سەربەرزی خۆی لەبیرکردووە, لەهەمان کاتدا خۆم بەنامۆ دەدیتەوە لە پایتەختە جوانەکەی وڵاتەکەدا, پاش لەوەی ژمارەیەکی زۆری پۆڵۆنی و چیکی و هەنگاری و ڕۆتنی و سربی و کورواتی و...هتد ڕوویان لەم شارە جوانە کردبوو.

بۆم دەرکەوت ئەو هەوڵانەی دکتۆر لۆجر و پارتەکەی بۆ ڕزگارکردنی وڵات هیچ بەرهەمێکی نابێت, بەتایبەت ئەوکاتەی زۆری زمان و شێوە زارەکان ڤییەنای کردبووە بابلی دووەم, ئەستێرەی گەشاوەیی ئەڵمان بەرەو ئاوابوون دەڕۆیشت.

گوتم نەمسا بووەتە مۆزەخانەی نەتەوەکان, بەڵام ئەو قورەی ئەم بینایەی ڕاگیرکردووە خەریکە هەڵدەوەرێت, ئەگەر تەنها لەدوورەوە لەم بینایە بڕوانیت ئەوکات زۆر بەهێزدیارە, بەڵام گەر بە لێدانێك لێی بدەیت ئەوکات وەکو شوشە تێك دەشکێت.

دڵم شکستی خوارد بەڵام هێشتاکە دڵم لای ئەمپراتۆریەتی ئەڵمانییە, بەڵام هێشتاکەش ئیمپراتۆریەتی نەمسام خۆش ناوێت. هەمیشە بڕوام وابوو کە

داڕووخانی ئەم وڵاتە مانای بەهێزبوونی نەتەوەی ئەڵمانی یە، بۆیە ڕۆژێك بڕیارم دا لەنەمساوە ڕوو لەئەڵمانیا بکەم، بیرۆکەی پشت گواستنەوەم بۆ ئەڵمانیا هەرلەو کاتەوە پەیدابووە کە نینۆکم پەیداکردووە، هەمیشە بەخەونێکی بەچێژ و بەهێزم دەدیت.

بڕیاری کۆچم دا بەرەو ئەڵمانیا بەبێ ئەوەی ئیشەکەم وەکو ئەندازیاری بینا یان وێنەکێش بێتە ڕێگرم لەبۆ بەشداری کردن لە بەدی هێنانی گەورەترین ئامانجم: یەکخستنەوەی نەمسا و ئەڵمانیا و دروستکردنی نیشتمانی گەورەی ئەڵمانی یان ڕایخی ئەڵمانی.

تەنانەت لەم ڕۆژگارەماندا ژمارەی ئەو کەسانەی خاوەنی ئەم بۆچوونە بومارەکەن زیادیان کردووە، بۆیە ڕوو لەو کەسانەش دەکەم کە چارەنووس وای لێکردوون بێبەش بن لە بەدی هێنانی ئەم ئاواتە گەورە هاوبەشە، لەگەڵ ئەوانەشی ناچاری نەگرتنەبەری ئەم ڕێڕەوتە بوونە و ناچاری تێکۆشان لەبۆ مانەوە لەسەر بنەمای کلتوور: زمانی نیشتمانی دایك، لەگەڵ ئەوانەشی خەبات دەکەن و تێدەکۆشن لەپێناو ڕزگارکردنی نیشتماندا، بۆیە داوای بەشداری کردنی هەموان دەکەم لەم ڕێڕەوت و خەباتە پیرۆزەدا.

خۆشەویستی نیشتمان لەمەناوی ئەوکەسانەی دوورن لێیەوە زۆر بەهێزە، ئەمانە مانای حەسانەوە و جێگیربوون نازانن گەر نەگەن بە کرانەوەی نیشتمان و چێژ نەبینن لەخوێنی هاوبەشی ئاشتی کار و دڵنەوایی لە ئیمپراتۆریەتێکی هاوبەش.

***

ڤیەنا ئەو خوێندنگە گەورەیە بوو کە فێری وانەی ژیانی کردم. بە تازە پێگەیشتوویی ڕۆیشتمە نێویەوەو بەکەسێکی بیرکراوەو کەم دووەوە لێی هاتمە دەر. لێرەوە بیرۆکەم لەبارەی گەردوون و ژیانەوە سەرچاوەی گرت، لەم کاتەوەش نەخشە ڕێگەی خۆمم کێشا لەبۆ گەیشتن بە سەرکەوتنی ڕامیاریانەم، هەر لێرەشدا ئەو شتانە فێربوم کە چۆن بتوانم کێشەکانی دووچاربووی پارتەکانی ئەم ڕۆژ چارەسەربکەم کە پێنج ساڵە دەستمان بۆبردووەو بەرە بەرە واخەریکە دەبێتە بزوتنەوەیەکی نیشتمانی نەتەوەیی بەهێز.

# بەشی سێیەم

## میونیخ

لەساڵی ١٩١٢دا ڤییەنام بەجێهێشت بەئاراستەی میونیخ.

ئەم شارە بەلای منەوە نامۆ نەبوو. بەشێوەیەکی وەها شارەزای بووم وەکو ئەوە وابێت بۆماوەیەکی زۆر لەم شارەدا ژیابێتم، هەموو ئەو وانەی پێشتر فێری ببوم هانی دام بۆ ڕووکردنە ئەم شارە بەمەبەستی دیتنی جوانیەکانی هونەری ئەڵمانی.

ئەوەی میونیخ نەبینێت وەکو ئەوە وایە هیچ شوێنێکی ئەڵمانیای نەدیتبێت. ئەوەی سەردانی ئەڵمانیا بکات و ڕوو لەشاری میونیخ نەکات ئەوا هیچ شتێکی لەبارەی هونەرەوە نەدیتووە. ئەو ماوەیەی پێش لە هەڵایسانی جەنگ لەم شارەدا گوزەراندم خۆشترین ساتەکانی ژیانم بوو، بەڵێ چێژی زۆرم لە پیشەکەم بینی، بەڵام هەرگیز بۆ بژەودان بەم پیشەیەم نەژیاوم. بۆیە ئەم کارەشم دەکرد بۆئەوەی بەردەوامبم لەڕێڕەوی گەیشتن بە ئامانجەکەم.

هەر لەیەکەم ڕۆژی گەیشتنم بە میونیخ ئەم شارەم زۆر خۆش دەویست، لەدەوروبەرم دەڕوانی و بەخۆم دەگووت: چەندە جیاوازییەکی گەورەهەیە لەنێوان ئەم شارە ئەڵمانیە و ڤییەنای بابل ئاسا لەفرەگەلیدا ! ئەمەش وای لێکردم زیادتر پێوەی پەیوەست بم، سەرباری شێوازاری دانیشتوانی ناوچەکە کە شێوەزاری دانیشتوانی باڤاریای خواروو و ڕۆژانی منداڵیمی یاد دەخستمەوە، هۆکاری خۆش

ویستنی من بۆ ئەم شارە بەهۆی پڕبوونی بووە لە خەڵکی جوان خواز, لەم شارەوە هەستەکانم گەشەی کرد و پەرەی زیادترم بەخۆم دا.

بەردەوام بوونم لەسەر پیشەکەم و خوێندنەوەم لەکاتە بەتاڵەکانمدا نەبووە هۆی دابڕانی من لە بەدواداچوون کرم بۆ ڕووداوە سیاسیەکانی ناوخۆ و دەرەکی. من لەم کاتەدا لە سیاسەتی دەرەکی ئەڵمانیم دەڕوانی لەڕێگەی پەیڕەوی هاوپەیمانی سەرهەڵداوی ئەوکاتەوەی کە من لە ڤییەنادا بە ناتەندروستم دەزانی. بەڵام لەم کاتەدا وام دادەنا کە سەرکردەکانی بەرلین بێ ئاگانین لەو لاوازییەی بەسەر هابسبۆرگیە هاوپەیمانەکانیاندا هاتووە, ئەوان ئەم ڕاستیە لە گەلەکەیان دەشارنەوە بۆئەوەی کاریگەر نەبێت لەسەریان, دیسانیش پەیوەستن بەو هاوپەیمانیەتانەی کە بسمارك هێناویەتە بوونەوە.

بەڵام وادیاربوو کەمەڵەبووم لەم شیمانەیەم, بەڵام ئەوەم بەلاوە سەیربوو کە ئەڵمانەکان بەمەڵە لەتواناکانی هابسبۆرگیە هاوپەیمانەکەیان تێگەیشتبوون. گەورەترین ئەندێشە ئەوەبوو کە نەمسا تاوەکو ئێستا وەکو وڵاتێکی ئەڵمانی ماوەتەوەو لەهەر کاتێکدا بێت دەتوانێت سوپایەکی گەورە بۆ بەرگری کردن لە ماڤ ئەڵمانەکان پێکبهێنێت. بەڵام ئەو شتانەی دیپلۆماسیەتی فەرمی وڵاتی ئەڵمانی تادواسات لێی بێ ئاگا بوو من دەمێك بوو بەباشی ئاشنای ببووم. دیپلۆماتی وڵات هیچ جیاوازییەکی نەبوو لەگەڵ ڕای گشتی وڵاتدا لەڕوانین بۆ هاوپەیمانە نەمساییەکان, بڕوایان وابوو وڵاتی بنەماڵەی هابسبۆرك گوێرەکەیەکی ئاڵتونییە, بەم چەشنەش ئەڵمانەکان تائەو کات بڕوایان بەمانەوەی ئەوهاوپەیمانییە سێ قۆڵیە هەبوو کە ڤییەنا بانگەشەی بۆدەکرد و ببووە جێگەی گاڵتەجاڕی ڕۆژنامەی پایتەختە سلاڤیەکان, بەتایبەت پراگ کە ئەم هاوپەیمانێتیەی بە شانۆیەکی پڕ لە گاڵتەجاڕ دەزانی بەجۆرێك, جارێك دەتگرێنێ و جارێکیش پێت دەکەنێنێ. ڕای باو وابوو کە تەنانەت سەرباری ئەم هەموو خولك و ماچکردنانەی لەنێوان ئەم دوو ئیمپراتۆریەتەدا هەبوو, بەڵام بڕوا وابوو کە لەگەڵ یەکەم تاقیکردنەوەدا ئەم هاوپەیمانێتیە تێك دەشکێت.

بینیمان کە ئیتالیا لەڕۆژگاری تاقیکردنەوەدا ڕەتی کردەوە لەپاڵ هەردوو هاوپەیمانە ئەڵمانی و نەمسایەکەیدا لەدژی دوژمنەکانیان بوەستێتەوە. بەڕاستی

ئەوانە زۆر ساوێلکە بوون کە بڕوایان وابوو دەتوانن دەستی ئیتالیا و نەمسا تێکەڵاو بکەن و پێکەوە بیان خەنە جەنگەوە.

ئەو کاتەی لە ڤییەنابووم تێبینی ئەوەم دەکرد کە خانەی پاشا و لایەنگرانی یەکێتی ئەڵمانیا زۆر بەجوانی پشتگیری ئەم هاوپەیمانێتیە سێ قۆڵیەیان دەکرد، بەڵام ڕەگەزەکانی دیکە بەتەواوەتی گاڵتەیان بەمە دەکرد و بەهیچیان نەدەزانی. بۆ بنەماڵەی هابسبۆرگ بەستنی هاوپەیمانێتی لەگەڵ ئەڵمانیادا بەلایانەوە وەکو داپۆشینی یەکجارەکی کێشەی ئەڵمانیە نەمسایەکان وەهابوو. بەجۆرێك لەم ڕێگەیەوە دەتوانن لە کێشەی ئەڵمان خوازانی ولاتەکەیان بدەن. بەڵام ئەڵمانەکانی نەمسا بەهۆی مەرام پاکیەوە بەشداری ئەم هاوپەیمانێتیەیان دەکرد بەو بڕوایەی لەکاتی جەنگدا ئەم ولاتە دەبێتە کۆڵەکەی هێزی پاڵپشتی ئەڵمانیا. ئەم گەش بینی و خرۆشیەیان مانای کورت بینیان بوو لە ڕامیارێتی؛ چون بڕوا و هیوایان وابوو کە ڕەنگە ئەم هاوپەیمانێتیەی نێوان ئەڵمانیا و نەمسا هۆکاربێت بۆ دیاریکردن و یەکلایی کردنەوەی چارەنووسی نەمسا بە کێشکردنی بۆلای ڕایخ. بەڵام نەیان زانی ئەو هاوپەیمانێتیەی دڵیان پێی خۆشە لەگەڵ خۆیدا ڕایخیش بەرەو چاڵی لەناوچوون پەلکێش دەکات. هەروەها سەرانی بزوتنەوەی یەکێتی ئەڵمانی زۆر ساویلکەبوون ئەوکاتەی بڕوایان وابوو ئەم هاوپەیمانێتیە سێ قۆڵیە دەستەبەری سەرکەوتنی یەکگرتنی ڕەگەزی ئەڵمانییە. وەك پێشتر نوکە قەڵەمێکمان لێدا، ئامانجی ڤییەنا لەم هاوپەیمانێتی بەستنە لێدانی ڕەگەزی ئەڵمانی بوو لەولاتەکەیدا. لەم ڕێگەیەوەش توانی بووی ئەم لێدانانە پەردەپۆش بکات، تا دواساتەکانیش بەرلین بەردەوام بوو لەم شێوە خۆ هەڵخەڵەتاندنەی، ئەوەی بەلای ئەوەوە گرنگ بوو ئەمەکداری ڤییەنابوو بۆ ئەم هاوپەیمانێتیە.

بەڵام سیاسەتی ناوخۆیی بنەماڵەی هابسۆرگ و هەڵوێستیان لەبەرامبەر بزوتنەوە ڕەگەزخوازییەکانی مەترسی دار بۆسەر دەوڵەت دوایین شت بوو کە بەرلینیەکان بیریان لێی دەکردەوە و بگرە هیچ گرنگیشیان پێی نەدەدا.

ئەم دۆخە وای لەزۆرێك لە ئەڵمانەکانی نەمسا کرد هیچ پێخۆشحاڵ نەبن بەم هاوپەیمانێتیە: چونکە بوونی هاوپەیمانێتی لەگەڵ ئەڵمانیا و هەڵایسانی ڕاپەڕینیش لەلایەن ئەڵمانەکانی نەمساوە مانای هەڵگەڕانەوەو خیانەت کاری دەبەخشی نوێیە

دواتــر ئــەم هاوپەیمانێتیــەیان بــەباری قورســی ســەر شــانیان دەزانــی. هەرســێ هاوپەیمانــەکان درکیــان بــەوە نــەکردبوو کــە مانــەوەی ئــەم هاوپەیمانێتیــە بەنــدە بــە بالأدەستی ئەڵمانەکانی نەمسانشینەوەو بەنەمانی توانا و دەستەلأتی ئەمان ئەوا ئەم هاوپەیمانێتیەش پــووچ دەبێتــەوە, بەتایبــەت ئــەو ڕۆژەی سلاڤیەکان دەست بەسەر نەمسادا دەگرن. ئــەوا ئــەم هاوپەیمانێتیە هیچ مانایــەکی نامێنێت. بۆیــە ئەڵمانــەکانی نەمســا ئەوپــەڕی هــەوڵی خۆیــان دەدا بەمەبەســتی تێکەیانــدنی دیپلۆماتکــارن و ڕای گشتی ئەڵمانی بەوەی بە لاوازبوونی ئەمان لاوازبوونی بەرلینیشی بەدواوە دەبێت و چارەنوســی گــەلێکی حــەفتاملیۆنی دەکەوێتــە مەترســیەوە, بۆیــە تاکــە دەســتەبەری هێشتنەوەی ئەم هاوپەیمانێتیە زاڵێتی ئەڵمانەکان بوو بەسەر نەمسادا.

ئەگەر بەرلین بگەڕایەتەوە بۆ مێژوو و بەجوانی توێژینــەوەی دۆخەکەی کردبا ئەوا بۆی ڕوون دەبوویەوە کە هەرگیز کیرینالْ و کۆشکی ئیمپراتۆری ڤییەنا نـاتوانن لەپاڵ یەکـدا دژی دوژمـن لەجەنگـدا بجـەنگن. گـەلی ئیتـالیش نـاتوانن گرنگـی هەڵوێستی هابسۆرگیەکان لـە هێشتنەوەی یـەکێتی ولأتـدا لەبیربکـەن, بۆیـە هـەرگیز ئیتالیا زاتی ئـەوەی نییـە تاکـە سـەربازێك بنێرێتـە جەنگێکـەوە کـە لولـەی تفـەنگ و ئاراسـتەی فیشــەکەکەی بــەرەو بنەماڵــەی هابســبۆرگ نــەبێت. بەشــداری کردنــی ڕۆمــا لــەم هاوپەیمانێتیە سێ قۆڵیە هەڵخەڵەتاندنی دوژمنە لەمێژینەکەی بوو, بەجۆرێك خۆی وا پیشان دەدا پابەندی ڕێککەوتنامەکەیە و پشتیوانە لەکاتێکدا خۆی بۆدژبەری کردنی و پەلاماردانی ئامادە دەکرد.

بەڕاســتی پــاش لــە تێکچــوونی پەیوەندییــەکانی نێــوان نەمســا و ڕووســیا و دروســتکردنی هاوپــەیمانێتی ئــەڵمانیا لەگــەڵ نەمســادا لەســەر بنــەمای ئەندێشــەی هەڵەبوو.

کەواتە بۆچی لەسەرەتای سەدەی بیستەمدا ئەڵمانیا هـەوڵی کۆکردنـەوەی زۆرترین هاوپــەیمانی دەدا؟ دیارە ئەمـەش بـۆ مەبەستی دابینکردنـی هێزی پشتیوانی بوو بۆ جەنگ لەلایەك و بەدی هێنانی خۆشگوزەرانی بۆگەلی ئەڵمانی لەکاتی نەبوونی جەنگدا لەلایەکی دیکەوە.

سەرکردەکانی ئەڵمانیا ساڵ بەدووی ساڵ دەبوو ڕووبەڕووی کێشەیەك بوەستنەوە کـە زیـادبوونی دانیشـتوان بـوو بـە (٩٠٠)هـەزار کـەس بـۆ سـاڵێك. ئـەم زیادبوونـە

لەرادەبەدەرە یارمەتی دووچاربوونی وڵات دەدات بەفەتارەت گەر هەنگاوی پێویستی بۆ نەنرێت لەبۆ بنبڕکردنی برسێتی بڵاوبۆوە. لەم کاتەشدا چوار ڕێگە و ئامرازی لەپێش بوو :

یەکەم: سنورداركردنی وەچەخستنەوە, بەمەبەستی ڕێگری کردن لەزیادبوونی ژمارەی دانیشتون بەشێوەی فەرەنسای هاوسیٚ.

لەسالآنی نەهامەتی و برسێتی و باوی نەخۆشیدا ئەوە سروشتە ڕۆڵی سنورداركردنی وەچەخستنەوەو هەڵاوسانی دانیشتوان دەبینێت. بەلآم دیسان وەکو بەردێکی خوارو خێچ لەپێشی جوتبوون و زاوزێدا ناوەستێتەوە, بەڵکو تەنها مرۆڤەکان کەم دەکاتەوەو دەیگێڕێتەوە بۆ نەبوون لەڕێگەی تاقیکردنەوەیەوە, بەلآم گەل بەهێز و خۆڕاگربێت ئەوا هەلی مانەوەو زاوزێ کردنی لەپێشدا دەمێنێتەوە, بەم شێوەیەش سروشت خۆی توخم و ڕەگەزە لاوازەکان لەناودەبات و باشترینەکان دەهێڵێتەوە. بەم چەشنە کەم بوونەوەی تاك یارمەتی بەهێزبوونی هاوولآتی و هێشتنەوەی ڕەگەزی ڕەسەن دەکات.

ئەوکاتەی مرۆڤ خۆی هەڵدەستێت بە ڕێکخستنی وەچە ئەوکات دۆخەکە پێچەوانە دەبێتەوە؛ چونکە مرۆڤ ناسروشتی یە, ئەم مرۆڤانە هیچ گرنگی بەگەزەکانیان نادەن لەپێگەیاندنی وەچە خراوەیاندا , بەڵکو لەڕێگەی زاوزێ نەکردن بەمانای وەچە نەخستنەوەوە ئەم کارەی ئەنجام دەدات. وای دێتەپێش چاو ئەم ڕێگەیەی مرۆڤ دۆستانە و دادگەرانەیە؛چونکە لەم گەردوونە فراوانەدا تەنها خۆی دەبینێت, هیچ گرنگییەك بۆئەو ڕەگەزە دانانێت کە لێیەوە سەرچاوەی گرتووە.

ئەم شێوازە پەیڕەوکراوەی مرۆڤ بۆ سنورداركردنی هەڵاوسانی دانیشتوان پێچەوانەی سروشتە و ئەنجامەکەشی پێچەوانە دەبێت. سروشت ڕێگە بەمرۆڤ دەدات بۆ زاوزێ کردن و دواتر لەڕێگەی تاقیکردنەوەیەکی قورسەوە باشترینیان دەهێڵێتەوە بۆ بەرەودان بەژیان. بەلآم مرۆڤ هەوڵی نەهێنانە دونیای وەچە دەدات و بڕوای وایە ئەوەی هاتە سەر ئەم زەوینە دەبێت بژێت و نەکوژرێت و لەناونەچێت و مافی ژیانیش بۆهەموو کەسێکە' جا ئەو کەسە باش بێت یان خراپ, لاوازبێت یان بەهێز. بەم شێوەیەش دەتوانێت سنورێك بۆ زیادبوون دابنێت.بەلآم لەم کاتەدا بەهای تاك وەگەڵ کەمبوونەوەی چاکی تاکدا کەم دەکات.

تێکۆشانی سروشتی لەپێناو ژیاندا بوار بەکەسە لاوازەکان نادات بەمانەوە تەنها کەسە بەهێزەکان نەبێت. بەڵام پەناگرتنە ڕەوتی زاوزێ بۆ کەمکردنەوەی دانیشتوان ناتەندروستە و سنورداانان بۆ ژمارە زۆربوون وەچە لاوازەکان لەناونابات بەڵکو بنەمای دیارکەوتنی وەچەیەکی لاواز تر دادەنێت. ئەمەش لای خۆیەوە دژبەرییەك بۆ سروشت دەئافرێنێت کە تاوێك ناتاوێك پێویستە بەسەریدا زاڵبێت؛چونکە سروشت بەردەوام زەوی لەو کەسانە پاقژ دەکاتەوە کە کاڵ و پێنەگەیشتوون, هەمیشە بەهێزەکان زاڵبدەنەسەر لاوازەکان و لەناویان دەبەن. بۆیە بەم کاری ڕێگرتن لەوەچە خستنەوەیە دەرگاش لەڕووی ئەو کەسانەدا دادەخرێت کە درەنگ دەیانەوێت دەربکەون و ماوەیەکی درێژیان بریوە تاوەکو گەیشتونەتە پێشی ئەم دەرگایە بەمەبەستی تێکۆشان.

کەواتە پێویستە ئەو ئەڵمانیانەی دەیانەوێت لاسایی فەرەنسای دراوسێیان بکەن لە ڕێگرتن لە وەچەخستنەوە ئەوا دەبێت باش بزانن کەبەم کارەیان داهاتووی گەلی ئەڵمانی لەناودەبەن.

دووەم: شێوازی دووەم بریتییە لە ڕێگەی (( داگیرکردنی ناوخۆیی))ئەمەش پرۆژەیەکە تەنانەت ئەوانەش داکۆکی لێدەکەن بە ئەنجامەکەی شارەزاو ئاشنانین.

گومان لەوەدا نییە کە دەتوانرێت بەرهەمی زەوی زیادبکرێت. بەڵام ئەم زیادکردنە هەمیشەیی نییە و پشت پێبەستنی بۆ ڕزگارکردنی گەلی ئەڵمانی لەبرسێتی ڕەنگە بۆماوەیەکی دیاریکراو سودبەخش بێت. بەڵام بەتەواوەتی ناتوانێت ئەم کێشەیە بنەبڕبکات. چونکە ژمارەی دانیشتوان زۆر لە بڕی بەرهەمی زەوی زیاددەکات. لەبەرئەوەی پێویستیەکانی مرۆڤ بەردەوام ڕوولەزیادبوون و جۆراوجۆرییە. ئەو بڕە خۆراك و پێویستیانەی باوانمان بە باسەدەیەك پێش ئێستا پێویستیان بووە بەپێنج هێندە کەمتربووە لەو بڕە خۆراکەی ئەم وەچەیەی ئێمە پێویستیەتی.

پشتیوانانی ئەم بیرۆکەیە بەو ئەندێشەیە هەڵخەڵەتاون بەوەی هەر زیادبوونێك لە بەرهەمدا یارمەتی زۆربوونی ژماردی لەدایك بووان دەدات. ئەمەش ڕوونادات تەنها ئەوە نەبێت زەوی دەستبکات بە بەرهەمدانی بەفەر. مرۆڤ خۆی بەستۆتەوە بەبەکاربردنی بەرهەمەکانەوە بەبێ ئەوەی هیچ گۆڕانێکی فراوان لە زیادبوونی بەرهەمدا بێنە دی. زەویش بە فەرمانی خوا نەبێت فەری خۆی بەمرۆڤ نابەخشێت

ئەو ڕۆژەش دێت کە زەوی توانای بەرهەم دانی نامێنێت, لەم کاتەدا برسێتی بەرۆکی هەموو دانیشتوان دەگرێت, ڕەنگە لەسەرەتاوە ئەم برسێتیە ناڕوون بێت, بەلام بەتێپەڕوونی کات و زۆربوونی ژمارەی دانیشتوان ئەم برسێتیە دەگۆڕێت بۆ قات و قڕی و لەم کاتەشدا تەنها سروشت دەتوانێت ئەم کێشەیە چارەسەربکات لەڕێگەی دەست تێوەردانەوە لەڕێگەی لەناوبردنی لاوازەکان و هێشتنەوەی بەهێزەکان ، دانیشتوان لەم کاتەدا دەکەونە نێو بێژەنگی سروشتەوەو لە بێژەنگیان دەدات و میهرەبانی بۆ کەسیان نانوێنێت.

ڕەنگە کەسێك پێچەوانەی ئەم بۆچون و شیمانەیەی هەبێت و بڵێت: ڕوودانی برسێتی پەیوەندی بە ڕەگەز و ژمارەوە نییە و فەتارەتێکە و بەسەر هەموو مرۆڤایەتیدا دێت و هیچ گەلێکیش خۆی بۆ دەستەمۆ ناکات , بەڵێ ئەم قسەیە ڕاستە . بەلام ئەمە ناتوانێت لە تێڕوانینی ڕاستەقینەمان بۆ دۆخەکان بێتەڕێگرمان. بەڵێ ئەو ڕۆژە هەردێت کە مرۆڤایەتی توانای دابینکردنی پێویستیەکانیان نییە و لەم کاتەدا یان ئەوەتا ڕێگە بەسروشت دەدەین قسەی خۆی بکات یام ئەوەیە بەڕێگەی تایبەتی خۆی هەڵدەستێت بە هاوسەنگکردنەوەی دۆخەکە. بەلام ئێمە هێشتاکە دوورین لەمەوە. لەڕاستیدا چەندین گەل هەن پێبەخشراوی خۆش ژیانین, هەندێکی دیکەش سکالادەکەن لەنەبوونی توانا بۆ دابینکرنی پێداویستیەکانی؛ چونکە دەروونی خۆی ڕانەهێناوە لەبۆ بەکارهێنانی ئەو زەوییەی کە هەیەتی بەمەبەستی بەرهەم هێنان و لێوەدەستەبەرکردنی خۆراك و پێداویستیەکانی. ئەمە لەکاتێکدایە لەم جهانەماندا ڕووبەرێکی بەرفراوانی زەویش هەیە کە تەنها پێویستی بە خاوەن دارێتی لێکردن هەیە و سروشت ئەم زەویەی بۆ هیچ ڕەگەز و گەلێك دیاری نەکردووە و هەرگەلێك بتوانێت بەزوویی داگیری بکات دەبێتە موڵکی خۆی.

سروشت مانای سنوری سیاسی نازانێت. هەموو بوونەوەرە زینوەکان لەسەر ئەم گۆی زەویەدا دەخاتە تەنیشت یەکەوەو لەتاودانی هێزە جیاوازەکان دەنوارێت, دڵی بۆ بەهێزەکان لاواز دەکات؟ چونکە کوڕی هەڵبژێردراوی ئەوەو شایەنی ژیانە !

ئەو گەلەی چاوی لەسەر داگیرکردنی زەوی ناوخۆییە لەکاتێکدا گەلانی تری جهان سەرقاڵی زیادکردنی ڕووبەری زەویە بەفەڕەکانیانن ئەوا ئێستابێت یان دواتر ناچاری سنوردارکردنی وەچەخستنەوە دەبێت. تێبینی ئەوەش کراوە باشترین نەتەوە ئەوانەن

چـرای ژیـاری و پێشـكەوتنیان بەدەسـتەوەیە و چـاوی لەسـەر داگیركردنـی زەوی نـاوخۆیی نییـە و دەسـتیش لەهـەڵگرتنی زەویـە بێخاوەنـەكانی دەرەوەی سـنوری سیاسی خۆی هەڵناگرێت بۆ ئەوانی تر. ئەوكاتەی دەبینین ڕەگەزی یەكەم كەپشتی بە داگیركردنی زەوی ناوخۆیی بەستووە ناچاری دیاری كردنی وەچە خستنەوەیە ڕەگەز و نەتەوەی دووەم بەردەوام ژمارە و ڕووبەر و سنوری دەستەڵاتی لەفراوان بووندایە.

بەڕاستی دەسـتەواژەی داگیركردنـی نـاوخۆیی بۆنێمـەی ئـەڵمان مەترسـیدارە گـەر هەست بە خراپییەكانی ئەم پرۆژەیە بكەین و بڕوامـان بـەو شتانە هـەبێت كە خاوەند لەسـەر ئـەو زەوینـەدا بـۆی ئامـادەكردووین و پێیـداوین. گـەر پەنابگرینـە داگیركردنـی ناوخۆیی ئەوا تەنها دەتوانین لەپێش خۆردا بەجوانی دابنیشین و هیچی تـر نەكـەین. ئەوكا تـەی ئەڵمانیـەكان بڕوایـان وابـوو تـەنها خـاكی ئـەڵمانیا بەسـە بـۆ ئەڵمانیـەكان ئەوكات دەبێت بەئەڵمانیا بڵێین: بابیای خوات لەگەڵ. و بـەرەو لەناوچوون ئاراستەی دەكەین.

لـەوە گاڵتـەجاڕی تـر هەیـە كـە جولەكـەكان ببنەسـەرداری ئێمـەی ئـەڵمانی و پێمـان بڵێن: دەتوانین بڕی خۆراك و پێداویستی تەواو بۆ هەموو گەلی ئەڵمانی دابین بكەین ؟!

وتم و دەشـیڵێمەوە كـە داگیركردنـی زەوی نـاوخۆیی ئـەڵمانیا لەبرسـی بـوونی ماوەدرێژ ڕزگارناكات، مانەوەی گەلەكەمان بەندە بە توانای داگیركاریمانەوە بۆ زەویـە نوێیـەكانی دیكـە. ئەگـەر مـەودای زینـدەیی بـۆ وەچـەی داهـاتوو دابـین و دەسـتەبەر نەكـەین ئـەوا گـەورەترین غیانـەتمان لـە گـەل و نەتەوەكـەمان كـردووەو بـەرەو لێـواری مەرگ و لەناوچونمان ڕاپێچ كردوون.

ناشبێت ئەوەمان لەبیربچێتەوە ئەو وڵاتـەی خاكەكەی كەمـە یـان ڕووبەری بچووكـە لـەڕووی سیاسـی و سـەربازییەوە ئەگـەری دەركـەوتنی چـەندین دۆخـی چـاوەڕوان نەكراوی لێدەكرێت.

ڕووبەری فراوان هۆكاری چەسپاندنی سەلامەتی و جێگیری دۆخی وڵاتـە، تـاوەكو ڕووبەری وڵات فراوانبێت باشتر بەرگری لێدەكرێت. دەبیـنین چـەندین سـەركردەی بـالا توانیویانـە بەئاسـانی گـەلانی خـاوەن ڕووبـەری زەوی تەسـك تێـك بشـكێنن. بـەلام لـە وڵاتی ڕووبەر فراواندا دۆخەكە پێچەوانەیە و تێكشكان زۆر كەمترە وەك لە سەركەوتن. بەجۆرێك هێزی هێرشبەر پێش لەگەیشتن بەئامانجەكەی دەڕووخێت.

ئەڵمانەکان زۆرێکیان بیرۆکەی داگیرکردنی زەوی ناوخۆییان ڕەت دەکردەوە؛ چونکە وەکو هێرشێکیان دەزانی بۆسەر زەوی گشتی و تایبەتی وڵات.

سێیەم: دابین کردنی نان و کار بۆ دانیشتوان لەڕێگەی دەستگرتن بەسەر زەوی نوێ و نیشتەجێ کردنی ئەڵمانەکان لەو خاکە تازانەدا.

چوارەم : هەوڵدان بۆ پڕکردنی بازاڕ بەبەرهەمی خۆماڵی، بەمەش قازانجێکی باشمان دەست دەکەوێت و بەدووردەبین لە مەترسی برسێتی.

کەواتە پێویستە لەسەر ئەڵمانەکان ڕێگەی یەکەم دووەم ڕەتبکەنەوەو پشت بە سیاسەتی فراوانکردنی زەوی  یان داگیرکاری بازاڕەکان ببەستێت. ڕێگەی دووەمیان هەڵبژارد پاش لە چەندین تاوتوێکردنی دڵەڕاوکێ هێنەر، بەڵام دەبوو هیچ نەبێت ڕێگای یەکەم بەکاربێنن چونکە سەلامەت و کەمتر مەترسیدارتر بوو، بەڵام باشترینیان ڕێگەی سێیەم بوو، بەدەست هێنانی زەوی نوێ یارمەتی نیشتەجێکردنی زیادە دانیشتوانەکە دەدات بەمەبەستی هاوسەنگکردنەوەی دۆخەکە لەئێستا و لەداهاتووشدا گرنگە. لەم کاتەشدا پێویستمان بە هێنانە ئارای چینێکی جوتیاری بەهێز هەیە بەجۆرێك هەموو دانیشتوان پشتی پێببەستن بۆ دابینکردنی خۆراك. ئەوەی ئەمڕۆ بووەتە کێشە جیاوازی بەرهەمی پێشکەشکراوی نێوان گوند و شارەکانە، بوونی چینێکی کشتکاری بچووك و مام ناوەند وەکو هێزێکی بەرگری وەهایە بۆ مانەوەی گەلەکەمان بۆ دژایەتی کردنی کێشەی کۆمەڵایەتی و کەم خۆراکی کە لەئێستادا دانیشتوان گیرۆدەی بوونە. چونکە چالاکی ئەم چینە لە چوارچێوەی ئابوریەکی داخراودا یارمەتی باشتربوونی چالاکی ئابوری وڵات دەدات، لەم ڕێگەیەوە هاوسەنگی پێویست لەنێوان خواست و پێویستیەکانی نێوان دانیشتوان و باری بەرهەم دێنێتە ئاراوە.

بەڵام ئەم سیاسەتی زەوی فراوانکردنە لەم ڕۆژگارەماندا مانای دەستگرتن بەسەر زەویەکی دووری وەکو کامیرۆن ناگرێتەوە، بەڵکو مەبەست لێرەدا ئەوروپایە. دەبێت ئەڵمانەکان بەباشی بڕوایان بەوە هەبێت کەدەڵێت : گەر خوا ویستی ڕووبدات دەقەومێت، خواش بیەوێت زەوی گەلێك بە پەنجا هێندەی گەلێکی دیکە فراوان دەکات. ئەگەر ئەو زەویەی لەسەری دەژین توانای بەرهەمدانی هەیە بۆ بەخێوکردنی چەندان هێندەی تری دانیشتوان ئەوا دەتوانی هەوڵی سنورفراوانکردن نەدەیت، بەڵام

گەرهاتوو پێچەوانەبوو ئەوا ماف و تێکۆشانی بەدەستهێنانی باشترین و زۆرترین زەوی ماق بەخشراو نییە بەڵکو وەرگیراوە, بۆیە لەم کاتەدا پێویستە لەسەر هەموو تاکێك بەوپەڕی تواناییەوە هەوڵی مانەوەبدات, بۆئەمەش هەموو هێزێك شایەنی پەناتێگرتنە. ئەگەر باپیرانمان بەهەمان شێوەی ئەم وەچە ئەڵمانیانەی ئێستامان بیریان بکردایەتەوە ئەوە ئێستاکە سێ یەکی ڕووبەری ئەم زەوییە ئەڵماننشینانەمان لەژێر دەستدا نەدەبوو, لەم کاتەشدا هیچ هەلێکی ئەوتۆ بۆ گەلەکەمان نەدەڕەخسا بۆ گرنگی دان بەداهاتوو! بەڵێ گەر تێکۆشان و ملهوڕی پتەوی باپیرانمان نەبوایە ڕایخ چلۆن دادەمەزرا.

چەندین دەستەواژەی دیکەهەن کە والە فراوانکردنی زەوی دەکەن ببێتە باشترین ڕێگەچارە:

هەندێك وڵاتی ئەورووپی لەم ڕۆژگارەی ئێستاماندا شێوە قوچەکیەك لە سەر سەریانەوە دیارە,ڕووبەری ئەم وڵاتانە کەم و بچووکە گەر بەراورد بکرێت لەگەڵ ڕووبەری زەوی وڵاتانی دەرەوەی کیشوەرەکەدا, لەگەڵ ئەمەشدا خاوەنی بازرگانیەکی گەشەکردوون....لەڕاستیدا لوتکەی ئەم قوچەکانە ئەورووپایە, بەڵام بنکەکەی هەموو جهانە, ئەمەش پێچەوانەی دیتنەکانی هەرێمە یەکگرتووەکانی ئەمەریکایە کە بنکەکەی لەسەر هەمان خاکی خۆیەتی و هیچ خاڵێکی جیاکارەوەی نییە لەگەڵ وڵاتانی دیکەدا تەنها لە لوتکەدا نەبێت, ئەمەش وای لەم وڵاتە کردووە بەئاسانی نەتوانرێت ئیرەیی پێببرێت, لەکاتێکدا پێچەوانەی ئەمە بووەتە هۆی لاوازی بۆ چەندین وڵاتی داگیرکاری ئەورووپی.

بەریتانیا پێچەوانەی ئەوە نییە کە باسم لێوەکرد؛ چونکە دۆخی ئەم وڵاتە و ئەو تێکەڵاویەی لەگەڵ وڵاتانی ئەنگلۆسەکسۆنیدا هەیەتی بەگشتی و ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکاش بەتایبەتی وای لەم وڵاتەکردووە زۆر زیادتربێت لەوەی بتوانرێت لەگەڵ وڵاتێکی دیکەی ئەورووپیدا هاوتا و بەراوردبکرێت.

بەڵام باشترین سیاسەتیش بۆ ئەڵمانیا فراوانکردنی زەویەکانیەتی بەسەلامەتی. بۆئەمەش پێویستی بە ئازادکردنی بواری زیندەیی خۆی هەیە لەنێو خوودی کیشوەردەکەدا. چونکە داگیرگەکانی دەرەوەی کیشوەرەکە بەکەڵکی پێکانی ئامانجەکەمان نایات گەر نەتوانێت کۆمەڵێك لە دانیشتوانی ئەورووپی لەخۆبگرێت.

لەکاتێکدا ئەو داگیرگانەی ئەم تایبەت مەندیەشیان هەیە ناتوانرێت بەشێوەیەکی کەم کێشەیی دەستیان بەسەردا بگیرێت. لەبەرئەوەی پێویستی بەجەنگ و کوشتارێکی زۆرە بۆیە باشتر وایە ئەم هەوڵ و رەنجە بۆ ئەوروپا بدرێت لەبری ئەوەی لەدەرەوەی کیشوەرەکە بەسەرکێشیانەوە ئەمجام بدرێت.

ئەوکاتەی ئەم بیرۆکەیە لەناوەزی هەناوی گەلەکەماندا چەسپا باشتر وایە ئامادەکاری بۆبکرێت بەمەبەستی هەنگاونان بۆ بەدی هێنانی. لەم کاتەدا دوودڵی و سنوردارکردنی بۆچوونەکان سوودی نابێت بەڵکو دانان و پەیرەوکردنی باشترین پلان کەڵکدارترینە. دەشبێت سیاسەتی رایخ لەسەر ئەم بنەمایە دابرێژرێنەوە بەجۆرێك بتوانێت بمان گەیەنێتە ئەم ئامانجە پیرۆزەمان و لەم کاتەشدا گەر لەهەموو ئەو پەیمان نامانە بڕوانین کە ئەڵمانیا لێی بەشداره ئەوا پێیم سەیر نابێت گەر بڵێین: هەنگاوی یەکەم بریتیە لە کشانەوە لەزۆرێك لەم پەیماننامانە و دواتریش فراوانکردنی زەویەکانی ئەڵمانیا لەسەر هیسابی رووسیا. لەم کاتەشدا پێویستە لەسەر رایخ هەمان رێبازی سوارانی ((توتون)) بەکاربێنێتەوە کەپێشتر لەم بوارەدا بەکاریان هاوردبوو، بۆئەوەی بەم رێگەیە شمشێرەی ئەڵمانی رێگە بۆ درێژکردنەوەی رێگەی ئاسنی ئەڵمانی خۆشبکات،دواتریش دابین کردنی نانی رۆژانەی گەلەکەمان بەم رێگەیە.

ئینگلتەرا تاکە وڵاتێکی ئەوروپی بوو کە پێویست بوو لەسەر ئەڵمانیا پێش لەدەستبردن بۆ هەڵمەتی دەست بەسەرداگرتنی کیشوەرەکە هەوڵی دروستکردنی هاوپەیمانێتی لەگەڵدا بدات. بەڵێ بەتەنها دگەڵ ئینگلتەرا. پاش لە پاراستنی پشتەوەمان ئەوکاتە دەتوانین خاچی ئەڵمانی نوێ بەرزبکەینەوە. ئەم خاچ هەڵگرتنەمان ماف باوباپیرانامە. بەڕاستی ئەو هاوڵاتیەی ئەو تیکانە ڕەت دەکاتەوە کە لەناردی رۆژهەڵات دروستکراون ئەوا کارێکی باش ناکات. ئایا لەبیرمان چوو کە ئەوە شمشێرە رێگە لەپێش درێژبوونەوەی رێگەی ئاسندا والأدەکات؟

دەبوو بەهەرجۆرێك بێت دەست بەسەر ئینگلتەرادا بگرین لەرێگەی هاوپەیمانییەوە. لەوەی داوای داگیرگەکانی لێنەکەین و دەست لەپرۆژەی کردنی ئەڵمانیا بەهێزی یەکەمی دەریایی هەڵبگرین و بۆبەریتانیای بەحێ بهێڵین و نەشبینە

بارگرانی بۆسەر بەرهەمە پیشەسازیەکانی بەریتانیا، لەبری ئەوەدا برەو بەهێزی وشکانیمان بدەین.

بەم ڕێگەیە دەتوانین بۆماوەیەك ئەم وڵاتە هەڵبخەڵەتێنن بەوەی واهەست بکات بۆی ملکەچ بووینە، ئەمەش بۆ دواڕۆژێکی گەشی ئەڵمانی هیچ ڕێگرێکی جێبەجێکردنی نییە.

لەسەرەتای سەدەی بیستدا بەریتانیا ژمارەی دانیشتوانی بەتەواوەتی زیادبوو بۆیە پێویستی بەدەرچەیەکی ئەورووپی هەبوو کە بیگەیەنێتە باقی مەنی زەویەکانی جیهانی دەرەکی پێشتر بەردەست بەریتانیا نەکەوتوو. بەرلین دەیتوانی ئەم هەلە بقۆزێتەوەو خۆی لە بەریتانیا نزدیك بکاتەوە و دەستی یارمەتی بۆ ڕاکێشێت. بەڵام سەرکردە ئەڵمانیەکانمان ئەم کارەیان نەکرد بەبیانووی ئەوەی نایانەوێت دەستبکەنە نێو ئاگرە و سکڵەکەی دەربێنن و پێشکەشی بەریتانیای بکەن. بەڵام ئایا بەڕاست ئەم سەرکردانە نەیان دەزانی کە هەموو هاوپەیمانێتیەك لەسەر بنەمای بەرژەوەندی هاوبەش وەستاوە نەوەك تاك لایەنە؟

گەر ئەوکاتە ئەڵمانیا هەمان ڕێچکەی ژاپۆنی ساڵی ١٩٠٤ ی بگرتایەتەبەر ئەوکات بەدەست نادادپەروەری ڕۆژگارەوە نەیدەناڵاند.

گەر ئەو کارە ئەنجامبدرایە ئەوا بۆچی جەنگی جهانی دەقەوما و ئەم گەلەمان بەم شێوەیە لاواز دەبوو. لەبری ئەمەدا باشتر نەبوو ببینە یەکێك لەبەهێزترین هێزە دیار و کاریگەرەکانی جهان ؟

هەرچییەك بێت هاوپەیمانێتیمان لەگەڵ نەمسادا گەمژەترین هەنگاوی نراوبووە.

ئەو وڵاتە مۆمیاکراوە زۆر بەجوانی و ئاگاییەوە خۆی بە ئەڵمانیاوە گرێ دابوو. بەجۆرێك هیچ ڕێککەوتنامەیەکی سەربازی لەگەڵدا نەدەبەست ئەوەی هەبوو تەنها ڕێککەوتننامەی ئاشتی هەمیشەیی بوو، بەم جۆرەش سەرکردەکانی ڤییەنا هەلی قڕکردنی دانیشتوە ئەڵمانیەکەی وڵاتەکەیان بۆ ڕەخسابوو. گەر سەرانی ئەڵمانیا بەهۆشیارییەوە لە دۆخی نەمسایان بڕوانیبایە ئەوکات بۆیان دەردەکەوت کە بەهێزی پەیمان نامەی نێوان ئەڵمانیا و نەمسا لەسەر بنەمای بەهێزی و لاوازی دانیشتوە ئەڵمانیەکانی نەمسا وەستاوەو بەلاوازبوونی ئەوان ئەم ڕێککەوتنامەیەش پووچ

دەبێتەوە. دەستەڵاتدارانی بەرلین لە تێکۆشان دەترسان، ئەوەی پەلکێشی جەنگیشی کرد کارێکی چاوەڕوان نەکراوبوو.

هەوڵی هێشتنەوەی ئاشتی هەمیشەیی و هەنگاونەنانی مەترسیداریان دەدا، بەڵام بەیانییەك بە دەنگی گوللە تۆپ بەخەوەریان هێنایەنەوە.

ئەمەش وای لە سەرکردەکانی ئەڵمانیا کردبوو بەناچاری ڕێگەی سێیەم هەڵبژێرن: خۆفراوانکردن لەئەوروپادا. ئەڵمانەکان باش دەیانزانی کەلە ڕۆژهەڵاتدا دەتوانرێت دەست بەسەر ڕووبەری بەرفراوانی زەویدا بگیرێت، پێویستیشیان بەکەس نەبوو گرنگی ئەم داگیرکاریەیان بۆ ڕوون بکاتەوە. بەڵام لەم کارەشدا خۆیان لەقاڵب دابوو لەبەرئەوەی ئاشتییان دەویست، ئاشتی بەهەر نرخێك بێت، دروشمی ئەوان بوو، لەبری ئەوەدا دەیان توانی تیشکی بۆچوونەکانیان بخەنەسەر گرنگی هێشتنەوەی بنەمەکانی بەهێزی نەتەوەی ئەڵمانی، جا نرخەکەی هەرچەند و چۆنێك بێت !

ئەنجامی ئەم کارەش جەنگی ١٩١٤-١٩١٨ بوو.

تەنها ڕێگەی چوارەم و کۆتایی ماوەتەوە: ڕێبازی سیاسەتی داگیرکاری بازرگانی.

پێشکەوتنێکی لەم شێوەیە پێویستی بە خێرا جێبەجێکردن هەبوو، بەڵام داگیرکرنی هەر ناوچەیەك پێویستی بەکاتێکی زۆر هەیە، جاروبار چەند سەدەیەکیش دەکێشێت. داگیرکاری بازدانێکی لەناکاو نییە، بەڵکو هەنگاوێکی لەسەرخۆ و پلەکارییە، قووڵ و بەردەوامە، ئەوکاتەی ئەڵمانەکان ئەم ڕێگەیەیان گرتبووە بەر دەبوو باشیان زانیبایە کە بەهۆی ئەمەوە دووچاری جەنگی فراوان دەبنەوە کە ئەوان خۆیان لێی لادەدا. دەبینیت چلۆن خۆیان هەستان بە خۆ هەڵخەڵەتاندن بەدەربڕینی مەرام پاکی، بەوەی ئەڵمانەکان دەیانەوێت بەبێ شەڕ ناوچە گرنگەکان ئازادبکەن ؟

ئەم شێوازی جوڵانەوەیەمان هۆکاری دروستکردنی هەڵەبەز و دابەز بووە لەپەیوەندی نێوان ئێمە و ئینگلیزەکان، بەڕاستی سەیرمان لێدەهات لەوەی بەرتانیەکان بوونە ڕێگر لەپێش ئەم چالاکیە ئاشتی خوازیەمان. بەڕاستی ئەوە لەدەستی بەرلین دەرچوو بوو کە بتوانێت بۆ داگیرکردنی زەویەکانی ئەوروپا هاوپەیمانێتی لەگەڵ بەریتانیادا ببەستێت لەدژی ڕووسیا، بۆ فراوانکردنی هێزی ئەڵمانی لەدەرەوەی سنوری ئەوروپی و داگیرکردنی بازارەکانی جهان بەبەرهەمی

ئەڵمانی لەگەڵ ڕووسیادا لەدژی بەرتانیا بجەنگایە. لەم کاتەشدا ناچارەبوو دەست لەم هاوپەیمانێتیانەی هەڵبگرێت و لەگەڵ نەمسادا ڕێکەوتن نامە ببەستێت.

بەڵام هەرگیز بۆجارێك بەرلین ئامادە نەبووە لەدژی لەریتانیا لەگەڵ ڕووسیادا هاوپەیمانێتی ببەستێت یان بەپێچەوانەوە, چون باش دەیزانی هەر هەنگاونانێکی لەم چەشنەی مانای هەڵایسانی جەنگێکی مەترسیدارە و لەبۆ خۆ لادان لەم فەتارەتەش ئەڵمانیا هەستا بە هەڵبژاردنی سیاسەتی بەرهەم هێنان وەکو ئامرازێك بۆ داگیرکردنی جیهان بەئاشتی.

سەرانی ئەڵمان بڕوایان وابوو کە داگیرکردنی جیهان لەڕووی ئابوورییەوە بەشێوەیەکی ئاشتی خوازانە سنور دانەری توندوتیژی دەبێت, بەڵام بۆ بەدی هێنانی ئەم نیازە باشەشیان ناچاری دروستکردنی لەنگەرگەبوون کەبەریتانیا وەك مەترسی دەزانی بەوەی لەڕێگەیەوە ڕەنگە هێرش بکرێتە سەر خاکەکەی , لەکاتێکدا ئامانج لێی پاراستنی ئاشتی جهان بوو, لەگەڵ برەودان بە داگیرکاری ئاشتی خوازانە. بۆئەمەش ئەڵمانیا بڕیدا بۆئەوەی نیازپاکی خۆی دەربڕێت کەشتی گەلەکەی چەکی قورس هەڵنەگرن و بارەکانیشیان شتی مەترسیداری تێدانەبێت کەببێتەهۆی مەترسی دروستکردن لەسەر ئاسایشی بەریتانیا.

بەڕاستی داگیرکاری ئاشتی خوازانە سیاسەتێکی گەمژەپەیڕەوکار و نەشیاوە لەبەرامبەر وڵاتێکی زەبەلاحدا. بەریتانیاش پێشتر هەمان ڕێچکەی ئەڵمانەکانیان گرتبوەبەر و لەوان زیادتر سەرکەوتنیان بەدەست هێنابوو لەم بوارەدا, بەڕاستی ئەوانەی مێژوو ناخوێننەوە هیچ تێناگەن و فێرنابن و نازانن.

بەریتانیا ئەم ئیمپراتۆریەتە مەزن و بەرفراوانەی لەڕێگەی داگیرکردنی ئاشتی خوازانەوە دروست نەکردووە. بەڕاستی هیچ گەلێك لەجیهاندا بەقەد ئینگلیزەکان شێوازی دڕندانەیان بەکارنەهێناوە بۆ فراوانکردنی زەوی و داگیرگەکانیان: ئایا ئەوە لەتایبەت مەندیەکانی ئینگلیزەکان نەبووە کە بزانن چۆن هێزی سیاسی بەکاربێنن لەبۆ داگیرکردنی ناوچەکان لەڕووی ئابورییەوە, وەك چۆن سەرکەوتنیان لەگۆڕانی ئابوری بەهێزەوە بۆ سیاسەتی بەهێز دیار و ئاشکرایە ؟ بەڕاستی بیرۆکەیەکی گەمژانەیە گەر بڕوا وەهابێت کە ئینگلیزەکان ترساون خوێن بڕێژن لەپێناو فراوانکردنی ئابوریاندا. لەڕاستیدا بەهێزی سوپای ئینگلیز وەڵامی ئەم پرسیارە

ڕەداتەوە. هەر چۆنێك بێت ئینگلیزەکان لەبۆ قوربانی دان لەپێشدا کەسانی بەکرێ گیراویان بەکاردەهێنا و دواتر هاوولاتیانی خۆیان.

بەڕاستی لە ئەڵمانیادا بیرۆکەیەکی هەڵەیە لەبارەی باش تێگەیشتن لە ئینگلیزەکانەوە بەوەی لەڕێگەی ڕۆژنامەکانەوە وا پیشانمان داون کە ئینگلیزەکان پیاوانی سەرکەوتووی بازرگانی و کارن, فێڵباز و مەکارن, گێژ و تەڵەکەباز, دز و ترسنۆکن, بەڵام مامۆستایەکی لۆجیکمان هەرگیز ئەوەی بەئەندێشەدا نەهاتبوو کە پونێتنانی ئیمپراتۆریەتێکی وەکو ئینگلیز فراوان لەڕێگەی فێڵ و گزیکردنەوە دانامەزرێت و بەردەوام نابێت. ئەو ئەڵمانیانەی کە هانی هۆشیاربوونەوەی خەڵکیان دەدا لەبەرامبەر بەکەم زانینی توانای ئینگلیزەکاندا وەکو هێزێکی شەڕکار ژمارەیان زۆر کەم بوو, بەڵام هیچ کەس ئەم ئاگادارکردنەوەیانی بەهەل نەزانی و نەیقۆستەوە.

بەڕاستی ئەوکاتەی لەبەرەی فلاندەردا ڕووبەڕووی هێزی ئینگلیزی ئوسکتلەندی بووینەوە هاوڕێکانم و خۆشم دووچاری سەرسوڕمان بووینەوە لەوەی ڕۆژنامەکان چۆنیان هەڵخەڵەتاندووین بەوەی وێنەی درۆینەی ترسنۆکی ئەوانیان پیشان دابووین.

***

بۆزیادتر لەجارێك وتومەو دەشیڵێم: هاوپەیمانێتی سێ قۆڵی هەنگاوێکی نەشیاوی گەمژانەبوو, پەلەکردنی ئەڵمانیا لە هاوپەیمانێتی کردنی نەمسا ناچاری کرد تەنها گرنگی بەفراوانکردنی سنورەکانی خۆی بدات لە ئەوروپادا, ئەمەش پشت بەستراوبوو بە هاوڕێیەتی لەگەڵ ڕووسیادا. بەڕاستی کارێکی شێتانەبوو ئەوکاتەی ئەڵمانەکان بەپشت بەست بە وڵاتێکی هەلوەشاوەی وەکو نەمسا هەوڵی داگیرکردنی ناوچە مەبەستەکانیان دابوو.

بەڕاستی ئەڵمانیا زۆر بەختداربوو بەوەی جەنگی گەورەی جهانی بەهۆی نەمساوە هەڵایسا نەوەك ئەڵمانیا. ئەگینا سەرکردایەتی کردنی نەمسا لەلایەن سلاڤیەکانەوە هەرگیز ڕێگەیان بە بنەماڵەی هابسبۆرگی نەدەدا بەوەی تاکە سەربازێکیش بخشێننە جەنگەوە لەبەرخاتری ئەڵمانەکان. بەڕاستی ژمارەی ئەوانەی هەستیان بەو لاوازییە کردبوو کە ڕەنگە بەهۆی ئەم هاوپەیمانێتیەوەی ئەڵمانیا لەگەڵ نەمسا ئەم وڵاتە واتە ئەڵمانیا بکەوێتە کێشەیەکی گەورەوە زۆر کەم بوون !

بەڕاستی ژمارەی ئەوانەی هەوڵی دابەشکردنی نەمسایان دەدا زۆر زیادتربوو لەوانەی هەوڵی یەکخستنەوەیان دەدا و بۆنەمەش هەموان ئەڵمانیایان بە بەردی نەگونجاوی سەر ڕێگەیان دەزانی.

بەهۆی نەمساوە ئیتالیەکان ڕقیان لەئەڵمانیەکان دەهاتەوە, هیچ شتێك نەبوو لەنێوان ڕووسیا و ئەڵمانیادا لەبابەتی فراوانکردنی ئابوریاندا, بەلام بەهۆی جوولەکە و مارکسیەکانەوە هەلایسانی جەنگ بووە کاری کردە.

ئەوەرەکی هاوپەیمانێتیە سیٚ قۆڵیەکە نەبوایە ئەوا دوژمنانی ئەڵمانیا هەرگیز هەنگاوی ئەوەیان نەدەنا کە ئەورووپای ڕۆژهەلات و ڕووسیا و ئیتالیا ببەنە ڕیزی هاوپەیمانانەوە لەدژی ئەڵمانیا بەکاریان بێننەوە, هەموویان هەوڵی بەدەست هێنانی بەشی خۆیان دەدا لە پاشماوە بەجیٚ ماوەکانی نەمسا ! بەهۆی بوونی تورکیا لە هاوپەیمانێتیەتی ئەڵمانیادا ژمارەیەکی زۆری دەوڵەتی دیکە چوونە ڕیزی هاوپەیمانانەوە بەمەبەستی بەدەست هێنانی شتێك لە بەجیٚ هێڵراوەکانی سوڵتانی تورکی.

بەڕاستی پلان داڕێژەرە جولەکەکانی جهان پێویستیان بەم خۆراك پێدانەهەبوو بە دەوڵەتانی برسی و چاوبرسی, بەو ئامانجەی بیانگەیەنێتە مەبەستی خۆیان: لەناوبردنی ئەڵمانیا کە چیتر لەڕووی ئابووری و داراییەوە جولەکەکان دەستەلاتیان بەسەریاندا نەبوو.

***

با بگەڕێینەوە بۆ سیاسەتی ئابوری ئەڵمانی لەماوەی سالأنی پێش لە هەلایسانی جەنگی فراواندا.

لەبیرمان چوو سەرکەوتنی تاکتیك و پیشەسازی سەرکەوتووی ئەڵمانیەکان و گەشانەوەی بازرگانیان بخەینەڕوو, بەجۆرێك بوونی ئەمانە مانای بەهێزی پێگەی دەوڵەت دەگرێتەوە. زۆرێك بڕوایان وابوو وڵات بووەتە شارێکی ئابوری گرنگ و لەهەر شارێکدا چەندین بازرگانی گەورە دیارکەوتبوون, کەواتە وڵات پێش لە هەموو شتێك ببووە دامەزراوەیەکی ئابوری, کە خۆیشی وەهایە.

بەلام خوودی دەوڵەت دامەزراوەیەکە پەیوەست نییە بە بارێکی ئابوری دیارکراوەوە.دیسانیش یەکێتیەك نییە کە هەموو ڕەگەزە ئابوریە ئاڵۆزەکانی وڵات

بگرنەوە، لەڕاستیدا دەوڵەت: دامەزراوەیەکە و لەخۆگرتەی کۆمەڵێك خەڵکی پێکەوە گونجاوە لەڕووی جەستە و دەروونیشەوە، لەنێو ئەم دەوڵەتەدا ماونەتەوە بۆئەوەی خۆیانی تیا پێش بخەن، هەڵگری پەیمانی یەکترپارێزی سنور گیرن. ئەمەیە مانای دەوڵەت، بەلام ئابووری ئامرازێکی دابین کردنی پێداویستیەکانی دەوڵەت و هێشتنەوەیەتی، بەرام فاکتەری بوون و دیارکەوتنی نییە، هەرگیز ناشبێت ئابوری ببێتە بنەمای دیارکەوتنی دەوڵەت مەگەر ئەو دەوڵەتە لەسەر بنەمایەکی ناڕاست دابمەزرێت.

ئەو وڵاتەی ئابوری دەکاتە ئامانجی بوونی ئەوە هیچ بنەمایەکی مانەوەی تێدا نییە. ئەمە وەکو وڵاتێکی بێسنور وەهایە.

لەمێژووی ئەڵمانیادا ئەوەی زۆر دەبینرێت لەسەر ئاستی ئابووری هەمیشە بەرزبوونەوەو گەشەی ئابوری بووە لەسایەی زیادبوونی بەرژەوەندی و هێزی سیاسی وڵاتەوە، گەشەی ئابوری وڵاتیشمان هەمیشە پشت بەستوبوو بە سەرکەوتنە نەتەوەیی و خۆبەگەورە زانینەکانمانەوە، هەرگیز داڕووخانی وڵات مانای داڕووخانی ئابوری دەوڵەت نییە.

کەواتە هێزی دروستکردن و بەهێزکردنی وڵات چییە ؟

ئاوەز و خوازویست و نمونەی بالا و قوربانی دانە، مرۆڤ هەرگیز لەپێناو گرێبەستێکی بازرگانیدا خۆی نادات بەکوشت، بەلام بەهۆی بیرۆکە یان باوەڕێکی پتەوەوە ئامادەی گیان بەخشینە.

لەجەنگی جیهانیدا ئێمە لەپێناو ناندا جەنگاین، بەلام ئینگلیزەکان لەپێناو ئازادیدا. ئازادی ئەوان و ئازادی گەلانی بچووکتر. بینیمان ئینگلیزەکان چۆن بەنەترسانە و ئەمەکدارییەوە تاکۆتا هەناسەیان دەجەنگن، بەلام ئێمە تەنها چەند مانگی سەرتا گوڕ و تینمان هەبوو، وامان دەزانی لەپێناو باوەڕێکی بالادا دەجەنگین، بەلام ئەوکاتەی پێیان گوتین لەپێناو تیکە ناندا دەجەنگین هەموومان توشی داڕووخان هاتین و تواناکانمان هاتەوە خوار هیچ.

ئەمەش بەڵگەی هەڵەی ئەو بۆچوونەیە کە ئابوری بە بنەمای بەهێز وەستانی وڵات دادەنێت، هەرچەندە هۆکاری ژیانیشە.

هەرگیز هیچ ولاَتێك خاوەنی ئابوریەكی بێخەوش نییە, بەڵكو ولاَتان لەپێشتر و ئێستا و داهاتووش دەركەوتەی حەزی مانەوەن, مانەوەی ڕەگەزی, جا ئەم مانەوەیە بەڕێگەی قەڵەمبازی و پاڵەوانانە بەرجەستەبكرێت یان لەڕێگەی فێڵ و تەڵەكە بازییەوە. ئەگەر حەزی مانەوە پشت بەستوو بێت بە پاڵەوان بازی ئەوا نمونەی ولاَتە ئاریەكانە, حەزی مانەوەی پشت بەستووش بە فرت و فێڵ نمونەی داگیرگە جوولەكە نشینەكانە.

ئایا نامۆ نییە ئەڵمانیا بكەوێتە داوی حەزە سیاسیەكەیەوە و لەو ڕێگەیە لابدات كەپێشتر پروسیا گرتبویەبەر , كە نیشانەی پاڵەوان بازی نەبازانەبوو, نەوەك دژبەری و گرێبەست و ڕێككەوتن نامە ؟

لەسایەتی بەدواداچوونەكانمەوە لە ڤییەنا ئەوەی بۆم دەركەوت هەمان شتم بۆ دیاركەوت پاش لە كۆچكردنم بۆ میونیخ , بەوەی ئەو ڤایرۆسەی لەگەڵەكەمانی داوە هۆكارەكەی ماركسی و جووەكان بووە.

لەكاتی ئەم بەدواداچوون كردنانەمدا هەستام بە توێژینەوەی بیرۆكەكانی كارل ماركس و خوێندكارەكانی, هەوڵی خستنەڕووی ئەو هەڵانەم دا كە یارمەتی سەركەوتنی ماركسیەكانی دابوو لەبواری سیاسەت و ئابوری و فەرهەنگیش. ئەمەش بووە مایەی خۆشحاڵكردنم بەتایبەت ئەو كاتانەی كە گروپێكی دژە بۆچوونی ماركسیەتەكان لە ولاَتدا پەیدابوون. یاساكانی بسماركیشم لەم بوارەدا زۆر پێ خۆش بوو , بەوەی بڕوام وابوو كەبەم چەشنە هەنگاوانە كلكی مارەكە بڕدراوە بەلاَم سەرەكەی ماوە.

بسمارك دژایەتی قوربانیانی ماركسی دەكرد بەلاَم هەرگیز ڕووبەڕووی خوودی ماركسیە ڕاستەقینەكان نەبوویەوە. هەوڵی لەناوبردنی ئەم دەردەی دا لەڕێگەی كوشتنی دووچاربوانەوە و خۆی لە كوشتنی ڤایرۆسەكە خەلاَفاند.

جارێكی دیكە خوێندنەوەم كرد بۆ پەیوەندی نێوان ماركسیەت و جولەكە, توانیم بنەماكانی ئەم پەیوەندی دابەستنە بدۆزمەوە, زانیم ئامانج و مەبەستەكانی جووەكان لەم كارەیان چییە: بڵاوكردنەوەی ئاژاوەو گێژاوی فەوتێنەر لەجیهاندا بۆئەوەی هەل بۆ گەل هەڵبژێردراو برەوخسێت دەست بگرن بەسەر جهاندا.

ئەو کاتەی لە ڤییەنابووم ئەڵمانیام بە زەبەلاحێکی ئەدۆڕاو دەبینی بەڵام پاش کۆچکردنم بۆ میونیخ ئەو بڕوایەم بۆ پەیدابوو کە ئەم وڵاتەش توانای خۆڕاگرتنی لەبەرامبەر ئەم باهۆزە کاولکارە جوولەکە خوازە نییە. بەڕاستی کێشەی من دووچاربوونی خەڵکی نەبوو بەم پەتایە بەڵکو ڕەخنەم لە ڕوونی سیاسەتی دەرەکی ئەڵمانی بوو لەگەڵ شێوازی چارەکردنی کێشە کۆمەڵایەتیەکان، ئەمەش وای دەکرد کێشەی مارکسیەت ڕۆژ بەدووی ڕۆژ مەترسیدارتربێت. بەڕاستی سەیرم لێدەهات لەوەی بەرپرسانی وڵاتەکەم ڕێخۆشکار دەبن لەپێش بزوتنەوەی تێکدەری ئاراستەکراوی جووخواز. هیچ شتێکیان نەدەکرد لەپێناو لەناوبردنی ئەو دەسانەی ئەم تۆڕە مەترسیدارەیان نابۆوە، پەتەکەیان لەڕێڕەوی هاتووچۆی وەچەکانی وڵاتەکەماندا بڵاوکردبۆوە.

بەڕاستی لەم بوارەدا قەڵەم بەدەستانی ئەڵمانی ڕۆڵێکی کارای گێڕا لە هۆشیارکردنەوەی سەرکردەکانی وڵات ، بەمەبەستی هۆشیارکردنەوەی گەل. گەلی ئەڵمانی خۆی دژە لەناوچوونی سروشتی هەیە و هەرگیز بە کردار و پیلانی بۆگەن لەناوناچێت.

لەساڵی ١٩١٣ەوە هۆشیارکردنەوەی خەڵکم لەم بوارەدا خستەئەستۆی خۆم، زیادتر لەجارێك وتمە کە داهاتووی گەشی ڕەگەزی و نەتەوەی ئەڵمانی وەستاوەتەسەر لەناوبردنی مارکسیەتەوە پێش لەهەنگاونانی دیکە. بەڕاستی ئەم هۆشیارکردنەوەیەم کاریگەری گەورەی هەبوو لەسەر دەروونی خەڵك و ئێستاکەش زۆرینەی ئەوانەی بڕوای ڕاستیان پێهێنام وا لە گۆڕەپانی جەنگن و سەربازی بزوتنەوەی نەتەوەیی سۆسیالیستین.

تێپەڕبوونی کات ئەوەم بۆ دەرکەوت کە هەموو ئەو هەڵانەی سەرکردە ئەڵمانیەکان لەباری ئاسایی و جەنگی جهانیدا تێی کەوتوون بەهۆی ڕاوێژی هەڵەی ڕاوێژکارە مارکسیە جولەکەخوازەکان و بیرمەندە دەروون نزمەکان بووە، ئەوانەی کە هیچ مانای نیشتمان پەروەری نازانن، ئەو کاتەی ئەڵمانیا ئابوریەکەی پشت بەستبوو بەو بیرۆکە ناتەندروستە جولەکەکان یەکەمین چەپڵەلێدەری خۆشی دەربڕبوون، کە بڕوایان وابوو ئەو وڵاتەی ئابوریەکەی خوار و خێچە بێگومان بەرەو لەناوچوون هەنگاودەنێت و دواتریش ئەمان دەتوانن لەسەر پاشماوەی ئەم وڵاتە ئەو دەوڵەتە پونێت بنێن کە

خەونی پێوە دەبینن: دەوڵەتێك تێیدا بە ڕووكەش فەرمانڕەوایەتی بەدەست چینی پرۆلیتاریاوەبێت و لەهەناویشەوە كۆیلەی پاوانی جولەكەی سەرمایەداربێت.

چەندین ساڵە داڕووخانی هەناوی لەئەڵمانیادا بەرجەستە بووەو كەسیش ئاشنای نیشتمان و لانكەی ئەم ڤایرۆسە داڕووخێنەرە نییە. ئەوانەشی هەوڵی لەناوبردنی ئەم نەخۆشیەیان داوە شێوەی دەرەوە و هۆكارە قوڵەكانیان لێ تێك چووە.

تێبینی ئەوەم كردبوو كە سۆسیالیستی دیموكراتی لە ئەڵمانیادا پەڕەی ڕۆژنامەكانی كردبووە هۆكارێك بۆ بڵاوكردنەوەی بیرۆكەی داڕووخان، سەر نوسەرە جولەكەكانیان لەدامێنی گوتارەكانیاندا بە پێشبینی درۆزنەوە ژەهرخواردی خوێنەرانیان دەكرد. ئەم مەترسیە جولەكەییە لە نەمسادا بوونی نەبوو.

# بەشی چوارەم

## جەنگی جیهانی

لەکاتێکدا هاتمەدونیاوە کە پەیکەری سەرکەوتن و شانازی تەنها بۆ بازرگان و کارمەندان دروست دەکرا ئەمەش زۆری ئازار دەدام, لەو ڕۆژگارەدا جیهان وادیار دەکەوت کە فەڕی وئارامی باڵی بەسەردا کێشاوە, خەڵکی وایان بەئەندێشەدا دەهات کە پابەندی گەلان بە ئاشتی خوازی و داگیرکردنی بازاڕ و کێشکردنی کڕیارەکانی جێگەی پێشبڕکێی چەکداری کردن و کۆکردنەوەی پشتیوانانی گرتۆتەوە. دەستبڵاوان بە گەشبینیەوە لەم گۆڕانکاریەیان دەنواڕی کە بەردەوامی ئەم دۆخە لەجیهانەکەمان مانای دروستکردنی بازاڕێکی بەخشین و وەرگرتنە و تێیدا هەموو جامبازێکی بەهێز دەتوانێت بەشداربێت, باشترین بازرگانەکانیش باشترین پێگەیان بۆخۆیان دابین کردووە, واتە ئینگلیزەکان,لەبەرامبەریشیاندا باشترین کارمەندان وەستاونەتەوە, واتە ئەڵمانەکان, بەڵام ئەم پێشکەوتنە ناچاری جولەکەکانی کردبوو بۆ قوربانی دان بە لوتبەرزی بۆ خۆبڕژێوی و دەست هەڵگرتن لە نواندنی ڕۆڵی ئەو بورجوازیانەی کە لەبری ئەرك و ماندووبوون شتێك پارە بە کارمەندە بازرگانیەکە دەدەن.

بریا سەدساڵ پێش ئێستا هاتمایەتە سەر ئەم دوونیایەوە, لەڕۆژگارەکانی جەنگی ئازادکردن. لەو ڕۆژارانەی کە بەهای مرۆڤ پەیوەست نەبووە بە بەها و توانا بازرگانیەکەیەوە! بەڵام چارەنوس کەلەژێر دروشمی (جێگیری و پەیڕەوخوازی) هێنامیە دوونیاوە. ئەمەش وای لێکردم ببمە بونەوەرێکی بەخت ڕەش کە بازرگانی نازانێت و هیچ هەلێکیشی نییە بێتە بازرگان و حەز لە کارمەندبوون ناکات.

هەلآیسانی جەنگی (بویر) بۆمن وەکو بلآچکەی دیارکەوتنی گەردەلولێکی دوور وەها بوو.

ڕۆژ بەدووی ڕۆژ بەچێژەوە هەواڵ و ڕووداوەکانی ئەم جەنگەم دەخوێندەوە. بەبەدواداچوون کردنم بۆ قۆناغەکانی جەنگ و کوشتار نۆرم چێژ دەبینی (لەم کاتەدا تەمەنم تەنها دە ساڵ بوو). جەنگی ڕووسی-ژاپۆنی ئەندێشە پووچی لەمێشکی خەونەوانانی ئارامی جیهان هەڵگرت, ئەم جەنگە وای لێکردم بە ئاراستەی پیاوبوون هەنگاوبنێم, بەخێرایی هەستەکانم بۆلای ژاپۆن جولآن؛ چونکە وام دادەنا دۆڕانی ڕووسەکان مانای لاوازبوونی سلآڤیەکانی نەمساشە, ئەمەش لەبەرژەوەندی ئێمەی ئەڵماندابوو.

لەسایەی ئەو جەنگانەی ئەورووپا و ئەفریقیا بۆم دەرکەوت ئەوەی بەلای منەوە لەشێوەی خامۆشی و ناخرۆشاویدابوو ئارام و ئۆقرەیی بەر لەهەڵکردنی بۆرانێکی توند بوو, ئەو کاتانەش لە ڤییەنابووم هەستم دەکرد ساتێك ناساتێك تەوژمێکی گەرما بەسەر بەڵقاندا دێت و دەڕوات, ئامـاژەی هەڵکردنی گێژەلۆکەبوو. جەنگی بەڵقان هەلآیسا و گشت ئەورووپا شڵەقیا و لەژێر قورسی ئەم جەنگەدا نرکەی دەهات. هەموان لەچاوەنواڕی ڕوودانی فەتارەتە نەخوازراوە گەورەکەدابوون , هەستیان بەوە کردبوو ئەوەی لێی دەترسن هەر ڕوودەدات و زۆری نەبرد تاوەکو وشەی جەنگ یان چاوەنواڕی هەلآیسانی جەنگ بووە باس و خواسی پلەیەکی نێو کۆڕوکۆبوونەوەکان و وشەی جەنگ جێگەی بەوشەی ئاشتی بەردەوامی جیهانی لەق کرد.

لەساڵی ١٩١٤دا بروسکە زەبەلاحەکە لەزەوی کەوت و دەنگی ڕێژنەی فیشەك و تۆپەکان پەردەی گوێیان دەدڕاند. ئەو دەمەی دەنگۆی کوشتنی ئەرشیدۆك فرانسوا فەردیناند بە میونیخ گەشت (ئەو کات من زۆر بەکەمی ئەهاتمە دەرێ , لەم کاتەدا هەواڵی زۆر ناڕۆشن و سەیرم بەرگوێ دەکەوت),بەڕاستی زۆر نیگەران بووم: ئایا بەڕاست کوشتنی ئەرشیدۆق لەلایەن خوێندکارێکی ئەڵمانیەوە مانای ئەوەیە کە ئەڵمانەکان بوونی ئەرشیدۆك بەزیاوە دەزانن بەوەی هەوڵی لکاندنی نەمسا دەدات بە ناوچە سلآڤیەکانەوەو بەم کارەشی مۆرکێکی سلآڤی بەنەمسا دەبەخشێت؟ ئەم کارە ئایا بەڕاست بەمەبەستی ڕزگارکردنی گەلی ئەڵمانی بووە لەم دوژمنە؟

خۆنەگەر ئەمە ڕاست بوایە و ئەڵمانەکان ئەرشیدۆکیان کوشتبایە ئەوکات نەمسا لەجیهانی ڕادەگەیاند: ئەڵمانەکان شەڕخواز و ئاژاوەگێڕن، بەکورتی دۆخەکە پەیوەندی ئەڵمانەکاندا نەدەشکایەوە، بەڵام پاشتر دیارکەوت ئەمە تەنها تۆمەتێک بووە بۆ ئەڵمانەکان؛ بەڵکو ئەوە سربەکان بوون ئەرشیدۆکیان کوشت، واتە سلاڤیەک بەدەستی هاوڕێیەکی سلاڤی خۆی کوژرا،بەمەش تۆمەتەکە لەئەڵمانەکان دوورکەوتەوە.

هەرکەسێک واری تێبینی کردنی هەڵوێستی نەمسای بۆ ڕەخسابێت لەبەرامبەر سربیادا ئەوکات بەجوانی بۆی دیاردەکەوت کە، ئەو خرەبەردەی لە سەر لاپاڵی گردێکەوە تلۆر دەبێتەوە جێگەی گیرسانەوەی تەنها بنکی دۆڵەکەیە.

پاش لەڕوودانی ئەم دەست درێژییە نەمسا مافی خۆی بوو گلەیی لەسربیا بکات جا بەهەرجۆرێك بێت دەربڕینەکەی، بۆیە هەنگاوی نەمسا لەم بوارەدا بەمافی خۆی دەزانرا و خەوشی و نەنگی لێنەدەبینرا.

بۆنەمسا لەسەر سنوری باشور-ڕۆژهەڵات دوژمنێکی کوشندە و سەرسەخت هەبوو، هەرکاتێك هەلی دەستبکەوتایە بێ دودڵی پەلاماری ئەم وڵاتەی دەدا و تەفری دەکرد.

بەڵام دوژمنانی ئەم پاشانشینە بڕوایان وابوو: نەمان و تیاچوونی ئەنجامێکی ڕاستەقینەی پەرتبوونی وڵاتە دوای فرانسوا جۆزیف، چون پاش لەمردنی هۆکاری بەرگری یەکەم لەدەست دەدات. فەرمانفەرما لەپێش چاوانی ئەندامانی وڵات خۆی بەرجەستە دەکرد. سلاڤیە ڕامیارکارەکان هەوڵی چەسپاندنی ئەم بیرۆکەیەیان دەدا لەناخی خەڵقیدا. وەهایان دەخستنەپێش چاو کە وڵات بەبوونی و بەردەوامی قەرداری لێهاتوویی فەرمانفەرما و ڕامیارکاریەتی، ئەم زیاوە ستایشە بۆ فرانسوا جۆزیف و دارودەستەکەی هەڵخەڵەتێنەر بوو، بەوەی لەپشت ئەم پیاهەڵدانانەوە شینەتیغێکی لەژەهر هەڵسواو هەبوو، کە سلاڤەکان دەیان ویست بەکوشتنی ئەم کەسایەتیە بکەونە وێزەی ئەو کەسەی خۆیان مەبەستیانە و پارچەپارچەی بکەن.

بەڵام مردنی جێنشین هەنگاوەکانی بەرەو کۆتایی بۆنوسراو خێراتر کرد. ئەوانەی ڕەخنەی ئەوەیان لە حکومەتی نەمسا دەگرت بەوەی کاتەکانی ڕوودانی فەتارەتەکەیان پێشخستووە بەڕاستی ستەمیان کردووە؛چونکە جەنگ ڕاستیەکی

حاشا هەڵنەگربووە و خۆ لێ لادانی جگە لە کات کوشتن هیچی دیکە نەبووە(جا کاتەکە ساڵێك بێت یان چەند مانگێك). هەردوو حکومەتی ڤییەنا و بەرلین هەمیشە یەکلایی کردنەوەی حساباتەکانی نێوانیان دوادەخست تائەوکاتەی چارەنووس بۆی پێش خستن. خوێنەوەرەکی پاش لەکوشتنی ئەرشیدۆك کاریان بۆ دوورخستنەوەی ڕوودانی فەتارەکە بکردایە بەدڵنیاییەوە بۆماوەیەکی باش ئەم کارەساتەیان دوادەخست و نەیان دەهێشت ئەم هەموو نەهامەتیە ڕوی دابایە، بەڵام هەمدیس ئەمەش بەقازانجی دوژمنەکانیان کۆتایی پێدەهات.

جەنگ هەڵایسان کارێکی خۆ لێ لانەدراو بوو، هەردەبوو هەڵبگیرسێت. گەر نەمسا بێدەنگیش بوایە ئەوا هەرگیز ئاشتی سەلمێنراو نەدەبوو وەك چۆن هێندێك بڕوایان وایە. بەڵێ لەم کاتەدا پاساوی بەگەڵ هێرشکردنەسەرمان بوونێکی نەدەبوو. تەنها ئەوەنەبێت خوودی دەوڵەتی نەمسا پارچە پارچە دەبوو، لەم کاتەدا ئایا دەبوو بەگورج و گۆڵیەوە فریای نەمسا بکەوین یان بەدەست بەستراوییەوە لەدوورەوە بوەستین و ببینین کەچلۆن ئاگری ئاژاوە زەویەکانی دراوسێمان دەسوتێنێت؟

لەم ڕۆژدا ئەوانەی تانە لەو کەسانە دەدەن کە خوای جەنگیان لەخەو ڕاپەڕاندووە و ئامۆشیاری پێشکەش دەکەن ئەوا خاستر واسە بەر لەهەموو کەس بزانن کەخۆیانن بەرپرسیارترین. وا دەیان ساڵە بەرەی سۆسیال دیموکراتی ئەڵمانی هانی پەلاماردانی ڕووسیا دەدات، بۆئەمەش هەرگیز ڕۆژێك دەستەوەستان نەوەستاوەتەوە. بەڵام پارتە ناوەنجیەکان بەشداربوون بە هۆی ئامارژە ئاینیەکانەوە، بەوەی وا لە دەوڵەتی نەمسابکەن ببێتە گۆشەبەردێکی سیاسەتی ئەڵمانی. ئەوەی پارتە ڕامیاریەکان چێندیان وڵات چنیەوە، هەر وڵاتیش بوو نەهامەتیەکانی ئەم جەنگەی لەئەستۆ گرت.

بەڵام ئەوەی ڕووی دا ئەنجامی خوزاراو نەبوو، لەم وارەشدا هەڵەی حکومەتی ئەڵمانی ئەوەبوو کە، هەمیشە هانی ئاشتی پاراستنی دەدا، کاتە گونجاوەکانی هێرش کردنی لەدەست دا، بووە قوربانی بۆچوونی ئاشتی جیهانی، بەڵکو قوربانی هاوپەیمانێتی جیهانیش بوو. بەوەی ئەڵمان هەوڵی ئاشتی خوازی دەدا، بەڵام ئەوانی تر سووربوون لەسەر هەڵایسانی جەنگ، دواتریش ئەڵمانیا کەوتە ئەم داوەوە.

ئەگەر حکومەتی ڤییەنا بەژیرانەو میانڕەوترەوە ڕەخنە و گلەییەکانی خۆی ناراستەی لایەنی بەرامبەر بکردایە ئەوکات قورسی ئەم گلەییانەی لەسەر گۆڕینی

ڕێڕەوتی جهانی هیچ کاریگەرییەکی ئەوتۆی نەدەبوو. واتە هەڵایسانی جەنگی جیانی ڕەنگە بۆماوەیەکی نادیاری دوا بخستایە. بەلأم بەم کارەی ڕاپەڕین و شۆڕش لەنێوخۆی وڵاتدا بەرپا دەبوو. چونکە ئەم شێوازی ئاگادارکردنەوەو گلەیی دەربڕینە بە لاواز لەقەڵەم دەدرا. ئەمەش هەرگیز بە توندوتیژ و پاڵەوانانە لەقەڵەم نادرێت. ئەوەشی پێچەوانەی ئەم بۆچوونەی لا گەلاڵەبووبێت بێگومان یان ئەوەتا مێشکی پوچە یام دووزمانێکی خوێڕییە.

جەنگی ١٩١٤ ئەسەپێندراو بووە سەر هەموو گەل. بەلأم دیسانەوەش حەز و خواستی هەموو گەل بوو. بەشێوەیەکی کوتوپڕ دوو ملیۆن ئەڵمانی خۆیان ناونوسی جەنگ کرد لە پیر و گەنج و ژن و پیاو. بەم کارەش سەلماندنیان ئامادەی پاراستنی سنورەکانی وڵاتیانن تا دوا دڵۆپی خوێنیان.

جەنگ توانی لەو گێژاوی خەمۆکیانەم ڕزگاربکات کە منداڵیمی داپۆشی بوو. بەخێرایی تەوژمی خرۆشان پەلکێشی کردم و لەسەر ئەژنۆم چەماوەو سوپاسی ئاسمانم دەکرد بەوەی لەو کاتەدا نەمردم و لەڕیزی زیندوەکاندا مامەوە.

لەپێناو ئازادیدا تێکۆشانێکی سەخت دەستی پێکرد. بەردەوام بوو. هەر لە دەسپێکی جەنگەوە زۆرینەی گەل لەوە تێگەیشتبوون کە بانگەشەی تێکۆشان و خەبات گێڕی ئەم جارە جیاوازەترە لەبارەکانی تر. بەوەی دەبێت قوربانی زۆر بدات. ئەمجارە تەنها پەیوەست نابێت بەدیاریکردنی چارەنووسی سربیا و نەمساوە بەڵکو دەگاتە قەوارەی نەتەوەیی ئەڵمانی و سنورداری دەکات. بەم چەشنەش گەلی وڵات دوای ساڵانێکی زۆر لە چاوبەستراوی ڕێڕەوەکانی داهاتووی بۆ دیارکەوت. هەر لەدەسپێکی کێشمەکێشەکەوە هێندێکی باش و پتەو هاوتای گرەوتینەکەبوو. بەرام هیچ کامێک لە ئەندامانی گەل بیریان لەو دوا گۆڕانکاریانە نەکردبوو کە ڕەنگە بەهۆیەوە ئاراستەیان بکرێت. بروایان وابوو ئەم شەری دەست و یەخەیە تەنها چەند مانگێک دەخایەنێت و پاشتر هەرکەسە و بۆسەر ماڵ و کارو باری ژیانی دەگەڕێتەوە

دوای دەرکردنی ڕاگەیاندنی فەرمی وڵات بەهۆی کوشتنی ئەرشیدۆکەوە. دوو بۆچوونم لا گەلاڵە بوو:

١- هیچ گومانێك نییە لەوەی جەنگ هەڵدەگیرسێت

٢-ئەم ڕووداوە نەمسا ناچار دەکات بەڵێن و پەیمان نامەکانی بباتەسەر و لێیان پەژیوان نەبێتەوە؛ گەلەك لەوە دەترسام بەهۆی ئەمەوە ئەڵمانیا لەسایەی هاوپەیمانێتیە سێ قۆڵیەکەوەی پەلکێشی جەنگ بکرێت بەبێ ئەوەی خوودی نەمساش هۆکاری ئەم کێشمەکێشە بووبێت, بەهۆی دۆخی ناوخۆییەوە ڤییەنا زۆر لەوە دەترسا کە هاوپەمانەکانی لەدەست بدات, هەرچۆنێك بێت بەهۆی ئاگادارکردنەوەکەی نەمساوە (گەر بەڕووکەشیش بێت) ئەم فەرمانفەرما بەساڵاچووە ناچاربوو بەدەست لەناودەستی ئەڵمانیا دژی دۆخەکە بوەستێنەوە جا بەرئەنجامەکانی هەرچی و چۆنێك بێت.

هەڵوێستی من لەمەڕ ئەم چەن و چونکارییە زۆر ساکار و ڕوون بوو: هەر لەیەکەم ساتەوە بۆم ڕوون بوویەوە کە ئەم کێشمەکێشە بۆ ئێمەی ئەڵمانی قازانجی نابێت بەوەی بەبیانووی تەمبێکی کردنی سربەکانەوە ڕەنگە دووچاری نەهامەتیەکی گەورە ببین, بەم کارەش ئەو ئەڵمانیایەی بەهۆی کارەکانی بسمارکەوە یەکی گرت ناچاری قوربانی دان و خۆ پەرت کردنەوە دەبێت, ئەوەشی باوباپیرانمان بە خوێنی خۆیان بۆیان دروست کردووین لەجەنگە تۆقێنەرەکانەوە لە فیسمبورگەوە تاوەکو سیدان و پاریس لاوی ئەڵمانی ناچاردەبێت هەمدیس بۆیان تێبکۆشێتەوە. ئەگەریش توانیمان برەو بە تێکۆشان بدەین تاکۆتا خاڵی سەرکەوتن ئەوکات فەرمانفەرمای ئەڵمانی سەرلەنوێ دەبێتەوە نوێکارەوەیەکی بەهێزی ئاشتی پارێز بەبێ ناچارکردنی نەوەکانی گەل بەوەی لەپێناو ئاشتیدا پێویست بێت لە پاروە نانی ڕۆژانەیان بێبەش بکرێن.

لە تازەپێگەیشتوویی و جاحێڵیمدا ئاواتم ئەوەبوو کە بۆجارێکیش بێت ئەو هەلەم پێبدرێت یان بۆ برەخسێت بۆئەوەی بیسەلمێنم کەئەم هەستی خۆش ویستنی نیشتمانە لای من هەستێکی پاشبەند و لاوەکی نینە. بۆیە هەرلەکاتی هەڵایسانی جەنگدا پەرتوکەکانم لەنێو کتێبخانەکەمدا دانا و بڕیارم دا لەبریدا چەك هەڵبگرم. بەمەبەستی پاراستن و بەرگری کردن لە وەچەکانی گەلی ئەڵمانیا. لە ٣ خەرمانانی ساڵی ١٩١٤ دا داوایەکی ڕێپێدان بۆبەشداری کردنم لە ڕیزی سوپای ئەڵمانیادا پێشکەشی پاشا لویسی سێیەم کرد و ڕۆژی دواتر ڕەزامەندیم بۆگەڕایەوە بەوەی

دەتوانم بەخێرایی پەیوەندی بکەم بە یەکێك لە لەشکرەکانی باڤاریەوە. بەڕاستی زۆر خۆشحاڵ بووم، نەمدەزانی لەخۆشیدا چیبکەم!

بەم چەشنەم سەردەمێکی نوێی ژیان دەستی پێکرد. بەجۆرێك هەرگیز ناتوانم لەبیری بکەم. ڕابردوو لە گەرمەی ڕووداوەکاندا وون ببوو. بەپەرۆشەوە چاوەنواڕی هەلاتنی ڕۆژی دواترم دەکرد. ڕۆژی پەیوەندی کردنم بەبەرەکانی جەنگەوە. نەدەترسام لەوەی چیم لێ بەسەردێت بەڵکو لەدواکەوتن دەترسام بەوەی درەنگ بگەمە بەرەکانی جەنگ. لەم کاتەدا هەواڵی سەرکەوتنەکانمان یەك بەدووی یەکدا بەر گوێم دەکەوت. کۆدەنگەییەك هەبوو لەوەی ئەم جەنگە کورت دەبێت لەشێوەی جەنگی هەفتایی یان حەفتاکان. نەوەك درێژخایەن.

لەکۆتادا بەئاراستەی بەرەکانی جەنگ بەرەو ڕۆژئاوای وڵات کۆچمان کرد. لەوێدا بۆیەکەم جار چاوم بە ڕووباری ڕاین کەوت. لەم جێگەیەدا بڕیاری پاراستنی خاکی ئەڵمانیامان پێ بوو. بەوەی نابێت ڕێگە بە پەڕینەوەی دووژمن بدەین لەم ناوچەیەوە بۆ نێو خاکی خۆمان. ئەڵمانیا....لەگەزنکی بەیانییەکی نیوچە تەمومژدا کە پەیکەری ئەڵمانیامان بۆدەرکەوت بۆمان ڕوون بوویەوە کە ئەڵمانیا بەسەر ڕینانەوە دەستەلاتدارە. لەم کاتەدا سرودی ڕین لەسنگمانەوە دەردەپەڕییە دەرێ. هەستی نیشتمان پەروەریم ئەوەندە بەهێزبوو سنگم نەیدەتوانی ئەم هەموو هەستانەم بشارێتەوە. بەڵێ بۆیەکەمین جاربوو لەژیانمدا ئەوەندە هەست بە سەروەری و شانازی بکەم.

لەشەوێکی زۆر سارددا بە دەشتەکانی فلاندەر گەیشتین. دەستمان دایە بەرەوپێش چوون لەژێر سێبەری تاریکاییدا. بەبێ ئەوەی ڕووبەڕووی هیچ دوژمنێك ببینەوە. بەڵام هەرکە گەزنکی بەیان بەدیارکەوت دەنگی فیشەك و تەق و هوڕ لەملا و ئەولامانەوە دەستی پێکرد. لەم کاتەدا هاوار و بانگ و سەلا لەدووسەد شەڕوانەوە بەرزبوویەوەو خۆشحاڵیان دەردەبڕی بەوەی پەیامی مەرگیان ئاراستەکراوە. دواتر لەهەردوولاوە بۆمب تێگرتن دەستی پێکرد. هەموومان هەستی خۆبەخشینمان لەپێناو گەل و وڵاتدا خرۆشابوو. هەستمان بە هاندەرێك دەکرد بەرەو پێشەوە پاڵی پێوە دەناین. لەناکاو لەنێو کێڵگەکانی کەلەرمدا دگەڵ دوشمن دەستەویەقە بووین. لەم کاتەشدا بانگەشەی سەرکەوتنی هاوڵەکانمان لەبەرەیەکی نزیکدا بەر گوێمان

دەکەوت رۆژی پێنەچوو تا ئەوکاتەی بانگەشەی خرۆشانی هەستی نیشتمان پەروەری هەموو بەرەو ڕیزەکانی جەنگمانی گرتەوە. لەودەمەشی داسۆلکەی مەرگ دەی نوریندەوە هەریەرنەواه بووین لەسەر بانگەشە و وتنی سرودی: (ئەڵمانیا لەسەرووی هەموانەوە یە. چوار ڕۆژی دواتر گەڕاینەوە بۆ خاڵێکی دەسپێکی هێرش بردنمان گۆڕانکارییەکی گەورە بەسەر ناخماندا هات. بەڕاستی ئەو چوار ڕۆژەی لەجەنگ بووین بەس بوو بۆ بەپیاوکردنی هەموو جاحێڵ و لاوە حەقدەسالییەکان.

پێشمەرگەکانی لەشکرەکەمان لەشکری(لیست) بەپێی پێویست هونەری جەنگاندن فێر نەکرابوون. بەڵام دەیان زانی چلۆن وەکی گەریلا پێشەییەکان خۆیان گیان بەخش دەکەن.

ئەمە سەرەتا بوو. ساڵ تێپەڕی. کەشی بەدەم هۆنراوە وتنەوە جەنگین گۆڕدرا بۆ بەتۆقانەوە شەڕکردن. کەمەکەمە کڵپەی نیشتمان پەروەری لەهەناوی سەربازانماندا دامرکایەوە. لەهەناودا کێشمەکێشێکی سەخت دروست بوو لەوەی: ئایا خۆیان بە نیشتمان ببەخشین یان خۆمان بدزینەوەو ڕزگارمان بێت و نەمرین ؟

بەجلکی ئاوەزەوە ترس و بیم بەدەوروبەرماندا دەخولایەوە. هەوڵی قایلکردنی دەداین بەوەی ئەنجامی ئەم کارەمان تەنها خۆکوشتنە. دەی ترساندین بەوەی یاخی بین و هەڵبێین. بەڵام تاوەکو حەزی مانەوەمان بەهێزتردەبوو ئەوکات باشتر تێدەکۆشاین. تادەهات ترسان کەم دەبویەوەو لەئەنجامدا هەستکردن بەئەرکدارێتی لەناخماندا چەسپا سەبارەت بەمن ئەم کێشمەکێشە هەناویەم لە زستانی ١٩١٥-١٩١٦ بەکۆتا گەیشت. لەو ڕۆژانەی لەسەرەتای ڕووبەڕوو بوونەوەدابووین سرودی خرۆشێنەرمان دەچڕی و لەگەڵ هاوڵاتەدا پێدەکەنیم. لەجەنگەکانی ساڵی ١٩١٥ دا بە پتەوی و نەبەزییەوە دەجەنگام. بەدڵ قایم و نەترسیەوە. لەوکاتە بەدواوە ئەم هەستەم تێکەڵاوبووەو لێمدا بەجێ ماوە.

ئەم ڕوو گۆڕانەمان لەترس بەتەنێ منی نەگرتەوە. بەڵکو هەموو سوپا و لەشکری باڤاریاشی گرتەوە. بە نەترسی و خۆڕاگریەوە برەومان بەجەنگ دەدا, بەدەمار پۆڵاینەوە. ئەوەی بەسەر ئەم لەشکرەدا هات لەچوار ساڵی پڕلە خەباتی بەردەوامدا مێژوو نوسان دەتوانن وشەی خۆیانی تێدا بدۆزنەوەو لەبارەوە بڵێن. بەم کارەش سوپای باڤاری توانی دانسقەیی خۆی بسەلمێنێت لەوەی لەهەموو دوژمنانی بەتوانا

و بەگوڕ و هێزدارترە، هەموو ئەمانەش سەرباری ئەمامەتیەکانی برسێتی و نەخۆشی بڵاو. ڕەنگە پێش لەوەی مێژوو نوس بتوانێت باس لە پاڵەوانی پاڵەوانبازیەکان بکات چەرخەکە تێپەڕێت، ئەمەش بەوەدەبێت مێژوونوسان باس لەپاڵەوانێتیەکانی سوپای ئەڵمان نەکەن لەجەنگدا.

تاوەکو وەچە ئەڵمانییەك مابێتەوە لەسەر ئەم زەوینەدا هەرگیز ناتوانێت ئەوە لەبیری خۆی بەرێتەوە، کە چلۆن برا جەنگاوەرەکانی توانیویەتی لە جەنگەکانی (١٩١٤-١٩١٨) سەری نیشتمان و گەل بڵند ڕابگرێت، جهانیش قەتحەن ناتوانێت نمونەی قوربانی دانی ئەڵمانەکان و لەخۆبوردوییان لەبیری خۆی بەرێتەوە.

ئەو دەمەی پێشمەرگە بووم، هەرگیز حەزم لەوە نەدەکرد ببمە سیاسەت مەدار؛ پێم وابوو نەشیاوترین کارە، بەپشت بەست بەو بڕوایەی کە دزێوترین بەردەستەی کشتیارێك خزمەتێکی زیادتری کردووە بە نیشتمان لەچاو دیارتین کەسایەتی پەرلەماندا. بەڵێ، بەڕاستی ڕقم لەهەموو سیاسەت مەداران دەهاتەوەو گەر دەستەڵاتم هەبوایە یان مێژوو بگەڕێتەوە دواوە ئەوا لەشکرێکی تایبەتی پێکدێنم و هەموو ئەندام پەرلەمانە بۆگەنەکان لەناودەبەم، لەم کاتەشدا چیتر ئەم کەسە خراپەکار و فرەوێژانە ناتوانن لەسەر هسابی تیکە و پاروی هەژاران برەو بە زۆر بڵێیی خۆیان بدەن، بەڵێ ئەم جۆرە کەسانە تەنانەت توانای هاوارکردنیشیان نەبوو بەڕووی دوژمندا.

گوتم: مەرامی بەشدارێتی کردنم نەبووە لە ڕامیارچێتی دا، بەڵام بەهۆی زۆری خراپەکاری ئەنجامدراو لەدەرهەق گەل و نەتەوە بەگشتی و سوپا بەتایبەتی لەهەندێك هەرێمەکانی وڵاتدا ناچاری خۆتێوەگلاندنی کردم بەم کارە. دوو شت هەبوون زۆر دەیان ورووژاندم و دەمارگیریان کردم، بەوەی: لەبەدەستهێنانی سەرکەوتنی هەولیمانەوە ڕۆژنامەگەلێکی بنچینە پۆخڵ زۆر بەژیرانە دەستیان دایە تێکدانی خۆشیەکانمان و لەم کاتەشدا زۆرێك لە جەنگ خوازانی وەکو من نەیان دەتوانی ڕاستی و ناڕاستی دەقی ئەم ڕۆژنامانە لێکدی جودابکەنەوە، هەموو ئەو ئاهەنگ بۆنانەی لەوڵاتدا بەبۆنەی سەرکەوتنە سەربازیەکانەوە ڕێکدەخران ئەم ڕۆژنامانە هەموویان ڕەت دەکردەوە، بە بیانووی ئەوەی ئەم کارە بێ مانا و بچووکە شایستەی گەلێکی مەزنی وەکو ئەڵمان نییە، لەڕاستیدا دەربڕینی خۆشی بۆ ئازادی و سەرکەوتن

کارێکی سروشتیە و هیچ مانای کەمکردنەوەی دەستکەوتەکان نادات. ئەڵمانەکان خوازیاری جەنگ نەبوون بەوەی هۆکاری هەڵایسانی جەنگ نەبوون، بەڵکو تەنها یارمەتی پێشکەشکاری وڵاتانی بووە، بۆیە کارێکی سروشتیە بەسەرکەوتن خۆشی دەرببڕێت.

لەباتی ئەوەی دەستەڵات هەستێت بەراپێچکردنی ئەم خۆشی شێوێننانە بەرمو مەرگ کەچی سنوری بۆ خۆشی دەربڕان دانا، ئەو دەستەڵاتدارە کورت بینانە ئەوەیان لەبیرکردبوو کە بە کپتکردنی خۆشیەکان ڕەنگە میللەت بخنکێت، واتە سەرکەوتنەکان بەشکست جێگە دەگیرێتەوە،گەلی ئەڵمان سەرخۆش بوو بەخۆشی گێڕانەوە، بۆیە دەبوو لەم کاتەدا بەرپرسان لێیان گەڕێن بۆئەوەی خۆشی دەربڕن، ئەمەش هەنگاوی یەکەمی شکست بوو، بەڕاستی گەمژەترین کار ڕێگرتنە لە دەربڕینی خۆشی سەرکەوتن لەلایەن گەل و میللەتەوە، کارکردن لەپێناو سارکردنەوەو دامرکاندنەوەی جۆش و خرۆشی سەرکەوتن لە هەناودا مانای کەم تەرخەمی نواندنە بە نزیک بوونەوەشی لە غیانەت لەنیشتمان.

هۆکاری دووەمی نارامی لەبەر برانم، چاوپۆشی بەرپرسان بوو لەکارە خراپەکانی مارکسیەکانی وڵات، بەبیانووی ئەوەی بەرژەوەندی وڵات لەپێش بەرژەوەندی تاک پارتێکەوەیە و بۆبەدیهێنانی سەرکەوتن پێویستمان بەکخستنەوەی ڕیزەکانی هەموو پارت و بۆچوونەجیاوازەکانی وڵاتە، بۆیە لەم کاتەشدا نابێت مارکس خوازەکان بکرێنەدەرەوەی ئەم یەکبونی نیشتمانیەوە! بەڵام خاوەن ئەم بۆچوونی یەکخستنەوەی هێزەکانی وڵاتە لەبیری چوو کە مارکسیەکان پارت نین بەمانای وشە،بەڵکو مارکسیەت تەنها بیروڕایەکە و بەبڵاوبوونەوەی هەموو کۆڵەکە بەهێزەکانی وڵات لاواز دەکات، دواتریش فاکتەری تێکدانی هەموو بەرەکان و مرۆڤایەتیشە بەگشتی.

یەکێك لە نیشانەکانی گێژ و وێژی سەرکردە ئەڵمانیەکان قەدەغەکردنی لەناوبردنی چالاکی مارکس خوازەکان بوو، بەڵام وەزیری ناوخۆی ئەوکاتەی ئەڵمانیا دەیگوت: کارێکی کەودەنانە نییە پاش لەوەی پارتەکەیان گەڕایەوە باوەشی نیشتمان و بڕیاری نیشتمان پەروەری دا ئێمەش لەئەستۆیان بگرین. ئایا بەڕاستی ئەم قسەیە مانای

گەحۆڵیەکی ڕوون نییە ؟ ئایا بەڕاست حکومێت ئەم هەڵوێستەی دەبوو گەر بەجوانی ڕەناوەڕۆکی مەبەستەکەیان گەیشتبایە ؟

بەڕاستی دەسەڵات و کارمەندانی حکومێتی ئەڵمانی هیچ چاکەیەکیان نەبوو بەوەی لە تەمووزی ١٩١٤ دا هەرچی کرێکار و جوتیاری ئەڵمانی هەبوو لە پەتا کوشندەکەی جوولەکە ڕزگاریان بوو، بەڵکو بەهۆی دەستپێشخاری خۆیانەوە بووە بۆ دەستبردن بۆچەك بەمەبەستی بەرگری کردن لەنیشتمان، بەڕاستی ئەم جۆش و خرۆشە بۆ بەشداری کردن لەجەنگ مارکس خوازە جولەکەکانی خرۆشاند و ناچاری سوتانی بۆچوونەکانی خۆیان بوون؟ بەوەی پێشتر بڕیاری لەناوبردنی هەستی نیشتمان پەروەرییان دابوو لەناخی میللەتدا، بەڵام بەسەر خۆیاندا شکایەوە، بەخێراییەکی چاوەڕوان نەکراو بۆجووەکان، جولەکە مارکس خوازەکان خۆیان لە گۆشەگیرییەکی تەواودا بینیەوە، بەدەم فرمێسك هەڵڕشتنەوە دیتیان چلۆن ئەو باڵەخانەیەی بەدرێژایی شەست ساڵ سەرقاڵی کەڵەکەکردنی بەردەکانی بوون بەشەوڕۆژێك داڕووخا و لەناوچوو.

بەڵام ئەم شکستە نەبووە هۆی کۆڵدان بە سەرکردەکانی ئەم بزوتنەوە جوگەرایە و لە توانایانی کەم نەکردەوە، ئەمجار بە لەبەرکردنی جلکی پیاوخوایی دەستیان بەمینرێژکردنی هەموو جۆش و خرۆشەکانی نیشتمان پەروەران کرد، بەوەی پاراستنی نیشتمان و گەورەیی نواندنی بە ئاهەنگ گێڕان و خۆشی دەربڕین نابێت.

ئەوکاتەی خوێن پاکەکان لە بەرەکانی پێشەوەی جەنگدا سەرقاڵی خۆبەخشین بوون بە نیشتمان کەچی زۆڵە جولەکەکان لەپشتەوەو لەناوچەئارامەکانەوە سەرقاڵی لێدانی خەنجەربوون لە سوپای ئەڵمانی، بۆیە پێویست بوو لەسەر دەسەڵات ئەم دوژمنانەی گەل لەناوبەرێت و سڵ لەبانگ و سەلا و هات و هاواریان نەگرێت و پاکتاویان بکات.

دەبوو دەسەڵات ئەو دوژمنانەی بکوشتایە و لەناوی بردنانە، لەلام ئەفسوس فەرمانفەرمای وڵات هەستا بە درێژکردنی دەستی لێخۆشبوون بۆیان و هەموویانی بەخشی، بەم کارەش دەوڵەت کایەی ئەنجامدانی چالاکیەکانی بۆ مارەکان فراوانترکرد، ئەمانە ئامادەکاری باشیان کرد بۆ هەڵایسانی شۆڕش لەناو وڵاتدا، ئەمەش زۆر ڕقی هەستاندم، لەخۆم دەپرسی: ئایا بەڕاست ئەوە ئەرکی فەرمانفەرما نەبوو کە ئەم کەسە

گلاوانە دەستگیربکات و لەناویان بەرێت و گەلیان لەدەست ڕزگاربکات؟ باشە بۆچی حکومەت هەڵنەستا بە داخستنی پارتە بۆگەنەکانیان و سنورێکی بۆ زۆر بلێی ئەندام پەرلەمانە گێژەکان دانەنا؟ لەلایەکی دیکەوە لەخۆم دەپرسی: ئایا دەتوانرێت بۆچونێك بە گوڕی شمشێر لەناوببرێت؟ ئایا بەبەکارهێنانی هێز دەتوانرێت قەڵاچۆی چەمکێکی فەلسەفەخوازی بکرێت؟ بۆئەمەش بەمێژوودا ڕۆچووم و ئەمەم بۆدیارکەوت:

ئەو بیروبۆچونانەی لەسەر بنەمای فەلسەفەیەکی چەسپیو دامەزراوە، بەتایبەت بزوتنەوە هاندراوەکان بەگیان و هێزەوە، پاش لەگەیشتنی بەقۆناغێکی دیاری کراو، هەرگیز ناتوانرێت بە هێزی بەرجەستە لەناوببرێت، مەگین ئەم هێزە ئاوەزیە بەتەنها لەڕێگەی بۆچوونێکی دیکەی فەلسەفی نوێوە لەناوبچێت، بەچەشنێك لایەنگرانی ئەم بیروڕا نوێیە زۆر لەوەی پێشووتر بەهێزتربێت.

بەڵام بەکارهێنانی هێزی بەرجەستە بەتەنها و جگە لەهێزی ئاوەزی چەسپیو لەبەرامبەر هێزێك یان بۆچونێکی گیانیدا، ئەوا هیچ کارایییەکی نابێت مەگەر لایەنگرانی ئەو بۆچوونە لەناوببرێت و دوادانەیان قڕبکرێتەوە. ئەمەش ڕەنگە ببێتەهۆی ناشرینکردنی ناوی وڵات لە لیستی وڵاتە بەهێزەکاندا بۆماوەیەك و جاروباریش بۆهەمیشەیی؛ چونکە بەئەنجامدانی ئەم جۆرە کوشتارانە گروپی باشی کۆمەڵگە لاواز پیشان دەدات، هەرگیز هیچ بیرۆکەیەك بەخراپ سەیرناکرێت و زۆرکردن و هەوڵدان بۆ قڕکردنی لایەنگرانی ئەو گروپە یارمەتی ناوبانگ دەرکردنی ئەو گروپە دەدات و لەم کاتەشدا هەنگاوەکان لەبری قازانج زیانی دەبێت.

لێکچوونی نێوان بۆچوون وبیروباوەڕەکان لەوەدایە کە تائەوکاتەی ساوا و گچکەیە لەناوبردنی زۆر ئاسانترە وەك لەوکاتانەی ژمارەیەکی زۆری خەڵك دەبنە لایەنگیری، ئەمەش وەکو منداڵ وەهایە لەکاتی ساواییدا زۆر لاوازە و بەتێپەڕوونی کات بەرگری پەیدا دەکات، بەڵام گەر ئەم بۆچوونە لەناخی هەزاران کەسدا چەسپی ئەوکات هەنگاوەکانی لەناوبردنی هیچ ئەنجامێکی باشی نابێت بەهۆی: مەرجی سەرکەوتن لەبۆ قڕکردنی هەر جۆرە بۆچون وڕایەك بەردەوامی دانە بە دژایەتی کردنی بەبێ ئەوەی بۆساتێکیش دەست لەم هەنگاوە هەڵبگیرێت، بەڵام پاش لەماوەیك لە ئازاردان

و کوشت وبڕ بڕیاری لێخۆشبونیان بۆ دەربکرێت ئەوکات چەندان هێندەی جاری پێش لە هەوڵەکانی قەڵاچۆکردن بەهێزتر دەبنەوە.

کرداری قڕکردن ئەگەر لەسەر بنەما و پلان و مەرامێکی زۆر بەهێز نەبێت ناتوانرێت تاسەر لەسەری بەردەوامبی و لەرزۆك دەبێت, کەواتە هەرجۆرە هێرشێکی قڕکردن تەنها پشت بەستراوبێت بە مادییەت ئەوکات ماوەی بەردەوامیدانی کەم و کورتخایەنە مەگەر لەپشتی ئەم چەکە بەرجەستەیەوە فەلسەفەیەکی نویێ هەبێت, هەرهێز و باوەڕێك شێرئاسا بەکار بهێندرێت بۆپەلاماردانی هەر پارت و بەرەیەك, ئەوا بێگومان سەرکەوتنی مسۆگرە.



ئەدۆلف هتلەر(یەکەم کەسی لای ڕاست), ئەوکاتەی تەنها سەربازێکی ئاسایی خۆبەخش بووە لەساڵی ١٩١٦ دا .

ئەوەش وای کردووە هیچ هەوڵێك بۆ لەناوبردنی مارکس خوازەکان سەرنەگرێت ئەوەیە لەناوەڕاستی ڕێگەکەدا پەژیوانی دەبێتە ڕووپۆشی دژە مارکسیەکان و لەبۆچونەکانیان هەڵدەگەڕێنەوە.

بسمارك زۆر بەتوندی دژی مارکس خوازەکان وەستایەوە, بەلآم ئەنجامەکەی پووچ بوو؟ چونکە بڕوای تەواوی بەکارەکەی خۆی نەبوو, یاخوود بەمانایەکی دی تەنها مەبەستی لاوازکردنیان بووە نەوەك قڕکردنی تەواویان, بۆیە لەئەنجامدا بەناچاری بسمارك پەنای بە بورجوازیەتی دیمۆکراتی گرت, بەلآم ئەوکاتەی سۆسیالیستە توندڕەوەکان هێزیان پەیداکرد ئەوکات بەرەو مارکسیەت ڕوویان وەرچەرخا. ئەمەش وەکو ئەوە وەها بوو بزن بکەنە ئێشکگری کەلەرم بەمەبەستی پاراستنی.



بسمارك, سەرکردەی دەست ئاسنین

بسمارك لەڕێگەی توانا و دەستەلآتی دەوڵەتەوە دژایەتی مارکسیزمی کرد, چون هیچ پارتێکی دیکەی بەهێزی نەدەبینی لەبەرامبەر پارتی سۆسیالیستیدا بووەستێتەوە. لەساڵی ١٩١٤ شدا دۆخەکە نەگۆڕا. مارکسیەکان تاکە خاوەن پارتی خاوەن بۆچوونی تایبەتی بوون لە وڵاتدا, بەلآم سۆسیالیستیە دیمۆکراتیەکان پارتێکی پەرلەمانی بوون, جاربەجار لێیان نزیك دەبوونەوەو هەندێك جاریش لێیان وەدوور دەکەوتنەوە بەپێی دۆخ و بەرژەوەندیەکانیان.

# بەشی پێنجەم

## ڕاگەیاندن لە جەنگدا

ئەوەی زۆر بەلامەوە سەرەنج ڕاکێش و بۆچوون کێشکار بوو, لەو کاتانەی کە بەدواداچوونم بۆ ڕووداوە سیاسیەکان دەکرد, گرنگی بانگەشەکردنم بۆ دەرکەوت وەکو شێوەیەکی ڕووناککردنەوەی بۆچوون وڕێگەکان یان وێلکردن و لەڕێگەلادانی ئەوانەی مەبەستن. تێبینی ئەوەشم کرد پارت و ڕێکخراوەکانی سۆسیالیستی مارکسی بەجوانی توانیویەتی ئەم هەلە قۆزێتەوە کە لای پارتەکانی دیکەی ڕکابەری هەستی پێنەدەکرا, جگە لە پارتی مەسیحی سۆسیالیستی کە لەسەردەمی دکتۆر لۆجر دا ئەویش ئەم هەلەی قۆستبۆوەو بەکاری هێنابوو.

جەنگ گرنگی ڕاگەیاندن و کاریگەریەکانی خستەڕوو, لەم بوارەدا بەباشی چالاکیەکانی دوژمنم تەی دەکرد, زۆر تووڕەبووم بەهۆی لەبیرکردن و بەکارنەهێنانی ئەمچەکە کوشندەیە لەلایەن گەلەکەمانەوە. هەرگیز سەرکردەکانمان نەیان ویستبوو ئەم چەکە لەدژی بەرەی دژدا بەڕاستی و ڕاستەقینە کاربێننەوە , لەکاتێکدا ئەوان لەبەرامبەر ئێمەدا بەژیرانەوە بەکاریان دەهاورد, ئەوان هونەرمەند و نواندنکارێکی زۆر پیشەیی بانگەشەبوون, تەنانەت هەندێك لەسەرکردەکانمان ڕقیان لەفێرکردن و فێربوون لەوانی دیکەوە دەبۆوە, بەلاَم هەندێکی دیکەیان خاوەنی خوازهێزێکی باش و ڕەسەن بوون و لەسادەیدا نەیان دەویست ئەم چەکە بەکاربێنن.

بەڵێ بەمانا ڕاستەکەی ئێمەی ئەڵمان خاوەنی بانگەشەی ڕاست نەبووین. ئەوەشی ناوی بانگەشەکردنیان لێنابوو لەبنچینەوە لەسەر بنەمایەکی ناتەندروست ڕێکخرابوو,

ئەنجامی پێچەوانەی مەبستی دابەدەستەوە جا لەڕووی تەرزەوەبێت یان بابەتیەوە، چـون ئەوانـەی فـەرمانی دروسـتکردنی بانگەشـەیان پێسـپێردرابوو لەبەرژەوەنـدی ئەڵمانەکاندا بە پیشەیانەوە کارەکانیان ئەنجام نەدەدا و نەیان دەزانی ئەم کارەیان ئامرازی جەنگە یان ئامانج؟

هیچ گومان لەوەدا نییە بانگەشە ئامرازە، بەڵام دیسان بۆ پێکانی ئامانجەکەشی پێویستی بە بەکارهێنانی دروست هەیە، بەم پێودانگەش دەبوو بانگەشە ئاراستەی ئامـانجی چـەك هـەڵگرتنی ئـەڵمانیا بکرایـە، ئـەو ئامانجـەی کـە ئابڕوومەندانـەترین ئامانجـە بۆئـەوەی مـرۆڤ لەپێناویـدا بتوانێـت چـەك هـەڵبگرێت: ئامـانجی پاراسـتنی گەلەکەمان و ئازادی پێبەخشینی و دابینکردنی ڕۆزی و نان و ئایندەیەکی گەشیشی بۆدەستەبەردەکات، بێگومان گەل ئەڵمانی لەپێناو ئامانجێکی ئابڕوومەندانەدا جەنگا، دەبوو لەم کاتەدا بانگەشە بۆ بەهێزکردنی گیانی نیشتمان پەروەری بەکاربهێندرایە و ئەمـەش بئاخنرایەتـە نێـو مێشـکی سـەربازەکانی ئەڵمانییـەوە کەلەبەرەکانی جەنگدا لـەپێناو خـاك و نەتەوەکەیانـدا سـەرقاڵی تێکۆشـان بـوون، بـەم کـارەش دەتـوانرا سـەرکەوتن فەراهـەم بکرایـە، ئەودەمـەی لـەپێناو ئازادیـدا گـەلان تێدەکۆشـن جـوانی ومـرۆڤ دۆسـتی بـونێکی نامێنێـت، چـون بـەبێ بەرجەسـتەیی ئـاوەز ئەمانـە هـیچ مانایەکیان نابێت، ئەودەمـەی ئەمە لەناوچوو ئەویش لەناودەچێت؛چونکە سروشت هێشتاکە بەباشی نەیناسیوە، هەرگەل و کۆمەڵێك زیاد لەپێویست گرنگی بە پێزانین و جـوانی و مـرۆڤ دۆسـتی بـدات لـە مەیدانی جـەنگ، لـەکاتی پاراسـتنی قـەوارە و مـاف مانەوە، ئەوکات ئەم گەلە لەناو دەچێت.

مۆڵتکـە ئێـژێت: ((لـە جەنگـدا مـرۆڤ دۆسـت تـرین شـێوازی کوشـت و بـڕ توندوتیژترینیانە؟ چونکە سنوردانان بۆ ئەم گێرمە و کێشەمەیە خێراتر دەکات. ئەو تێکۆشانەشی ئامانجی پاراستنی گەلێکە لەنێویدا هیچ جۆرە ئامـاژەیـەکی جوانی بەرجەسـتە نییـە، چـونکە لـەژیانی مرۆیـدا هـیچ شـتێك نییـە لـە کۆیلـە بـوون دزێـو تربێت)).

بەڵێ، بەڕاستی مۆڵتکە ڕاستی فەرمووە. ئەم گوتەیەشی بەسەر شێوازی بانگەشە و چەسپاندنی لەجەنگدا دەسەپێت. گەل ئەڵمانی چەکی لەبۆ پاراستن و بەرگری کردن لە قەوارە یان کیانەکەی هەڵگرتبوو، ئەو چەشنە بانگەشەیەشی ئامانجی جۆشدانی

گوێڕوتینی نیشتمان پەروەرییە بەر لەگشت چتێك ئاگاداری گەیشتنە بە ئامانجەکەی بەبێ لەپێش چاوگرتنی ئامرازەکانی دەست پێڕاگەیشتنی, لەم کاتەشدا هەر چەشنە چەك و کەرەستەیەك پێچەوانەی ڕێوشوێنە مرۆڤایەتیەکان بێت, ئەوەندە بەکەڵك تر دەبێت لەکاتی بەکارهێنانی لەبۆ پاراستنی ئازادیەکان.

بەڵام لێرەدا پێویستە بزانین : ئاخۆ بانگەشەی ڕاگەیاندنی ووروژێنەر ئاراستەی خوێندەواران یان هەموو گەل دەکرێت ؟

بانگەواز نابێت تایبەت بکرێت بە ڕاکێشانی چین و بەرەیەکی دیاریکراو لەکاتی جەنگدا, بەڵکو پێویستە بۆهەموو گەل بێت, بەڵام چینی خوێندەواران ڕاڤەی زانستی ئەم بانگەشەیەیان ئاراستە دەکرێت؟ چونکە بانگەشە خۆی دەقی زانستی تیادا نییە, بەزۆری هەڵگری دروشم و وتەی ڕاگەیاندنکاریی خرۆشێنەرە. هونەری بانگەشەبۆکردن وەستاوەتەسەر توانای وێنەکردنی وێنەکێش لەبۆ سەرەنج ڕاکێشانی جەماوەر. گریمان بانگەشەی پێشانگایەکی هونەری دەکەین, لەسەرەتاوە پێویستە بانگەشەکە تایبەت بێت بەناساندنی هونەر لەو پێشانگایەدا و دواتریش بیرۆکەی پشت کردنەوەی پێشانگاکە, بەڵام بەتەنها پشت بەست بەهونەر ناتوانین پێشانگاکە سەربخەین بەڵکو پێویستمان بەپێش سەردانی کردنی جێگەی پێشانگاکەیە لەگەڵ تێڕوانینمان لەهەموو تابلۆکان بەچاوی ڕەخنەگرانەوە.

بانگەشە هۆکارێك نییە بۆ ڕۆشنکردنەوەی بیری تاکە کەسێك لەسەر بنەمایەکی زانستی, بەڵکو خرۆشاندنی زۆرینەی دانیشتوانی وڵاتە لەبۆ بەهاناوەچوونی ڕووداو و بەسەرهاتەمەترسیدارەکان, بۆیە پێویستە لەسەر بانگەشە کاران پێش لەڕووکردن و ئاراستەکردنی مەبەستەکانیان لە ئاوەز ڕوو لە دڵ بکەن , چونکە بیرکردنەوە بەئاوەز یارمەتی گەشەو سەرکەوتنی بانگەشەکە نادات, بەڵام دڵ پێچەوانەی ئەمە بەدەستەوە دەدات.

ئەو بانگەشەیەی ئاراستەی ووروژاندنی هەستی کۆڕای گەل دەکرێت پێش لەگەیشتنی سەرکەوتنی مسۆگرکراوە, بەو مەرجەی ئەم بانگەشە پشت بەستوو نەبێت بە هەڵخەڵەتاندن و درۆ و شاردنەوەو سەروژێرکردنی ڕاستیەکان.

ڕۆژنامەکانی ئەڵمانیا و نەمسا زۆر خۆیان ماندوو کردبوو بەوەی دوژمن بەشێوەی بچووك و لاواز پیشان بدەن, بەڵام جێدەستی ئەم بانگەشانەیان لەجەنگی

ڕووبەڕووبوونـەوەی دوژمنـدا بـابردی و هـیچ ئـەنجامێکی نـەبوو, چـون لـەم کاتـەدا زۆربـەی خوێنـەرە سـەربازەکانی ئـەم ڕۆژنامـە لـەڕێ لادەرانـە بۆیـان ڕوون بویـەوە کـە سەربازەکانی دژومن یان بەرەی بەرامبەر ئازایانە دەجەنگن و بەنەترسی و بزێوییەوە بـەپیری مەرگـەوە دەچـن, ئەمـەش وای کـرد هـەموان متمانـەی خۆیـان بـەم چەشـنە بانگەشانە لەدەسـت بدەن, بەم کارەش لـەبری خۆشەویستی ڕقیان لـەناخی سـەربازە نەمسای و ئەڵمانیەکاندا چاند, لەبری هێز ترسنۆکیان پێبەخشین.

بـەلأم لەبەرامبـەری ئەمـەدا بانگەشـەی ئەمـەریکی و ئینگلیزەکـان زۆر ڕاسـتەقینە و ڕوون و شـارەزایانە بـوون, بـەوەی وەهایـان لەســەرباز و خـەڵکانیان دەگەیانـد: ئەڵمانەکان هاوشێوەی تیرەکانی هونی مەغۆلی دڕندە و مەترسیدارن, بەمەش تادەمات ڕقیان لەناخی سەربازەکانی خۆیاندا لەبەرامبەر ئێمەدا دەچەسپاند و بەم کارەش هێز و گوڕ و تینـی زیـادتر و سـەرکەوتوانانەیان پێدەبەخشـین, ئەودەمـەی سـەربازەکانی دوژمـن ئازایـەتی و جـۆری چەکی ئەڵمانـەکانیان زانـی بۆیـان دیارکـەوت هـیچ کـات سەردارانیان هەڵیان نەخەڵەتاندوون, بەڵکو پێشتر ئاگاداریـان کردونەتـەوە و بەمـەش ئەو بڕوایەیان لاپەیدابوو کەبەڕاستی ئەڵمانەکان لەتیرەکانی هون دڕەندە و کێوی ترن, بـەم کـارەش لەهەفتـەی یەکـەمی جەنگـەوە سـەربازانی ئینگلیـز زانیـان سـەرانی ولأتەکـەیان هـەڵیان نەخەڵەتانـدوون و ڕاسـتیان پێڕاگەیانـدوون و هیچـیان لـێ نەشاردونەتەوە, جا ڕاستیەکان چەندە تاڵیش بن بەلأم پێشتر لێی ئاگادار کراونەتەوە. ئەفسوس ئەمەپێچەوانەی بۆچوونی سەربازانی ئەڵمانی و نەمسایی بوو لەبەرامبەر سـەردارانی ولأتەکەیاندا, تەنانـەت هەنـدێك جار سەربازەکان بڕوایـان بـەهیچ چەشنە ڕاگەیانـدن و بانگەشـەیەکی ولأتەکەشیان نـەدەما و هـەموویان بـە درۆ و ناتەندروست لەقەڵەم دەدا. هۆکاری شکستی بانگەشـەکانی ئێمـەی ئـەڵمانی دەگەڕایـەوە بـۆ گرنگـی نەدان بە دەروونناسی, بەکەم پیشاندانی ڕۆڵی ئەڵمانەکان لەزۆر بواری جیاوازدا, بەبێ ئەنجامدانی هیچ چەشنە بەراوردکارییەك لەنێوان خۆی و ولأتانی دژیدا. توخـوا ئـەوە گێلێتی و ساوێلکەیی نییە کارگەیـەکی دروستکردنی ساون لـەپاڵ بانگەشـەکردن بـۆ ساونەکەی خۆیدا باس لەباشی ساونی کارگەیەکی دیکەش بکات ؟!

بەڕاستی بانگەشـەکارانی ئێمـە ئـەوەیان لەیادچـووبوو کەبەمەسـت لـەم بانگەشـە بۆکردنە دابەشکردنی دادپەروەری نییە لەنێوان گەلان و لایەنەکانـدا, بـەڵکو تـەنها کار

بۆ بەهێزکردنی بەرەو گەلێکی تایبەتی دەکات نەك بۆ هەمووان بێت. بانگەشەکارانی ئێمە ئەوەشیان لەیادچووبوو کە زۆر درۆهەڵبەستن یان خستنەڕووی تەواوی ڕاستیەکان زۆرجار لەبەرژەوەندی دوژمندا دەبێت، بەڵکو پێویست بوو حاڵەتەکانی کردنی قسەی ڕاست و درۆکردنیش دەست نیشان بکرانایە و بەسەلیقەدارییەوە بەکاربهێندرانایە، بەڵکو دەبوو بانگەشەکاران ئەو ڕاستیانە بۆ گەل و پێشمەرگەکان بخەنەڕوو کەخزمەت بە بەرژەوەندیەکانی نیشتمانمانی دەکرد نەوەك خزمەت بەدوژمن بکات.

هەروەها ئەوکاتەی بانگەشە کارانمان بەمەبەستی بەرگری کردن لەوڵات وەهایان پیشان دەدا کە نابێت هەلایسانی جەنگ بەتەنها بخرێتە ئەستۆی ئەڵمانیا؟ چونکە ئەوە تەنها پەیوەست بووە بە سەرانی وڵاتەوە و بڕیار بەدەستانەوەو ئەمانەش کەمینەن نەوەك زۆرینە، زۆرینەی وڵات پێکدێن لە خەڵکی لەرزۆك و کەم توانا لەبیرکردنەوە، ئەم چەشنە بۆچون دەربڕینانە هانی گەلی دەدا بۆ ساردبوونەوە لەوەی ئەمان لەلایەن بژاردەیەکی کەمەوە بەئاراستەی کوشتنیان هەنگاویان پێدەنرێت، لەم حاڵەتەشدا سەرباز پێش لە بینینی تاوانی دوژمن تاوانی سەرانی وڵاتەکەی دەبینێت، لەبەرامبەریشدا کارایی بانگەشە و لێهاتوویی بانگەشەکارانی دووژمن سەربازان و گەلی ئەڵمانی دەخستەگومانەوە لەبەرامبەر وڵات و توانا و مەبەستی بەشدارێتی کردنی وڵاتەکەیان لەم جەنگە هەلایساوەدا. ئینگلیزەکان باش هەستیان بەوەکردبوو کە زۆرینەی گەل لە کاتی کێشەکاندا دەرونیان وەکو ئافرەتی لێدێت، بەجۆرێك بۆچوون و ڕەفتارەکانیان دەرهاویشتەی کاریگەریەکانیانە نەوەك بیرکردنەوەی ڕووت. ئەوەشی کار لە هەست و سۆزی زۆرینە دەکات ئاڵۆز نییە، جۆراوجۆریش نییە، هەستێکی نەرێنی یان ئەرێنی پڕ لە خۆشەویستی یان ڕقە، بەدرۆبێت یان ڕاست، بەهێزبێت یان لاوازچێتی، لەم کاتەدا هیچ شتێك بوونی نییە بەناوی نیوچە سۆز یان سۆزی نیمچەیی.

بانگەشەکارانمان کەوتنە هەڵەیەکی گەورەوە ئەوکاتەی بانگەشەیان بۆ ئەستۆپاکی ئەڵمانیا دەکرد لەوەی جیهانی نەبردۆتە قاڵبی جەنگەوە، بەڵکو بەرەی دوژمنیش ئامادەیە لەم کارەدا بەشداربووە! دوژمن زۆر باش دەیزانی چۆن خەڵك و لایەنگرانی بەرەی دوژمنیش بۆلای خۆی ڕاکێش بکات و هەمیشە و بەبەردەوامی دەیگوتەوە کە

ئەڵمانەکان بەرپرسی هەڵایسانی ئەم جەنگەن، بەڕاستی ئەم هەڵبەستراوە هیچ بەرهەمێکی نەدەبوو گەر دشمن هەموو ڕۆژێك دووبارەی نەکردایەتەوە؛ چونکە سەرکەوتنی بانگەشە بۆکردن پەیوەستە بە خۆچڕکردنەوە لە خستنەڕوو و باسکردنی یەك بابەت بۆماوەیەکی درێژ.

دوژمن هەستابوو بە پێدانی ئەرکی بانگەشەکردن بەکەس گەلێك بەڕاستی زانابوون لەکێشکردنی جەماوەردا، بەڵام ئێمە ئەم ئەرکەمان خستبووە ئەستۆی کەسانی سەر دوانگە و قەڵەم بەدەستانی هیچ نەزانان، ئەمانە بڕوایان بەبەکارهێنانی ڕەوان بێژی و فرەبۆچوونی هەبوو، لەبری ئەوەی هەر ڕۆژە و باسیان لەبابەتێك بکردایە باشتر وابوو خۆیان بۆ تاکە بابەت و گەیاندنی مەبەستێك چڕبکردایەتەوە و خەڵکیان بەم هەڵوێستەی خۆیان قایل بکردایە، زۆرێك لە گەل مێکشیان داخراوە و لەڕەوان بێژی تێناگەن بەڵکو پێویستیان بەوە هەیە بەزمانی خۆیان قسەیان لەگەڵدا بکرێت و بۆئەمەش دەبێت بەردەوام هەمان جۆرە ئاوەزیان بۆ بژەنیتەوە تاوەکو بڕوات پێدێنن.

لەماوەی چوار ساڵدا دیتمان چلۆن دوژمن خوویان بەباسکردنی بابەتێکی دیاری کراو و بنچینەییەوە گرتووە، لەسەرەتاوە بڕوامان وابوو ئەم قسانەی دوژمن جگە لە زنجیرەیەك لەدرۆی ئابڕووبەرانە هیچی دیکە نییە، بەڵام لەکۆتادا توانیان بڕوامان پێبهێنن. جەنگی شۆرش لەئەڵمانیا هەڵایسا و دروشمەکانی لە دوژمنەوە وەرگرتبوو.

ئینگلیزەکان بانگەشەیان بە چەکێکی گەورە و بنچینەیی دەزانی، پیاوانی تەواوکامڵیان بۆی تەرخان کردبوو، بڕێکی زۆر لەپارە و داراییشیان خستبووە خزمەتیانەوە، بێگومان ئەمەش هانی سەرکەوتنی دان و توانیان جەنگەکە بەبەرژەوەندی خۆیان کۆتایی پێ بهێنن.

بەڵام ئێمە بانگەشەمان وەکو چەکی دووەم یان یەدەگ دەبینی، بەکەسانی نەشیاومان ڕاسپاردبوو، بەو کەسانەی دوورەپەرێزبوون لەشێوازی بیرکردنەوەکانی جەماوەر، ئەنجامی کاری ئێمە لەم بوارەدا هیچ بوو....هیچ...

# بەشی شەشەم

## شۆڕش

لەساڵی ساڵی ۱۹۱٥ دا دوژمن بانگەشەی دەست پێکرد و ساڵی داهاتوو بەشێوەیەکی دیار کاریگەریەکانی دیارکەوت, لەزستانی ساڵی ۱۹۱۸دا شەپۆلێك لە درۆ و هەڵبەستراو ئاراستەی ئەڵمانیا و بەرەی ئەڵمانی کرا, لەم کاتەدا بەڕوونی کاریگەری ئەم بانگەشانە لەسەر چۆنێتی بینینی ڕووداوەکان دیارکەوتن, لەشکر و هێزی سوپای ئەڵمانیش شێوازی بیرکردنەوەکانی وەکو دوژمنی لێهات. بەلأم لەلایەن دەولەتی ئەڵمانیاوە هیچ شێوە کاردانەوەیەکی پێشیاوی باسکردن نەهاتەئاراوە و دیارنەکەوت, بەڵێ سوپا و سەرکردە مەزنەکانی ئامادە و سوربوو لەسەر بەربەرەنکانێی دوژمن, بەلأم پێویستی بەئامرازێکی یارمەتی دەر و سەرباز و گەل هاندەر هەبوو,بەڵێ هەڵەیەکی دیکە ئەوەبوو خودی بانگەشەشیان کردبووە ئەرکێکی بەسەر سوپادا سەپێنرابوو, ئەمەش وای کرد ئاراستەی دەروونی سەربازەکان تاڕادەیەك گۆڕانی بەسەردابێت, بۆخۆلادان لەم کارە دەبوو بانگەشەکە لەناواخنی ولأتەوە هەڵقولأبێت.

بەلأم ئایا لەم کاتەدا لەنێو خودی ولأتی ئەڵمانیادا چی دەگوزەرا؟

لەهاوینی ساڵی ۱۹۱۸ و پاش لەچۆڵکردنی کەناری باشوری ڕووباری مارن ڕۆژنامەکان ئەڵمانیا بەتەواوەتی خۆیان لەهاندان بۆ جەنگ بەدووردەگرت و تەنانەت ڕۆڵیان لە ڕۆڵی دوژمنەوە بۆ دامرکانەوەی سوپای ئەڵمانیا نزیك بۆوە, لەم کاتەشدا

بەتوڕەیی و ڕق و کینەوە پرسیم: پاشای بەرلین چاوەنواڕی چی دەکات و بۆچی خاوەنی ئەم شەپۆلی هێزداڕوتێنەرەوانە لەناونابات ؟ گەر وابڕوات پاڵەوانەکانمان هەموو لەدەست دەدەین.

ئەو دەمەی بەیەک لێدانی کتوپڕ توانیمان فەڕەنسا لەساڵی ١٩١٤ بگرین , چی لەوێدا ڕوویدا ؟ ئەو ڕۆژەی بەرەی ئیتالیا داڕووخا هەڵوێستی ئیتالیا چی بوو؟ ئەی ئەو ڕۆژەی سوپای ئەڵمانیا ویستی هەموو فەڕەنسا داگیربکات و سوپای تۆپ هاوێژەکەی ئەڵمان گەیشتە کەنار و دەروازەکانی شاری پاریس لەساڵی ١٩١٨ دا , فەڕەنسا چی کرد ؟

بەڵێ شەپۆلێکی بەهێزی بانگەشەی وروژێنەر بۆ ڕزگارکردنی فەڕەنسا دەستی پێکرد, بەجۆرێك وای هاندەدان کە سوپا دۆڕاوەکانی جارێکی یەکیان گرتەوە و خۆیان ڕێکخستەوەو گەلیش لەدواوە پشتگیری لێکردن لەدژی ئێمەی ئەڵمان, بەجۆرێك لەخەڵکی فەڕەنسایان دەگەیاند: سوپای ئەڵمانیا تەنها بۆماوەیەکی کەم شەڕیان پێدەکرێ و هەوڵێکی بێ ئاکامیان لەم بوارەدا داوە, گەر خۆمان یەکبخەینەوە ئەمجار بەیەك لێدانی جەرگبڕ لەخاکەکەمان فەڕنسا وەدەریان دەنێین.

زۆرم غەمم بۆئەوە دەخوارد کە من یەکێك نەبووم لەوانەی ئەرکی بانگەشەکردنیان بۆ هاندانی سوپای ئەڵمانی پێ سپێردرابوو, بەڕاستی ئەوانەی لەو شوێنە دانرابوون تەنها بێتوانا نەبوون بەڵکو مەستی کاڵفامی بوون و ئامانجی باشیشیان نەبوو. گەر من یەکێك بوومایە لەو بانگەشە بۆکارانە بێگومان ڕەوتی بانگەشە بۆ سوپای ئەڵمانی ئەو هەڵەیەی نەدەگرتەبەر, چارەنووسی غەیانەتکار لە شوێنێکی فرێدام کە هەر ڕەش پێستێك دەیتوانی بە فیشەکێك لەناوم بەرێت, هەرچەندە ئەگەر لەم کارە سەختتریشم پێ بسپێردرایە بەبێ دوودڵی بۆ نیشتمانەکەم ئەنجام دەدا. بەڵام دەبێت من چیم بکردایە ئەوکاتەی تەنها سەربازێکی ئاسایی بووم لەنێو ٨ ملیۆن پیاودا !؟

***

لەهاوینی ١٩١٥دا یەکەمین بڵاوکراوەی دوژمن کەوتە نێو دەستمانەوە, هەمووی لەسەر یەک جۆر ئاواز دەیخوێند و یەك چەشنە مۆزیکی لێدەدایەوە: قات و قڕی لەئەڵمانیا ڕۆژ بەدووی ڕۆژ ڕوو لەزیاد بوونە, جەنگ درێژەدەکێشێت و ئەڵمانیاش هەلی سەرکەفتنی نییە و نەماوە, هەربۆیەش گەلی ئەڵمانی خوازیاری ئاشتیە, بەڵام

قەیسەر و سەرکردە سەربازیەکانیان سورن لەسەر بەردەمی دان بەجەنگ, خۆنەگەر جیهان چەکی لەبەرامبەر ئەڵمانیادا هەڵگرتووە ئەوا مانای وانییە دژی گەلی ئەڵمانی چەکیان هەڵگرتبێت, تاکە ئامانجی هەڵگرتنی چەك لەبەرامبەر ئەڵمانیادا لەناوبردنی قەیسەر غۆلیۆمە, ئەم ململانێ و کێشمەکێشەش بەردەوام دەبێت تائەوکاتەی قەیسەر لەسەر کورسی دەستەڵات لادەبرێت, ئەودەمەی جەنگ کۆتایی هات و جیهان هێور بوویەوە ئەو دەم گەلانی ئاشتی و ئازادی و دیموکراتی خواز باوەشی برایەتی بۆگەلی ئەڵمانیا دەکەنەوە و هاوکاری تەواوی دەکەن لەرێگەی کۆمەڵەی ئاشتی هەمیشەیی جیهانیەوە, ئەم ئاشتیەش کۆڵەکەکانی تەنها لەسەر پاشماوەی گیانی سەربازانی پروسی دەتوانرێت توندبکرێت.

لەسەرەتاوە سەربازەکانمان بەشێوەیەکی گشتی گەمەی بەم هەوڵەی هاوپەیمانان دەهات و پاش لەڕوانین لە ناوەڕۆکی بڵاوکراوە بەسەردا باریوەکان ئەوکات ڕەوانەی بەرپرسانی باڵای جەنگ دەکرا کەلەبەشی دواوەی سوپاکەوەبوون, زۆری پێنەدەچوو سەربازەکان ناوەڕۆکی ئەم بڵاوکراوەیەیان لەبیردەچوویەوە, بەڵام دوژمن هەرگیز بێ هیوا نەبوو لەم کارەی خۆیدا, جارێکی دیکە بەسەرماندا دەیبارانەوە, ئەوجار ویستیان دووبەرەکی بخەنە نێو ڕیزی سوپا و بەرەی ئەڵمانیەوە بەوەی لەنێو سوپای باڤاریادا ڕەخنەی توندیان لە سوپای پروسی دەگرت, بەوەی دەیان گووت: پروسیا هۆکاری هەڵایسانی جەنگە و هاوپەیمانان سوپای باڤاری بەدوژمنی خۆیان نازانن و بەڵام ناشتوانن بەهیچ شێوەیەك لەم کاتەدا ئالیکارییان بکەن, چون باڤاریا لەم کاتەدا لەخزمەتی پروسیادایە, لەم کاتەشدا تەنها دەتوانن بەڕووی نێو ئاگرەکە دەربێنن و پێشکەشی ئەوانی بکەن. بەڕاستی شایەنی دان پیانانە بەوەی کە ئەم بانگەشە بۆگەن و ترسناکانە کاریگەری باڵایان هەبوو, لەڕیزی سوپای ئەڵمانیدا ڕق لەبەرامبەر پروسیەکان بەرجەستەبوو, لەم کاتەشدا دەستەڵاتدارە گەورەکان هیچ جۆرە هەنگاوێکی ڕاستەقینەیان نەنا لەم بوارەدا, تائەوکاتەی دۆخەکە لەدەست دەرچوو, لەم کاتەشدا گەلی ئەڵمانی تەواوی باجی ئەم بێخەمیەی سەرکردەکانی دا.

ئەو نامانەی لەلایەن دایك و ژن و کەسەکانەوە بۆ سەربازەکانی بەرەی جەنگ دەنێردرا هۆکاری لاوازبوونی هێرشی ئەڵمانەکان بوو, چون خۆیان لەکاتی جەنگدا لەنەهامەتیدا دەژیان و ئەوکاتەی دەنگ و باس و ناڵەی دایك و خوشك و ژنان و کەسە

نزیکـەکانیان نەزانـی ئەوەنـدی تـر لاواز دەبـوون، دوژمنـیش ئەوکاتـەی لەڕێگـەی دیلکردنی هەندێك سەربازەکانمانەوە ئەم نامانەی دەست کەوت و خوێندنیانەوە، زۆر بەجوانی توانیـان ئـەم هەلەبقوزێتـەوە و ئەوەنـدی تـر لـەم ڕێگەیـەوە باوەڕیـان بـە سەرکەوتنی خۆیان مسۆگرتر کرد.

بەم جـۆرە لـەکۆتایی سـاڵی ١٩١٥ دا ناقـابیلی و کـەم ورەیـی لـەنێو ڕیـزی سوپادا دیارکەوت و لەزستانی ١٩١٦ دا کێشەکە گۆڕدرا بۆ قەیران، بەڵام هەمدیس گروتینی سەربازەکانمان هێشتاکە لەئاستی جەنگان و بەرگریکردندا مابوو، خوتە و بۆڵەکانیان تـەنها لـەکاتی حەسـانەوە یـان نـەبوونی تەقـەدا لـەیادبوو، بـەڵام ئەوکاتانـەی فەرماندەکەیان فەرمانی هێرشبردنی بۆ دەردەکردن هیچیان لەبیرنەدەما و بەرەوپیری مردن هەنگاویان دەنا، هەرپێشمەگەیەك وەها خۆی بەو شوێنەوە دەبەستەوە کەبۆی دیاریکراوە، وەکو ئەوە وابوو چارەنووسی گەلی ئەڵمان تەنها لەسەر بەرگری کردن لـەم شوێنەی ئەو وەستابێت وەهابوو.

هەستم بەبوونی جیاکاری ئەکرد لەنێوان بەرەی پێشـەوەی جـەنگ و بـەرەی دواوە ، بەتایبەت لەوکاتەی بریندار‌بووم.

لەکۆتایی ئەیلولی ١٩١٦دا لەشکرەکەم بانگێشت کرا بەمەبەستی پەیوەندی کردن بە لەشکرانی دیکەی پشتێنەی ڕووباری (سوم)ەوە، بـەجۆرێك لـەم شـوێنەدا بـۆ یەکـەمین جـار کەوتینـە نێـو کوشت و بڕێکـی مەترسـیدارەوە لەگـەڵ دوشمـن، جـەنگێکی سـێ گۆشەیی کە باشترین ڕۆڵ نوێنی تاقیکردنەوەی تفاق وچەك و کـەل و پـەلی نـوێ بـوو، وای لێکـردین ئـەم جەنگـە بـە ژەهـانم ببیـنم. سـەرباری هەوڵـە یـەك بـەدوای یەکـەکانی دوژمـن، بـەڵام بەرەکـەمان تـوانی ڕۆژان و هـەفتان بەخۆڕاگریـەوە تێپـەڕێنێت، ئەگـەر شتێك لەدەست بدرایە شتێکی لەبەرامبەردا وەردەگیرایەوە.

لە حەوتی تشرینی یەکەمدا فیشەکێك بەرم کەوت، گواسترامەوە بۆ بـەرەی دواوە و پاشتریش بەشەمەندۆفێری تەندروستی بەرەو ئەڵمانیا گوازرامەوە، ئەمەش بەدووساڵ پاش لەجێهێشتنی نیشتمانەکەم بوو، بەڕاستی لەو دۆخـەی منـی تێدابوو وام هەست ئەکرد ئـەو ماوەیـە زۆر زیـادتر بـوو وەك لـەوەی ڕۆژ ژمێـر دەیـژمێرێت، تەنانـەت وام لێهـاتبوو نـەم دەزانـی شـێوەی نیشـتمانەکەم چـلۆنە، ئەوکاتـەی شـەمەندەفەرەکە لەزەویەکانی ئەڵمانیا نزیك دەبوویـەوە بڕوام نـەدەکرد خـەڵکم بـەجلکی ناسـەربازیەوە

ﺌﻪدیت. ئەودەمەی لە شەمەندەفەرەکەدا گوێ بیستی وشەیەکی جوان دەربڕی ئەڵمانی بووم لەرزێك بەنێو لەشمدا هات و بڕوام نەدەکرد ، ئەمەش لەوکاتە بوو کە نەخۆشەوانێکی ئافرەت لەگەڵ هاوڕێ بریندارەکەمدا بەئەڵمانیەکی جوان دەدوا، بەڕاستی دەمێك بوو گوێم لەدەنگی ناسکی وەها نەبوو.

لەکۆتادا شەمەندەفەرەکە گەیشتە نێو خاکی ئەڵمانیا، دەستی کرد بەبڕینی شار و گوندەکان.

ئەکاتەی لەساڵی ١٩١٤ دا بەناوچە سنوریەکانی ئەڵمانیادا تێپەڕین خرۆش پڕ بەسنگمان بوو، دروشم و سرودەکانمان دەورووبەرمانی تەنیبوو‌ه، بەڵام ئێستا ئەو شەمەندەفەرەی دەمان گوێزێتەوە بێدەنگی دایگرتووە و هیچ نوسکەیەکی لێوەدەرنایات، هەندێك خۆشحاڵ بوو بەوەی لەبەرەکانی جەنگ بەسەلامەتی گەڕاوەتەوە، بەڵام هەندێکی دیکەشمان زۆر نیگەران بوو بەوەی نەیتوانی بوو ئەو ئەرکە جێبەجێ بکات کە هەموان لە وڵاتدا چاوەنواڕیان لێدەکرد.

لەکەناری شاری بەرلیندا براینە نەخۆشخانەی بیلیتیز، بەم شێوەیە لە زەلکاوەکانی ڕووباری (سوم)ەوە گواسترامەوە بۆ سەر ئەم جێگە نەرم و باڵەخانە زەبەلاح و خۆشە. پێش لە گەیشتنم بەم جهانە ئازار و نەهامەتی زۆرم چەشت،زۆر جەنگابووم لەکەنەلآن و دەشت، شەونخونی زۆر و نەنساراوی خەو ببووم، ئەی ئێستا بۆ لەسەر ئەم جێگە نەرم و خۆشەم ؟

بەڵام بەداخەوە ئەم شوێنە لەڕوانگەیەکی دیکەوە بۆمن هەمدیس نوێ و ناخۆش بوو.

ئەو بەها و ورانەی سەرباز لە بەرەدا هەیەتی لە نەخۆشخانەدا بەرجەستەنابێ، لێرەدا گوێبیستی هەندێك گوتە و قسەدەبووم کە پێشتر لەبەرەکانی جەنگدا نەم بیستبوو: گوێم لەبریندارێك بوو بە خۆ فشکردنەوەو شانازییەوە باسی لەترسنۆکی و خوێڕێتی خۆی دەکرد لەوەی چۆن هەڵهاتووە و نەیوێراوە تەقەبکات! یەکێکی دیکەی لەو لاوە دەیگوت خۆی ڕۆیشتۆتە نێو تەلەدرکینەی سەربازییەوە بۆئەوەی بۆنەخۆشخانەی بنێرن، بەم کارەی خۆی دەگووت کاری پاڵەوانان، هەندێك لەهاوڕێکانی ئەوێم بەم قسانە تورە دەبوون هەندێکی دیکەش سەریان بۆ دەلەقاندن وەکو نیشانەی دەست خۆشی لێکردن. بەڵام بەداخەوە بەشی کارگێڕی بەرپرسی ئەو

نەخۆشخانەیە ئەم فرمویژە ترسنۆکانەی هێشتەوە، ئەم باش گرنگی نەدانە بەسوپا مانای نەنگی و گەحۆلی سەرکردەکان بوو، ئەوەندەی توانیم جارێکی دیکە بەرێدا بڕۆم داوام لێکردن مۆڵەتم بدەن بۆئەوەی سەردانی بەرلین بکەم، ئەوانیش پێیان دام.
پایتەخت شەڵەقابوو، قات و قڕی و برسێتی بڵاوببوەوە، خەڵکەکەی زۆر ڕق و کینە لەدڵ ببوونو بەڵام لەبەرامبەر کێ؟!

شێوازی قسەکردن لەنێو یانەکاندا هیچ جۆرە جیاوازییەکی ئەوتۆی نەبوو لەگەڵ شێواوی قسەکردنی کەسە ترسنۆکەکانی نێو نەخۆشخانەدا، ڕەنگە ئەمەش بەهۆی ئەوەوە بوبێت کە ترسنۆکە هەڵهاتووەکانی جەنگ بەزۆری ڕوو لەیانەکان دەکەن و لەوێدا ژەهری خۆیان بەسەر ئامادە بواندا هەڵدەڕێژن.

میونیخ دۆخی لە بەرلین خراپتربوو.

پاش لەوەی بەتەواوەتی چاك بوومەوە پەیوەندیم کرد بە لەشکری فریاکەوتنی سەربازی لە شاری ئەلفان. ئەو دەمەی بە گیانە شکست خواردوویەکەیەوە لە میونیخم ڕوانی زۆرم ڕق لێی هەستا. ورەی ئەو دەستە سەربازیەی پەیوەندیم پێوەکرد بۆ دوژمن دڵخۆشکاربوو، بێگومان بەرپرسانی باڵا هیچ لەسەربازەکان باشتر نەبوون؛ چونکە دەستەیەك لەسەربازانی پێشتر جەنگ دیتوو درابووە دەستی کۆمەڵێك لەئەفسەری پێشتر جەنگ نەدیتووەوە بۆئەوەی مەشق و ڕاهێنانیان پێبکرێت، بۆیە نەیان دەتوانی لەو سەربازانەیان بگەن کە بەخوێنی خۆیان بەرگریان لەخاك و نیشتمانەکەیان کردبوو.

بەبێ لەپێش چاوگرتنی ئەم دۆخەش هیچ کات باری دەروونی سەربازان دڵخۆشکار نەبوو، بینیم زۆربەی کارە سڤیلیەکان دراوەتە دەستی جووەکانەوە، هەموو جێگری بەرپرسان لەوانن، هەموو جۆرە جێگرەوەیەك، بەڕاستی ئەم دۆخە منی هەژاند و نەم توانی بەراورد نەکەم لەنێوان نوێنەرانی هەڵبژاردەی گەل لەنێو خاك و لەبەرەکانی جەنگدا.

لەوەش نەهامەتی تر خراپی دۆخی ئابوری وڵات بوو، لە بواری ئابوریەتدا جولەکەکان پایە و کۆڵەکەن، لەم کاتەدا وەکو جاڵجاڵۆکە دەستیان بەمژینی خوێنی گەلی ئەڵمانی کردبوو، بەڵام بەبێ پەلەکردن، جووەکان لەیەکخستنەوەی سەرچاوەکانی بەرهەمی جەنگەوە توانیان خۆیان بۆ وەشاندنی گورزێکی جەرگ بڕ لە ئابوری

نەتەوەیی ئازاد ئامادەبکەن، بەهاتنی زستانی ١٩١٦-١٩١٧ زۆربەی بەرهەمەکانی وڵات کەوتوە ژێر دەستەڵاتی سەرکردە دەوڵەمەندە پلان دارێژەرە جولەکەکانەوە.

لەم کاتەشدا گەلی ئەڵمان سەرقاڵی کۆکردنەوەی ڕق و کینەبوو بەڵام لەبەرامبەر کێ دا؟

لەوکاتەی جووەکان سەرقاڵی گیرفان برینی نەتەوەبوون و هەوڵی دەست بەسەردا گرتنیان دەدا، بانگەشەکان لەدژی پروسیەکان بوو، بەڵام ئەوانەی لەدواوەی بەرەکانی جەنگەوە بوون ئەوەندە هۆشیار نەبوون کە بزانن داڕووخانی پروسیا مانای لەناوچوونی باڤاریایە و لەناوچوونی باڤاریەش مانای توانەوەی ڕایخە، واتە هەردووکیان پێکەوە گرێدراون، بەڵام من دەمزانی ئەم گەمە گڵاوە پیلانگێڕی جووی بەدواوەیە، بەم کارە باڤاری و پروسیەکان دژی یەکتر ڕادەوەستێنن و خۆشیان سەرقاڵی ڕووتکردنەوەی دانیشتوان بوون لەهەرجۆرە دراوو سەرچاوەیەکی بژێوی، لەم کاتەی کە لەباڤاریاوە جمێن بە پروسیا دەدرا جووەکان سەرقاڵی کلۆرکردنی خوودی دەستەڵاتی هەردوو دەوڵەت بوون بەوەی پلانی بەرپاکردنی شۆڕشیان داڕشتبوو.

بەڕاستی بەم دۆخە قایل نەبووم، بۆیە داوام کرد بمگێڕنەوە بۆ بەرەکانی جەنگ، ئەو ڕۆژەی داواکاریەکەم پەسەندکرا زۆر خۆشحاڵ بووم و میونیخم بەجێ هێشت، لە ١ ی ڕەشەمێی ١٩١٧ دا سەرلەنوێ پەیوەندیم بە لەشکرەکەمەوە کردەوە، لەتێکۆشان بەردەوام بوومەوە.

لەکۆتایی ساڵی ١٩١٧ دا سوپای ئەڵمانی توانی بەسەر نەهامەتیەکانی بێ ئومێدبووندا سەربکەوێت، دارمانی توانای بەرگری کردنی ڕووسیا ئومێدی بەگەلی ئەڵمانی بەخشی، کشانەوەی ڕووسیا لەجەنگ مانای سەرکەوتنی جەنگ بوو لەبەرژەوەندی ئەڵمانیا، لەم کاتەدا لەشکر و دەستە و سوپاکانی باڤاریا گەڕانەوە دۆخی جارانی سەرەتاکانی جەنگ و بەدڵ گەرمیەوە سەرقاڵی چڕینی گۆرانی وسرودەکان بوون، نەوەك کێشانی بەنگ، سەرلەنوێ ژیانەوەی ورە لەناخی سەربازانماندا مانای چارەباشی پێدەبەخشین، شکستی ئیتالیاش لەساڵی ١٩١٧ دا ئومێدی تر خۆشی پێبەخشین، دەروونی سەربازەکان پڕبوو لە باوەڕ بەسەرکەوتن، هەموان چاوەنواڕی هاتنی بەهاری ١٩١٨ و کۆتایی هاتنی جەنگیان دەکرد

بەسەرکەوتوویی ئەڵمانەکان, بەڕاستی زستانی ١٩١٧-١٩١٨ زستانێکی ئارام بوو, ئارامیەکی پێش لە هەڵکردنی با و گێژەڵوکە بوو, دژی بە ئەڵمانیا و بەقازانجی مارکسی و جوو !

لەم کاتەدا ئامادەکاریەکانی ئەڵمانیا بەردەوام بوو, لەم وەختەدا تادەهات هێزی زیادتر بەرەو بەرەی ڕۆژئاوا دەڕۆیشت و خواردن و چەك و تەقەمەنی زۆریشیان بۆ دەناردن, هەموو شتێك ئاماژەی دیارکەوتنی هێرشێکی مەزنی سەرانسەری بوو, بەڵام ئەوەی چاوەڕوان نەکراو بوو ڕوویدا و ئەڵمانەکانی توشی شۆك کرد!

دوژمنانی باڤاریا بەخۆیان دەگووت: دەبێت ڕێبگرین لەم سەرکەوتنانەی ئەڵمان, نابێت بهێڵین تاکۆتابێت, ئەمە لەکاتێکدا بوو کەئاماژەکانی سەرکەوتنی تەواوی ئەڵمانیا دیارکەوتبوو, دوژمنان پەنایان بردە بەر هۆکارێکی زۆر کوشندە بۆ داڕووخانی ئەڵمانیا, تاکتیکێکی نوێ بەکارهات بۆ لەناوبردنی هێرشەکەکانی ئەڵمانیا لەبێشکەوە پێش لەوەی بکەوێتە سەر پێ.

لەم کاتەدا کرێکارانی کارگەی ئازوخە مانیان گرت!

وایان خەمڵاندبوو کەسەرکەوتنی ئەم مانگرتن و نەچونەسەر کارە مانای داڕمانی بەرەی ئەڵمانی دەگەیەنێت؛ چونکە دابین نەکردنی خۆراك و پێداویستیەکانی وەکو تفاق و چەك و کەرەستەی سەربازی بۆ سەربازەکان مانای لەنگ بوونی هێرشی سەربازانە پێش لە هێرش بردن, هاوپەمانەکان پاشان هێرشیان کردە سەر بەرەکانی ئەڵمانیا و لەچەند قوڵێکەوە کەلێنیان خستەنێو ڕیزی سوپای ئەڵمانیەوە, بەم جۆرە کردارانە دوژمنانی ئەڵمانیا بە شکستەوە بەرەو سەرکەوتن هەنگاویان هاژوت, سەرمایە نیودەوڵەتیەکان دەستیان بەسەر ئەڵمانیادا دەگرت, سەرخستنی مارکسیەکان دەگەیەنێتە ئامانجی خۆی, بەڵام لەم وارەدا تاڕادەیەك هاویمانان سەرکەوتونەبوون؟ چونکە مانگرتنی کرێکارانی کارخانەکان زۆری نەخایاند کۆتایی پێهات, بۆیە زیانی زۆری نەبوو بۆ بەرەکانی جەنگ تەنها ئەوە نەبێت زیانی لە باری دەروونی دانیشتوان وڵات گەیاند !

هێزی پێشمەرگەمان کەماڤ خۆی بوو بپرسێت و دەیپرسی: جەنگان مانای چییە لەکاتێکدا وڵات سەرگەرمی خۆشی گێڕانە بەسەرکەوتنەوە, لەڕێگەی نەناردنی ئازووخەوە؟ ئایا ئەوە ڕاستە سەرباز لەکاتێکدا بۆ وڵات دەجەنگێت ئازووخەی لەلایەن

گەلی وڵاتەوە لێبپرێت ؟ کەواتە لەم کاتەدا بۆچی پێویست دەبێت سەربازەکانمان خۆیان بەکوشت بدەن ؟

ئایا مانگرتنەکە بۆ وڵاتانی دوژمن قازانجی چی بوو؟

لەزستانی ۱۹۱۷-۱۹۱۸ دا لە خێوەتەگەکانی هێزی دوژمن بێ ئومێدی جێگەی ئومێدبەخشی گرتبۆوە, هەرچی خەون و هیوابوو بووەیەوە تۆز و بابردی, هێرشە یەك بەدوا یەکەکانی هاوپەیمانان بۆ سەر ئەڵمانیای زەبەلاح هەمووی بەشکست کۆتایی دەهات,ئەم وڵاتە زلهێزە, ئەڵمانیا, بەدەستێکی قەڵغان چەکە بۆ پاراستنی و بەدەستەکەی تریشی شمشێری هەڵگرتووە بەمەبەستی لێدان لە بەرەی دوژمن, جارێك بەلای ڕاست(ڕۆژهەلات) و جارێك بەلای چەپ(ڕۆژئاوا) و جارێکیش بەلای باشوری دەست دەوەشێنێت, پێش لەوەی سوپای ئەڵمان دەستی لەدوژمنێکی ببێتەوە دوژمنێکی دیکەی بۆ دیاردەکەوێت, ئەمەش مانای جۆگەلەبەستنی خوێن بوو, بەم جۆرەش دەستی شمشێر توانای بەرگری کردنی هەبوو لەقەڵغان و قەڵغانیش لەشمشێر, ئەودەمەی هاوپەیمانان نەیان دەتوانی بەرگری سوپای ئەڵمان تێك بشکێنن, چاوەنواری هێرشی ئەڵمانەکان بوون, ئەم جۆرە هێرشانە هاوپەیمانانی زۆر دووچاری شۆك کردبۆوە. بەردەوام بوون لەبەستنی کۆنگرە جارێك لەپاریس, جاری داهاتوو لەلەندەن, بانگەشەکانیشیان تاڕادەیەك بێ ورەیی پێوەدیارکەوتبوو؛ چونکە زۆر گران بوو هەموان بڕواپێبێنێت کە سەرکەوتنی ئەڵمانیا نامسۆگرە.

بێ دەنگی باڵی کێشابوو بەسەر بەرەکانی جەنگدا و دوژمن دەستی لە فرەوێژی هەڵگرت؟ چونکە بۆچوونەکانی جێگەی پێ قایل بوون نەبوون, هەرچی سەربازی ئەڵمانی لەناوەندی جەنگدا بڕوای بەشێتی خۆی هێنابوو؟ چونکە جەنگێکی داهاتوو ناڕوون دەکەن, بەلەناوچوونی ڕووسەکان تاڕادەیەکی زۆر لەسەرکەوتن نزیك کەوتنەوە, پاش لەوەی دوژمنان لەڕۆژهەلات و ڕۆژئاواوە بەگاڵتەجاڕی پێکرنمانەوە هێرشیان دەکردینەسەر ئێمەش بەرگریمان لەخۆمان دەکرد, بۆماوەی سێ ساڵ بەرگریمان کرد لەدژی ڕووسیا, لەم کاتەشدا پاریس و لەندەن و ڕۆما بڕوایان وابوو کەشکست چاوەنوارمانە لەبەرامبەر ڕووسەکاندا؟ چونکە بەژمارە ئەوان زۆر لەئێمە زیادتربوون.

لەپایزی ١٩١٤ دا دوای ڕووداوی تاننبرگ، کاروانی دیلەکانی ڕووسیا بەرەو ئەڵمانیا بەڕێکەوتن، لەو ساتە بەدواوە هاتنی دیل بەرەو ئەڵمانیا بەردەوام بوو، بەڵام زۆری نێرینە لەڕووسیا نەدەبڕایەوە، هەرسوپایەك لەبری ڕووسیادا بوایە تەواو تیادەچوو، چۆن دۆڕان شایەنی فەرمانفەرمای قەیسەری نیکۆلا ی پڕ لەپیاگە کە دەکرێنە قوربانی خوا جەنگ ؟ لەم کاتەدا ئەڵمانەکان مافی خۆیان بوو بە نیگەرانیەوە بێنەپرسیار و بێژن: تاوەکو کەی ئەم پێشبڕکێیە بەردەوامی دەبێت؟ ئایا تاوەکو کۆتایی سوپای ئەڵمانیا توانای خۆڕاگرتنی هەیە ؟

کێ ناڵێت ڕۆژێك نایات کە پاش لەوەی ئەڵمانەکان لەجەنگدا سەردەکەون سوپایەك لەدیلی ڕووسیش لەئەڵمانیادا بەرجەستەنابێت؟ واتە ڕەنگە ڕووسەکان بەم ڕێگەدا دواتر هەنگاوی کاری لێوەگرببخەن، هاوپەیمانان دەیانزانی ڕووسیا ڕەنگە سەربکەوێت، بەڵام نەختێك دوادەکەوێت، بەڵام ڕووسیا لەناکاو کەوت و بەمەش ورەی هاوپەیمانان تاڕادەیەکی زۆر داڕووخا و ناوکیان کەوت، هاوپەیمانان دەیان زانی ئەڵمانەکان خۆیان بۆهێرشی بەهار ئامادە دەکەن، هەستیان کرد ئەو سوپایەی پێشتر دووکەرت ببوو، بەڵام هێشتاکە چۆکی دانەداوەو لەبەرامبەر سوپاکەیاندا وەستاوەتەوە و خۆیان بۆهێرشی کوشندە هازر دەکەن، ئەمەش دوای کۆکردنەوەی هەردوو بەرەکە بوو لەکەناری ڕۆژئاوای وڵات بەمەبەستی ئەنجامدانی جەنگی یەکلاکارەوەی فراوان.

بێگومان هاوپەیمانان لەساڵانی ١٩١٧-١٩١٨ لەدۆخێکی وەهادابوون کەهیچ ئیرەییان پێنەدەبرا، ئەوکاتەی گرمەی هەورە تریشقەدەهات وایان دەزانی ئەوە سوپای ئەڵمانە و هێرشیان کردۆتەسەریان و بەرەو ڕوویان هات، بەڕاستی سەرکردەکانیان لەدەم بیرکردنەوەی وردەوە ترسیان لێ نیشتبوو، لەوکاتەی فەرمانی دوا هێرشی ئەڵمانەکان ڕادەگەیەنرا مانگرتنی گشتی لە وڵاتی ئەڵمانیا ڕاگەیەنرا، چۆن؟ بەڕاستی هەموو جیهان دووچاری شۆك بوونەوە و نەیان دەزانی ئایا بەڕاستی ئەوە ئەڵمانەکانن ئەم کارەدەکەن ؟ ئەمەش هەناسەی ئەمری بە جەستەی مردووی سەربازانی هاوپەیمانان‌اندا کردەوە و لەبری بێ متمانەیی بڕوا پتەوی جێگەی گرتەوە، هەمووان بەوە قایل کرابوون کە بەرگری کردنی درێژخایەن لەدژی هێرشەکانی ئەڵمانیا مانای سەرکەوتنە، با ئەڵمانەکان تا دەتوانن سەرکەوتن بەدەست بێنن بەڵام

دوا وتە لای ئەو بەرەیە دەبێت کەتاوەکو دوا هەناسە دەمێنێتەوە, ئەمە دروشمی ڕۆژنامە فەرەنسی و ئینگلیزی و ئەمەریکایەکان بوو, بەوەی هەوڵی چەسپاندنیان دەدا لەمێشکی خوێنەراندا, لەم کاتەدا بانگەشە وڕەبەخشەکان هانی بەهێزبوون و زیادکردنی خۆراگری دەدا لای سەربازانی هاوپەیمانان, لەم کاتەدا لە ئەڵمانیا شۆڕش هەڵدەیسا, ئەمەش مانای سەلماندنی سەرکەوتنی هاوپەیمانانە, بەم کارەش دەستی لەرزۆکی دوژمن هێزی هاتەوە بەر و بەرەنگاریان بۆ گەڕایەوە بۆ سەرەتاکانی جەنگ, ئەمەش لەکاتێکدایە کە نائومێدی پێشتر هەموو چالاکیەکانیانی ئیفلیج کردبوو.

مانگرتنی کارگەکانی ئازووخەی ئەڵمانیا ئومێدی بۆ هاوپەیمانان بوژاندەوە و ناخۆشی بێ هیوایی ڕەواندنەوە,ئەگەر چی لەم شکستە تاڕادەیەك ئەڵمانەکان سەرکەوتن گەر بەڕواڵەتیش بێت,چاودێران لەم کاتەدا بڕوایان بەخۆیان هێنا بەوەی سەرکەوتن دەبێتە پشکی هاوپەیمانان.

***

گەورەیی ئەوەم پێبەخشرا کە لەهەردوو هێرشی یەکەم و دوا هێرشدا بەشداربم, بەچێژترین کاتی من گواستنەوەم بوو لەبەرگریەوە بۆ هێرشکردن, دوای ئەوەی سێ ساڵ لەدۆزەخی چاوەڕوانیدا بووم, چاوەنواڕی ڕۆژی هەسابکاری, هێرشی بەهاری ١٩١٨ گەڕاندینیەوە بۆ کەش و هەوای پایزی ١٩١٤, کە دەستە سەرکەوتوەکانمان بە شەکانەوەی ئاڵاکەمان و وتنەوەی سرودی نیشتمانیمانەوە بەرەو هێرشبردن بەدەرکەوتن, لەم هێرشانەماندا لەوە دڵنیابووین کە لەهەردوو بەرەی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوادا سەرکەوتن بەدەست دێنین.

بەڵام ڕۆژگار چارەنوسی چاوەنواڕ نەکراوی بۆ حەشاردابووین؟!

لەهاوینی ١٩١٨ دا هێلاك کەوتن بوەدیارە و بەهەموو بەرەکانی جەنگماندا تەنیەوە, دووبەرەکیش کەوتە نێوان هاووڵاتانی پشتەوەی بەرەکانی جەنگامانەوە, بەڵام ئەمە لەبەرخاتری چی بوو ؟

ڕووداوەکانی نێو وڵات بەبەرەکانی جەنگ نەدەگەیشت, هەندێك دەیان گووت گەل بەردەوامی دان بەجەنگ ڕەت دەکەنەوە چونکە گوڕ و تینی لێبڕیون و لەماڵ و دارایی داپڕوتاندونەتەوە, یەکێکی دی دەیگوت تەواو چیتر ئەڵمانیا هەتاماوە سەرکەوتن بەدەست ناهێنێت, کەواتە بەردەوام بوون لەتێکۆشان مانای ناتەواوی شێتی

دەگەیەنێت, بەڕاستی قەیسەرغولیۆم و سەرمایەداران تاکە قازانج کارن لەبەردەوامی دان لەبەردەوامی دان بەم کوشتارگەیە.

پڕوپاگەندەکانی چاکسازیی ویستراو لەلایەن پیشەوەران و سیاسەت مەدارانەوە بەنێو ڕیزی جەنگاوەراندا بڵاوبویەوە, بەڵام ئەمە هیچ کاریگەری نەبوو لەسەر دەروونی سەربازەکان, ئەم سەربازانە و ئەوانەشی لەدەشتەکانی فلاندەرەوە بەسرودی (ئەڵمانیا لەسەرووی هەموویەوە) و ناوچە و خاکەکانی دیکەی ئەڵمانیا خوێنیان ڕژا لەپێناو هەڵبژاردنی ڕاستەوخۆ و ڕای گشتی دا خۆیان نەکردە قوربانی, بەڕاستی ئەوانەی داوای هەڵبژاردنیان دەکرد لەم کاتەدا جگە لەگەمژە گەلێك هیچی دیکەنەبوون و قسەی ئەم کەسانە سنوری قسەکردنی تێنەدەپەڕاند, بەڕاستی بەرەکانی جەنگ تاڕادەیەکی باش ڤالابوو لە مرۆڤی پووچ و گێل و کەودەن, لەوکاتەی پیاوانی نێو پەرلەمانی سەر بەپارتەکان سەرقاڵی بەدەست هێنانی دەستەڵات بوون لەڕێگەی پەرلەمانەوە , ئەوکاتە سوپای ئەڵمانیا بڕیاری بەردەوامی دانی دابوو لەجەنگ و تێکۆشان لەپێناو بەرەودان بە سەروەریەکانی نیشتمان. سوپای ئەڵمان نەیدەویست دەست لە بەدی هێنانی ئامانجەکەی هەڵبگرێت: سەرکەوتن, بۆ گەیاندنی ئامانجەکەی بەڕێز شیدمان و ئیبرت و بارت و لیبکنت و مانگرتنەکانیان, بەوەش قایل نەدەبوون کە چەمکی دەستەڵات بکەوێتە دەست ئەو کەسانەی هیچ کات بەشداری جەنگ نەبوونە و دەیانەوێت سوپا بخەنە ژێر دەستەڵاتی خۆیانەوە.

خۆم زۆرم ڕق لە سیاسەت مەداران دەبویەوە, چونکە میللەتیان چەواشەدەکرد, بەڕاستی ئەم یاریەیان بەسەر مندا تێنەدەپەڕی. خستنەڕووی سووربوون لەسەر بەرژەوەندی گشتی پەردەپۆشی مەبەستە ڕاستەقینەکانیانی پێدەکەن: پڕکردنی باخەڵە ڤالاکان و دروستکردنی باڵەخانەی شکۆمەندی خۆیان لەسەر دار و پەرووی وڵات.

ئەوانەی لەسەرەتاوە بەشداری جەنگیان کرد بەهەمان شێوەی من سەیری ئەو سیاسەت مەدارانەیان دەکرد, بەڵام ئەوانەی دواتر ڕەوانەی بەرەکانی جەنگ کران تاڕادەیەکی زۆر پێچەوانەی ئێمەبوون لەبیرکردنەوەدا. بەڕاستی تێکەڵاوبوونی سەربازە کۆن و نوێیەکان بووەهۆی هەڵوەشاندنەوەی یەکگرتویی ڕیزەکانی سوپا.

لەکۆتایی ئەیلولی ۱۹۱۸ دا لەشکرەکەمان بۆ جاری سێیەم ئەو شوێنەی داگیرکردەوە کە پێشتر لەڕێگەی ئەو لەشکرەشەوە داگیرمان کرد کەلەسالی ۱۹۱٤ دا پەیوەندیم پێوەکردبوو.

لەم شوێنەی ئێستادا لەسالی ۱۹۱٤ دا خۆم و هاوڕێکانم بەدەم گولەبارانکردنەوە ڕووبەڕووی دوژمن وەستابوینەوە, لەم کاتەدا دلی هەموومان پڕ بوو لەخۆش ویستنی نیشتمان و گەل. لەم کاتەدا کەس خۆی بەقوربانی نەدەزانی گەر بشمردیە, چونکە وای دەهاتەپێش چاو کەبەم کارەی خاك و ولات و نیشتمانەکەی دەپارێزێت.

لەتەموزی ۱۹۱۷ دا بۆجاری دووەم هەمان ناوچەمان داگیرکردەوە,ئەم شوێنە بۆ ئێمە خاکێکی زۆر پیرۆز بوو, چونکە لەم خاکەدا چەندان هاوڕێم تەرمەکانیان نێژراون بەوەی لەپێناو نیشتماندا گیانیان بەخت کرد و لەچاوی ئەوانەوە بزیسکەی ورە بۆ سەربازانی دیکە بەرزەبوویەوە. ئەم شوێنە بەر لە سێ سال بەهێرشێکی زۆر جەگبڕانە داگیرمان کرد بۆیە ئێستا کاتی بەرگری لێکردنیەتی. لەو کاتەی ئینگلیزەکان بەتۆپ و بۆمب بارانیان بەسەرماندا دەباراند و هەولی داگیرکردنی دەشتەکانی فلاندەری دەدا ئێمە بۆ بەرگری کردن خۆمان ئامادە دەکرد و لەم کاتەدا بۆهەریەکێك لەئێمە مشتێك خاك لەهەموو شتێك پیرۆزتربوو , وامان دادەنا هاوڕێ گیان بەخش کردوەکانمان چاودێریمان دەکەن, بۆیە ئێمەش نابێت دلیان بشکێنن بەوەی لەئامانجەکەیان لانەدەین, بەلام تادەهات ڕیزەکانمان تەسك و بچووك دەبویەوە, ئەوکاتەی ئینگلیزەکان لە۳۱ ی ئابدا لەم ناوچەیەدا تەنگیان پێ هەلچنین سەردایەتی بڕیاری پاشە کشێ کردنی بۆدەرکردین, ئەم لەشکرە بەرەبەرە بەرەو کەمبوونەوە دەچووو تەنانەت ژمارەکەی بۆ چەند دەستەیەك کەم بوویەوە کە لە ماندووبوندا خۆیان بەپێوە ڕانەدەگرت.

بەلێ ئەو شوێنەی یەکەمین هێرشمان لێوە دەست پێکرد لە پایزی ۱۹۱۸ دا گەڕاینەوە بۆی, بۆ ئەو گوندەی کە جاربەجار بۆ حەسانەوە پەنامان تێدەگرت, ئەو گوندەش ناوی (کۆمین)بوو, بەڕاستی ئەم گوندە لەجێگەی حەوانەوەوە گۆڕا بۆ گۆڕەپانی جەنگ. لەڕاستیدا گۆڕانی جەنگ هەمان گۆڕەپانی جاران بوو بەلام کەسانی بەشداربوو گۆڕابوون: ئەمانە سیاسەت ببووە هەموو ئیش و کارێکیان,

چونکە ئەو ژەهرەی سەربازە نوێیەکان لەگەڵ خۆیاندا هێنابویان توانی بووی بگاتە زاری و مێشکی زۆربەی سەربازەکان.

شەوی ١٣-١٤ ی گەلاّ ڕێزانی ١٩١٨ تۆپخانەکانی ئینگلیز بە گازێك کەپێی دەوتریا (گازی خاچی زەرد) دەستی دایە تۆپبارانکردنی هێڵەکانمان، ئەم گازە یەکێك لەتایبەت مەندیەکانی ئەوەبوو کە هەست بەبوونی نەدەکرا بۆئەوەی خۆتی لێلی لادەی، تائەو کاتەی نیشانەی کاریگەریەکانی لەسەر جەستەت دیار دەکەوت. لەم کاتەدا لەشکری ئێمە لەناوچەیەکی نزدیك لە چۆمی لایبر بوو، ئەو دەمەی هەست بە کاریگەریەکانی ئەم گازە کرا کاروانی گواستنەوەی برینداراني ئەم گازە دەستی پێکرد، بەڕاستی ژمارەیەکی زۆر بوو، هەندێك لە توشبوان بەم گازە پێش لەوەی بگەنە بەرەکانی دواوە بەمەبەستی چارەسەر وەرگرتن مردن. خۆشم ئەمەو بەیان هەستم بەکاریگەربوونم بەم گازە کرد و بەرەبەرە ئازار هەموو لەشمی گرتەوە. چاوم گڕی تێبەر ببوو هێزی لەسەر پێوە وەستانم نەمابوو، وەکو سەرخۆش بەم دیو و ئەو دیودا دەکەوتم. بەم بارەوە بەرەو بەرەکانی دواوە کشامەوە. چەند کاتژمێرێك دواتر هەستم کرد لە نوتەکدام و چتم نەدەبینی، بەم دۆخەمەوە بۆ نەخۆشخانەی (باسفللك) گواسترامەوە و لەوێدا هەستم بەدیارکەوتنی شۆڕش کرد.

شۆڕش بەلای هەندێکەوە ببوە کارێکی ئاسایی، بەلاّم بەلای منەوە هیچ ئاسایی نەبوو، هەر لەوکاتەدا کرێکارانی کارگەی ئتزوخە و تفاقی سوربازی مانیان گرت. سەرباری ئەوەی لەم و لەوی هاوڕێمەوە دەم بیست کە گشت شتێك تەواوبوەو دۆخەکە لەدەست دەرچووە و ڕەنگە چەند هەفتەیەکی دیکە شۆڕش هەلاّیسا!بەلاّم من بۆخۆم بڕوام بەم جۆرە دەنگۆیانە نەدەکرد. بڕوام وابوو ئەوەی لای ئەوان بووەتە گرنگ تەنها مانگرتنێکی سادەیە لەشێوەی مانگرتنەکەی بەهار و پاش ماوەیەکی کورت هەموویان لێی پەژیوان دەبنەوەو دەگەڕێنەوە سەر ئیش و کارەکان و جەنگ لەبەرژەوەندی ئەلمانیادا کۆتایی پێدێت.

دوای ئەوەی گەیشتمەوە بیمارخانە جارناجارێك گوێبیستی یاخی بوونی هێزی دەریایی دەبووم. بەوەی لەسوپای ولاّت هەڵگەڕاوەتەوە. بڕوام وانەبوو هێزی دەریایی هەرگیز خەنجەر لە پشتی ئێشتمان بدات. بۆیە گوتم ڕەنگە یارییەك بێت یان گەر

ململانێــی ڕاســتەقینەش بێــت ئــەوا ماوەیــەکی زۆر کــەم دەخایــەنێت و هــەموان دەگەڕێنەوە بۆ بەرەکانی پێشەوەی جەنگ.

لەخەزەڵوەری ١٩١٨ دا بارودۆخەکە زیادتر شەڵەقا, بەیانییەک بەسواری ترۆمبێلی بارهەڵگر ژمارەیەکی زۆری کارمەندانی هێزی دەریایی گەیشتنە نێو شار و هانی بەرپاکردنی شۆڕشیان دەدا, لەم کاتەدا سەرکردەی ئەم بزوتنەوە شۆڕش خوازە (لەپێناو ئازادی و ئابرووی گەلەکەماندا) ئەو گەنجە جولەکانە بوون کەپێشتر هیچ کامێکیان نەچووبوونە جەنگەوە.

نەختێک تەندروستیم باشتر بوو, بە ڕوونیەکی ڕێژەیی دەمتوانی شتەکان ببینم, پزیشکەکان پێیان گوتم: کاریگەری ئەو گازەی بەرت کەوتووە بەتێپەڕبوونی کات کەم دەکات و نامێنێت, بەمەش بینایت بۆدەگەڕێتەوە, بەڵام بەڵێنی ئەوەیان پێ نەدام کە هەموو شتێک وەکو جاری جارانی لێدێتەوە.

دگەڵ باشتربوونی تەندروستیمدا شۆڕش هەڵایسا, بەڵام من بەتەنێ بە جوڵانەوەیەکی ناوخۆییمان دانابوو, هەوڵی قایلکردنی هاوڵانی بیمارخانەم دەدا بەوەی سەربازانی دەریایی وڵات ئەمەکدارییان لەئێمە کەمتر نییە بۆ وڵات, بەڵام ڕووداوەکان بێ ئومێدی کردم, شۆڕش بەچەند ڕۆژێک ناوچەیەکی بەرفراوانی گرتەوە و ئەم درمە تەنیەوە بۆ میونیخ کە مشتێک لە جولەکەکان دەستیان گرتبوو بەسەر بیروبۆچونی خەڵکانی میونیخ دا. بەڵام ئەم گۆڕانکاریانە هەرگیز نەیان توانی بوو لەبۆچوونەکەی خۆمم هەڵگەڕێننەوە: شۆڕشێکە چوارچێوە تەسکە, بەڵکو هەوڵێکە بۆ یاخی بوون و بەتەنها یەک گەلەکەشتی ئەنجامی دەدەن و سوپا ڕێگە بەمە نادات و بە تێپەڕبوونی چەند ڕۆژێک سوپا هەموو ئەمانە پێشێل دەکات.

ڕۆژانی دواتر بۆمن هەڵگری هەواڵی زۆر جاڕس کاربوو. شۆڕش لەهەموو وڵاتدا تەنی بووەوە, تەنانەت لەبەرەکانی جەنگیشدا باسی چەکدانان هاتبووە ئاراوە.

لە ١٠ ی خەزەڵوەری ١٩١٨ کەشیشێک هات بۆئەو نەخۆشخانەیەی منی لێ بوو, بۆئەوە هاتبووە هەندێک قسەمان بۆبکات. لەم قەشەیەوە هەموو شتێکمان زانی.

بەو پەڕی جۆش و خرۆشەوە گوێم بۆ ڕادێرابوو. بە دەنگێکی گڕ و نوساووەوە قسەی بۆدەکردین, پێی ڕاگەیاندین کە بنەماڵی هوهونزولرن ماف سەرکردایەتی کردنی وڵات و تاجیان لەدەست داوە, ئەڵمانیاش شێوازی هکوم ڕانی تێیدا لە

پادشایەتیەوە بۆ کۆماری گۆڕدراوە. داوای پاڕانەوەی لێکردین لەخوا بەوەی ئەم پەیڕەوە نوێیەمان کارا و بەسوودی گەل بێت و لەداهاتوودا دەست لەگەلەکەمان هەڵنەگرێت و پشتی لێنەکان.

ئەم قەشە لە وتەکانیدا باسی لە خانەی خاوەن یان ماڵی پاشا کرد و تێیدا ئاماژەی بەهەموو کار و چاکەکانی بنەماڵەی هوهونزولرن بۆ میرانیا و پروسیا و نیشتمانی ئەڵمانی بەگشتی کرد. پیاوە پیرەکە گریان قوڕگی داگرتبوو. ئەمەش وای کرد هەموو ئامادەبوانی نێو هۆڵەکە بەدوایدا لەپرمەی گریان بدەن ودەست بکەن بەشین و واوەیلێ. ئەودەمەی کەشیشەکە ڕاڵەی ناچاری ئەڵمانەکانی دەکرد لەبۆ چەك دانان پێی ڕاگەیاندنین کە ولآتەکەمان.ئەڵمانیا، لەجەنگدا دۆڕا، ئێستاش لەژێر سێبەری بەزەیی دوژمنی سەرکەوتوماندایین و دەبێت بەهەموو ڕێککەوتنێك قایل بین کە ئەوان پێشکەشمانی دەکەن و دەبێت بە دەستبلآوی دابنێین. ئەوکاتەی قەشەکە بەم ئاستی قسەکردنە گەیشت ئەم جهانەم لەپێش چاو بووە تاریکستان و گوێم هیچی نەدەبیست و چاوەکانیشم چتێکی نەدەبینی، وەکو سەرخۆش هۆڵەکەم بەجێ هێشت و بەرەو نوێنەکەم بەڕێکەوتم، سەری گرگرتووم خستەژێر بالیفەکەمەوە و ئەم دەویست بڕوا بەم ڕاستیە تاڵە بێنم.



بسمارك، یەکخارەوەی ئەڵمانیا

پاش لە ناشتنی دایکم تاوەکو ئەو ساتە بۆهیچ کەس نەگریاوم، خۆم لەسەر خۆڕاگری ڕاهێنابوو، لەچوار ساڵی جەنگدا دەمدیت چلۆن مردن هاوڕێ خۆشەویستەکانم لەدەست دەردێنێت و دەرەویان دەکات، هەرگیز بۆجارێکیش تاکە فرمێسکێکم نەڕشت و خۆم لەسەر ئەوە ڕاهێنابوو کەئەمانە پاڵەوانن و پێگەی بەهێزی وڵات لەسەر جەستەی ئەمانە پونێت دەنرێت. ئەو دەمەی لە جەنگدا گاز بەرم کەوت وەخت بوو دەستبکەم بەگریان بەڵام هەستم بە هێزێك دەکرد لەمەناوەمەوە پێی دەگوتم : (ئەی ترسنۆکی هیچ و پووچ، تۆ دەگریت بۆخۆت لەکاتێکدا ئەم نەهامەتیەی بەسەر تۆدا هاتووە هەزاران جار لە نەهامەتی بەسەردا دراوی هاڕێکانت کەمترە! ). بۆیە خۆم ڕاگرت و ئارامیم بۆخۆم گێڕایەوە. بەڵام ئێستا هەموو شتێکم لەدەست دا. ئەودەمەی نیشتمان دەدۆڕێنیت هەموو شتێکت دۆڕاندووە.

کەواتە هەمووی پوچ بوو. ئەو هەموو قوربانیانە، ئەو هەموو تێکۆشان و هەوڵانە، لەپێناو هیچدا تاڵی برچێتیمان چێشت. تینوێتی بەدرێژایی چەندین مانگ بۆ هیچ بوو! ئەو هەموو جەنگینەمان بابردی، پێکەوە لەپێناو سەرکەوتندا بەپشت بەست بەحەزی مردن بەرامبەر بە ترسی بڵاوکراوە دەجەنگاین. کەواتە زیاد لەملیۆنێك ئەڵمانی لەپێناو هیچدا لەگۆڕەپانەکانی خۆکەورە نواندندا خۆیان کرد بەقوربانی !

تۆ بڵێی ئەو ڕۆژەبێت کە گۆڕی سەدان هەزار لەو سەربازانە هەڵبدرێتەوە کە لە کەندرەکانەوە چونەتەدەرێ و داسی مردن کوشتونی؟ توبڵێی ئەو ڕۆژەبێت قاپی قەوری ئەو سەربازە خۆبەخشانە بکرێتەوە بۆئەوەی وەکو خێوی تۆڵەسێن و لەشێوەی پاڵەواندا بنێردرێنەوە بۆئەو نیشتمانەی کەلەپێناویدا خۆیان کرد بەقوربانی ؟ لەبەرخاتری ئەوەی کۆمەڵێك مێشولە دەست بەسەر دەستەڵات و چارەنوسی وڵاتدا بگرن چەندان هەزار سەرباز لەجەنگەکانی خەرمانان و گەلاوێژی ١٩١٤ دا بوونە قوربانی و دواتریش چەندین لەشکری خۆبەخش بەدوویاندا ڕۆشتن، ئایا لەپێناو ئەم شۆڕش هەڵایسێنەرانەدا لاوانی خوار تەمەن ١٧ ساڵ خاکی فلاندەر لەباوشی گرتن؟ ئایا لەبەرخاتری چاوی کاڵی ئەم تازە پیاکەوتوانەدا دایکە ئەڵمانیەکان وەچەکانیان پێشکەشی خاك و نیشتمان کرد؟ ئەو ڕۆڵانەی کە دەیانزانی پاش لەڕۆیشتنیان ڕەنگە چیتر نەتوانن بیانبیننەوە؟!

بەڕاستی دەبوو بۆ ئەو پاڵەوانانە شاپەیکەرێك دروست بكەین و لەسەری بنوسرێت

(( ئەی ئەو كەسەی وا بەرەو ئەڵمانیا بەڕێكەوتوی، بە وڵاتەكەمان بێژە: ئێمە لێرەدا ڕاكشاوین، ئێمە ئەمەكداری نیشتمان و ئەركەكانیشین)).

ئاخۆ سبەی مێژوو چلۆن ئەم ڕووداوە تۆماردەكات؟ ئەی دەبێت چی بە وەچەكانی داهاتووی نیشتمانەكەمان بڵێین و بیانوی چییان بۆ بهێنینەوە؟

بەڕاستی ئەوانەی ئەم فەتارەتەیان هێنایە ئاراوە گەلەكەمانیان بەرەو شێتی ئاراستەكردبوو، مێژووە سەروەرانەكەیان پڕكرد لە نامەردی.

شەو دەهات و ڕۆژ تەواو دەبوو، ڕۆژدەهات و شەو كۆتایی دەهات، بەڵكەی لەدەستدانی هەموو شتێك دەسەلمێندرا، لێرەوەش هەستی ئەوەم بۆ دیاركەوت كە پشت بەستن بە دەستبلاوی و سەخاوەتی دوژمن كارێكی گەوجانە و شێتانەشە، بگرە تاوانیشە. ئەو دەمەی بیر لە چۆنێتی كۆتایی هاتنی جەنگ دەكەمەوە ڕق و قینم لە قازانی سنگمدا قوڵ دەدات بەرامبەر ئەوانەی بوونە هۆكاری ئەم شكست و شێوە ئەنجام گرتنەن.

ئەو دەمەی دۆخەكە نەختێك ڕوونتربوویەوە ناچار بڕیاری كاركردنم دا لە سیاسەتدا، لەم كاتەدا دەستم لەئەندازیاری هەڵگرت بۆ سیاسەت ؟ چونكە لەم شێوە دۆخانەدا دواین شت ئاوەدانكردنەوەیە كە خەڵك بە بیران بێتەوە.

بڕیاری ئەوەم دا لە سیاسەتەوە بگلێم، بەمەبەستی قوتاركردنی ئەڵمان و ئەڵمانیا لەدەست هەردوو جۆرە دوژمنی خوێنمژ، جولەكە و ماركس خوازەكان.

غولیۆمی دووەم یەكەمین فەرمان فەرمای ئەڵمانی بوو كە دەستی یارمەتی بۆ ماركس خوازەكان درێژكرد و نەیدەزانی كە ئەمانە تەڵەكەباز و گزیكارن و هیچ كات پشت پێبەستراو و ئەمەكدارنین. بەدەستێكیان چاك و چۆنیان دگەڵ غولیۆم دەكرد و بەدەستەكەی دیكەیان شینەغیان هەڵگرتبوو بەبەمەستی غیانەت لێكردنی!

# بەشی حەوتەم

## دەستکردن بەچالاکی ڕامیاری

لە خەلوەزری ١٩١٨دا جارێکی دیکە گەڕامەوە بۆ میونیخ , بەمەبەستی خۆ پەیوەستکردن دگەل وان سەرباز کە لە لەشکرەکەمدا بوون, دیتم لەشکرەکەم بەدەست ئەرجومەنی سەربازیەوەیە, زۆری نەبرد تالەم دەزگایە وارس بووم و دواتر بۆ (ترۆچین) گواسترامەوە و لە ڕەشەمێی ١٩١٩ دا وەگەڵ ئارانست شمیسی هاوڵمدا گەڕامەوە بۆ میونیخ.

لەشاری میونیخدا دۆخەکە دوور بوو لەئارامی و سەقامگیرییەوە, مردنی ((ئیزنر)) هۆکاری خێرادیارکەوتنی دیکتاتۆریەت بوو لەسۆڤیەت, ئەمەش ڕەنگ بوو ببێتە هۆی کەمبونەوەی دەستەڵاتی جووەکان, ئەوانەی تۆوی شۆڕشیان لەناخی هەمواندا چاندبوو.

ئەو پلان و نەخشە و پرۆژانەی بەمێشکمدا دەهات بەبێ هیچ چەن و چونیەك تەنها بۆخۆم بوون, واتە هەنگاوم نەنا بۆ جێبەجێکردنیان ؟ لەبەرهەوەی چاك شارەزای ئەوەبووم کە لەم دۆخەدا هیچ کەس گوێ لە کەسێکی بێ ناوبانگی وەکو من ناگرێت, هەمدیس ئەمانە نەبوونە بەربەست لەپێشمدا بۆئەوەی بۆچوونەکانم دەربڕم, ئەمەش وای کردبوو لە ناوەندی سۆڤیەت لە میونیخ وەکو دوژمنانی شۆڕش داوابکرێم,

لەسەر ئەم بنەمایە لە ۲۷ ی نەورۆزی ۱۹۱۹ دا چەکم بەڕووی ئەو سێ کەسەدا دەرهێنا کە هاتبوون بۆ ئەوەی دەستگیرم بکەن، بەڵام بەم کارەم شکستم بەم هەوڵە بۆگەنەیان بەخشی. جارێکی دیکە هیچ کەس بەم هۆیەوە نەهاتەوە بەلامدا.

پاش لە ڕزگارکردنی میونیخ بە ئەندامی ئەو لیژنەیە دانرام کە ڕاسپێردرابوو بۆ لێکۆڵینەوە لە هۆکارەکانی یاخی بوون و دیارکەوتنی شۆڕش کە لەشکری پیادەی دووەمی کردبووە دووبەشەوە. دواتر فەرمانێکم پێگەیشت بەوەی دەبێت ئامادەی وانەگەلێکی تایبەت بە پێگەیاندنی ئاکاریانەی نیشتمانی ببم، کەبە ئەندامە چەکدارەکان دەوترایەوە. ئەم دۆخە وای لێکردم ئەو هاوڕێ و دۆستانەم ئاشنابم کە هاوبۆچوونی منن لەم بوارەدا. لەزۆر دۆخی یاسایی و کاروباردا هەمان ڕەوتی منیان هەیە و هەمان قسەی من دەکەنەوە. هەموومان بەوە قایل بووین کەئەو کەسانەی تاوانی خەزەڵوەریان ئەنجامدا پێشیاوی ڕزگارکردنی ئەڵمانیا نین لە نەهامەتی بەرۆکی پێگرتووی. ڕێکخراوە((بورژوازیە نەتەوەییەکان)) لەتوانایدا نەبوو هەموو ئەو شتانە چاك بکاتەوە کە خراو کاران تێکیان داوە!

توێژینەوەی تواناداری خۆمان کرد لەبۆ دامەزراندنی پارتێکی خاوەن بەرنامەی دیاری کراو وەکو ئەوەی پاش جەنگ ناوی پارتی کشتکارانی لێنرا. لەم کاتەدا هەوڵی دۆزینەوەی ناوێکی گونجاومان دەدا بۆ پارتەکەمان بۆئەوەی سەرەنجی زۆرینەی کۆمەڵگە بۆلای خۆی ڕاکێش بکات، بۆیە ناوی (( پارتی کۆمەڵایەتی شۆڕشگێڕ))مان لێنا، چونکە بنەما کۆمەڵایەتیەکانی بزوتنەوە نوێیەکە خاوەنی سروشتێکی پێشکەوتوخوازی شۆڕش گێڕی بوو.

ئەوەی وای لێکردم ئەم ناوە لەم پارتەمان بنێم ئەوەبوو کە، بڕوام بوو کەفاکتەر و کێشەی ئابوری هەرگیز چوارچێوەی کێشە کۆمەڵایەتیەکانی نەبڕە. ئەوکاتەی ئاسۆی توێژینەوەکانم فراوانکرد لۆم دیارکەوت کە سیاسەتی هاوپەیمانێتیەکانی ئەڵمانیا ئەنجامی خەملاندنێکی هەڵەبووە بۆ بنەماکانی ژیانی ئابوری و گرنگیەتی بۆ دابینکردنی خۆراك بۆ گەلی ئەڵمانی. بۆم دیارکەوت کە تێڕوانینی سەرمایە بەدەستان تێڕوانینێکی دواکەوتو و ڕووکەشییە.

**کەواتە سەرمایە چییە ؟**

بەرهەمی کارە، بێجگە لە بەرئەنجامی بەرهەمی کار هیچی دیکە نییە. سەرمایە جێگیر نییە؟ چونکە بەهەمان شێوەی کار کەوتۆتەژێر کاریگەری فاکتەری چالاکیەکانی مرۆڤ یان کۆسپەکانی پێشیەوە.

بەم چەشنەش سەرمایەی نەتەوەیی پەیوەستە بە بەهێزی دەوڵەت و ئازادیەوەی. ئەو دەمەی لێرەدا گوتمان دەوڵەت ئەوا مەبەستمان لە نەتەوەیە. ئاراستەکردنی سەرمایە بەپێی بەرژەوەندی ئازادی دەوڵەت دەبێت و سەربەخۆیەشی بەسروشتی دۆخ بەرەو ئازادی و هێز و مەزنی نەتەوەی ڕاکێش دەکات...

بەم چەشنەش ئەرکی دەوڵەت لەبەرامبەر سەرمایە ڕوونی ئاشاڵۆزە: پێویستە دەوڵەت سەرمایە بخاتە خزمەتی خۆیەوە لەجیاتی ئەوەی خۆی بکاتە کۆیلەی، ئەمەش پێویستی بە سەربەخۆیی ئابوری دەوڵەت هەیە، لەم کاتەشدا پێویستمان بەوە هەیە کە تەواوی مافی کرێکاران پارێزراوبێت.

لەپێش و ڕابردوودا هیچ جوداییەکی زۆر دیارم نەدەبینی لەنێوان ئەو سەرمایەیەی کە بەرهەمی کارە، لەگەڵ ئەو سەرمایەیەی کە بوونی وەستاوەتەسەر جامبازی بە تەنها. چاکەی ئەم جودا کردنەوەیەشم دەگەڕێتەوە بۆ یەکێك لە مامۆستاکانم، لەو مامۆستایانەی کە خۆم و هاوڕێ سەربازەکانم بەردەوام گوێ بیستی دەبوین، کەناوی گۆتفرید فیدەر بوو. ئەودەمەی یەکەمین جار ئامادەی وانە وتنەوەیەکی فیدەر بووم هەستم کرد توانیومە بنەمای دامەزراندنی پارتێکی نوێی سیاسی بدۆزمەوە.

***

فیدەر زۆر بەجوانی هەوڵی جیاکردنەوەی سەرمایەی نێونەتەوەیی تایبەت بە جامبازی و سەرمایەی پەیوەست بەئابوری نەتەوەی دەدا ، ئەوانەشی دژبەرییان دەکرد بەناچاری دانیان بە تەندروستبوونی بۆچونەکانیدا نابوو، بەڵام بڕوایان وانەبوو کەبتوانرێت لەژیانی ڕاستەقینەدا جێبەجێ بکرێت.

ئەوەی لەڕوانگەی ڕەخنەگرانی ئامادەبووی وانەکەوە خاڵی لاواز بوو لەڕوانگەی منەوە خاڵی بەهێز بووە. بەڕاستی کاری ئەوکەسەی یاسا بۆ ئەنجامدانی کارێك دادەنێت خستنەڕووی فاکتەرەکانی بەرجەستەکردنی پرۆژەکە نییە، بەڵکو پیشاندانی پرۆژەکەیە وەکو ئەوەی بەدی دێت، بەو مانایەی ئامانج بەلای خاوەن پرۆژەکەوە گرنگ ترە وەك لە هۆکار. بۆیە ئەو کەسەی پەیڕەو و وەرنامەی عەر بزوتنەوەیەك

دادەنێت پێویستە ئامانجەکەی بەباشی بزانێت و دەست نیشان بکات. چەسپاندنی ئەم ئامانجانە ئیشی رامیارچێتیانە. دەبێت بەباشی ئەوەشمان لەبیربێت کە ئەوەی مرۆڤ بیری لێدەکاتەوەو پلانی جێبەجێ کردنی بۆ دادەنێت مەرج نیبیە وەکو خۆی لەجیهانی راستینەدا بچەسپێت و بێتەدی.

باشتر وایە ئەوە بزانین کە بیرۆکەی نمونەیی لەرووی تەندروست داری و گەورەیی ئامانجەکانیەوە ناتوانرێت بە ئامراز و فاکتەرە مرۆییە ئاسراوەکان بچەسپێندرێت بەو شێوەیەی خاوەنی بیرۆکەکە بیری لێی کردۆتەوە. بۆیە لەم روانگەشەوە نابێت گەورەیی خاوەن بیرۆکەکە بەپێوانەی چەندێتی بەدی هێنانی بیرۆکەکە یان ئەو ئامانجە نەخشەی بۆ کێشاوە پێوانە بکرێت, بەڵکو بەپێی تەندروست داری ئەم ئامانجانە و کاریگەرییان لە گەشەی مرۆڤ و پێشکەوتنیدا دەپێورێت. بەڵام ئەگەر سەرکەوتنی تەواوی بیرۆکەکەمان بەپێی گەورەیی خاوەنەکەی پێوانەکرد, ئەوا لەریزبەندی کەسە گەورەکاندا هیچ کام لە نێردراوەکانی ئاسمان بەگەورە نابینین؟ چونکە بەدی هێنانی تەواوی پەیامەکەیان بەتەواوەتی کارێکی نەکردەیە. تەنانەت ئاین خۆشەویستیە, ناتوانرێت جێبەجێ بکرێت, تەنها کاردانەوەیەکی لاوازی نەبێت لەبۆ مەرامی ئەم دامەزراوە مەزنە. بەڵام گرنگیەکەی دەوەستێتەسەر ئەو ئاراستەیەی کە مەبەستیەتی فەرمەنگی لێوە پێش بخات و لە ئاکار و نەریتەکانی مرۆڤدا رەنگی پێبداتەوە.

ئەم جیاوازیە زۆرەی نێوان خاوەن بیرۆکە یان رێبازەکان و پیاوانی رامیارکار وای کردووە نەتوانرێت هەرگیز ئەم دوو جۆرە کەسایەتیە لەیەك جۆر مرۆڤدا کۆبکرێتەوە. ئەم چەشنە بنەمایەش بەزۆری بەسەر ئەو سیاسەت کارانەدا دەچەسپێت کە چالاکیەکانیان لەچوارچێوەیەکی شیمانییەدا ئەنجامداوە. بسمارکیش ئاماژەی بەوانە داوە بەتایبەت ئەوکاتەی لەبارەی دەست نیشان کردنی سیاسەتەوە گووتیەکە : هونەری کارکردنە لەسنورێکی شیمانییەدا.

بەراستی ئەو سیاسەت کارانەی خۆیان دووردەخەنەوە لە بیرۆکەی روون و مەزن سەرکەوتنیان باشتر و خێراترە وەك لەوانەی شوێنی ئەم ئامارژەیە دەکەون. بەڵام لەم کاتەدا پرۆژەکانی ماوەکورتن و بەمردنی خاوەنەکەی بیرۆکەکانیشی لەناودەچن, هیچ کاریگەرییەکی بەسەر چینی ئایندەی گەلەوە نابێت, چونکە سەرکەوتنی

وەستاوەتەسەر خۆ بەدوورگرتن لە پرۆژەی مەزن و ئاریشەی دیار و دوورکریگەر. ئەم جۆرە پرۆژانە لەلایەن جەماوەریشەوە پاڵپشتی دەکریٚ بەوەی لەهەمان ئەو کاتەی تێیدا دەژین خۆراك و خواردنەوەی پێویستیان بۆدابین دەکات, بەبێ بیرکردنەوە لە نەوەکانی داهاتوو.

ئەمەش وامان لێدەکات هیچ بەلامانەوە سەیرنەبێت ئەوکاتەی سیاسەت کاران هیچ گرنگی بە پرۆژە زیندەییەماوەدرێژەکان نەدەن, خۆیان بۆ جێبەجێکردنی پرۆژەی ماوەکورت و قازانج خێرادا چڕبکەنەوە !

بەڵام ئەوەی پەیڕەوەکەی داناوە مەبەست لە خۆشگوزەرانی ماوەیەك یان چینێکی دیاری کراوی ئێستا نەبووە, لەبەرئەوەی زۆرجاریش هاوڵاتیان ناتوانن بڕوا بە جێبەجێکردنی بیرۆکەکەی بکەن بۆیە بەناچاری و بەبێ ئومێدیەوە دەڵێن: ئەوکەسە تەنها لەخەیاڵدا دەژی و هیچی تر !

بەڕاستی گەر هونەری سیاسەت کاران بەڕاستی هونەری کاربێت لەسنوری شیماییەدا ئەوا هزەرەوان یان بیرۆکە داڕێژ لەو دەستەیەدەبێت کەخواوەندیش قایل دەکات لەوکاتەی هەوڵی ئەنجامدانی نەکردە دەدات یان داوای دەکات. کەواتە هزرەوان لە هەژمارەکەی خۆریدا خەملاًندنە هاوچەرخەکانی بۆ پەیامەکەی لابەرێت, چون بڕیاردان لەسەر باشی و ناباشی ئەم بیرۆکە و پەیڕەوە کاری وەچەکانی دەهاتوو دەبێت.

خاوەن بیرۆکە مەزنەکان کە هاوچەرخانیان بەجوانی لێیان تێناگەن, گەورەییان بە لەمپەرەکانی خەڵکی کەم نابێتەوە, بەوەی بەباشی دەزانن کە ئەو نەوانەی ئێستاکە نەفرەتیان لێدەکەن سبەی ئەم کەسانەیان لاپیرۆزدەبێتەوە, سبەی ئاکار و فەرهەنگی هزرییان بەسەراسیماو لێکەیشتنەوە ئەخوێنن, لەم ڕێگەیەوەش پێخۆرێکی هەناوی دەئافرێنن بۆنەتەوەو لەکاتی پێویستدا دەتوانرێت کەڵکی لێوەربگیرێت.

***

ئەوەمەی فیدەر یەکەمین وانەی پیٚ وتینەوە لەبارەی سەرمایەوە بۆم دیارکەوت ئەم زەلامە خاوەنی بیرۆدۆزەی نەترسی یە, دەتوانرێت وەکو بنەمایەك بۆ بۆونیاتنانی ئابوری نەتەوەیی ئەڵمانیا کەڵکی لێوەر بگیرێت. فیدەر زۆر بەئاشکرا داوای

جیاکردنەوەی سەرمایەی نێونەتەوەیی یان بازاڕی ئابوری دەکرد لەسەرمای نەتەوەیی؟ چونکە مانەوەی ئەمە بەملکەچی بۆئەوە مانای لاوازکردنی سەربەخۆیی ئابوری وڵات دەگەیەنێت.

ئەمەش بانگەشەی دژە نێونەتەوەیی کردنی ئابوری ئەڵمانی بوو. لەسایەی هزرەکانی فیدەرە و خۆشمەوە بۆم دیارکەوت کە، سەختترین تێکۆشان دەبێت لەبەرامبەر سەرمایەی نێو دەوڵەتیدابێت لەڕێگەی لە گەلانی دژبەری خۆمانەوە. چەندین ڕووداوی پشتگیری کاری ئەم بۆچوونە بەدیارکەوت، تەنانەت سەرکردە بۆرژوازیەکانی ئەم ڕۆژگارەمان هەستیان بەوەکردووە کە سەرمایەداری نێودەوڵەتی تەنها بە هەڵگیرساندنی جەنگی گەورەی جیهانی کۆتایی نەهات ، بەڵکو پاش لەوەی جەنگ تاوانەکانی خۆی ئاشکراکرد، ئەم سەرمایەیە هەوڵی لەناوبردنی ئاشتی و گۆڕینی بۆ دۆزەخێکی پڕ لەئازاری دەدا. هیچ کەسێك نەما کە ئەمەکداری نیشتمان بێت و هەستی بەوەنەکردبێت کە دژبەر کردنی سەرۆك داراییەکانی نێونەتەوەیی و سەرمایەی ئامادەی وام بووەتە ئەرکێکی نیشتمانی و نابێت هیچ لایەنگرێکی نەتەوە دژبەری نەکات، گەر هاتو هەستی سەربەخۆیی و پاراستنی زگارێتی ئابوری نیشتمانەکەی لەئەندێشەدا گەڵاڵە بووبێت.

بەڵام ئەوانەشی کەلە بەرئەنجامەکانی ئەم ئاراستە نەتەوەییە دەترسێن ئەوا ئەمن پێیان دەڕێم: ترسەکەتان لەجێگەی خۆیدا نییە؟ چونکە تاوەکو ئێستاکە ئەڵمانیا زیاد لە یەك چەشنە ڕەچەتەی ئابوری نەشیاوی تاقیکردۆتەوە. مەترسی پیاوانی سیاسەت کاران لەبەرانبەر ئەم جۆرە بیرکردنەوەیەی کە دەستەبەرە بۆ پاراستنی قەوارەی نەتەوەیی بە بۆچونێکی پێچەوانەی ڕای گشتی هەمان بۆچوونی پزیشکانی کۆنگرەی باڤاریامان بیردێنێتەوە کە بە پزیشکانی ئامادەبووی کۆنگرەکەیان گووتبوو بۆچوونی خۆیان لەبارەی زیانەکانی هێڵی ئاسنەوە بخەنەڕوو، ئەوانیش وایان کرد. ئەم کۆنگرەیە دروستکردنی ئەم ڕێگەیەی ڕەتکردەوە بەبیانووی ئەوەی کە گەشتیاران لەکاتی گەشتەکەیاندا بەم ناوچەیە دووچاری سەرەخولێ دەبنەوە و دەنگی شەمەندەفەرەکەش زیان بەدانیشتوانی ناوچەکە دەگەیەنێت، بۆیە داواکرا پێش لەدروستکردنی هێڵەکە لەمپەرێکی تەختەیی یان لەهەرمادیکەی شیاو دروستبکەن.

که بەبێ ئەوەی جەماوەری ئامادەبوو هەست بە تێپەڕبوونی ئەم شەمەندۆفێرە بکەن ئەو قیتارە بەم ناوچەیەدا بەشێوەی مار تێپەڕبێت.

ئامۆشیاری ئەو کەسانە دەکەم کە بڕوایان بە گەشەی پلەکاری هەیە, بەوەی داوایان لێدەکەم ئەم بۆچوونانەیان بەس بابۆ خۆیان بێت, بهێڵن ڕاژەکارانی دڵسۆز و ئەمەکداری نەتەوە هۆکارەکانی گەشە بۆ گەلەکەیان دابین بکەن, بەجۆرێك بتوانرێت لەم ڕێگەیەوە وەچەکانی گەل خۆراکی تەواویان بۆ دابین بکرێت, خوێنیان بە پاقژی بهێڵێتەوە و ئەو ئەرکەش ئەنجامدبات کە خواوەند پێی سپاردووە.

لەم پێناوەشدا دەبێت هەموو ئەڵمانییەك بەو پەڕی توانایەوە کاری بۆبکات, بۆئەوەی سودی بۆی هەبێت پێویستە هزری لەم بوارەدا ڕابهێنێت و بەسەربازی ئەم بوارەی بکات, لەسایەی ئەمەشدا پێویستە لەسەرمان بەجوانی دۆخەکان شیبکەینەوەو کێشەکانمان بخەینە ژێر ڕاڤەکردنەوە, لەم کاتەشدا پلان و ڕێبازەکانمان دادەڕێژینەوە.

پاش لە قوڵبوونەوەم لە توێژینەوەکانی بیردۆزە جوخوازەکانی کارل مارکس بۆم مەبەستی پشت سەرمایەداریم بۆدیارکەوت بەپێی بۆچوونی ئەو, بەڕوونیش هەستم بەوەکرد کە ئامانجی سۆسیالیستی-دیموکراتی چییە لە دژبەری کردنی ئابوری نەتەوەییدا: ئامانجەکەکەی بریتی بوو لەوەی دارایی نیشتمان و ئابوریەکەی بخاتە ژێر دەستەلاتی سەرمایەدارانی نێو دەوڵەتی یان جولەکەوە.

وانەبێژان کاتێك ناکاتێك ڕێگەی تاوتوێ کردنی بۆچوونەکانیان پێدەدایـن. جارێکیان ئامادەی گفتوگۆیەك بووم, دیتم کەسێك زۆر بە ملهوڕیانە و دڵگەرمییەوە بەرگری لە جوولەکە و مارکس خوازەکان دەکات بۆیە منیش وەڵامم دایەوە و پێچەوانە بۆچوونیم خستەبەرباسەوە, بۆئەمەش ئامادەبوان تاڕادەیەکی باش بۆچوونەکانمیان بەدڵ بوو. چەند ڕۆژێك دواتر وەکو پەروەردەکارێکی سەربازی نێردرامە نێو یەکێك لە لەشکرەکانی میونخیەوە.

لەم کاتەدا ڕێکخستن زۆر لاوازبوو, ملکەچیش وەکو ئەرك نەدەبینرا, چونکە فەتارەتەکەی ئیزنر و مانگرتنەکەی گوێڕایەڵی کردبووە خۆبەخشانە, دەبوو دژبەم دژەبۆچوونەم تێبکۆشم, بەڵام بەژیری و داناییەوە, هەروەها دەبوو سەربازانی پێ

سپێردراوم لوسەر بنەمای بیرکردنەوە لەبەرژەوەندی نەتەوەو خاك و نیشتماندا ڕابێنم و گۆشبکەم.

بەخرۆشاوی و ئاست بەرزییەوە دەستم بەکارەکەم کرد, بۆچی چانسی ئەوەم پێدرابوو وەکو وتاربێژ بەختی خۆت تقیبکەمەوە لە گۆڕەپانێکی بەرفراوانی بۆ ڕام کراوم, بەخێرایی هەستم بەوەکرد کە گوتاربێژێکی بەهێز و دەنگ زولاڵم. بەهەڵەدا نەچوومە گەر بڵێم ئەرکەکەم وەکو مامۆستا یان پەروەردەکار بەسەرکەوتوویی ئەنجامدا, توانیم سەدان سەربازی توشبوو بە درمی مارکسیەت بگێڕمەوە بۆنێو پەچەی نیشتمان, دیسانیش توانیم ڕێکخستن تاڕادەیەکی باش پیادەبکەم و بگێڕمەوە بۆ ڕیزەکانی سوپا.

لەو ماوەیەی وەکو مامۆستایەکی سەربازی گوزەراندم توانیم ئاشنایەتی دگەڵ چەندین هاو بۆچوونی خۆمدا پەیدابکەم , بە بەشداریتی ئەوان توانیم دواتر بنەماکانی بزوتنەوە نوێیەکە دابڕێژمەوە.

# بەشی هەشتەم

## پارتی کشتیارانی ئەڵمانی

جارێکیان بروسکەیەکم لەسەرکردەکانمەوە پێگەیشت کەتێیدا داوای ڕاستکردنەوە یان سەرلماندنی بۆچوونێکی دەکرد بەوەی کە دەڵێن: ڕێکخراوێکی نوێ دیارکەوتووە بەناوی ((پارتی کشتیارانی ئەڵمانی)). ئەم پارتە بڕیاری کۆبوونەوەی دابوو لە غۆتفریدفیدەر.

لەوکاتەدا دەست تێوەردانی سوپا لەسیاسەت و ڕەوتی پارتە ڕامیاریەکاندا کارێکی سەرسوڕهێنەر نەبوو. شۆڕش دانی بەوەدا نا کە سوپا یان سەرباز دەتوانێت کاری سیاسی ئەنجام بدات، سوپاش بێگومان ئەم وارە تازەیەی پێخۆش بوو، بەبێ هیچ بیرلێکردنەوە و خۆبۆئامادەکردنێك خۆی تێهاویشت. بەس ئەوکاتەی پارتەکانی ناوەند و پارتی سۆسیالیستی دیمۆکراتی هەستیان بەدوورکەوتنەوەی سوپاکرد لە پارتە چەپڕەوەکانەوە بەرئاراستەی پارت و بوزتنەوە نەتەوەییەکان هەوڵی گەڕانەوەی دوورەپەرێزی جارانیان بۆ سووپا دەدا لەکاری سیاسەتدا، بۆئەمەش ماق خۆهەڵبژاردن و کارکردن لەبواری ڕامیاریان لێسەندەوە.

گەر ئەم پارتە چەپڕەوانە سوپایان لە ڕامیارکاری دوور نەخستایەتەوە ئەوا هەرگیز نەخۆیان و نەحکومەتەکەی خەزەڵوەر لەم بوارەدا سەرکەوتوو نەدەبوون. سوپا

دژبەری ئەم پارتانەی دەکرد بۆ ڕزگارکردنی نەتەوە لە خوێن مژان بەوەی بەم کارەیان دژی پێشبڕکێ کارانە بۆ ڕاژەکردنی هاوپەیمانانی دوژمن لەنێو خوودی وڵاتماندا. لەوەش ناخۆشتر دەستی یارمەتی درێژکردن بوو لەلایەن ئەوانەوەی کە پارت گەلی نیشتمانی نەتەوەخواز بوون بۆ ئەو پارتانەی دژە نەتەوەبوون، بەم کارەشیان دەگەیان لەنیشتمان و سوپاش دەدا.

وادیاربوو ئەم بۆرژوازییە ئاوەز نەزۆکانە لەلایەن مارکسی و هاوپەیمانانەوە ڕاکێش کرابوون، بەوەی کە بڕوایان لاپەیداکردن بەوەی دووبارە دوورخستنەوەی سوپا لە سیاسەت مەنای دروستکردنی قەڵغانێکە بۆ نیشتمان،لەکاتێکدا ئامانجی مارکسیەکان زۆر ڕوون و ئاشکرابوو: نەهێڵن سوپا پشتیوانی پارتە نەتەوە خوازەکان بکات و نەش هێڵن سوپا بەشداری چاکسازیەکانی وڵات بێت و وڵات بەئاسانی دۆخەکەی باشترنەبێت. ناڵێم پارتە نەتەوەییەکان خۆیان بۆئەو بڕیارە یەکلایی کردبۆوە کە سوپا سودێکی نییە بۆ کایەی نەتەوەیی. لەسایەی دەرچوونی بڕیاری زانینی بوونی شوێنی کۆبوونەوەی ئەو بزوتنەوەیەوە توانیم ئەم باسە بوروژێنم، بزوتنەوەی پارتی کشتیاری ئەڵمانی، سووربووم لەسەر ئەوەی بچمە کۆبوونەوەی پارتەکەوە و ئەوەی دەیبنم و دەبیستم بۆ تەواوکردنی ڕاپۆتە هەواڵیەکەم بینوسمەوە.

ئەو دەمەی بە یانەی (سترنکر) لە میونیخ گەیشتم، زیادتر لەبیست کەسم لە ژوورە فراوانەکەی کۆبوونەوەکەدا نەبینی، هەندێك سەربە چینی بەشخوراوی میللەتی شار بوون. لەوانەکەی فیدەرەوە زۆر شت فێر ببووم ، ئەوەی فیدەر پێشکەشی کرد هەمان ئەو بۆچوونانە بوون کەپێشتر بۆی خستبوینەڕوو، بۆیە بەتەواوەتی گوێم بۆ ڕادێرابوون، تەنانەت چاودێری گوێگرانیشم دەکرد. پاش لەوەی ڕۆشتمە هۆڵەکەوە بێگومان بووم لەوەش ئەم بزوتنەوەش بەهەمان چوارچێوەی بزوتنەوەکانی دیکەی پاش جەنگ دیارکەوتوون، تەنانەت دوای تەواوبوونی کۆبوونەوەکە لەهەمان بۆچوون پاش گەز نەبوومەوە.

لەم کاتەدا هەموو ئەڵمانییەك لای خۆیەوە بڕوای بەوەهەبوو کە پێشیاوی گرتنەدەستی دەستەڵاتە و توانای سەرداڕێتی کردنی نەتەوەی هەیە و گونجاوە بۆ قوتارکردنی وڵات لەو پاشا گەردانیەی تێی کەوتووە. پارتەکان بەبێ نانەوەی دەنگە دەنگ دیاردەکەون و لەناودەچنەوە؟ چونکە بنەمای لەسەر دامەزراو و بڕواکەیان

بمێزنەبووە، نەیان دەزانی ئامانجی تەواوی ئەم بزوتنەوەیەیان چییە و لەداهاتوودا بەرەو کوێ ئاراستەیان دەکات.

پاش لێبوونەوەی فیدەر لە قسەکانی پێشکەشکاری کۆبونەوەکە کەسێکی دیکەی پێناساندین کە دژە فیدەر و بەدرۆخارەوەی قسەکانی فیدەر بوو. چونکە فیدەر لەبواری بیردۆزیەوە قسەی دەکرد بەڵام ئەم کەسە لەبواری جێبەجێ کاری. ئەم کەسە پێشنیاری بۆ سەرانی ئەم پارتەکرد کە وەرنامەکەیان برگەیەکی تایبەتی تێدابێت لەبۆ کشانەوەو جیابوونەوەی باڤاریا لە نەمسا ، بەتەواوەتی جەختی لەوە دەکردەوە کەپاش جیابوونەوەی باڤاریا نەمسای ئەڵمانیش بەتێپەربوونی کات دەچێتە پاڵ باڤاریا. بەڕاستی ئەم قسانەی دووچاری شۆمیان کردم، ورووژاندمی و داوای مۆڵەتی قسەکردنم کرد، وەڵامێکم دایە پێش لەوەی لەقسەکانی بێتەوە بەتەواوەتی دەستی لەقسەکردن هەڵگرت و لە کۆبونەوەکە ڕۆیشتە دەرێ. بەڵام ئامادەبوانی تر بەو پەڕی چێژوەرگرتنەوە گوێیان بۆ قسەکانم ڕادێرابوو، هەموان دەستخۆشیان لێکردم، بەرلەوەی لە هۆڵەکە بڕۆمە دەرێ کەسێك نامیلکەیەکی گچکەی خستە نێو دەستم و داوای خوێندنەوەی لێکردم، بەخۆشحاڵیەوە ئەو نامیلکەیەم وەرگرت ؟ چونکە چیتر پێویستم بەوە نابێت لە کۆبوونەوەکانی پارتەکەدا ئامادەبم بەمەبەستی زانینی مەبەست و ئامانجە دوور مەوداکانی.

لە چادرگەی لەشکری دوو، لەژورەکەمدا دەستم دایە هەڵدانەوەی یەك بەیەکی لاپەڕەکانی نامیلکەکە، وام دەزانی ئەمە وەرنا و پەیرەوی پارتە نوێیەکەیە، ئەوکاتەی لێم ڕوانی دیتم دانپیانانی کرێکارانی ئەڵمانی یە-ڕەنگە نوسراوی ئەو کەسەبێت کە نامیلکەکەی خستە نێودەستمەوە-بەساکارییەوە باسی لە ((بەئاگاهێنانەوەی هزری))دەکرد، بەخێرایی دیتم بەخرۆشەوە دەیخوێنمەوە؛ چونکە ئەم پیاوە بەهەمان ئەو قۆناغانەی مندا تێپەڕیوە کە منیش پتێیدا تێپەڕیوم، پلەبەپلە دەرروونی خۆی بەرەو سەرکەوتن ڕاهێناوە و گەیشتۆتە قۆناغی جێگیری. ئەم کەوسە پەیوەندی بە بزوتنەوە کرێکاریەکانەوە کردووە و تادوا بزیسکی هێزی خۆی بۆ کردونەتەقوربانی، بەڵام ئەودەمەی هەستی بەوەکردووە کە مارکسیزم جەنگێکی دژە نیشتمان و نەتەوەیە و هەوڵی لەناوبردنی بەهار و پیرۆزیەکانی نەتەوەدەدات بۆیە دەستی لێیان هەڵگرتووەو لەمەنگاوەکانی دیکەشی پەژیوانە.

دوو هەفتە پاشتر نامەیەکی وەرگرتنم لە لەلایەن پارتی کشتیارانی ئەڵمانییەوە پێگەیشت بەوەی بوومەتە ئەندام، داوای ئامادەبوونی لێدەکردم لە کۆبوونەوەکانیدا. بەڕاستی زۆرم سەیر لەوە دەهات چۆن دەتوانرێت لایەنگر بەم شێوەیە بۆ پارت و بزوتنەوە کۆبکرێتەوە، هەمدیس بەهۆی ئەوەی بڕیارم دابوو خۆم پارتێك دابمەزرێنم و سەرکردایەتی بکەم، بۆیە بەتەنگ بانگەشەی بەئەندام بوونەوەم لەم پارتەدا نەڕۆشتم. ویستم داوای لێبوردنیان بۆ بنوسمەوە بەڵام لوتبەرزیم نەیهێشت، بۆیە بڕیاری ئامادەبوونی کۆبوونەوەکەم دا.

لەکاتی دیاریکراودا گەیشتمە میوانخانەی ڕۆزنباد شوێنی کۆبونەوەکە، ڕۆشتمە ژوورێکی گەورەوە کە مێزێکی لەناوەڕاستدا دانرابوو و لەسەر کورسیەکانیش چوار گەنج دانیشتبوون، هەستم کرد یەکێکیان ئەوکەسەبوو کە نامیلکەکەی پێ دام. بەگەرمیەوە چاك و چۆنی لەگەڵ کردم و بەهاوڕێکانی ناساندم و باسی نیشتمان پەروەری و نیازپاکیمی بۆکردن، دواتر فەرمووی دانیشتنم لێکرا، پێیان ڕاگەیاندم: هەموان چاوەنواڕی هاتنی سەرۆکی پارتن...دوای چەند خولەکێك سەرۆك گەیشت و بۆم دیارکەوت هەمات کەسی پێشکەشکاری کۆبوونەوەکەی مەیخانەکەی پێش لەدووهەفتەیە. بەرلە دەستکردن بەقسەکردنی فەرمی بۆم دیارکەوت سەرۆکی باڵا ناوی (هاریردان)ە، سەرۆکی لقی میونیخیش ناوی (ئەنتوان در کسلر)ە.

پاش لەخستنەڕووی کۆمەبەستی کۆبوونەوەکەی ڕابردوو، دواتر ئەمینداری دارایی پارت هاتە قسە و گووتی: کۆی ئەو پارەیەی هەمانە تەنها حەوت مارك و نیوە، هیوا زۆرە بەوەی لەداهاتوودا ئەم بڕە زیادبکات. ئامادەبوانیش متمانەی خۆیان بە ئەمینداری دارایی پارت بەخشیەوە، ئینجائەمەشیان تۆمارکردەوە.

پێش لەمەنگاونان بەرەو خستنەڕووی خشتەی کارەکان سەرۆکی پارت هەستا بە خوێندنەوەی سێ نامەی وەڵامی پارت کەلە بەرلین و کیبل و دۆسلدرۆفەوە بۆیان نێردرابوو. ئامادەبوانی کۆبوونەوەکە زۆر شادومان بوون بەم چەشنە نامە گۆڕینەوانە و بەفراوانبوونی پارتیان لەقەڵەم دەدا. لەکۆتادا ئامادەبوان گەیشتنە خشتەی کار یان پەیڕەوی مەبەست. لەم کاتەدا کێشەی پاڵێوران هەبوو بۆ پەیوەندی کردن بەم پارتەوە. لەم کاتەدا سەرۆکی پارتەکە پرسیاری ئەوەی لێکرد کەئایا بەڕاست تۆ دەتوانی هاوکاری ئەم پارتەمان بکەیت و ئەمەکداربیت بۆی؟ بەڵام من وەڵامی ئەم

پرسیارەم نەدایەوەو لەبریدا پرسیم: کار و ئامانج و بنەما فەلسەفیەکانی پارتەکەتان چییە ؟ ئەی شێوازی کارکردنتان؟ بەڕاستی وەڵامەکان بۆمن ڕوون نەبوون، بۆیە لۆم دیارکەوت ئەم پارتە هیچ ئامانجێکی نییە و تەنها دەیەوێت بوونی هەبێت و هیچی تر، بەڕاستی دانیان بەوەدانا کە تاوەکو ئێستا پەیڕەو یان خشتەی کاری پارتەکەیان نەنوسیوەتەوە و شتی لەم جۆرەیان نییە، بەهۆی لاوازی دۆخی داراییانەوە توانای چاپکردنی بلاْوکراوەو ئامادەکردنی تەسکەرەی ئەندامێتی و ئاراستەکردنی داوەتنامەی چاپکراویان نییە، بەلاْم بەشێوەیەکی گشتی وادیاربوو ئامانجی گشتی ئەم بزوتنەوەیە بوژانەوەی ئەلْمانیا و گەڕانەوەی سەروەریەکانی ڕابردووی بووە.

ئەم گەنجانە وایان هەستدەکرد نیشتمانەکەیان، ئەلْمانیا، لەسەر لێواری مەرگە و ئەو پارتانەی هەن توانای ڕزگارکردنی ولاْتیان نییە، بۆیە ئەمانەش بڕیاری دامەزراندنی ئەم پارتەیان داوە بەمەبەستی پاقژکردنەوەی ولاْت لە مشەخۆر و زەروەکانی نێوخۆی ولاْت و ئازادکردنی لەکۆت و بەندی دەرەکیش.

ئەو دەمەی لەنیوە شەودا بۆ خێوەتگەی سەربازگەکەم گەڕامەوە خۆم لەپێش ئاریشەیەکی زۆر ورددا بینیەوە: ئایا بەڕاست دەبێت لەم بزوتنەوەیە دابڕێم یان بچمە نێویەوە؟ بۆچەند ڕۆژێك بیرم دەکردەوەو تێدەفکریم، هەست و سۆز هانی تەقلبونی دەدام بۆ ڕیزی پارتی کشتیارانی ئەلْمانی بەلاْم ئاوەزم هانی خۆ بەدوور گرتنی دەدام لەم پارتە. خۆنەگەر من لەو جۆرە کەسایەتیانە بوومایە کەبەئاسانی بۆچوونی ڕامیاریان دەگۆڕن ، ئاسانتر لەوەی جلیان بگۆڕن، ئەوا تەقلی ئەم بزوتنەوەیە دەبووم، بەدوو هەفتە پاشتر بڕیاری تەقلبونم دا بۆ نێو ئەم بزوتنەوەیە، لەم کاتەدا وام هەستدەکرد ئێشی من تەواو، ئێرە دوا سنوری خۆمە و بۆخۆم بڕیاری کۆتایی چارەنوسی خۆمم نوسیوەتەوە. بەو مەبەستەش قایلی تەقلبونە نێو ئەم پارتەم دا کە ئەم بزوتنەوەیە پێویستی بە کەسێکە ڕێبەریان بکات و ئامانج و وەرنامە و پەیڕەویان بۆدیاری بکات و بنوسێتەوە و کاربۆ گەیشتن بەئامانجە پیرۆزەکانیان بکات، سەربەخۆیی ئەلْمانیا لەدەست داگیرکارە بیانیەکان و مشەخۆر و خوێن مژانی ناوخۆیی ولاْت، وام هەست دەکرد دەتوانم بەدڵی خۆم لەداهاتوودا ئەم بزوتنەوەیە بەو ئاراستەیەدا بەرم کەبڕوام پێیەتی و بەئامانجی گەیشتن بە ئامانجە گەورەکەم.

بروام وابوو نەداری خاڵی لاوازی من نییە, بەڵام ئاخۆ ڕێگاچارەسەر بۆ ڕزگارکردنم لە چوارچێوەی هاوڵاتی شاراوە کامەیە؟ ئایا بەڕاست من هاوڵاتییەکی بێچارە نیم لەنێو چەندین ملیۆن کەسدا؟ لەکوێ بووە کەسێکی بێناو بتوانێت دژبەری سەرکردە بزوتنەوە و پارتەسیاسیە ناودارەکان بکات ؟

لەو چەشنە مرۆڤانە نیم لوتبەرزیم لەڕێم لادات و ئاراستەکەم بگۆڕێت. بەڵام هەمدیس ون ناویشم بە کۆسپی پێش سەرکەوتنم نەدەزانی. ئەی بڕوانامە نزمەکەم, بۆئەمەش بەردەوامی دانم بەخوێندنەوە بەباشتر زانی وەك لە هەوڵدان لەبۆ بەدەستهێنانی بڕوانامەی بەرزتر.

بەم چەشنەش بەئەندامی کاتی ژمارە ٧ تەڤلی نێو ڕیزەکانی پارتی کشتیاری ئەڵمانی بووم.

# بەشی نۆیەم

## هۆکارەکانی تیاچوونی

ئەودەمەی تەنێك دەکەوێت قولایی کەوتنەکەی بەپێی ئەو ماوەیەی لەنێوان دۆخە نوێیەکە و ئەو دۆخەی کەپێش لەکەوتنەکە هەیبووە دەپێورێت. ئەم بنەمایەش دەتوانرێت بەسەر داکەوتنی گەلان و ولاتیشدا جێبەجێ بکرێت.

داکەوتنی فەرمانفەرمایەکە زۆر مەزن بوو؛ چونکە لەبەرزاییەکی بەرزەوە کەوتەخوار. ئەو فەرمان فەرمایەی داڕووخا دامەزراندنی بەرئەنجامی کارەفرەوێژییەکانی ئەندامانی ئەنجومەنی نوێنەران و گزی و تەڵەکەبازی سیاسی کارانیش نەبووە، بەڕاستی بەهێزی پێشمەرگەکان پونێت نرابوو، بەرئەنجامی زنجیرەیەك سەرکەفتنی ڕەوا و ئەنجامدراوی نەمرانەبوو. بێگومان دامەزراندنی فەرمان فەرما بەرئەنجامی کاری فرەوێژی قسەی زۆر بلێیانی ناوەوە و دەرێی پەرلەمانێن نییە. بەرکو ئەو دەمەی تۆپەکان بۆمب بارانی پاریسیان دەکرد لە جەنگی حەفتادا ئەم بیرۆکەیە لای گەل پەیدابوو، دواتر بڕوایان پێی هێنا و دواتر ئەڵمانەکان بڕیاریان دا، سەردارانی گەا، کە فەرمان فەرمایەك دابمەزرێنن و تاجی ئیمپراتۆریش جارێکی دی وەکو ناونیشانی یەکێتی پیرۆزی خاکی ئەڵمان دەست نیشان بکەن.

ولاتەکەی بسمارك بەرئەنجامی کوشت و بڕی زۆری بێ ئەنجام نەبووە، دەستی کەسانی سیاسەت کاریشی تیادا نەبووە لەبەدی هێنانی ئەم خەونە نەتەوەییەدا.

بەڵکو پاڵەوانانمان لە مەیدان و گۆڕەپانەکانی جەنگدا بەدەستیان هێناوە، یاخود دروست و پونێتیان ناوە.

ئەم یەکێتی و هەوڵە دیارکەوتنی فەرمان فەرمایەکی بەخەرمانەیەك لە پیرۆزی مێژوویی چواردووبەر گرتبوو، ئەودەمەی دەستی دایە سەرکەوتنەکان و هەنگاوی نەترسانەیان دەنا ئەوکات جیهان لەوە دڵنیابوونەوە کەئەم چەشنە هەنگاوانە تاکۆتا بەردەوام دەبێت و دەگاتە دوندە و دواتر دەست بەسەرجیهاندا دەگرێت و سەرپەرەشتی دەکات. لە باوەشی ئەم فەرمان فەرمایەدا نەتەوە دڵخۆش بوو بە سەروەرێتی و ئارامی و لەخۆش گوزەرانیدا دەژیا. ئەم وڵاتە بووە خاوەنی هێز و دەستەڵاتێکی زەبەلاح بەپشتیوانی سوپایەکی گەورە و سەرکردەیەکی بیرفراوان و ژیر و بەیارمەتی نەتەوەیەك کە بڕوای بەخۆدیاری کردنی چارەنوسی خۆی هەبووە.

بەڕاستی سەیربوو ئەوکاتەی لە دوندەدا ئەم فەرمان فەرمایە دابکەوێت. هەموو گەلی ئەڵمان سەیریان لێدەهات و بڕوایان بەوە نەدەکرد. توشی شۆك هاتبوونەوە. تەنانەت وایان لێبەسەرهاتبوو نەشیان دەتوانی بیرۆکەیەکی جوان و ڕێکخراو بۆ وڵاتەکەیان لەمێشکیاندا کۆدابکەن کەتایبەت بێت بەماوەکانی پێش لەداڕووخانی. کەواتە زانینی هۆکاری تیاچوون و دارمان پاش لە دەست دەرچوونی دۆخەکە سودی چیی دەبێت گەر بەچاوی خۆت کلۆربوونی پایەکانی وڵات و لەقبوونی کۆڵەکەکانی لەسەر وەستاوی وڵاتەکەت ببینیت و بزانیت ؟

ژمارەی ئەو هاووڵاتیە ئەڵمانیانەی کە تێبینی کەوتنی وڵاتەکەیان دەکرد لەکاتی خۆیدا زۆر کەم بوون. ژمارەیەکی زۆر کەمیشیان نیشتمانی ئەم پەتاکوشندەیە ناشنابوون و هەوڵی سڕینەوەو قڕکردنیان دەدا.

ئەم کەسانە نەیان توانی ئەم پەتایە بەباشی لەناوبەرن؟ چونکە تاڕادەیەکی زۆر دەرکەوتەی نەخۆشی و هۆکارەکەیان لێ تێکەڵاو ببوو. ئەوەتا ئەمڕۆ زۆرینەمان لەبەرامبەر ئەم پەتایەدا دۆڕاوین و بگرە بەکارێکی ژیرانەشمان دەزانی کەئەم داڕووخانە ڕووبدات؟ چونکە گروپی لێکۆڵەر و شارەزا ئابوورییەکانی وڵات ئاستی ژیریان لاوازبووەو دەرکیان بە بەشوێندا هاتووەکانی ئەم فەتارەتە نەکردبوو ئەم بۆچوونە نەشیاوە تەنها لای دەستە ماف خوراوەکاندا بەرجەستە نەبووبوو کە تەنها باشکردنی دۆخی ژیانی خۆیانیان دەوێت! لەشێوەی کرێکاراندا. تەنانەت ناوەندە

ڕۆشنبیریەکانیشی داگیرکردبوو، بەوەی ئەمانە پێیان وایە کە شکست پێش لەسەربازی بەسەر ئابوریدا دەچەسپێت، ئەمانە هەوڵی پێکهێنانی پایەی ئابوری نوێیان دەدا لەسەر بنەمای ئابوری شیاو و تەندروست.

هۆکاری ئابوری پێویستە لەخانەی سێیەم یان دووەمدا بێت، لە لوتکەی ئەو هۆکارانەی کە بوونە هۆی ئەم دارمانە فاکتەری سیاسی و هەناوی و فاکتەری خوێن بوون. لەسەر بنەمای ئەم چەشنە هەستکردنەمان سەرکەوتنمان دەوەستێتەسەر دەست نیشان کردنی پەتاکە و لەناوبردنی، دواتریش دۆزینەوەی چارەسەری گونجاو بۆ نەخۆشانی بەرکەوتووی ئەم پەتایە.

ئەمەش وامان لێدەکات ڤەکۆڵین لە هۆکارەکانی دارمانی ئەڵمانیا ببێتەکارێکی مەردانەی مەزن، بۆیە پێویستە لەسەر هەموو بزوتنەوەیەك کاروچالاکی خۆی لەم بوارەدا برەوپێبدات بەومەرجەی بەقازانجی نەتەوەو دژە دۆڕان کۆتایی پێبێت.

لەو ڕاڤە باوانەی کەلەم ڕۆژگارەماندا بۆ دارووخانی ئەم ئیمپراتۆریەتە دەکرێت: دەبێت سزای ئەو جەنگانە هەڵبگرین کە کردومانن، ئەو کێشە و ئاریشانەی دووچارمان بووەتەوە بەرئەنجامی جەنگە دۆڕاوەکانمانە.

بێگومان هەندێك لەهاولاتیانی ئەڵمانی ئەم ڕاڤەیە بە نیاز پاکیەوە وەردەگرن. بەلام ژمارەی ئەوکەسانەشی هەوڵی ڕێ وێڵکردنی دانیشتوان دەدەن زۆرن و وەکو زەروو لە دەزگاکانی دەوڵەتەوە خوێنی میللەت دەمژن.

هاولاتیانی ئەڵمانیا هێشتاکە گلەیی بانگەشەکارانی شۆڕش گێڕانی مارکس خواز و جوەکانیان لەبیرنەکردبوو لەبەرامبەر گەلی ئەڵمانیادا؛ چونکە ئەم شۆڕشەیان نەبوەهۆی درزخستنە نێو گۆپاڵەی گوێڕایەڵی و جەنگ لەبۆ کەمکردنەوەی چێشی سەرکەوتن لای سەرمایەداران. ئایا ئەو شۆڕش گێڕە خوێڕیە غەیانەت کارانە دووپاتی ئەوەیان نەدەکردەوە کە لەناوبردنی گیانی سەربازی پروسی هۆکاری دەستەبەریی ئاسایش و بوژانەوە و ژیان ئازادی ولاتە؟ پاش لە فەتارەتەکە دیتمانن ئالای تاوانبارکردنی سەربازییان بەرزکردەوە، بەوەی ئەم شکستە بەرئەنجامی نانەبەزی سەربازان و سەرکردە سەربازیەکان بووە ؟!

گومان لەوەدا نییە شکستمان لە جەنگدا خراپ کاریگەری دەبێت لەسەر داهاتووی نەتەوەکەمان. بەلام ئەم شکست خواردنە هۆکاری سەرەکی ئەم کاریگەر دیارکەوتنە

نەبووە. بەڵكو هۆكار گەلێكی دیكەبوون كە ئێستاكانێ ئەمانە خۆیانی لێ بێبەری دەكەن. ئەمانە هۆكاری بڵاوبوونەوەی فەتارەتەكەبوون لەوڵاتدا كەئەویش بەرهەمەكەی جگە لەشكست بەخشین بەمناخی سەربازەكان و چەك دانان زیادتر هیچی دیكە نەبوو. ئەمانە هەموو شتێك دەخەنە ئەستۆی سەركردە سەربازییەكان و خۆیان وەكو بای بەیان بۆی دەردەچن و بێبەری دەكەن. سوپای ئەڵمانی بوێر لەبەرامبەر سوقایەكی چەند هێندكی خۆی بوویەوە. جا لەڕووی ژمارەی سەربازەوە بوو بێت یان جۆر و چەشنی چەكی بەكارهێندرا. لەماوەی چوار ساڵدا توانی گەورەترین گورزیان لێ بوەشێنێت و گەیاندیانیە لوتكەی مردن و لەناوچوون، بەڵام ئەفسووس.

تیاچوونی بەرەی ئەڵمانی فاكتەری ئەم ئاریشەیەی ئێستا نییە. بەڵكو بەرئەنجامی تاوانی ئەو كەسە غەیانەت كارانەیە كە دەیان هەوێت هەموو بەرپرسیارێتیەكان بخەنە ئەستۆی سوپا و وەكو قوربانی لەناوی بەرن. لەكوێ بووە تەنها دارمانی سەربازی تەواوی دەوڵەت و نەتەوەبێت؟ كوا شكست خواردن لەجەنگێكدا مانای تیاچوون و هەڵوەشانەوەی نەتەوەی شكست خواردووە ؟

ئەو دەمەی گەلێك دووچاری شكست دەبێتەوە بەهۆی خوێڕێتی و ترسنۆكییەوە ئەوا ئەو گەلە بەئەنجامی كاری خۆی گەیشتووە. بەڵام كوا بووە گەلێك بەهۆی تەنها شكستێكی سەربازییەوە دابڕووخێت لەكاتێكدا گەلەكە قارەمانانە جەنگابێت و هەوڵی سوود وەرگرتنەوە بدات لەم جەنگە دۆڕاوانەی . مێژووش پشت ڕاستی ئەم قسانەم دەكاتەوە.

زۆر بەداخەوە شكستی سەربازی نەتەوەكەمان تەنها تۆڵەیەكی خواوەند بووە لە نەتەوەكەمان كردیەوە. ئەم شكستە دیاردەیەكی بەرجەستە پێكدێنێت كە لەسایەی هەڵوەرینی بڕواكانی هاوڵاتیانەوە لەبۆ دیتنی دەركەوتەكان گەشەدەكات.ئەو دەمەی گەلی ئەڵمان خۆشحاڵی بۆ شكستەكە دەربڕی ئەم بیرۆكە بۆگەن و ترسناكانە دیاركەوتن.

ئایا ماركس خواز و ناوەندە سەر لێ شێوێنراوەكان لەلایەن جوولەكەوە خۆشییان دەرنەدەبڕی لەبۆ شكست خواردنی وڵاتەكەیان لەجەنگدا؟ ئایا هەندێكی دیكەمان شادەمانی پیشان نەدەدا بەوەی خاڵی سەرەتا و كۆتایی لەبۆ داڕووخانی دەوڵەتەكەی بەدەستی خۆی بووەو دوژمن تەنها بروسكەیەكیان بۆناردووەو ئەو خۆی هەموو

کارەکانی دیکەی ئەنجامداوە؟ ئایا دەستەیەك لەئەڵمانیەکانی خۆمان جەنگی بەدبەختی هێنیان هەڵنەگیرساند؟ گەلی ئەڵمانی لەرێگەی ئاوەزەوە ئەم شکستەی قبوڵکرد, کەواتە دەتوانین بڵێین: ئەو نەهامەتیەی بەسەریدا هات ماف خۆی بووە و پێی بەخشراوەتەوە, بوڕاستی چارنووس ئەم شکستەی بۆ نەنوسی بووین, چونکە گەر دەستی چارەنوسی تێدابووە ئەوا دڵمان پڕدەبوو لە ڕق و کینە لەبەرامبەر ئەو دوژمنانانەمان کە شکستیان پێ هێنابووین و بەدووی ڕۆژی سەرکەوتنماندا دەگەڕایان, نەتەوەش هەمووی بۆ پێشوازی کردن لە سەربازانی گەڕاوەی بەرەی جەنگ ڕیزیان دەبەست و سەرلەنوێ باوەڕ و متمانەی خۆیانیان پێدەبەخشینەوە, ئای کەوا نەبوو !؟

بێگومان, گەر چارەنووس بەرپرسی ئەم شکستەمان بوایە ئەوا هیچ کەس لەبۆ ئەم شکست هێنانەمان خۆشحاڵی دەرنەدەبڕی و سەمای نەدەکرد و گۆرانیان نەدەوتەوە, هیچ کەسیش نەی دەوێرا بەلوتبەرزییەوە شانازی بە بەشدارێتی خۆی بکات لەبۆ لاوازکردنی بەرەکانی جەنگی ئەڵمانی و درز تێخستنی‌و ئەوانەشی مارکس خوازەکان چەواشەیان کردبوون و دەستیان بەسەر ئاوەزیاندا گرتبوو هەرگیز بەشان و باڵی دوژمندا هەڵیان نەدەدا وشانازییان بەشکستی و کەوتە چاڵەوەی خۆیانەوە نەدەکرد. سوکایەتیشیان بە سوپا ماندووە گەڕاوەکەی جەنگ نەدەکرد و ئاڵاکانیان بەر پێ لەقە نەدەدا! تەنانەت ئەم دۆخە وای کردبوو کەیەکێك لە ئەفسەرە ئینگلیزەکان بەناوی ریغنتۆن بڵێت: لەنێوان هەرسێ ئەڵمانییەك یەك دانەیان غەیانەت کار و ناپەکە !؟

بەڵێ بەڕاستی ئەم دۆڕانە یەکێك بوو لەبەرئەنجامی دەرهاویشتەکانی ئەو پەتایەی کە توشی نەتەوە هاتبوو‌ز ئەم پەتایە خۆڕاگری نەتەوەی ئەڵمانی کلۆرکرد و داب و نەیت و ورەو مەردایەتی سروشتی بۆ مانەوە و حەزی جەنگین لەبۆ سەرکەوتنی لاوازکرد, ئەو جوولەکە و مارکس خوازانەی کە ئەم شکستەی وڵات بەرئەنجامی کاری جێبەجێ کردنی نەخشەکانی ئەوان بوو هەوڵی ئەوەیان دەدا کەئەم فەتارەتە هەموو تاوانەکانی بخەنە ئەستۆی تاکە کەسێکەوە کەناوی (لودندرۆف) بوو.

بەم هەنگاوەشیان توانییان ئەو هێزە لەدەستی ئەم سەرکردە پاکە وەرگرنەوە کە دەیتوانی وڵات لەم ناپاکانە لە وێڵکاران پاقژ بکاتەوە, لودندرۆف ی تۆمەت بارکراو بەشکست پێهێنانی گەورەییەکانی ئەڵمانیا بۆیە لەڕۆژی لێپرسینەوەدا ئەم کەسە

توانـای بـەرگری لـەخۆکردنی نابێـت، ناشـتوانێت کاربکاتەسـەر وەرچـەرخانەکانی دۆخەکە.

ئەودەمـەی مـارکس خـواز و جوولەکـە مامۆسـتاکانیان ئـەم درۆیـەیان تـەفرکردەوە بەباشـی دەیـانزانی نـەختێك لـەم درۆیە لەمێشکی ئەڵمانیەکانـدا دەمێنێتـەوە و دواتر کاریگەری خۆی دەبێت، ئەمەش لەداهاتوودا کاریگەری خۆی دەبێت لەسەر وێڵکردنی ئـەو کەسـانەی بـەدووی تۆمـەتبارانی ڕاسـتەقینەوەن.بەڕاسـتی باشـیان خەمڵانـدبوو، تـوانی بوویـان پشـت بەسـت بـە دەروونـی جـەماوەر ئـەم درۆیێـەیان شـێوەیەکی ڕاستەقینەیان پێبەخشی. ئەوکەسەی بۆمـاوی چوارسـاڵ تـەنها بیری لـە سەرخستنی وڵات و بـەدی هێنـانی خۆشـگوزەرانی دەکـردەوە بـۆ وەچـەکانی داهـاتووی وڵات وا ئێسـتا تۆمـەتبارکراوە، ئـەم کەسـە لەبەرئـەوەی خـۆی خـەڵکی بـەبێ تـاوان و چـاك دەزانێـت وای هەسـت دەکـرد ئـەوانیش وابـن. بێگومـان درودەلەسـە خەسـڵەتێکی سروشتی و تایبەتی گەلی بژاردەیە. ئایا بنچینەی دامەزراندنی ئەم کۆمەڵەیە خوودی درۆ نییە بەوەی دەڵێن ئێمە خاوەن یەك ئاینین لەکاتێکدا ئـەوان بۆ نـەژاد کاردەکەن، بەڵام کام نەژادن ؟

شـوێن هـاوەر لـە باسـی جوولەکـەدا ئێـژێت : ((گـەورەترین مامۆسـتای هونـەری درۆکـردنن)). بێگومـانین لـەوەی لـەم ڕۆدا هـەموو ئەڵمانییـەك بەباشـی ئـەوە دەزانێـت کەئەم پیاوە پاك و بێ تاوانە، جا ئەو کەسـەش نکوڵی لـەم ڕاسـتیە بکـات یـان ئـەوەتا شێتە یام دڵپاك و زووخەڵەتیاو، ڕەنگە ترسنۆکبێت و خۆی لەدەرخستنی ڕاستیەکان بدزێتەوە.

بۆ چـانس باشـی گەلەکەمان ئەو پەتایـەی وەخـت بـوو هـەموو لەشـی نەتەوەکەمان داڕزێنێت لەناکاو بەشێوەی فەتارەت دیارکەوت و هەموان لێـی بەئاگا هاتنـەوە ئەگینا بەرەبـەرە هـەموو لەشـی نەتەوەکـەمانی هەڵدەپڕوقانـد و تیـای دەبـردین ، ئـەم خێـرا کاریگەربوونەی زۆر لەوە باشتر بوو کەلەسـەرخۆ و درێژخایـەن بێـت. مرۆڤ دەتوانێت بەئاسـانی بەسـەر نەخۆشـی چـاوەقوڵەدا زاڵبێـت بـەڵام نەخۆشـی سـیل زاڵ بـوون بەسـەریدا ئاسـان نییـە، چـونکە چاوەقوڵە لـەناکاو بەشـێوەیەکی خێـرا دیاردەکـەوێت کەسەکە دەزانێت چی توشی بووەو بەڵام سیل یـان دەردەباریکـە کوشـندە و لەسـەرخۆ کاریگەرە. چاوەقوڵە ترس و نەهامەتی بڵاودەکاتەوە، بـەڵام سـیل بـەهێمنی کاریگەری

خۆی دەنوێنێت، ئەودەمەی مرۆڤێك دووچاری چاوەقوڵەدەبێتەوە هەموو كارێك بەس بۆئەوەی لێی ڕزگاربێت بەڵام سیل لەبەرئەوەی بەیەكجار كاریگەریەكانی دیارناكەوێت بۆیە كەسەكە تەوەزەل دەبێت لەبەرامبەر لەناوبردنیدا . ئەمەش وادەكات لەكۆتاییدا دەردی یەكەم كەم كاریگەرتربێت لەدەردی دووەم. بەم ڕێگەیەش مرۆڤ توانی ناخون و چنوڕكەكانی چاوەقوڵە ببڕێت بەڵام لەبەرامبەر دەردەبارێكەدا تائێستا دەوەستانە.

بۆیە ئەو پەتایانەی دووچاری نەتەوەكان دەبێت هەندێك درێژخایەنە و هێندێكی دی خێرا و لەناكاو. سەركەوتن لە چارەدۆزینە و لەناوبردنی پەتای باودا بەندە بە دۆزینەوەی چارەسەر بۆ خودی بنچینەی پەتاكەكە. یان قرتاندن و ڕیشەكێشكردنی پەتاكە لەبنەڕەتەوە.

ئێمەی ئەڵمانی ئەودەمەی هەوڵی دەست نیشان كردنی پەتاكەمان دا هۆكار و دەركەوتەكانی پەتاكەمان تێكەڵ كرد. بڕوامان وابوو كە ئاریشەی كۆمەڵایەتی-ئابوری فاكتەری هۆكارە لەكاتێكدا ئەمە جگە لە دەركەوتەیەكی پەتا كوشندەكە زیادتر هیچی دیكە نەبووە.

ئەودەمەی ئەڵمانیا دەست نوقاوی نواند لەبەرامبەر وەچەكانیدا كەساڵ بەدووی ساڵ ڕوویان لەزیادبوونە، پەیداكردنی نانی ڕۆژانەی خەڵك گرنگی زۆری هەبووە لە دارشتنەوەی پلانەكانی بەرپرسانی وڵات. لەجیاتی ئەوەی لەخوودی ئەورووپادا بەدووی فراوانكردن زەوی و دابینكردنی قوتی هاوڵاتیاندا بگەڕێن. بەڵام ئەم سیاسەتە پشت گوێ خرا، ئەمەش بۆئەوەبوو كە سیاسەتی تایبەتی دابڕێژنەوە بەمەبەستی دەستگرتن بەسەر جیهان لەڕووی ئابورییەوە.

ماركس خوازەكان ئەم خراپی باری گوزەرانی نیوەی دانیشتوانەیان قۆستەوەو توانییان تۆوی ڕق و كینە لەناخی چینی كشتیاراندا بچێنن و نەتەوەو دەوڵەت دابەشی دووچین بكەن: چینی پرۆلیتاری زۆرینەی هەژار و چینی بۆرژوازی و سەردەستەی دەوڵەمەند.

ئەودەمەی ئابوری وڵات بەرەو بوون بە كۆڵەكەی پشتی وڵات هەنگاوی دەنا سەروەت و دارایی لەسەر كورسیەك دانرابوو كە پەرەستنیان بۆ دەكرد لەڕێگەی هاندانی كەسێكەوە كە دەبوو دژبەری ئەم ململانێیەی بكردایە و سنوری بۆ مەترسیەكانی دانابایە. بەڕاستی فەرمان فەرما غولبوو كەوتە هەڵەیەكی گەورەی

شایسته بەلێخۆش نەبوونەوە کە هانی خانەدانەکانی دا بۆ تەقل بوونە نێو کاروباری داراییەوە، ئەگەر بەجوانی بیری بکردایەتەوە ئەوا خانەدانی بۆجێماو، خانەدانی خوێن، ئەودەمەی خانەدانی دارایی دێتەئاراوە خۆیشی ناناسێتەوە، چونکە گرێبەستە داراییەکان بەهێزترە لەکێشکردنی خانەدانەکان وەك لە جەنگ. ئەو خانەدانانەی ڕاژەی فەرمان فەرمای وڵاتی ئەڵمانیایان دەکرد بێ ئاگابوون لەوەی شکستی ئیمپراتۆر یان فەرمان فەرما مانای شکستی ئەوان و لەناوچونیان، لەبەرئەوەی سود و قازانجی مامەڵەی دارایی لەخانەدانێتی ڕاستەقینەی خستبوون و کردیبونە کەری دەستی جووەکان.

یەکێك لەدەرکەوتەکانی پوچ بوونەوەی ئابوری نەتەوەیی لەناوچوونی سامان و داهاتی گشتی خەڵکی بوو بەهۆی نەخشەی فۆرخکاری نێونەتەوەیی و ئاژاوەکانی مارکس خوازەکانەوە. پیشەسازی قورس لەوڵاتدا هەوڵی دژبەری کردنی ئەم ڕەوتەی دا بەلام مارکس خوازەکان توانییان سنورێك بۆئەم دژایەتیانەیان دابنێن پاش لەسەرکەوتنی شۆڕشەکەیان کەپاش لە شکستە سەربازیەکان هاتبوە ئاراوە، بەم شێوەیە دوژمنانی ئەڵمانیا توانییان ئابوری ئەڵمان بکەنە ئابورییەکی نێودەوڵەتی، یەکێکیش لە بەرئەنجامەکانی ئەم کارەیان گۆڕینی خاوەنداریتی تۆڕی هێلی گواستنەوە بوو لە خاوەندارێتی دەوڵەتەوە بۆ پشککاری نێونەتەوەیی.

ئەودەمەی حەزەکانی مارکس خواز و جولەکەکان هاتەدی لە داڕووخاندنی پایەکانی ئابوری نەتەوەیی هاتە ئاراوە، پاش لەمەش بانگەشەی هەستانەوە و بوژانەوەی ئابوری ئەڵمانیایان دەکرد بەوەی پێشیاوی بەرەوپێشەوەچوونە. دەستەلأتدارانیش ئەم بیرۆزە خواروخێچەیان قبوڵکرد، لەکاتێکدا گەر لەفەڕەنسای سەرکەوتوومان بڕوانیبایە دەمان دیت کە سەرباری گرنگی دانی بەبوژانەوەی ئابوری وڵاتەکەی کەچی گرنگییەکی زۆریش بە بوژانەوەی بواری هێز و هەناویش ئەدات، لەکاتێکدا بەکۆتایی هاتنی جەنگ فەرەنسا هیچ کات ئابوریەکەی لەئێمەی ئەڵمان خاستر نەبوو.

***

لەدەرکەوتەکانی پوچبوونەوە و هەلوەرینی پایەکانی دەوڵەتی ئەڵمانیا لەپێش جەنگ نەمانی ئەوهێزانە بووە کە باوباپیرانمان هەیان بووە. ئازایەتی و نەبەردی و

چاونەترسی و وێژەی باڵا و دەروون بەرزی پووچ بوویەوەو گۆڕدرا بۆ سستی و تۆسنۆکی و خوێڕێتی و کاڵفامی، بێگومان لەم کاتەشدا شێوازی پەیڕەوکراو بۆ پەروەردە بەرپرسی ئەم چەشنە هەڵوەشاندنەوەیەی دەوڵەت بوو؟ چونکە ئەوەی گرنگی پێنەدەرا بواری پێگەیاندن و پەروەردە بووە و فەرمان فەرما وای دەزانی منداڵانیش بەخۆڕسکی هەمان ئاکاری باوانیان وەردەگرن! پادشا هەرچی بگوتایە دوا بڕیاربوو، کەس نەی دەتوانی بڵێت لەل یان نا و نەخێر بوونی نەبوو، خۆنەگەر کەسێکی بەهێزی وەکو بسمارك هەبایە چی لەبەرژەوەندی نەتەوەدا نەبوایە پێی بگوتایە نەخێر و جێبەجێی نەکرایە ئەوا ئەمڕۆ دەمانتوانی تەنها سەرزەنشتی چارەنوس بکەین بەوەی ئەمە بەهۆی چارەنوسێکی‌یەوە توشمان بووە، بەمەش دەمانتوانی خۆمان لەدەرئەنجامەکانی ئەم شکستە قوتار و بێبەری بکەین.

لەهەموو کات و ساتێکدا کۆشك نشینانی مشەخۆر بارن بەسەر خوودی پادشا و دەوڵەتیشەوە، ئەوەندە لەکۆشکدا دەمێننەوە بەخۆیان دەڵێن پاشاخوازەکان و بەمەش دەتوانن خۆیان لە خەڵکانی دیکە جیابکەنەوە. بەڵام ئەوکاتەی ئەم پاشا نان پێدەرەیان دووچاری فەتارەتێك دەبێتەوە ئەمانە پشتی لێدەکەن و بەقەولی رەفتارناکەن، خۆیان دەخشێننە باوەشی تازە دەستەڵاتدارەوە و دەبنەوە ماستاکەری ئەو کەسە، ئەمە لەکاتێکدایە پێشتر پادشای نان پێدەریان چاوەنواڕی خۆکردنە قوربانی لێدەکردن . ئەی کەواتە کوا ئەم هەموو متمانەیە بۆکوێ ڕۆشت ؟

بەڕاستی کەسی دڵسۆز ئەوەنییە ئەو فەرمانانەی پاشا وەکو خۆی جێبەجێ بکات کە لەبەرژەوەندی نەتەوەو دەوڵەتدا نییە، بەڵکو ئەو کەسە دڵسۆزە کە ڕێنمایی پادشا دەکات و لەهەڵەکانی ئاگاداری دەکاتەوە، مەرج نییە هەموو تاج لەسەر نراوێك ژیر و تۆکمەبێت، بەڵکو ئەوانەی خاوەنی تایبەت مەندی زیرەکی و نەبەردین زۆر کەم دەبنە تاج لەسەر نراو، ئەوەش ئاسمان بوو کەخۆی بڕیار لەوەدابوو کە فریدریکی گەورە ببێتە پادشای گەورەی وڵات، یاخوود کەسێکی هێمنی وەکو غولیۆمی دووەم، بەڕاستی ئەم پێبەخشینە سەدسالێ جارێك ڕوودەداتەوە.

ژمارەی ئەو سەرکردە پادشایانەی کە ئاگاداری ئەم ڕاستیەن کەمن، لەکاتێکدا زۆرن ئەوانەی بوون بەقوربانی ئەم کاڵفامی و هیچ لێنەزانینە.

لەمشەخۆری سەرکردەکان و خراپ پەروەردەییەوە چینێکی کەمئەندام لەئاوەز دێنەئاراوەو دەست بەسەر پایەکانی فەرمانڕەوایەتی ولآتدا دەگرن، ئەمانە لەبەرپرسیاریێتی ڕاستەقینە ڕادەکەن و لەبەرەو پێشەوەچوونی ڕاستەقینەش دەترسێن. پەیرەوی پەرلەمانی یارمەتی دەرێکی باشی ئەم چەشنە چینەیە، چینی ڕاکردوو لەبەرپرسیاریێتی، لەولآتدا زۆرجار دەستەلآت دووچاری چەندین تەنگی دەبێتەوە و هەرکە بڕیارێك دەردەکات پاشتر هەست بەخەوەشەکان خۆی دەکات و لەم کاتەشدا بەتەنها نیوچە چارەسەری دەکات و کێشەکان بەتەواوەتی نابڕنێتەوە، بۆیە لەم کاتەدا هکومەت پێتقی وە دەستپێشخاری گرنگ و ژیرانەیە.

ڕۆژنامەکان ڕۆڵی سەرەکیان هەبوو لەئاراستە بەخشین بەڕای گشتی و دوورخستنەوەی تاك لەپەروەردەی تەندروست.

ئەوکەسانەی ڕۆژنامەکان دەخوێننەوە سێ چەشنن:

١-هەندێکیان بڕوایان بەتەواوی قسەی ڕۆژنامەنوسانی نوسراو پەسەند دەکەن.

٢-هەندێك بەتەواوەتی قسەی نێو ڕۆژنامەکان ڕەت دەکەنەوە.

٣-هەندێك پاش لەخوێندنەوەی لێکۆڵینەوەو بەدواداچوون بۆ دەقەکان دەکەن.

زرینەی خەڵك سەربە ژمارە یەکن، واتە زۆرینە کۆمەڵگە نەخوێندەوارن و بیرکردنەوەیان بەئەرکێکی قورس لەقەڵەم داوە بۆیە بەکەسانی دیکەیان سپاردوەو ئەمان بەتەنها بەرهەمەکەی دەخۆن، بڕوایان وایە ئەو کەسانەی بۆچوونەکانیان بلآودەکەنەوە هەمووی بۆچوونی چاك و بەهێزی هەسان دراوی خزمەتکاری نیشتمان و تاکی کۆمەڵگەیە ، بۆیە ئەوانە شایەنی شوێن کەوتنن.

کەواتە ئەتوانین بێژین: ئەم بەشە زۆرینەیەی کۆمەڵ تاقەتی بیرکردنەوەیان نییە و بوونەتە نێچیری ئەو ڕۆژنامانەی کەبە چەواشەکاری و بەهەڵەدابردنی خەڵك دەژین، ئەمە و سەرباری هەوەی زۆر بەزووی دەشکەوێتە تەڵەی بەرنامەی ڕێکخراوە نانەتەوەییەکانی هاوشێوەی مارکس خواز و جولەکەکانەوە.

کۆمەڵی دووەمیش پێشتر سەربە کۆمەڵی یەکەم بوون، واتە پێشتر بەخوێندنەوەی ڕۆژنامەکان بۆچونەکانی خۆیان پنیات دەنایەوە، بەلآم بە تێپەڕبوونی کات بۆیان دیارکەوت کە ئەو ڕاستیانەی لەڕۆژنامەکانەوە وەردەگرێت زۆرکەمن و زۆرینەی زانیاریەکان هەڵە و چەواشەکارە، بۆیە لە باوەڕوونی تەواوەوە بە قسەی ڕۆژنامەکان

بڕیاری وەرچەرخانیان دا بۆ گومانی تەواو لە قسەی ڕۆژنامەکان، هەرگیز بڕوا بە قسە نوسراوەکانی نێو ڕۆژنامەکان ناکات بەڵکو هەمیشە گومانی لێیەتی و وای دەبینێت کە ئەوانەی ئەم ڕۆژنامانە دەنوسن جگە لەکۆمەڵێك دەست خاڵی زیادتر کەلەسەر چەواشەکردنی خەڵك دەژین هیچی دیکەنین، ئەم جۆرە کەسانەش بێ سوودن بۆ هەموو کارێك.

بەڵام پۆلی سێیەمی خەڵك ئەمانە بژاردەیەکی کۆمەڵن و زۆرینەیان کەسانی ژیر و لێهاتوون، بەهۆی بەهرەدارییانەوە دەتوانن بەباشی بیربکەنەوە و بەجوانی لەوەی دەیخوێننەوە لێی ورد ببنەوە و ئەمانە دەتوانن جیاوازی بکەن لەنێوان بێهێز و بەهێزدا. جێگەی داخ نییە ئەم بژاردە ژیرەی کۆمەڵ جێدەستی دیارنەبێت لە بەڕێوەبردنی کۆمەڵگە و دەوڵەتدا لەکاتێکدا زۆرینەی نەخوێندەوار جێدەستی دیارە؟

بەهۆی شێوازی پەیرەوکراوی ناسراو بە پەیڕەوی دەنگدانی گشتی زۆرینەیەکی نەخوێندەوار پولێکی تایبەت بەخۆیان هەڵدەبژێرن، بەڕاستی بەر لە هەڵایسانی جەنگ ئەم زۆرینە نەخوێندەوار و کاڵفامەی کۆمەڵ بژاردەیەکی گەواژی خەڵکی ئاراستەی پەرلەمان کرد، کردنیە ئەندام پەرلەمان، کەهیچ ناوبانگی و ژیرییەکیان پێوە دیارنەبوو، بەڵام ڕۆژنامەکان کوردنیە کەسانی پاڵەوان و هەرئەوان هەبوو.

ئەودەمەی گەنج ولاوانی ئەڵمانی لەمەیدانی جەنگیدابوون و خۆیان دەکردە قوربانی خاك و نیشتمان و نەتەوەکەیان کەچی ئەم ئەندام پەرلەمانەبۆگەنانە سەرقاڵی تەڵە نانەوە بوون بۆ هەموو نیشتمان پەروەرێك ، ئەمەش تەنها بۆ پڕکردنی گیرفانە قوڵەکانیان بووە.

ئەوە ئەرکی دەوڵەت نیە ڕێگربێت لەو ڕۆژنامانەی لەڕێگەی چەواشەکردنەوە ئاراستەی خەڵك دەگۆڕن و دەیان خەنە سەر ڕێڕەوی هەڵە؟ ئایا چاودێری کردنی ڕۆژنامە کاریگەرەکانی وڵات ئەرکی دەوڵەت نییە ؟

بەڕاستی گەر ئازادی ڕۆژنامەوانی نەزانرێت بەجوانی بەکاربهێنرێت ئەوا نەتەوە بەئاقارێکی پێچەوانەی مەبەستەوە دەبات و هەموان چەواشەدەکات و نەتەوەش هەڵدەوەشێنێتەوە، بۆیە پێویستە دەوڵەت بەجوانی ئاگای لەئازادی ڕۆژنامەوانیش بێت و چاودێری هەموو ڕۆژنامەکان وێت.

هەلویستە شەرمەزارکارەکانی ڕۆژنامە ئەڵمانیە چەواشەکارەکانی پێش و کات و پاش لەجەنگم لەبیرنەکردووە. خۆ ڕۆژنامە چەپڕەوەکان -کە دواتر کاریکردە سەر پاقی مەنی ڕۆژنامەکانی دیکە و بەئاراستەی خۆیدا شەنی پێدەکردن- لەکاتێکدا هەموو جیهان خۆیان بۆ دژایەتی کردنی ئەڵمانیا پرچەك دەکرد ئەم گەمژانە بانگەشەی ڕزگارکردنی ئاشتیانەیان بلاوەکردەوە؟ ! خۆ ڕۆژنامەکانمان لەسەرەتای سەدەی بیستدا زۆر بەجوانی ستایشی دیموکراتی خۆرئاوایان دەکرد و زۆر بەڕوونی بانگەشەی لاوازکردنی دەوڵەت و بەهێزکردنی تاکیان دەکرد؟ هەر ڕۆژنامەکان نەبوون کە دژایەتی نەریت و پیرۆزیەکانی نەتەوەکەمانیان کردە کارێکی ئاسایی و خەڵکیان لە گێژاوی ئەندێشەی چێژدا نغرۆ نەدەکرد ؟

هەر ڕۆژنامەکان نەبوون کەدژایەتی کرداری بەسەربازگرتن نەبوون؟ کێی ئەندام پەرلەمانەکانیان دەدا بەوەی لەڕێگەی پەرلەمانەوە هەوڵی بڕینی یارمەتییە داراییان لەسوپا بدەن، لەکاتێکدا بۆرانی جەنگ بەسەر ئەورووپادا هەڵی کردبوو ؟

ئەو کەسانەی لەم ڕۆدا سەرقاڵی فرمێسك ڕشتن بۆ ئایندەی ئەڵمانیا ئەی لەبیریان کردووە کەئەوە خۆیان و ڕۆژنامەکانیان بوون کەهۆکاری هەڵوەرینی دەوڵەتکەیان برەوپێدا ؟

ڕۆژنامە مارکس خوازەکانیش لەڕێگەی لاوازکردن و لێدان لە پایە کۆمەڵایەتی و نەتەوەییەکانی دەوڵەتەوە هەوڵی ئاسانی مل پێکەچکردنی گەلی ولاتیان نەدەدا بۆ جووانی گەورە و نەخشە بۆداڕێژەریان.

ئەی دەوڵەت چیکرد لەبۆ پاراستنی گەل و بەدوورگرتنی لە ژارە ؟ بەڕاستی هەنگاوێکی وەها نەنا کە شایەنی گرنگی پێدان بێت. ئەمەش بەهۆی ئەوەبوو کەبە ئاوەز بیری نەکردبۆوە. چون ئەگەر بەجوانی و ئاوەزەوە بری بکردایەتەوە ئەوا هەرگیز بە ڕەفتارە نامرۆڤ دۆستانەکانی دوژمنانی نەتەوەی ئەڵمانی قایل نەدەبوو کەخۆی دەنواند لە لاوازکردنی بنەماکانی پایەی دەوڵەت لەڕێگەی لێدان لە ئاکاری نەتەوەو باشەی تەندروست و توانای بەرگری بەهێز و زیندەیی تاك لەنەتەوە و ئابوری نێوخۆیی بەهێز. گەورەترین نەهامەتیش ئەوەبوو کەپاش لەوەی ئەندامانی نەتەوە دووچاری ئەم پەتایە هاتنەوە بەرەنگاری هەموو ئەو کەسانە دەبوونەوە کە بۆ

بەرژەوەندی ئەوان دەپەیڤین، لای ئەمانە نەتەوە لەپیرۆزترینەوە بۆ قێزەوەنترین گۆڕدرا.

بێگومان ئەودەمەی ڕۆژنامە مارکس خواز و جوو ویستەکان لەهەوڵی هەڵوەراندنی پونێتی دەوڵەتدا بوون لەڕێگەی بڵاوکردنی بێ ئابڕوویی و بانگەشەی بەناو ئاشتی و ناشرینکردنی پایەکانی نەتەوە خوازی و کلۆڵ کردنی ژێواری نەتەوە و ئەنجامدانی کاری ناشرینەوە ،دەوڵەت لەم کاتەدا دەستەوەستان وەستابوو. دەوڵەت لێرەدا هەرئەوە نەبوو دژایەتی ئەم بزوتنەوە دژە خۆیەی نەکردووە بەڵکو بگرە لێشیان ترساوەو جاروبار دەستی یارمەتیشی بۆ درێژکردوون. جوولەکەکان زۆر بەژیرانە توانیوبویان مێشکی زۆرینەی کۆمەڵگە ژاراوی بکەن بەبێ ئەوەی هیچ کەسێك گومانیان لێبکات. ڕۆژنامە مارکس خوازەکان زۆر بەشێنییەوە هەوڵی لەناوبردنی هەموو پیرۆزیەکانی دەوڵەت و نەتەوەیان دەدا و تادەهات دژایەتی دروستکردن لەنێو ئەندامانی نەتەوەدا بەرەوی زێدتری پێدەدرا، لەم کاتەدا ڕۆژنامە بۆرژوازییە دیمۆکراتیەکان بەشێوەیەکی بابەتیانە چارەسەری کێشەکانی دەکرد، بەشێوازێکی هێمنانە و پتەو، دوور لە توندوتیژی، ئەمەش بەهۆی ئەوەوەبوو کەجولەکەکان باشیان دەزانی کەمێشك پوچەکان بەپشت بەست بە ڕووکەش بڕیاری خۆیان دەدەن، ئەم مێشك پوچانە هەمیشە بە نەرم و نیانی گەلی بژاردە و نارەزووی ئاشتی خوازییان هەڵخەڵەتاون، تاوانی هەندێك گشتیر ناکەن؟ چونکە توانای ئاشکراکردنی گەمە دروستکارەکەی نییە.

ڕۆژنامەی ((لاغازیت دو فرۆنکفۆرت)) نمونەی بالآی ڕۆژنامەی جوولەکەی میانڕەو بوو. دروشمی ئەم ڕۆژنامەیە نابۆ توندوتیژی و بەڵێ بۆ نەهێشتنی کێشەکان لەڕێگەی ئاوەز و لۆژیکەوە. ئەم ڕۆژنامەیە هەرگیز بۆجارێکیش لەڕێڕەوی خۆی لاینەداوەو جاربەجاریش ئامۆشیاری ڕۆژنامە مارکس خوازە هاو ئامانجەکانی دەکرد لەوەی لەرەخنەگرتنی وڵات نەوەستن. ئەم ڕۆژنامانە بەناوی ئازادییەوە هەموو شتێکیان ئەنجام دادا، ئەوکاتەی ڕۆژنامەیەك بڕیاری داخستنی دەدرا یان دەدرایە دادگا ئەم ڕۆژنامانە هەموو کارێکیان دەکرد و سنورێکیان بۆخۆیان نەدەهێشتەوە.

دەستەلآت لەترسی نیگەران نەکردنی ڕۆژنامە(چاکەکان) لە دادگایی کردنەکە دەستی هەڵدەگرت و ئەمجار هەمدیس ڕۆژنامەکە لەجارانی جاران خراپتر دەکەوێتە

ویـزەی خـەڵکی نەخوێنـدەوار و ژەهراەکـانی خـۆی بەسـەردا دەپرشـنەوە و بەمـەش بەرەبەرە وڵاتـی بـەرەو هەڵدێری هەڵوەشانەوە ئاراسـتە دەکرد. بـەم جۆرەش توانیان بواری بەرگری کردن لە خوودی ئیمپراتۆریش وەرگرنەوەو نەمێڵن بـەرگری لەخۆیشی بکات, بەمەش فەرمان فەرماییەکە بەرەو هەڵوەشاندنەوە ڕۆیشت و نیاچوونی بـەرەی دەرەکی ئەڵمانی بەرئەنجامی تیاچوونی بەرەی ناوخۆیی وڵات بوو.

***

زیـادتر لـە بەڵگەیـەك هەیـە کـەئاماژەی لاوازی حکومـەتی ئـەڵمانی و بێدەسـتەڵاتی و بێ دەست و بری سەردارانی ئەڵمانیابووە لەچارەکردنی کێشەکاندا. لەپاڵ چاوپۆشی کردنیـان لـە ژەهـر پرژێنـەرە مـارکس خـواز و جولەکەکانـدا دیتمـان چـلۆن هکومـەت دەستاوەستاوە لەبرامبـەر نەخۆشـی سوسـنك و دەردەباریکە. نەخۆشـی زوهـری یـان سوسـنك لەشـارە گـەورەکانی وڵاتـدا تەنیـەوە, بـەڵام دەردەباریکـە یـان سـیل کـون و قوژبنی وڵاتی گرتەوە. ئەڵمانیا بە دەستەڵات و میللەتیشەوە لەهەمبـەر قەڵاچۆکردنی ئەم نەخۆشیانەدا دەستەوەستان مابونەوەو نـەیان دەزانـی چییکـەن. بـەڵام هەوڵـەوکان بۆ زاڵبوون بەسەر نەخۆشیەکەدا بریتی بوو لە لەناوبردنی دەرکەوتەکانی نەخۆشیەکە لـەبری لـەناوبردنی فاکتـەرەکانی بڵاوبوونـەوەی کـە لەسـەرووی هەموویانـەوە بـەهۆی لەشفرۆشی و کوزفرۆشتنەوە بوو لەبەرانبەر برێك پـارەدا, لەهـەر وڵاتـدا کوزفرۆشـی و گانـدان لەبەرامبـەر پـارەدا بڵاوبوویـەوە ئـەو وڵاتـە تـەنها تیاچـوون و هەڵوەشـاندنەوە چاوەنوارێتی.

لەشفرۆشـی مانـای ڕەهـاکردنی پەیوەندییـە ڕەگەزبازیـەکان و کردنیـەتی بـە بەکارهێنراوێکی بازرگانی , بڵاوبوونـەوەی کوزفرۆشـی مانـای سسـت و لاوازکردنـی ئەو پەیوەندییە گیانیانەیە کە تاکەکانی کۆمەڵی بەخۆشەویستیەوە پێکەوە گرێداوە, لەم کاتەدا مردوە گیان لەبەرەکان دەست دەکەن بە زاوزێ و وەچەیەك لەحەرام زادەکان بۆ وڵات دێننە ئاراوە. بەتەنها ڕوانین لـە وەچەکانی خانەدانـەکان ئـەم نەهامەتیانـەمان بـۆ دیاردەکـەوێت, بـەوەی بـاوکی ئـەم منداڵانـە لەیانـەکانی خواردنـەوەو لەشـوێنەبازرگانیەکاندا دگـەڵ کـەنیزەك و بەردەسـتەکانیاندا جووتبونـە و وەچـەیەك لەمنداڵی زۆڵیان لێهناونەتە دونیاوە کە ئەم وەچە ئینتیماشیان بۆ باوکی خۆیـان نییە جا وەرە بۆ دەوڵەت و نەتەوە هەیان بێت !

ئەی لەم کاتەدا دەوڵەت بۆ سنورداانان بۆئەم قێزەوەنترین کارە چیکرد؟ تەنها هەستا بە بەستنی کۆنگرەی پزیشکی بەمەبەستی چارە بۆ دۆزینەوەی. قەڵاچۆکردنی نەخۆشی زوهری یان سوسنك یەکەمین هەنگاوی لەڕێگەی قەدەغەکردنی لەشفرۆشیەوە دەبێت کەبۆ جولەکەکان قازانجێکی زۆری هەیە, هاوکات دەستکردن بەنوسینی بەهێز بەمەبەستی هۆشیارکردنەوەی نەتەوە لەئەوەی زاڵبوون بەسەر ئەم نەخۆشیەدا ئەرکێکی نەتەوەیی و نیشتمانی دڵسۆزانەیە؟ لەبەرئەوەی مانەوەی ئەم پەتاسە گورەشەیە لەبۆ هەڵوەشاندنەوەی نەتەوە.

لەهەمان کاتدا پێویستمان بە زنجیرەیەك لە هەنگاوی بوێری دیکەمەیە و لەشێوەی دژبەری کردنی ئەو نەریت و بیرۆکە کۆنانەی کە وادەزانن باسکردن لە چەشنی پەیوەندییە ڕەگەزبازیەکان کارێکی قەدەغەکراوە و نابێت هیچ کەس بەئاشکرا باسی بکات و باسکردنی شێوەیەکە لە بێ ئابڕوویی. بۆئەمەش دەبێت لەتەمەنێکی کەمدا هاوسەرگیری ئەنجامبدرێت, هاوسەرگیری درەنگ وەخت یارمەتی بڵاوبوونەوەی لەشرۆشی دەدات کە هەموو مرۆڤایەتی بەرەو نەنگییەکی تەواو دەبات و لەقوڕێکی خەستدا دەیان خنکێنێت.بەڕاستی زۆر هەڵەن ئەوانەی پێیان وایەو بەتەنها لەڕێگەی وتار و ئاگادارکردنەوە و هۆشیاری ئاینییەوە دەتوانرێت دیاردەی لەشفرۆشی قڕبکرێت..تاکە چارەی پێش وەهت بۆئەمە هاوسەرگیرییە لەتەمەنێکی کەمدا.

قڕکردنی ئەم پەتا کۆمەڵایەتیە پێتڤی وە کۆمەڵێك هەنگاوی جێبەجێ کاری هەنە پێش لەهاندان بۆ ئەمجامدانی کرداری هاوسەرگیری لەتەمەنی کەمدا, کە گونجاوە دگەلْ سروشتی مرۆڤدا بەتایبەت سروشتی نێرینە ؟ چونکە ڕۆڵی مێچکە لەپەیوەندییە ڕەگەزبازیەکاندا ڕۆڵێکی گەورەی نەرێنی هەیە.

دەوڵەت هەستا بە پشت گوێ خستنی ئەم لایەنە هەروەك چۆن هەستا بە پشت گوێ خستنی سنورداانان لەبۆ زاوزێ کردن لەهەندێك ژینگەدا. دەوڵەت ئەوەی لەبیرکردبوو کەمەبەست لێرەدا تەنها هاوسەرگیری نییە, بەڵکو ئامانجێکی زۆر لەوە گەورەترە: پاراستنی جۆر و ڕەگەزە. ئەگەر هاوسەرگیری نەکاتە ئەم ئاستە ئەوا دگەل لەشفرۆشیدا هیچ جودابیەکیان لەنێواندا نابێت. یەکێك لەباشیەکانی هاوسەرگیری زوو یان پێش وەخت مۆرکردنی نەتەوەیە بە وەچەیەکی بەهێز و تەندروست, بەڵام

هەمدیس پێش لەم هەنگاوەش دەوڵەت دەبێت ئاستێکی کۆمەڵایەتی شیاو بۆ هەموان دابین بکات.

ئەمڕۆ هەست بەوەدەکەین کە کۆمارە ترساوەکە ((سۆسیالیستی کۆمەڵایەتی)) لەڕێگەی کێشە دروستکردن لەبۆ هاوسەرگیری نێوان هاوڵاتیان کێشەکانی خۆی چارەدەکاتو ئەمەش هۆکاری سەرەکی دەبێت بۆ پەنابردنە بەر کوزفرۆشتن و کوزکڕین و دواتریش دووچاربوون بە نەخۆشی سوسنك و چەندین پەتای دیکەی مەترسیدار.

ئاستی دووەمیش کەپێویستە دەوڵەت گرنگی پێبدات بواری پەروەردەو فێرکردنە.

لە پەیڕەوی پەروەردەی ئێستادا هیچ چەشنە دیاردەیەکی ڕاستەقینەی وەرزشی بەدی ناکرێت, کە پێشتر باوانمان بۆ پێگەیاندنی وەچەیەکی بەهێز و چاوکراوەدا پەنایان تێکرتبوو. پاش جەنگ ئەوەمان لەبیرکردبوو کە میچشکی ساغ لەدەرەوەی جەستەی ساغەوە بوونێکی نییە, , لەم کاتەدا دەستمان دابوویە چاودێری کردنی ئاوەز و بڕوامان وابوو ئاوەز ستونی باڵای هەستانەوەی نەتەوەیە.

ئەودەمەی بەلشەفیەت لەو ژینگانەدا دیارکەوت کە بەرگری ڕەوشتییان کەمە بۆچاودێران دیارکەوت کە بنەماکانی داڕووخاندن ئەم کاریگەرییەی نەدەبوو ئەگەر لەبەرامبەر جەستە و ئاوەزی ساغدا ئاراستەبکرایە.

ئەو هاوڵاتیانەی ئەم بەرنامەیەیان وەرگرت مێشکیان پڕکرابوو لە بیرۆدۆزەکان و سکیان خاڵی یان پڕبوو بەڵام بە شمەك گەلێك کە پێدەچوو ڤالابێت لەو چتانەی ئالیکاری گەشەی جەستەبن, وزەی پێویستیشی بۆ دابین نەدەکرد بۆئەوەی دایەتی فێڵە بەرجەستەیی و هزریەکانی پێبکاتەوە.

سەرباری ئەمەش گرنگی نەدان بە پەروەردەی جەستەیی لەئەنجامدا سەرکێشییەکانی ئارەزوو و ڕەفتارە نەشیاوە ڕەگەزبازییە خۆڕسکەکانی لێدەکەوێتەوە. لەبەرئەوەی ئەو جاحێڵەی سەرقاڵی وەرزشی جەستەیە توانای لغاوکردنی بۆ ئارەزووەکانی جوتبوون و ڕەگەزبازی زێدەترە وەك لەو گەنجەی لەماڵێدایە و سەرقاڵی وەرزشی مێشکە لەڕێگەی خوێندنەوەوە. هەرچەشنە پەیڕەوێکی پەلاوەردەیی گەر بەڕاست ئامانجی باشترکردنی کۆمەڵگەبێت ئەوا پێویستە هەردوو بەشی مرۆڤ (جەستە و ئاوەز) بکاتە ئامانج و هەردووکیان پەروەردەبکات.

لەو ساتەوەی بەلشەڤ و جوە تەڵەکەبازەکان سەرقاڵی کلۆرکردنی دەوڵەتی ئەڵمانی بوون دەستیان دایە نانەوەی تەڵەی ڕەگەزبازی لەسەر ڕێگەی گەنجانی ئەڵمانیادا بەجۆرێك بۆهەر کوچە و کۆڵانێك بڕۆیشتیتایە بەتەڵەکەدا دەتەقیتەوە و دەیگرتی, وای لێهاتبوو کورسی بێ شەرمی و بەڕەڵایی لەشانۆ و سینەما و ڕووسی خانە و کوزفرۆشگا و یانەکانی خواردنەوەدا قوت دەبوویەوە و تەنانەت لەگۆڕەپانە گشتیەکانی وڵاتیشدا دیار دەکەوت.

دەستەڵات چی کردووە–ئەوانەی بەر لەهەڵایسانی جەنگ و ئەمانەی پاش لە لێبوونەوە لەجەنگ–بۆ نەهێشتنی ئەم تەڵە مەترسیدارانە؟ جگەلەوەی بۆ پیاوانی ئاینی بەجێی هێشتووە بۆئەوەی بەرەنگاری ئەم دیاردە ناشرینە ببنە هیچی دیکەی نەکردووە,بەمەش پیاوانی ئاینی کرانە بەرپرسی لاوانی ئایندە و سەلامەتی گەنجامی ئەمڕۆ و نەتەوەش. ئایا هیچ سەرمان لەوە سوڕ دەمێنێت کە لەم ڕۆژدا نێرەمۆکی و نێربازی بڵاوبووەتەوە و حەز و توانای جوتبوون لای لاوانی ئەمڕۆمان لەچاو باوانماندا چەندان هێند کەمی کردووە !

کەواتە چۆن دەتوانرێت پشت بەم چەشنە گەنجانە ببەسترێت بۆئەوەی ڕاپەڕن و پارێزگاری لە نەتەوەو خاکەکەیان بکەن و قوربانی بدەن لەبۆ پراستنی دامەزراوە و نەریتەکان و مێژووی ئەڵمانیا بەکارە پاڵەوانەکانیان چلۆن دەوڵەمەند دەکەن؟ چۆن دەتوانن ئەم چەشنە گەنجانە ببنە سەردێری باسی وەچەکانی داهاتوو ؟

لەم کاتەدا زۆر بەئاسانی نەخۆشی سوزەنەك دەتەنێتەوە و لەشی گەنجانمان هەڵدەوەرێنێت لەکاتێکدا ئەنجامدراوە ڕەگەزبازیەکانیان بەزۆری لە کونی گەرماوەکان و ماڵانی کوزفرۆشدا ئەنجام دەدەن ؟

بۆنەهێشتنی تەواوی دیاردەی لەشفرۆشی یان گانۆکێی پشت بەستوو بەچێژی پارە پێویستمان بە نەهێشتنی سەرچاوەکانی گەندەڵی و دیاردەی کاری بێ ئابڕوویی هەیە , کە بەشێوەیەکی سروشتی بوونی وئەمانە ئامادەکاری دەکات بۆ بڵاوبنەوەی لەشفرۆشی. ئەگەر نەتوانین لاوانی ئەڵمان لەم زەلکاوە پڕ لەژاژە ڕزگار نەکەین ئەوا ناتوانین گەرەنتی لەناونەچوونی کۆمەڵگە و نەتەوەی ئەڵمان دەستەبەر بکەین !

ئەوانەی دەوای چاکسازیی دەکەن پێویستە زۆر بەباشی ئەوە بزانن کە پێویستە ریفۆرم بەتەنها لە سیاسەتدا نەبێت بەڵکو لە سینەما و شانۆ و ڕۆژنامە و پەروەردەشدا بێت. پاراستنی ڕەگەزی ئەڵمانی دەبێت لەپێش پاراستنی تاکەوە بێت, کە بەناوی پاراستنی تاکەوە مارکسی و جووەکان بەرگری لە بێشەرمیی و ڕووت خوازی و کوزفرۆشی دەکەن. ئەو چارەکارانەی خستماننەڕوو وەهێزنینە لەبۆ لەناوبردنی تەواوەتی نەخۆشی سوزەنەك, بەڵکو هەنگاوی دیکە و یەکلاکارەوەی ئەم بوارەهەن کە پێویستمان پێیانە.

لەوە تاوانترهەیە کە لە دووچاربوانی ئەم نەخۆشیە گەڕێن کە جووتبوون بەئارەزووی خۆیان لەگەڵ گەنجەکانماندا ئەنجام بدەن و ئەوانیش دووچاری ئەم نەخۆشی بەکەنەوە و کۆمەڵگە و نەتەوەی ئەڵمانی بەرەو لەناوچوونی یەکجارەکی بەرن ؟ لەم بیرۆکە گەوجتر هەیە کەبۆ پاراستنی تاکە کەسێك واری کوشتنی سەد کەس دەڕەخسێنین ؟

بەمەبەستی چاەکردنی ئەم نەخۆشیە پێویستمان بە قوربانی دان و جیاکردنەوەی توشبوان و لەناوبردنیانە لەپێناو پاراستنی ڕەگەزی پاکی ئەڵمانیدا.

بێگومان دەبێت ئەوانەی دووچاری نەخۆشی سوزەنگی درێژخایەن هاتونەتەوە دووربخرێنەوە لەدابەستنی پەیوەندی جوتبوون, ئەمەش لەڕێگەی دانانی یاسا و سزای تایبەت بەم وارە و پشکنینی پێش هاوسەرگیرییەوە دەبێت. دەوڵەتی ئەڵمانیا بۆماوەیەکی زۆر ئەم چەشنە ڕێبازەی پەیڕەوکرد بەڵام ئاسانکاری یاسابەسەتان و ڕێککەوتنی پزیشکان لەگەڵ توشبوانی ئەم نەخۆشیانەدا هۆکاری لاوازبوونی ئەم پەیڕەوەش بوو. لەم کاتەدا تاکە چارەسەر جیاکردنەوەی توشبوان و لەناوبردنی وزەی جوتبونیانە, هەرچەندە ئەمە کارێکی تاڕادەیەك دڕندانەیە بەڵام بۆپاراستنی هەموو کۆمەڵگە شیاوترینە, بەڵێ لەپێناو پاراستنی نەتەوەدا باشترین قوربانی دان کوشتنی تاکی دووچاربووە لەپێناو هەموو نەتەوەدا.

***

لەدەرکەوتەکانی هەڵوەشانەوەی فەرمان فەرمای ئەڵمانیا پێش لە هەڵایسانی جەنگ دابەزینی ئاستی ڕۆشنبیری بوو بۆ ئاستێکی زۆر نزم, ئەمەش بەهۆی ئاراستە کردنی خەڵکەوە بوو بۆ لەلایەن جووەکانەوە بەئاراستەیەکی نەشیاو. لەسەرەتای ئەم

سەدەیەدا هونەر لە بواری ڕاستەقینەی خۆی لایدا و ئاراستەی پڕکردنەوەی حەز و ڕەگەزبازیەکانی گرتەبەر.

ئەگەر تەنها هونەرمەند و بیرمەندانی جوولەکە و بەلشەفی سەرقاڵی نویٚ گەرایی بوونەیا ئەوا ئاسایی بوو ، بەلاّم ئەمانە هەموو پیرۆزیەکانی نەتەوەیان دادەڕزاند و بەزیاوەیان دەبینی و گەاڵتەیان پێی دەکرد. گەمەیان بە شیلەر و گۆتە و شۆپنهاوەر و هیگلٚ دەهات, بەدەستی ئەنقەست بۆچوونەکانی فریدریکی گەورەیان تێکدا و سوکایەتی زۆریشیان بە بسمارك کرد. بەم کارەشیان دەیانویست هەموو پەیوەندیەکانی ئەوڕۆ و پێریٚ لەیەکدی دابڕن, لەهەمان کاتدا وێژەی سووك و هونەری بیٚ شەرمییان کردبووە شمەکێکی ئاسان دەست کەوتوو, زۆری پێنەچوو ئەم کالاّ سوکانە هەموو کالاّ قورس و بەنرخەکانی دیکەیان لەناوبرد و ئەمان لەجێگەیدا دانرانەوە, سەر ڕووی نوسینگەکان و دیواری کۆنخانەکان پڕبوون لەهونەر و بەرهەمی پووچ و بەڕەلاّیی بەخش.

ئەم هەڵوەشاندنەوەیە تەنها لایەنی هونەری نەگرتەوە بەڵکو گیانی نەتەوەشی دارِزاند. بەلشەفی و جووەکان باش دەیانزانی نەتەوەی بەهێز و متمانە بەخۆبوو هەرگیز بەوە قایل نابێت متمانەی خۆی بداتە دەستی بێگانەکان, بۆیە لێرە وەدواوە پیاوانی ئاینی کرانە ئامانج لەژێر دروشمی پیرۆز ڕاگرتنی ئازادی بیروباوەڕ. چەندین پەرتووکی بێگانەی نەشیاویان پاچڤەی زمانی ئەڵمانی کرد ، ئەم کتێبانە بۆ کەسانی ڕۆشنبیر نەشیاو بوو جا وەرە بۆ کەسی عەوام و کاڵفامی نەتەوە, پیاوانی کڵێساش خۆیان لەم هێرشانەی نێوخۆی ولاّت گێل کردبوو بەوەی لەم کاتەدا سەرقاڵی ڕێنمایی کردنی ڕەش پێستانی ئەفەریقیابوون, ئەم کێبڕکێیە بەقازانجی پیاوانی کڵێسا کۆتایی نەهات بەوەی ئیسلام لەو ناوچانەدا توانیبوی بەباشی پێگەی خۆی قایم بکات.

پیاوانی کڵێسا مەڕەکانیان بەشوانی لە گورگ پارێز لەدەشتێکدا بەجیٚ هێشت بوو, ئەمەش بووەهۆی لاوازکردنی بیروباوەڕی ئاینی لای هەزاران هاولاّتی و کەمبوونەوەی هەستی ئاین خوازی لای ئەڵمانەکان.

لەبەرئەنجامدا دەتوانین بێژین: زۆرینەی گەل ژیر و فەیلەسوان نین, تاکە پەیوەندی ئەمانەش بە کڵێساوە تەنها باوەڕەکانیانە. دوژمنانی نەتەوە باش هەستیان بەمە کردبوو بۆیە توانیویان بە گومان خستنەدڵی هەزارانەوە لەبارەی ئاینەوە کۆمەڵگە

لەئاین دابڕوتێنەوە. ئامانجی ئەمانە لاوازکردنی بەرگری سوشتیانەی ئاینی بوو لەبز نەتـەوەخوازی و کەوتنـە ژێـر کاریگـەری بنـەماکانی داڕزانـدن و تەوژمـەکانی ڕوت خوازی.

***

هەمـدیس لەبەریـەك هەڵوەشـاندنەوە لـەبوار و کایـەی ڕامیـار کاریشـدا هاتـەئاراوەو بەدیارکەوت. هکومەتەکانی ئەڵمانیا سەرجەم کارو کردەوەکانیان تەنها سەرپێیی یان نیوچڵ بوە جا کردار و پرۆژەکانیان ناوخۆیی بوبێت یان دەرەکی. بەبێ بوونی هیچ چەشـنە ئامـانجێکی دیـاریکراو. ڕەنگـە سیاسـەت کـاران پێناسـەکەی بسـمارك بۆ سیاسەتیان وەرگرتبێت و کردبێتیانە پەیڕەوی خۆیـان. ئایا ئەم ڕاوێـژکارە ناسنینە نەی گووت کە ((سیاسەت هونەری کارە لە سنوری شیمانە بۆکراودا))؟ بەڵام بسمارك وای نەگەیاندوو کە سیاسەت تێکەڵ و پێکەڵاو و بێسەروبەری بێت. ئامانجی بسمارك لـەو پێناسـەی گونجـاوی هـەموو ئامرازێکـە بۆبـەکارهێنان بەمەبەسـتی گەیشـتن بەئامانجی خوازراو لەلایـەن سیاسـەت مەدارانـەوە. بـەڵام ڕاوێـژکارانی ئـەمڕۆ خۆیان داوەتە دەست ئاراستەی باوە و دەستیان لە ئاراستەکاری کەشتیەکەیان هەڵگرتوەو تـەنها بەشـیان بووەتـە سـەیرکردن لـەوەی بـزانن ئـەم تـەوژمی بایـە کەشـتیەکەیان بەرەوکوێ ئاراستەدەکات و بەکوێیان دەگەیەنێت. بەچەند ساڵێك پێش لەهەڵایسانی جەنگ. کەسانی ژیر و ئەمەکداری نیشتمان هەستیان بەوەکردبوو کە لاوازترین خاڵی دامـەزراوەی دەوڵـەت بریتیـە لـە : پەرلەمـەنان یـان ڕایشسـتاغ. لـەم دامەزراوەیـەدا کۆمـەڵێك لەترسـنۆکان و ڕاکـردوان لەبەرپرسـیارێتی کۆبوونـەوە و کۆشـکێکیان لـە فرمونێژی و کورسیەکیان لە زۆربڵێی ئافراند.

ئـەوە ئـەوە سـتەم کـردن نییـە لەپەرلـەمان کـە ئـەبوونی ڕێکخراوەیـی نەتـەوە و سیاسەتی دەوڵەت و نەبوونی جێگیری و نۆقرەیی و نیوەچڵی نەخشە و کردارەناماڵە کرلوەکان هەموو ئەمانە ئەمانە بخەینە ئەستۆی پەرلەمان و ئەوی لێبەرپرسیاربکەین بەڕاستی ئەمانە لەپێشترین هۆکارەکانی دارمانی مرمان فەرمای ئەڵمانیا بوو بۆهەر پێهەڵگاڵێکی چەرتی حکومەت کاریگەری پەرلـەمانی لەسـەربووە. جا نازانم ئەمە غەبانەتە یان نەزانی بێ ئەنقەست؟

هەموو ئەو سیاسەتانەی ئیمپاراتۆر بۆ دروستکردنی هاوپەیمانێتی پشتی پێدەبەست زۆر ساکار و لاوازبوون.

سیاستی ئێمە لەهەمبەر پۆلۆنیادا لاواز و سەرپێیی بوو. زیادتر لەجارێك ئەم کێشەیەمان وروژاندووە بەبێ ئەوەی هەوڵی چارەکردنی بدەین. ئەو ئەنجامەی کە ویستومانە (سەرکەوتنی ئەڵمانەکان یان ڕێککەوتن لەگەڵ پۆلۆنیەکان)هەرگیز بەدی نەهاتووە, بەڵکوئەنجامەکەی تەنها دوورکەوتنەوەی ئەڵمانیا و ڕووسیابوو لەیەکدی.

چارەکردنی کێشەکانی ئەلزاس و لۆرین ناتەواوبوو. لەبری ئەوەی بەیەك لێدان فەرەنسای غۆل ڕامالێن و دان بەمافەکانی ئەلزاس و لۆریندا بنێین وەکو هەموو دەوڵەتۆچکەکانی دیکەی ڕایخ, دەستمان داوە لاواندنەوەی فەرەنسای دێو و ئەلزاسیەکانمان لەبیرکرد, ئەمانە هەمووی بەهۆی ئەوەوە بوو کەلە ڕیزی پارتە بالآکانماندا خەڵکی خوێڕی و بێ ئەمەك و غاین هەبوونە.

دیتمان چلۆن پارتەکان پەرلەمان هەستان بەچەك دامالینی خەڵکی لەو چەکەی بەستیانەوە بوو لەشێوەی پاراستنی ئازادی و سەربەخۆیی و دابینکردنی نان. ئەمڕۆ گەر دەشتەکانی فلانەدەر هەڵدەینەوە تەرمی سەدان هەزار گەنجی ئەڵمانیمان بۆدیاردەکەوێت کە بەهۆی بڕیارەکانی پەرلەمانەوە ڕوویان لەجەنگ کردووە بەبێ ئەوەی مەشقێکی بالآیان پێبکەن.

ئەوکاتەی جووخوازانی جیهانی لەهەوڵی هێرش کردنەسەر گیانی سەربازی ئەڵمانی دا بوون, لەڕێگەی تاوانبارکردنی ئەڵمانیاوە بە دەرئەنجامەکانی جەنگ لەسایەی ڕۆژنامە مارکس خوازەکانەوە, لەهەمان کاتدا پارتە مارکس خوازەکان لەدژی دەنگدان لەبۆ مەشق کردنی هێزی جەماوەر بەمەشقێکی تەواو. کەوابوو شکستی ئەڵمانیا بەرئەنجامێکی ئاوەزگەرایی لۆژیکی ناچاری بووە لەوەی دەستەلآتداران لەکەشی ئاشتیدا لاوازبوونە و دوودڵی زاڵبووەتەسەریان لەبۆ کردنەوەی هێزی جەماوەر بەمەبەستی سازاندنی بۆ جەنگێك کە دووژمن دەویست لەڕێگەیەوە تۆڵە لەئەڵمانەکان بکاتەوە, ئێمەش مەبەستمان لەم خۆ سازاندن یان ئامادەکاریانە تەنها بۆ بەرگری کردن بووە لە خاك و نەتەوە و نیشتمانمان.

کەمتەرخەمی نواندن لەبۆ مەشق و ڕاهێنانی سوپا تەنها هێزی وشکانی نەگرتبۆوە بەڵکو هێزی دەریاییشی لەناوبردبوو, لەکاتێکدا لەساڵی ١٩٠٤ ەوە سەرکردە

دەرياييەكانی ئەڵمانيا باش دركيان بە بەهێزی هێزی ئینگلیزەكان كردبوو بەڵام لەبەرامبەر هیچ جۆرە خۆئامادەكارییەك نەدەبینرا.

گەمژەییەتیەكی دیكەی سەركردایەتی پرچەك نەكردنی كەشتی و هێزە چەكدارە كەشتیوانەكانی وڵات بوو بەوەی بەم كارەیان نەیان توانی بەباشی بەرپەرچی دوژمنە سەرسەختە دەرياييەكەيان بدەنەوە و زاڵبن بەسەريدا. وەك دیتمان بەرەوپێشەوەچوونی كەشتیەكان بەیارمەتی هێزەئاسمانیەكان بووە ئەوەك ئازایەتی خۆیان, دیتمان بەم كارە چلۆن بەرپرسانی باڵای ئەڵمان بەوە دڵی خۆیان خۆش دەكەن كە تۆپی ۲۸ ملم ی ئەڵمانی هەمان كاریگەری تۆپی ۳۰ملم ی ئینگلیزی هەیە, ئەگەر ژیر بوونایە ئەوا بەهەمان شێوەی ئینگلیزەكان كەشتیەكانیان بە تۆپی ۳۰ملم پرچەك دەكرد, چونكە باشترین پلانی جەنگ بەهێزتربوونە لەدوژمن نەك هاوتابوونی.

سەركردە دەرياييەكانی ئەڵمان كلیلی سەركەوتنیان دایە دەستی دوشمن بەوەی لەهێرش بەرییەوە كەشتیاكانیان بۆ بەرگری گۆڕی.

لە شەڕی دەریایی سكاجراك دا كەشتییە بەریتانیەكان توانییان سەركەون بەسەر ئێمەی ئەڵمانیدا. لەم كاتەدا ئەگەر كەشتیەكانی ئێمەش بەهەمان شێوەی دوژمن تیژڕەو و چەكی پێویستی هەبایە ئەوا بەو تۆپە ۲۸ملمانەی هەمان بوو دەمان توانی سەربكەوین, دەبوو سەركردە ئەڵمانیەكان بەهەمان شێوەی ژاپۆنیەكان لەم بوارەدا رەفتاریان بكردایە. لەبۆر ئەرسۆردا ژاپۆنیەكان بەبەكارهێنانی كەشتی خێراتر و چەكی باشتر و ژمارەش زیادتر ڕووبەڕووی ڕووسەكان بوونەوە.

***

سەردارانی سوپایْ وڵات نەكەونە هیچ هەڵەیەكی قەبلاندنەوە نەك لەبەرئەوەی زۆر كارمە و بیْ خەوش بوبێتن بەڵكو بەهۆی نەبوونی كاریگەری بۆچوونی ئەندام پەرلەمانەكانەوە بووە لەسەریان. دامەزراندن و پێشخستنی كەشتی گەلی خرایە ژێر سەرپەرەشتی پەرلەمانەوە, دەوڵەتیش داوای لە باڵی سەربازی كرد كە پابەندی رێنماییەكانی پەرلەمان بێت , ئەمەش هەلی ئەوەی بە ئەنجام پەرلەمانەكان وەخشی دەست وەربدەنە نێو كاروباری سەربازی ڕووتیشەوە, لە ڕێگەی بوونی دەستەڵاتیان لە دیاری كردنی سەركردە و جێگرەكانیان و دەست نیشانی باری هەڵگیراوی كەشتیەكان و چەك و خێراییەكەشی.

بەڵام سوپا لەکاتی گونجاودا بەهای خۆیەوە ڕۆیشت و خۆی بەدوورگرت لەهەر چەشنە بۆچوونێکی نا نەتەوەیی. لۆدندرۆف دەریاسالار بوو نێردرابوو بۆ سەرکردایەتی کردنی هەڵمەتی کەمکردنەوەی زیاوە خەرجی ناپێویست , کەئەمەش قازانجێکی ئەوتۆی نەبوو. ئەو دەمەی لۆدندرۆف نەیتوانی تا سەرکەوتن کەشتی گەلەکەی بەرێت تاوانی ئەمی تیانەبوو بەڵکو دەبوو لە پەرلەمان و ڕاوێژکارە لاوازەکەی باتمان هولویگ بپرسینەوە.

ئەمەش وای پیشان دەدا کە بەرپرسانی ڕاستەقینەی پشت شکستەکان خۆیان حەشار دەدا و سەرکردە ڕاستەقینەکان پێوەدەگلان. شالاَوێکی پەلامارناسا لەسەرەتای بەهاری ۱۹۱۸دا کرایە سەر لۆدندرۆف و دواتریش بواری ئەم هێرشەیان فراوانترکرد بەوەی گومانیان خستەسەر ڕاستگۆیی پاشا و هکومەتەکەی. ئەودەمەی سوپای هاویمانان گوشاریان دەخستەسەر وڵات ئەم ناجسنانە دەستیان دایە بڵاوکردنەوەی کارە نابڕووبەرەکانی بەرپرسانی وڵات و هانی زۆرینەی گەل نەخوێندەواریان دەدا بۆڕاپەڕین و شۆڕشکردن لەبەرمبەر ئەو هکومەتەی بڕیاری پاراستنی داون, ئەمە لەکاتێکدا بوو کە وڵاتانی دژبەئێمە هیچ کات باسی بچووکترین هەڵە و کارخراپی بەرصرسانی خۆیانیان نەدەکرد و هەموویان دەشاردەوە, تاوەکو جەنگ بەکۆتا گەیشت, دواتریش هەمدیس نکوڵییان لێی دەکرد.

دەبوو بەرپرسانی باڵای وڵات لەڕێگەی ڕوونکردنەوەدان بۆدەقە درۆیینە و هەڵواسراوەکان دوژمنانی وڵات لەناوخۆ و دەرێدا ڕامباڵن و بواری شۆڕشی ناتەندروست بە دوژمنانی وڵات نەدەن. بەڵام ئەفسوس تاکار لەکار نەترازا بەرپرسانی ئەڵمانی نەیان دەزانی بانگەشە بەشێوەیەکی گونجاو بەکاربێنن, بۆئەوەی بیکەنە چەك و داردەستەی خۆیان لەناوەوە و دەرەوەی وڵاتیشدا. ئەگەر دەڵێن: ئەم گەلەی ئێمە بواری بەدرۆکردن نەداوەو بەتاوانێکی گەورەی دادەنێت جا بۆ هەر ئامانجێك بێت ئەوا دەبوو بەلایەنی کەمەوە بەرپەرچی درۆ و هەڵبەستراوەکانی بداتەوە بۆئەوەی خۆی نەبێتە نێچیری درۆ.

نەتەوەی ئەڵمانی بەدەساڵ پێش لەمەلایسانی جەنگی فراوانی جهانی لەپێشی هەموو گەلانی دیکەی ئەورووپاوە بوو لەبۆ پاراستنی ڕەسەنێتی نەتەوەیی و دوورخستنەوەی لەکەوتنە تەڵەی بانگخوازە نێونەتەوەییەکان. ئابوری ئەڵمانیا توانی

بۆ درێـژترین مـاوە پارێزگـاری لـە سروشـتی نەتـەوەیی خـۆی بکـات, لەکۆتاشدا گونڕایـەڵی بۆ سەرمایە نێونەتەوەییـەکان گونڕایەڵییـەکی کێم بـوو. بەڵام لادانی لەم رەوتە ناچاری هەڵایسانی جەنگی کرد.

سـەرباری هـەوەی نەتـەوە نـەختێك لـە خانـەی پاشـا دوویرکەفتـەوە بـەهۆی دواکەوتوویی پاشا و دەستەڵاتدران لەهەندێك پێشکەوتنی ئاوەزی کەبەسەر گەلدا هـاتبوو, بەڵام هـەر نیشـانەی تـەختی پاشایەتی ئامارژەی یـەکێتی نیشتمانی و تاکە دادوەری نێـوان پارتـەکان و دەسـتی لغاوکـاری ئـارەزوو و خەونـە سیاسـیە مەترسـی دارەکان بوو. کۆمار خوازی لایـەنگری باشـی نـەبووە بـەهۆی ئەزموانـدنی فەرەنسـای هاوسێمانەوە کە ئەنجامەکەی هیچ بۆگەل ئێمە شیاوتر نەبوو.

سـوپای وڵات لەهـەموو دامـەزراوەکانی دیکـە خـەڵکی دڵیـان پێـی خۆشـتربوو, هەرچەندە جاربەجارێك دووچاری شکستیش دەبوویەوە؛ چونکە کۆڵەکەی ڕاگرتـووی پێنـای دەوڵـەت بـوو, ئەمـەش وای لـەدوژمنان کردبـوو کـە بـەو پـەڕی تواناوە هـەوڵی لاوازکردنـی بـدەن. ئەودەمـەی دوژمنـانی وڵات لـە فەرسـای کۆبوونـەوە لەسـەر زۆر ئاریشە و بابەت ناهاوتا و دژبۆچوون بوون, بەڵام لەبۆ لاوازکردنی سوپای ئەڵمان یـەك هەڵوێست بوون؛ چونکە سـوپا بۆ ئەڵمانـەکان مانـای پارێزەری نیشتمان و ئازادی و نیشانەی سەروەری و سەربەرزی بوو.

گـەر سـوپا بەهێزەکـەمان نەبوایـە ئـەوا هاوپـەیمانان هـیچ کـات دەستەوەسـتان نەدەوەسـتان لـەبۆ تـەفروتوانا و قڕکردنـی نەتەوەکـەمان, ئـەڵمانی, بـەوەی لەفەرسـای پیلانیان بۆدانابوو.

ئـەو ڕۆژانـەی ڕاکـرن لەگرتنەدەسـتی بەرپرسـیارێتی لەلایـەن بەرپرسـانەوە بـاوبوو بـەرگری کـردن و لەئەسـتۆگرتنی بەرپرسـیارێتی ببـوە ئـەرکی ڕاسـتەقینەی سـوپا, ئەودەمـەی پـەتای ترسـنۆکی تـەنیبۆوە ورەی هاوڵاتیـان لەلایـەن سـوپاوە بـەرز ئەکرایەوە...لەوکاتـەی مـارکس خـواز و بـەناو دیمۆکراتیـەکانمان هـانی بەرجەسـتەکردنی ئاشـتی دەدا لـەنێوان ئەڵمانیـەکان و ڕەش پێسـت و چـینەکانی فەرەنسـا و ئینگلیـزدا, سـوپا ئامادەکـاری دەکـرد بـۆ ڕووبـەڕوو بوونـەوەی ئـەو مەترسیەی بەڕێوە بوو.

دیتمان چلۆن سوپای هێمە وەکی شورایەکی پۆلایین لەدژبەری تەوژمی هێزی نەشیاوی جۆراوجۆردا دەوەستایەوە، هەوڵەکانی مارکس خوازەکان بۆ وەرچەخانی سوپا لەبەهما بالآیی هیچ کەڵکی نەبوو: پشت کردنە نیشتمان ، بانگەشەی جووەکانیش بۆ دروستکردنی کون و کەلەبەر لەنێو ئەم دامەزراوە نەتەوەییدا بێسوود و هیچ ئەنجام بوو، بەڵام تاکە خاڵی لاوازی سوپا پەیڕەونەکردنی دادپەروەری بوو لەنێوان نەخوێندەوار و خوێندەوارانىدا، بەوەی خوێندەواران تەنها بۆماوەی یەك ساڵ دەجەنگین، ئەمەش لای خۆیەوە تاڕادەیەك ئاڵۆزی نابۆوە لەنێو ڕیزەکانی سوپای یەکگرتووی وڵآتدا.

بەڵێ بێگومان سوپا قوتابخانەی نەتەوەی ئەڵمانیابوو، چەك و هێزی هەناوی پشت پێبەستراویش بوو. ئەگەر دەستەیەك لەئەڵمانەکانی خۆمان بەهۆی کێشەیەکی دەروونیەوە ئەمەی نەدیتوە ئەوا دوژمنانی دەرەکیمان باش درکیان بەمەکرووە، هەرلەسەر ئەم بنەمایەش بووە داڕشتنەوەی سیاسەت و پلانەدژبەرەکانمان.

لەپاڵ سوپادا کۆڵەکەیەکی دیکە هەبوو کە دامەزراوەی کارمەندانی وڵآت بوو. ئەڵمانیا لەڕووی ڕێکخستن و کارگێڕییەوە لەهەموو وڵآتانی دیکە لەپێشتربوو، فەرمانبەران نموونەی دەست پاکی و کارجوانی و بێلایەنی بوون.

حەسودان و خەوشدارانی دڵ هەمیشە تانەیان لە ناتەواوی کارمەندانی ئەڵمانیا دەدا بەوەی توانای بەڕێوەبردنی کاری بازرگانییان نییە بەسەرکەوتوویی. بەڵام دروستکردنی هێڵی ئاسن بە لێهاتوویی توانی ئەم دەنگۆ خراپانە لەناوبەرێت. گەر کارگێڕی وەبەرهێنانی پرۆژەکە پاش لەشکستەکەمان تێك چوو ئەوا هۆکارەکەی نەشیاوی پەیڕەوکردنی دەستەڵآتی کۆماری بووە، کە هەستا بە دوورخستنەوەی کارمەندە بەتواناکان و ملکەچانی لەجێگەیاندا دانایەوە.

پەیڕەوی کارگێڕی ئەڵمانی یەکێك لەتایبەت مەندیەکانی سەربەخۆبوونی بووە لە هکومەتە گۆڕدراوەکان، بەچەشنێك گۆڕینی شالیار و ئارەزوو و ئاراستەی ڕامیارییان کاریگەری ئەوتۆی نەکردۆتەسەر کار و بەرنامەکانی فەرمانبەرانی ئەڵمان. بەڵام لەمڕۆکەدا دۆخی فەرمانبەر ناجێگرە و شڵۆقە، ئیشەکان بەس بە کەسانی تواناداری نادرێن، ئەم کۆمارە دەیەوێت پاداشتی نۆکەران و ئەڵقەلەگوێیانی خۆی بداتەوە، هەر پارتێك بەپێی بەهێز و لاوازی خۆی کارمەند دادەنێت و لادەبات.

لەسەرەوەختی فەرمانفەرمادا شتی لەم شێوەیە نەبووە، بەوەی کار لەسەر بنەمای ئەرکداری بووە نەوەك نازناو، ئیمپراتۆر لەڕێگەی دابینکردنی پێداویستی و حەمو خواستەکانیانەوە فەرمانبەرانی لەتەڵەی پارتەکان بەدوور دەخستەوە. بەلام ئەمڕۆ فەرمانبەری بووەتە هۆکارێکی سازشکردن و دەرگایەکە بۆ لەبرسیدا نەمردن، فەرمانبەری سەرکەوتوو ئەوەیە لەهەر دۆخێکدابێت بەرگی ئەوە بپۆشێت، دگەڵ هەموو شاڵاوێکدا گرنگ پاراستنی سەری خۆی دەبێت لەم چەشنە دۆخانەدا.

بەلام ئەودەمەی جوولەکە بووە فەرمانبەر ئەوە گەندەڵی تەواوی وڵاتی تەنیەوە، هەرکە وشەی جوولەکەت بەکارهێنا دەبوو بەرتیل بدەی، جوولەکە هاوتابوو بەوشەی گەندەڵی و دەسپیسی.

***

لەسەر بنەمای پەیڕەوی پاشایەتی و هێزی سوپا و دامەزراوەی کارگێڕی تەندروستدا پەیکەری ئیمپراتۆر شانی دادەهێنا، لەم ڕەگەزە کۆوەبووانەوە ئیمپراتۆر هێز و گەورەیی خۆی بەدەست دەهێنا و بەجوانیش دەستەلاتی وڵاتی سەرپەرەشتی دەکرد. کەواتە ئەمڕۆ ئێمە لەکوێین بەبێ ئەمانە ؟

دەستەلاتی دەوڵەت نەوەستاوەتەسەر فرەوێژی پەرلەمانیەکان، پشت بەستراویش نییە بەو یاسایانەی ناچاری هاولاتیان دەکات ڕێزی دەستەلاتدران بگرن، ئەو یاسایانەی دادگاش نییە کە ئامانجی ترساندنی ئەو کەسانەیە کە دژایەتی دەوڵەتی گەمژەبەڕێوەبەرەکان دەکەن یان دانی پێدانانێت. دەوڵەتداری وەستاوەتەسەر متمانەداری بەو کەسانەی سەوڵەکەی بۆ لێدەدەن و کاروباری گشتی بۆ بەڕێوەدەبەن. ئەوم متمانەش بەرئەنجامی قایلمەندی ڕاستگۆیانە و نیشتمان پەروەرێتی دەستەلاتدارانە، هەمدیس بەرئەنجامی حەسانەوەی گشتیش دەبێت لەبەرامبەر سیستمی فەرمانڕەوایەتی کارکردە و ئالاکەی و ئەو یاسا و پەیڕەوانەشی پەیڕەو دەکرێن. خوێنەر مافی پرسینی ئەوەیهەیە کە ئیمپراتۆر سێ کۆڵەکەی بەهێزی مانەوەی هەبووە کەواتە تیاچوونەکەی لەبەرچی بوو؟ ئایا بەڕاست هۆکارەکانی هەڵوەشاندنەوەو تیاچوونی دەوڵەت ئەوەندە بەهێزبوون کە پایەکانی وڵات لەرزۆك بکات و هەموو ئارامی و ئاسایشی وڵات تێکبدات ؟

بڕوام بەهێزی ئەو فاکتەرانە هەبووە لە مانەوەی دەستەڵاتی پاشاکەماندا گەر هۆکارێکی زۆر گرنگی پشت گوێ نەخستایە کە ئەویش بابەتی ڕەگەز خوازی بوو، کەئەمەش کاریگەرییەکی بەرچاوی هەبوو لەسەر گەشەکردنی نەتەوە و پەرەسەندنی مێژوویی.

ئەو هاوڵاتیە ئەڵمانیە ژیرانەی هەستی خۆش ویستنی نەتەوەو نیشتمانەکەیان مابوویەوە بەر لەڕوودانی فەتارەکەتەکە و دوای ئەوەش بێگومان هەستیان بەوەکردبوو کە ئەو فەتارەتانەی نەتەوەکان تێوەی دەگلێنەوە هەمیشە ئیشی ڕۆژگار نییە، ئەو نەهامەتیەی بەسەر گەلەکەماندا هات بەرئەنجامی خۆڕسکانەی ئەو هەڵانەبوو کە خۆمان لەکاتی بەرگریکردن لە نەتەوەو نیشتمانەکەماندا ئەنجاممان دابوو، لەوەی ویستمان وەکو نەتەوەیەکی سەربەخۆ دیاربکەوین، بەڵکو نەشمان توانی لەڕاستیەکان بگەین.

خۆم لەگەڵ پرسیاردارانی دێمە پرسیارکردن: باپیرانمان چلۆن تواناداربوونە لەبۆ زاڵبوون وەسەر شکست و دوائەنجامەکانیدا؟ ئایا بەڕاست ئێمە پێشیاوی ئەو شانازی و سەروەرییە نین کە باوانمان بۆیان بەجێ هێشتوین ؟ گەر وابێت ئەوا مانای وایە ئەو خوێنەی لەدەمارەکانماندا هاتوچۆیەتی هەمان خوێنی باوباپیرانمان نییە و ئێمە زۆڵین !

لەم کاتەدا بەوە قایل بووم کە ئەم وەچەیەی ئێمە پێشیاوی بەرکەوتنی ئەو گورزە جەرگبڕە بووە؟ چونکە ئێمە هەمان تایبەت مەندی پیاوانەی باوانمان تیادا نییە و لەهەموو خەسڵەتە نەبەرادانەکانی ئەوان بەتاڵین. ئەوەی وای لێکردووین لە مێژووی پڕلە سەروەری ئەڵمانی لابدەن و لەبریدا شکستی بۆبخەینە سەربار زادەی ڕێکەوت نەبوە و نییە، بەڵکو هەنجامی یاسای پەیڕەکراوە لەبەرامبەر پاراستنی جۆر و برەودان بەگەزی پاکدا.

ئایا دەتوانین بێژین: ئەو خوێنەی لە ڕەگەکانماندا هاتوچۆیەتی خوێنێکی ئاری پوختە ؟ لەکاتێکدا لەبواری زاوزێدا نەمان توانیوە خۆمان لەتێکەڵ بوون لەگەلانی پلە نزم بەدوور بگرین ! وەڵامی ڕوونتری ئەمەش لەبەشی داهاتوودا دەخەینەڕوو یاخود خوێنەر خۆیشی دەتوانێت لەڕێگەی جوانتر تێگەیشتن لەڕووداوە ناوخۆیەکانی ئەڵمانیا پێش لەهەڵایسانی جەنگ هەست بەمە بکات، بەوەی چلۆن

دگەڵ هەر هەڵبژاردنێکدا ژمارەی ئەندام پەرلەمانە مارکس خوزەکان لەزیادبوندا دەبوو, بەمەش ژمارەی دژبەرانی پرچەککردنی سوپای وشکانی و بەهێزکردنی سوپای دەریا زیادتر دەبوو.

توخوا ڕەوایە نەتەوەی ڕەسەنی ئێمە دەست بخاتە نێودەستی دوژمنانی نەتەوەو ڕاپەڕین هەڵایسێنەرانەوە کەئەمانە خۆبەخشانە هەوڵی نەدارکردن و سەرشۆڕی بەخشینیان بۆ گەل دەدا ؟

کوا ئەڵمانییەکی ڕاستەقینە لەپێناو بەرنامەیەکی پووچی وەکو ئاشتی گشتی نەتەوەکەی خۆی کردۆتە قوربانی بەرنامە فێلاوییەکانی مارکس خواز و جولەکەکان؟ وەختە لەوەدڵنیابم لەوەی ئەو کەسانەی هێزیان بەبەرنامەی مارکس خوازەکان بەخشی و بوونبە کەری جوولەکەکان ئەوانەن کە خوێنی ڕەسەنی ئەڵمانییان لە لەشدا نییە.

بەڵام ئەو شۆڕشەی گەلەکەمان لەساڵی ١٩١٤دا گەلەکەمان ئەنجامی دا, شۆڕشێکی خۆڕسکی مانەوەبوو, چونکە مارکسیەکان بەژەهرەکانیان توانا و خواستەکانی نەتەوەیان لەنگ کردبوو. بەچاوی خەواڵوەوە بەرەو ڕووبەڕووبوونەوەی دوژمن هەنگاومان نا بەم کارەش کاریگەری ژەهری مارکسیەکان پوکایەوە و نەما. بەڵام شۆڕشی ناپەسەندان ڕێگای لە بوژانەوەو ڕاپەڕین گرت.

جگە لەپەراوێزخستنی چەرخی نوێ بۆ ڕزگارکردنی گەلەکەمان لەکەڵبەی گەندەڵان و چەواشەکاران هیچی دیکەمان بۆناکرێت, سەرباری دانانی بنەمایەکی تەندروست کە پێویستە ململانێی دەوڵەتی نوێی لەسەربێت, دەوڵەتی ئەڵمانی تەنها بۆنەتەوەی ئەڵمانی یە. ئەوکاتەی ڕەگەزی سەرکەوتوو زۆرینە دەبێ و کایەی چالاکی بۆ والادەبێ, بوار بۆ ئەنجامدراوەکانی نا ئاریە ڕاستەقینەکان نابێ.

لەم کاتەشدا جوولەکە و دەستکەلاکانی مارکسیەت لەم دەوڵەتە نوێیدا شوێنیان نابێتەوە.

# بەشی دەیەم

## گەل و ڕەگەز

کۆمەڵێك ڕاستی هەن کە ڕۆژ و شەو لەبازاڕەکاندا دەتلێنەوە، لەبەرهەوەی لەبازاڕ دەماودەم دەکەن بۆیە بەسەر هەموو کەسێکدا تێدەپەڕێت بەبێ ئەوەی بیبینێت و ئاشنای بێت بەمانای وشە. خەڵقی بەگشتی نابینان لەئاست دیتنی ڕاستیە باوەکان، ئەودەمەی کەسێك دەزانێت کە پێویستە ئەو ڕاستیەی ئەو دەیزانێت هەموو کەس بیزانێت تیادەمێنێت و نازانێت چی بکات! هەموو کێشەکانی دەوروخولمان بەئاسانی دەتوانین لەشێوەی هێلکەکەی کۆلۆمبسدا چارەی بۆ بدۆزینەوە بەرام کەسانی هاوشێوەی کۆلۆمبس کەمە.

بەم چەشنە دەبینین هەموو مرۆیەکان بەبێ لێك جودایی لەباخچەی سروشتدا لەگەشتدان بەوەی وادەزانن هەموو شتێك دەزانن، بەڵام نازانن هیچ نازانن، بەشێوەی نابینا لەبەرامبەر دیاردەیەکی دیاری سروشت ڕەفتاردەکەن کە ئەویش بوونی شێوەگرتنێکی ئەندامییە لەبۆ جیاکردنەوەی هەموو ئەو جۆرە بوونەوەرانەیە کە لەم جهانەماندا هەن.

بەتەنها ڕوانینێکی سەرپێیانە لەبۆ دۆزینەوەی بنچینەکانی حەزی گیانداران لە ڕەوتی زایندا دەبینین کە: هاژەڵی نێر بەدوای مێچکەی خۆیدا دەگەڕێت، بولبول

بەدوای مێینەکەیدا ڕێلە و مشك و گورگ و شێر و گوربەش بەدووی مێچەکە کەیاندا سەرگەردانن...

لادان لەم دۆخە ناوازەیی دێنێتەبونێ و ئەمەش بەرزۆری لەساتەوەختی دیل بوون یان بوونی ڕێگری گەورە لەپێشی جووتبوندا دیاردەکەوێت. بەڵام سروشت لەهەمبەر ئەم دۆخە ناوازەیەدا دەستەوەستان ناوەستێتەوە,بەدەربڕینی ناقایلی هەڵدەستێت بە بڕینی وەچەی ڕەگەزە تێکەڵاوەکان یان سنورێك بۆ ئەم چەشنە وەچە خستنەوانە دادەنێت.

سەیرنییە ئەوکاتەی بڵێین کە: جووتبوونی نێوان دووجۆر لە بوونەوەری لێك جوودا پێچەوانەی خواستی سروشتە, سروشت هەرگیز دان بەم چەشنە هاوسەرگیریانە نانێت, بەڵکو سروشت هانی بەهێزەدات بۆ دەستبەسەرداگرتنی لاواز نەوەك توانەوەی بەهێز لەنێو لاواز و خۆکردنە قوربانی. خۆئەگەر مرۆی لەم پەیڕەوە لابدات ئەوا گەشەی ڕێکخراوەیی بوونەوەران دووچاری شکستی نەخوازراو دەبێتەوە.

مەبەستی سروشت لەسووربوونی لەبۆ پاراستنی ڕەگەز یان جۆرەکان تەنها پاراستنی دیاردە ڕووکەشیەکان نییە, بەڵکو ئامانجی زێدەتر پاراستنی فۆرمی تایبەتیەتی, بۆنموونە: ڕێوی هەر ڕێوی دەبێت و پڵنگیش هەرپڵنگ و پشیلەش هەرپشیلە...ئەم جیاوازییەکی لەکاتی گەڕانەوە بۆ توانای خەبات و لێهاتوویی دا بۆمان دیاردەکەوێت, هەرگیز نابێت و نەبووە کە ڕێوی لەبەرامبەر مریشکدا هەستێکی ئاشتی خوازانەی هەبووبێت, هەرگیز پەیوەندی نێوان مشك و پشیلەش لەسەربنەمای یەکسانی نییە.

کوشت و بڕی ڕەگەزەکان لەنێوخۆیاندا چاوگەکەی برچێتی و خۆخۆشویستنە بەر لەوەی سەرچەشمەکەی ڕقبوون بێت لەبەرانبەر. بەهێمنی و پەلەنەکردنەوە سروشت لەم کوشت و بڕە دەنوارێت, زۆریش پێی ئاسوودەیە و ئاسائیشە بەلایەوە؟ چون تێکۆشان لەبەرخاتری پەیداکردنی نان هۆکاری لەناوچوونی بوونەوەرە لاوازەکانە. لە تێکۆشانی نێرینە لەبۆ بەدەستهێنانی مێچکەی خۆیان بەتەنێ هەوانەی تەندروستیان ساغە مافی ئەوەیان پێدراوە جووتبوون ئەنجام بدەن و وەچەبخەنەوە. تێکۆشان بەردەوام کاراکتەرێکی باڵایە لەبۆ بەهێزکردنی تەندروستی جەستە و وزەی جۆرەکان

لەپێناو زیادکردنی بەرگریدا, ئینجاش مەرجێکی سەرەکی یە بۆ پێشکەوتن و گەشەکردنی مرۆڤ.

بێگومان گەر ئەم پەیرەوەشمان پشت گوێ خست ئەوکات مرۆڤ بەرەو دواوە پاشە کشێ دەکات؟ لەبەرهەوەی بژاردە لەم کاتەدا ناچاری کشانەوەیە لەبەرامبەر زۆرینەدا, زۆرینەش بەژمارەی توانای سەرکەوتنی هەیە بەسەر بژاردەی وڵاتدا. گەر ئەمانە چانسداربن ئەوکات بەبێ خۆماندووبوونێکی زۆر ئەمانە دەتوانن بەسەر بژاردەی خوێن پاکی نەتەوەدا زاڵبن بەبێ ماندووبونێکی زۆر. لەم کاتەدا دەبێت لەبەرژەوەندی بژاردەی نەتەوەدا دەست لەم هاوکێشەیە وەربدرێت. لەم کاتەدا سروشت دێتە وەڵام و دەست وەردەداتە نێو ئەم دۆخە و ژمارەی زۆرینە کەم دەکاتەوە و واری جووتبون و زاوزێش بەتەنها بۆ بژاردەکان تەرخان و دابین دەکات.

گەر هاتوو سروشت لە یەککرتن و جوتبوونی دووڕەگەز لەرێگەی هاوسەرگیرییەوە ناقایل بوو ئەوا دەجەنگێت لەپێناو تێکەڵ نەبوونی ڕەگەزێکی باڵا لەگەڵ ڕەگەزێکی نزمدا؟ لەبەرئەوەی ئەم تێکەڵاوبوونە هانی مرۆڤایەتی دەدات کەبۆ دواوە بگەڕێتەوە. مێژووش بەڵگەی ڕاستێتی هەزاران نمونەی لەم چەشنەمان بۆ دیاردەخات.

لەبەرئەنجامی تێکەڵاوبوونی خوێنی ئاری دگەل ڕەگەزەکانی نزمدا هەمیشە بەزیانی گەلی ئاری کۆتایی هاتووە, بۆنمونە لەئەمریکای باکوور کەدانیشتوانەکەی بەزۆری سەر بە ڕەگەزی ئارین بەڕێژەیەکی کەم تێکەڵاوی گەلانی نزمی ڕەنگاوڕەنگ بوویەوە, ئەمە بەسوودی ئەڵمانەکان کۆتایی هات؛ چونکە ئەڵمانەکان لەئەمریکادا ئارادەیەکی باش بەپاکی خوێنی خۆیان پاراست, بەجیاواز لەوانەی کۆچیان بۆ ئەمەریکای باشور و ناوەڕاست کرد کەبەزۆری سەر بەڕەگەزی لاتینی بوون و بەبێ سڵکردنەوە تێکەڵاوی دانیشتوانی ناوچەکە بوونەوە.

ئەم نمونەیە بەسە بۆ ڕوونکردنەوەی بەرئەنجامی تێکەڵاوبوونی ڕەگەزەکان. ئەو ئەڵمانیەی بەپاکی خوێنی پاراست بوو بووە گەورەی کیشوەری ئەمەریکا, تاوەکو تایبەت مەندی خۆی بپارێزێت هەر بەم شێوەیەش دەمێنێتەوە.

بەپوختی دەتوانین بێژین, ئەنجامدانی هەر چەشنە تێکەڵاوییەک لەنێوان ڕەگەزەکاندا ئەنجامەکانی بریتی دەبێت لە:

١-نزمبوونەوەی ئاستی ڕەگەزی باڵا.

٢-دواکەوتنی دارایی و دەروونی و بەرئەنجامیش هەڵوەرینی نەتەوەی لێدەکەوێتەوە.

هاوسەرگیرییەکی لەم چەشنە دژبەری کردنی خواستی خواوەندە. زۆرێك هەن دەبێژن: مرۆڤ توانای زاڵبوونی هەیە بەسەر سروشتدا، بۆیە ئەم چەشنە هاوسەرگیرییە ئاساییە، بەلام ئەوەیان لەبیرچووبوو کە مرۆڤ هەرگیز ناتوانێت بەسەر سروشتدا زاڵبێت. ئەوەی تاوەکو ئێستا خراوەتە ڕوو تەنها بەشێکە لە نهێنیە شاردراوەکان، مرۆڤ هیچ کات چتێکی دروست نەکردووە؟ بەڵکو ئەوەی دۆزیوەتەوە تەنها گەیشتۆتە زانین و درك پێکردنی، مرۆڤ هەرگیز بەسەر سروشتدا زاڵ نەبووە بەوەی هیچی دروست نەکردووە، بەلام توانیویەتی لەڕێی هەستی دۆزینەوەوە هەندێك لە نهێنیە دابڕەوەکانی بدۆزێتەوە و بەمەش دەست دەگرێت بەسەر هەندێك بوونەوەری زیندوودا. جێگەی سەر سوڕمانە هەندێك داهێنانیش هەن لەبواری زانست و هونەر و تەکنیك و داهێناندا بەرهەمی چالاکی مەزنی چەند گەلێکی ڕەگەز یەکن.

بەردەوامبوونی شارستانیەت لەسەر زەویین بەندە بەم گەلانەوە، ئەگەر هەڵوەرین کەوتە نێو ڕیزی ئەم گەلانەوە ئەوا هەموو شتێکی سەر ئەم ڕووی زەوییە جوانیەکانی لەدەست دەدات. ژیاریەکۆنەکان داڕووخان؟ چون ڕەگەزی بالای پونێت نەری توشیاری تێکەلاوبوونەوە هات وەگەل ژاری خوێنینی گەلانی نزمدا. ئەوەیان لەیادکردبوو دەبێژن: شارستانیەت بەرئەنجامی کاری مرۆڤە نەوەك خوودی شارستانی. ژبۆ پاراستنی هەمی شارستانێن پێتڤیمان بەوەهەیە کەسی داهێنەرانی بپارێزین. ئەم پەیڕەوەش پەیزەوەستە بەوەی دەڵێت: خاستر و وەهێز شایەنی گەشە و سەرکەوتن شکۆمەندبوونە.

ئەمەش مانای وەهایە ئەوانەی حەزیان بە ژیانە ناچاری تێکۆشانن. ئەم جهانە جێگەی ئەوانەی تێدانییە کە لە تێکۆشان هەڵدێن و تێناکۆشن.

ڕەنگە ئەمە سەخت بێتە پێش چاوان بەرام لەمەش قورستر هەوڵی مرۆیە لۆ زاڵبون بەسەر سروشتدا، دواتریش سوکایەتی پێکردنی ، بەلام وەرامی سروشت بۆئەو کەسە کاڵفامانەی سەر ئەم بەلەمە بوونە وەلامێکی نائاساییە، کوشندەیەیە، بێ بەزەییانەشە. سروشت حەوت جار کوتەکیان تێدەسرەوێنێت.

***

هەر تەقەلادانێك بۆ زانینی ئەو ڕەگەزانەی ژیارییان دامەزراند کەدواتر پێی دەگوترا مرۆڤایەتی بێ ئاکام و ئەنجام هیچە.

ئەمەش مانای ئەوە هیچ کارمان بەسەر ڕابردووەوە نییە, کەواتە لێکۆڵینەوەکەمان لەسەر هەنوکەیە, ئەی ئێستا دەتوانین چی بەدی بکەین؟ هەوەی ژیاری لۆمانی دەخاتە پێش چاوان لە داهێنانەکانی بواری هونەردۆستی و زانست و تەکنەلۆژیا ڕەنگە هەمووی لەداهێنانی ئاری ڕەگەزەکان بێت, هەمەش واری وەمان پێدەبەخشێت بیژین کە ئاری ڕەگەزەکانی پێشینان دامەزرێنەری مرۆڤایەتی سەرکەوتوو بوونە, ئاریەکان نمونەی دەسپێکی ئەوەن کەپێی ئێژن (مرۆی). ئارییەکان لەپێش و ئێستاشدا مەشخەڵێکی خودانییە و ڕێگەی مرۆڤ بوون ڕۆشن ئەکاتەوە, بزیسکەی نەبەردی خواوەندی بەردەوام لەناوچاوانی ڕووناکیەوە دیارکەوتییە, هەر ئاریەکان بوون پێشەنگایەتی مرۆڤیان کرد بۆ زانست دۆزینەوە و ڕێ پیشاندەر مرۆڤ بوون بۆ دۆزینەوەی ئەو فاکتەرانەی کە مرۆی بە سەرداری ئافرێنراوەکانی سەر ڕووی ئەم زەوینە دەست نیشان دەکات. هەرکە ڕەگەزی ئاری کۆتایی پێهات ئەوکات ڕووناکی لەسەر زەویدا نادرەوشێتەوە و سەر ڕووی زەوی دەبێتە نوتەکی نوتەکەکان, ژیاری مرۆڤیش لەکەمتر لە چەند بابلیسکێکدا تیادەچێ و دەفەوتێ و ئەم جهانە جوان و سەوزەمان دەگۆڕێت بۆ بیاوانێکی سارا لەجوانی ژیان.

گەر هاتوو ویستمان مرۆڤ بوون پۆلێنی سێ پلەبکەین: ئەوانەی ژیارییان داهێنا و ئەوانەی ژیارییان پاراست و ئەوانەی کۆڵەکەکانیان داڕماند ئەوکات دەبینین ئاری ڕەگەزەکان دەچنەوە خانەی گروپی یەکەم , واتە ئەو پۆلەی شارستانیەتیان دەمەزراند. هەر ئاریەکان بوون دامەزرێنەری شارستانی و هێڵکاریەکانی جوانترین و باشترین داهێنراوەکانی مرۆڤیش ئاری کێشاویەتی, بەڵام ئەوکاتەی بوار هاتەسەر جێبەجێ کردنی هێڵکاریەکان بۆ داهێنان ئەوکات هەر ڕەگەزە و لای خۆیەوە بەپێی خواست و بەرژەوەندی خۆی جێبەجێی کرد.

بۆنمونە ڕۆژهەلاتی ئاسیا, دوای چەندین ساڵ ئەم پەڵەیەی سەر ڕووی زەوی دەتوانێت ناوی ژیاری تایبەت بەخۆی لەخۆی بنێت لەکاتێکدا بنچینەی هزرەکانی ئەغریقی و تەکنەلۆژیاشیان زۆری ئەڵمانین, بەتاڵن لە گیانی ئاسیایی جگە لەڕووکەش یان خووی ئاسیاوی. وەك باوە و زانراوە ئێستاکە ژاپۆنیەکان سەرقاڵی

بەکارهێنانی داهێنانی ئەورووپیی و خەریکی ئەوەن ئەم داهێنانە بۆ شارستانیەتی خۆیان زیاد بکەن. زانست و تەکنیکی ئەورووپی پێکڤە ئالاۆن و بەمەش ژاپۆنیەکان تایبەت مەندیەکانی شارستانیەتی خۆیان بەرجەستەدەکەنەوە. بنچینەی ژیان لەیاباندا لەسەر بنەمای ژاپۆنی ڕەسەن بوونێکی نەماوە بەڵکو بنچینەکەی گۆڕاوە بۆ زانست و تەکنیکی ئەورووپی و ئەمەریکی، واتە گۆڕاوە بۆ بەکارهێنانی بەرهەمی گەلانی ئاری. ئەگەر کاریگەری ئەورووپا و ئەمریکا بۆماوەیەك لەسەر یابان نەمێنێت ئەوکات ئەم وڵاتە بۆ چەند دەیەیەك بە بەهێزی و زانستداریەوە دەمێنێتەوە و بەردەوام دەبێت لە پێشکەوتن. بەڵام هیچ کانییەك نەمری و نەبڕانەوەی ئاوەکەی بوونی نییەو ڕۆژێك دێت هەر وشك بێت. ئینجا خەسڵەتەکانی گەلی ژاپۆنی هەمدیس بەسەر ئەم ڕواڵەتی شارستانیەدا زاڵ دەبێتەوە و ئەوکات ژاپۆنیەکان دەگەڕێنەوە بۆ بەر لەحەفتاساڵ پێش لەو کاتەی کە ژیارێتی ئاریەکان بێداری بکاتەوە لەسڕبوون.

ئەتوانین بێژین ئەوە کاریگەری شەپۆلە بیانیەکان بوو کە شارستانیەتی ژاپۆنی لەخەوی قوڵی ڕابردووی خۆی بەئاگاهێنایەوە. بەڵگەی ئەمەش دیسانەوە سڕبونەوەی ژاپۆنیەکانە بۆ گەڕانەوە لۆ خەوتن بە خەوی قوڵی بێئاگایی.

ئەوکاتەی گەلێك ڕەگەزەکانی شارستانیەتی بنچینەیی لە ڕەگەزە نامۆکانەوە وەردەگرێت و بەکاری هێنا و کەڵکی لێبینی، پاش لەناوچوونی ئەوانەی ئەم ڕەگەزی شارستانیەتەیان بۆ هێنابوو ئەم گەلە گەڕایەوە بۆ جارانی خەواڵووی. ئەوا دەتوانین بێژین: ئەم گەلە دەستی لەشارستانیەت هەڵگرتووە. شارستانیەتیشی نەدۆزیوەتەوە و پێی ڕانەگەیشتووە.

ئەگەر دۆخی گەلان لەسایەی ئەم بیرۆکەیەوە هەڵبسەنگێنین ئەوکات دەبینین هەندێکیان بنەماکانی شارستانیەتیان لەگەلانی بژاردەوە وەرگرتووە. بەڵام بۆخۆیان نەیان توانیوە ژیاری بۆخۆیان پێنیات بنێن.

ئەو بیرۆکەیەی تایبەتە بە پێشکەوتنی گەلانەوە دەتوانین بەم شێوەیە پوختی بکەینەوە:

چەندین گەلی ئاری ژمارە کەم هەن کە گەلانی بیانیان لەژێر دەستدایە و کاربۆ گەشەپێدانی لێهاتوویەکانیان دەکەن. ئەمەش وەهۆی ئەوەوەیە کە ئاریەکان توانیویانە ئەو ناوچانە بخەنە ژێر دەستەڵاتیانەوە. ئەم گەلانە دواتر شارستانیەتی

تایبەت بەخۆیان دەئافرێنن کەلەگەڵ خوودی هەناوی خۆیان و تایبەت مەندی هەرێم و گیانی دانیشتوانەکەیدا گونجاوە. بەڵام ئەم گەلانە ناتوانن سوود وەرگرتنی خۆیان لەبنچینەی وەرگیراوی شارستانیەتەکەیان بشارنەوە، ئەویش بنەمای پاراستنی خوێنی ڕەگەی باڵاو و پوختی پیسنەکراوە، لەم کاتەشدا هەوڵی تێکەڵابوونی خۆیان دگەڵ دانیشتوانە ڕەسەنەکەدا دەدەن، ئەمەش لەبەرژەوەندییاندا نابێت ، چونکە ون بوونی خوێنی گەلی سەردەستە لە گەلی ژێر دەستەدا بێگومان سوتەمەنی ڕووناکی بەخش بە مەشخەڵی ڕێگەی شارستانی مرۆڤی باو لەناودەبات.

ئەمەش تێپەڕینێکی خێرایە لەبارەی ئەوقۆناغانەی گەشەکردنەوە کە گەلان پیدا تێپەڕیون لەوەی هیچ کاریگەریەکایان نەبووە لە دۆزینەوەی شارستانیەتدا، بەڵکو وەری گرتوەو کەڵی لێ بینیوە، ئەمەش بیرۆکەی گەشەکردنی ئەوانەمان بۆ دەخاتە بەردەست کە شارستانیەتی مرۆڤایەتیان دۆزیتەوە و چالاکبوون و نەمانیشیان دیاری کردووە، گەلی ئاری.

کەسی باڵا وەك چۆن پێویستی بە بۆنەیەکە بۆنەوەی خۆی دیاربخات، بەهرەی ئافراندن لای گەلانیش بەهەمان شێوە شاردراوەیە تاوەکو دۆخی گونجاویان بۆ هەڵدەکەوێت. لە ژیانی ڕۆژانەی ئاساییدا هەندێك کەس ژینگەکەیان هەست بەبوونی داهێنەرانەیان ناکات، تا ئەوکاتەی چارەنووس دەیانخاتە دۆخێکی ناخۆشەوە و لەم کاتەدا هەست بوونیان دەکرێت و بەهرەمەندیەکانیان دەخەنەڕوو، لەم کاتەدا هەموان ئەوانەی پێشتر گەمەیان پێکردوون سەیریان لێدێت لەوەی ئەم چۆن پێشتر ئەم کەسەمان وەکو داهێنەرێك نەناسیوە؟! لێرەوەش دەتوانین بێژین: هیچ پەامبەرێك لەخاکی خۆیدا بە ئابڕوومەند لێی نەڕواندراوە. جەنگیش خاسترین هەلی ڤەکۆڵینی ئەم دیاردەیەیە. گەنج گەلێکی هۆشیار، شەرمۆك هەن کە لەکاتی ئاشتیدا هیچ ئاکارێکی داهێنەرانەیان لێ نابینرێتلەوەی وەکو پیاوی تەواو دیاربکەون، بەڵام ئەو دەمەی دووچاری نەهامەتی و ترس دەبنەوە، ئەو دەم بە ئازایەتی و نەبەردییەوە ڕووبەڕووی دەبنەوە و بەهێمنی و لەسەر خۆییانەوە مەرگ دەبەزێنن. لێهاتوویی و ژیری پێتڤی وە شۆك داهێنانە بۆ دیارخستنی کەسی بەهێز و کارامە لەپێش چاوان.

ئەوانەی دەڵێن داهێنەر لەڕۆژی دیارخستن یان خستنەڕووی داهێنانەکەیەوە ناوبانگی دەردەکات یان ژیرێتی ئەو کەسە هەست پێدەکرێت؟ هەڵەشە بێژیت چرای

بەهرەمەنـدی ئـەم کەسـە لـەڕۆژی ئامـادەکردنی داهێنانەکەیـەوە داگیرسـاوە, ئەمـە تەنانـەت بەرهـەمی پـەروەردە و خوێنـدن و فێرکـرنیش نییـە. ئـەوەی مەبەستمان بوو لەبلیمـەتی تاکـەکان بەسـەر بلیمـەتی ڕەگـەز و گـەلانیشـدا دەچەسپێت. ئـەو ڕەگەانـەی چالاکی شۆك پێدەر ئەنجام دەدەن , هەر لەکاتی ڕەگەز بوونیانـەوە خاوەن بەهرەیەکن کە هامازەی داهێنان و جوانکاری و ئافراندنی بالآیە. ئەمەش مانای وایە گەلانی دیکە دیکە ئەم ئاشـنای بەهرەمەندییە نین یام ڕەتی دەکەنـەوە تائەوکاتـەی داهێنـانی گەلی بلیمەت لەبواری هونەر و دۆزینەوە وتەکنیکدا دووچاری شۆکیان دەکاتەوە....

پاش لەدۆزینەوەو داهێنانەکان و سەلماندنیشیان گـەلان بەتـەواوەتی هێشتاکە دان بەم بلیمەتیەدا نانێن.

وەك چـۆن توانـا پێشـتر نـەبینراوەکانی مـرۆڤ پێتڤـی وە چـوکلەقنگەدان هەیـە بەمەبەستی دیارخستنی بەهرەمەندیـەکانیان ئاوهـاش بوونی توانـای داهێنـان کـاری لای گەلان و ڕەگەزانی بالآ پێویستی بە کایە و دۆخی دیاری کراوە بۆ یارخستنی, لەم دۆخەشدا ڕەگەزی ئاری جوانترین نمونەن.

ئاریەکان ئەوکاتەی دووچاری دۆخێکی ناڕەحـەت دەبنـەوە بەهرەمەنـدییان نـەش و نمـا دەکـات و جهـان توشـی شـۆك دەکـەن لەڕێگـەی داهێنانەکانیانـەوە, ئـەم چەشـنە شارسـتانیەتانە پەیوەسـتە بـە تایبـەت مەندیـەکانی خـاك و کـەش و هـەوا و دانیشـتوانەکەیەوە, لـەم دۆخـەدا دانیشـتوان هۆکـاری یـەکالآکارە؟ لەبەرئـەوەی هێـزی شارسـتانیەت بـۆ چەسـپاندنی پێویسـتی بـە دەسـتی کـارە, دەتوانرێـت لەڕێگـەی ڕێکخستن و بەکارهێنانی گونجاوەوە کرێکار جێگەی ئامێر بگرێتـەوە. ئەگـەر قەوەەر وانەبوایـە ئاریـەکان ناچاری بەکارهێنانی دەستی کاری بیـانی بـن ئـەوکات بەئاسانی بەرەو چەسپاندنی شارستانی نەیدەتوانی هەنگاوبنێت. وەك دەزانرێت شارستانیەتە سـەرەتاییەکانیش پـێش لەبـەرکاهێنانی ئاژەلی مالی پشتیان وەبـەکارهێنانی مرۆی بەسـتیە . چـونکە ئـاژەڵ بـۆ خزمـەتی مـرۆڤ و شارسـتانیەتەکەی بەکارنـەهات تـا ئەوکاتەی مرۆڤە لەئاژەڵ نزمەکان بەلاوە نەنرا.

هەندێك لەبانگەشەکارانی ئاشتی و بەناو ئاشتی نێوان ڕەگـەزخواز ئـەم ڕاستی یـان کەتوارییە بە هامازەیەکی داڕووخانی مرۆڤایەتی دەزانن, هەندێکی دیش ئەم کەتواری پێشەکەوتنە بەپێویست دەزانن لەبۆ گەیشتن بە ترۆپکی ژیاریی, پێشکەوتنی مرۆی

له پیله‌کانه‌یه‌کی بیکۆتاوه سه‌رچاوه ده‌گرێت, ناشتوانیت به‌بێ برینی پله‌کانی خوارێ به‌وانه‌ی سه‌رێ رابگه‌ی. ره‌گه‌زی ئاری ئه‌و رێگه‌یه‌ی هه‌ڵبژارد که راستینه بۆی راگرستبوو نه‌وه‌ك ئه‌و رێگه‌یه‌ی به‌ناوی ئاشتی خوازانی ئه‌مرۆ بۆیان ئاسان کردبێت. هه‌رچه‌نده ئه‌و رێگه‌یه‌ی که‌تواری لۆ مرۆی ده‌ستنیشان ده‌کات سه‌خت و نائاسان بێت به‌لاّم هه‌مدیس له‌به‌رئه‌نجامدا ده‌گاته‌وه ئه‌و رێگه‌یه‌ی که ئاشتی خوازان بۆ مرۆڤی ده‌کێشن, له‌چه‌شنه رێگه‌یه‌کی به‌م شێوه‌یه‌دا مرۆڤایه‌تی له ره‌سه‌نێتی خۆی لانادات به‌لاّم رێگه هه‌ڵبژێردراوه‌کانی ئاشتی خوازان مرۆڤ له ره‌سه‌نایه‌تی ده‌خه‌ن.

ئه‌و ده‌مه‌ی ره‌گه‌زی ئاری گه‌لانی بچوك و سووکی خسته ژێر فه‌رمانڕه‌وایه‌تی خۆیه‌وه‌و له‌رێگه‌یانه‌وه پاش به‌کارهێنانیان شارستانیه‌تی دروست کرد ئه‌مه کارێکی چاره‌نوارِ نه‌کرایاگ نه‌وییه, چون ته‌نانه‌ت له‌م کاته‌شدا له پێش ده‌ستی ئاریه‌کاندا چه‌ندان جۆر له هامراز و ئامێری پێشه‌که‌وتووی ئه‌وکات هه‌بووه بۆ ملپێکه‌چ کردنی لاوازه‌کان و هه‌مدیس دامه‌زراندنی شارستانیه‌ت.به‌م کاره‌ش نمونه‌ی ئه‌و رێگه‌یه دیارکه‌وت که پێویست بوو ئاریه‌کان بیگرنه به‌ر. به‌م چه‌شنه‌ش ره‌گه‌زی ئاری هه‌ستا به رامکردنی ره‌گه‌ز و گه‌لانی دیکه و ئاراسته‌کردنیان به‌پێی خواست و په‌یره‌وی ئامانجه‌کانی. ئاری نه‌وه‌ستا,هه‌رچه‌نده سه‌خت و ناره‌حه‌تیش بوبێت, له‌پێناو باشترکردنی چارنووس و به‌رزکردنه‌وه‌ی ئاستیدا کاری ده‌کرد و بره‌وی به‌خۆی ده‌دا. ده‌بوو ئاری پارێزگاری له‌م دۆخه‌ی خۆی بکات که وه‌کو گه‌وره‌ی ره‌گه‌زان لێی ده‌نواردرا, دیسانیش ده‌بوو به هێزه‌وه پاراستنی ئه‌و شارستانیه‌ته‌ی له‌ئه‌ستۆی خۆی بگرێت که دایمه‌زراندووه و گه‌شه‌ی پێداوه, چون مانه‌وه و به‌رده‌وام گه‌شه‌کردنی ئه‌م شارستانیه‌ته بارمته‌ی مانه‌وه‌ی ئارین له‌پێگه‌که‌یدا. به‌لاّم ئاریه‌کان نه‌یان زانی چۆن به‌م ده‌سته‌لاّتدرێتیه‌یانه‌وه بمێننه‌وه, به‌تایبه‌ت ئه‌و کاته‌ی دۆخی ژیانی دانیشتوانه ره‌سه‌نه خاستر بوو دیوار و له‌مپه‌ری نێوان خزمه‌تکار و خاوه‌ن بوونی نه‌ما, له‌م کاته‌شدا ئاریه‌کان له‌بیریان چوو بوو که مانه‌وه‌یان به‌به‌هێزی وه‌ستاوه‌ته سه‌ر مانه‌وه‌ی پاکێتی خوێنه‌که‌یان, به‌مه‌ش له‌ده‌ستی چوو چێژبینین له‌و به‌هه‌شته‌ی خۆی پونێتی نابوو له‌م سه‌ر زه‌وینه‌دا, هه‌مدیس به‌هره و توانا داهێنه‌ره‌کانیشی له‌ده‌ست دا, به‌م کاره‌ش ئاریه‌کان بوون به وێکچووی دانیشتوانه

ڕەسمنەکە چ لەشێوەو ج لە بیرکردنەوەشدا, دواتریش داخورانەکە کاری خۆی کرد و تاودەرەی کات ئەو ژیارییەی پێچایەوەو فەوتاند کە ئاریەکان دایان مەزراندبوو.

ئابەم شێوەیە ژیاری و فەرمانفەرمایییەکان تیاچدەچن و ڕێگە بۆ هەوڵ و تێکۆشانی نویێ چۆڵ دەکەن.

خواربوونەوەی ئاستی ڕەگەزەکان بێ گومان ئەنجامێکی ڕاستەقینەی تێکەڵاوبوونی ڕەگەزی باڵایە وەگەل ڕەگەزی نزم و سووکدا. هەر ئەم تێکەڵاو بوونەشە هۆکاری تیاچوونی ژیارییەکان و سڕینەوەیان لەسەر ڕووی زەوین. جەنگی دۆڕاو هۆکاری لەناوچوونی گەل و ڕەگەز نییە, بەڵکو ئەوەی فاکتەری تیاچوون و بڕانەوەی توانا و بەهرە و ژیرییەکانی ڕەگەزانە لەکۆن و ئێستا و داهاتووشدا تەنها فاکتەری خوێنە, گەر خوێن بە پاقژی مایەوە ڕەگەز لەناو ناچێت بەڵام خوێن پیس بوو بە بەیەککگرتنی دوو ڕەگەز یەکیان باڵا و ئەوی دیش نزم ئەوا ئەو ڕەگەزی باڵایە تیاچووەو لەنێو ڕەگەزی نزمدا تواوەتەوە.

***

حەزی مانەوە و پاراستنی جۆرەکان هۆکاری پشت هەموو ڕودراوەیەکی ڕووداوەکانی دیرۆکە, گەر لە فاکتەری ڕاستەقینەی سەرکەوتنی ئاریەکان وردبینەوە,دەبینین سەرکەوتنی بەشێوەیەکی تایبەتی وەستاوەتە سەر حەزی پاك مانەوە, نەوەك هێزی مانەوە. حەزی ژیان یان مانەوەو لەناونەچونی ژیان, حەزێکە لای هەموو مرۆڤایەتی بەدی دەکرێت, بەڵام جودایی ئێمە لەم کاتەدا ئەوەیە کە ئێمەی ئاری بە بەرجەستەیی هەستی پێدەکەین لەکاتێکدا ئەم هەستە لای ڕاپەڕیوانی ژێر دەستە جوداترە لە ئێمە و هۆکارەکانیشمان لێك جودانە.

حەزی مانەوە لەسەردەمی مرۆڤانی هەوەڵیدا دوورتر لەگرنگی دانی مرۆڤ بەخۆی هەنگاوی نەناوە و نەش ڕۆیشتووە. مرۆڤ ئەوکاتە ئاژەڵێك بووە تەنها بۆخۆی ژیاوە و هەوڵی زێدەتر لە دابینکردنی خۆراکەکانی بەولاوەی نەداوە, بەتایبەت ئەو دەمەی برسێتی گازی لێگرتووە و مەترسی خستۆتە سەر ژیانی هەموو هەوڵێکی داوە بۆ دابینکردنی خۆراك بۆمانەوەی . پاش لەوەی ژیانی هاوتایی نێوان نێر و مێ پتر لە جوتبوونی گەیاند ئاسۆکانی ئەم حەزە فراوانتربوون, لەم کاتەدا بەداوە پیاو خۆی بۆ ئافرەتێك تەرخان دەکرد و لەهەموو ئەگەرێکی نەخوازراویش دەیپاراست و خۆراکی

بۆ دابین دەکرد. دواتریش هەردووکیان دەستیان دایە کۆکردنەوەی خۆراك بۆ منداڵەکانیان. ئا بەم شێوەیە گیانی خۆکردنە قوربانی لەنێو مرۆڤدا بەدیارکەوت. ئەوەندەی ژمارەی خێزانەکان فرەبوون مەرجەکانی دەرکەوتنی کۆمەڵگەش دیارکەوتن

ئێستاش پەرتبوون و فراوانبوونی ئەم کۆمەڵگەیانە لە وڵاتانی خاوەن شارستانیدا هەست پێدەکەین. لەکاتێکدا گەل و ڕەگەزە نزمەکان هێشتاکە لەچوارچێوەی تەسکی خێلْ یان خێزاندا دەرنەچوون. چونکە تاوەکو ئێستا گیانی خۆکردنە قوربانی لەپێناو هەمواندا لای ئەم ڕەگەزە نزمانە گەشەی نەکردووە. بەڵام گیانی خۆ کردنە قوربانی لای ڕەگەز و گەلی ئاری زۆر بەهێز و باشی گەشەی کرد. گەورەیی ئارییەکان لەسەر بنەمای پشت بەستوو بە کلتوری هێزی و توانایی و لێهاتوویە ناسنوردارەکانیان بووە. گەلی ئاری هەمیشە ئامادەی پێشکەش کردنی بەرهەم و تواناییەکانیان بوونە لەهەمبەر ڕازاکردنی کۆمەڵگەدا. لای ئارییەکان حەزی مانەوە مەردانەترین شێوەی گرت: هەموو تاکێکی ئاری ئامادەی خۆکردنە قوربانییە لەپێناو کۆمەڵدا.

هیچ توانایی و بەهرەمەندییەکی ئاری نابینی لەدایك بووی ئاوەز بێت. چونکە گەر وەها بوایە ئەوا چالاکی ئارییەکان سنوری تێکدانی تێنەدەپەڕاند. هەرگیز پێگەی ڕێکخراوترینی بەدەست نەدەهێنا. مەرجی سەرەکی لای هەر ئارییەك خۆکردنە قوربانی بوو بۆ هەموان. هەرگیز ڕای خۆیەتی بەسەر هەمواندا ناچەسپێندرێت و بەرژەوەندی تاك بەسەر هەمواندا ناسەپێندرێت. بەخۆکردنە قوربانی لەپێناو بەرژەوەندی هەمواندا تاکیش بەشە قازانجی خۆی وەردەگرێت. بەڵام ئەوکاتەی خزمەتەکان لەم بۆچوونە پێچەوانە بوویەوە ئەوا ڕێڕەوتی دزی و چەقۆکێشی و ڕووتکردنەوەی خەڵك دەگرێتە بەر!..

قوربانی دان مەرجی سەرەکی نییە بۆهەر جۆرە ڕێکخستنێك بەتەنها, بەڵکو ئەمە مەرجی سەرەکی هەموو شارستانیەکی مرۆییە. لەڕێگەی قوربانی دانەوە داهێنەران هەستاوان بەخستنەڕووی داهێنانەکانیان و ڕێڕەوتی خۆشی و فەڕییان بۆ وەچەکانی دوای خۆیان کردۆتەوە, ئەمەش لای هەموو کرێکار و جوتیار و داهێنەر یان

کارمەندێك وەکو یەکە... ئەمانە بەپێی توانای خۆیان بەرهەم دێننە بونێ بێنەوەی خۆشگوزەرانی دابین بکەن ، بەمەش شارستانیەت دادەمەزرێت، گەرچی لەم کاتەدا دەستوبرد کاران هەست بەم خۆکردنە قوربانییە نازانن، هەڵبەت لەمەش لەپێشتر خۆکردنە قوربانی یە لەبۆ پاراستنی مرۆی و ژیاریەکەی. ئایا ئەمە دوا ترۆپکی میهرەبانی و جوانترین و بالأترین تەرزەکانی خۆکردنە قوربانی نییە ؟

ئامادەگی گیانی بۆ ئاراستە پێکرتنی ئەم چالاکییە تاکیانە لای خۆیە نمونەییە، نمونەییش یەکەمین گەرەنتی دامەزراندن و مانەوەی ژیاریەکانی مرۆڤە ، بەبێ نمونەیی بەهرە و تواناییەکانی ئاوەز لەبۆ پێکهاتنی بیرۆکەی داهێنەرانە کورت دەهێنێت.

هەندێك ئامێتەی نمونەیی ڕاستەقینە و خەونی ئەندێشەوانان و ئاشتی خوازان دەکەن کە بەتەواوەتی تەنها بڕوایان بەخۆگەرەکی هەیە، بەجۆرێك لەم کاتەدا عەرشی خۆگەرەکی قوت دەبێتەوە و گیانی خۆکردنە قوربانی فش دەبێتەوە، ئەم داخورانەش پاشتر لەشی هەموو کۆمەڵ دادەخورێنێت.

***

لەم جهانەماندا گەلێك نییە حەزی مانەوەی لادروست بوبێت و دیارکەوتبێت لەشێوەی ئەو گەلەی ناوی خۆی ناوە ((گەلی بژاردە)). بەهێزترین بەڵگەی ئەم قسەیەشمان مانەوەی ئەم ڕەگەزەیە تاوەکو ئێستا، لەگەڵ پاراستنی خوو و نەریت و تایبەت مەندیەکانیان، لەماوەی دوو هەزار ساڵی ڕابردووش ڕووبەڕووی هەموو ئەو ئاستەنگانە وەستاوەتەوە کەدژە ڕێی بوونە.

دیتمان جووەکان لوتیان دەبەنێو کێشە گەورەکانی جهانەوە، لەهەموو شۆڕشێکی شێوە کودەتاشدا دەستێکیان هەیە، بەلأم ئەو فەتارەتانەی مرۆڤایەتی هەژاندووە هیچ کاری لەوان نەکردووە، بۆمانەوەش وەکو ڕەگەزی بژاردە هەموو هەنگاوێك دەنێت لەبۆ پاراستنی ئەو کیانەی هەیەتی.

لەمڕۆدا بەجوولەکە نێژن فێڵباز بەڵکو بلیمەتن، هەموو کاتیش هەروابوونە.تاڕادەیەك جوو هەر بلیمەت بوونەو لەهەموو کات و ساتێکدا دیارکەوتووە کە ژیری جووە لەدایك بوو و بەرهەمی گەشەی خوودی یان ناوەکی نینە، بەڵکو لەسایەی بەرئەنجامی گەشەی ئەوانی دیکەوە گەشەی بەخۆی داوە،

لەبیری نەکەین ئەوەی کە ئاوەزی مرۆیی بەیەوك جارە هەنگاو ناتوانێت بگاتە ترۆپکی هەموو شتێك. بۆ هەر پێهەنگاڤێك بەرەو پێشەوەنان پێویستمان بەچەند هەنگاوێکی پاشەوەنراوە, واتە پێویستمان بە دیارکەوتەکانی شارستانیەتی گشتیە, لێرەشدا مەبەست ئەوەیە کە, دیارکەوتنی هەر بۆچوونێکی بەهێز یان بیردۆززراوەیەك بەرهەمی کەڵەکەبووی سەدان ساڵەی تاقیکردنەوەو ئەزموواندنی پێش وەختی تایبەتییە. ئاستی شارستانیەتی گشتی خۆرتك پێبەخشی تاك دەبێت بە زانیاری سەرەتایی, بەم هەندە زانیاریە تاك چەکداردەبێت لەبۆ هەوڵدان بۆ دۆزینەوەی ئەو کورتیانەی لە داهێنراوەکانی پێشووتردا هاتبوونە بوونی.

جوولەکە ژیاری تایبەت بەخۆی نییە, بەڵکو هەموو خانەکانی شارستانیەتەکەی وەرگیراوە لە داهێنەرانی ژیارییەکانەوە, واتە جوولەکە مشەخۆر و دزی شارستانین. ئەمەش بەهۆی ئەوەوەیە کە حەزی مانەوە لای جووەکان لەهەموو ڕەگەزانی دیکە بەهێزترە, مەرجی یەکەمی دەستەبەر بۆ ناولێنانی گەلێك بە ژیارخواز یان خاوەن ژیاری لەگەڵی بژاردەدا نییە: جووەکان پووچن لەنموونەیی.

ئەمەش بەهۆی ئەوەوەیە کە گیانی خۆکردنەقوربانی لای جووەکان چوارچێوەی (من) ی تێنەپەڕاندووە, ئەو یەکڕیزییەش کەلەنێو جوولەکەدا دیارە هەرگیز لەباری ڕاستەقینەدا شتێکی لەم چەشنە بوونێکی نییە؛ جووەکان ئەم یەکگرتنەیان لەشێوەی خڕبوونەوەی ڕانە مەڕێکدا بەدەوری یەکتردابۆنەوەی گورگ نەیان خوات, یاخوود کۆبوونەوەی چەند گورگێکە لەبۆ خواردنی مەڕێك, ئەوکاتەی ترسیش نامێنێت تەفر دەبنەوە, نچێرەکەشیان خوارد هەمدیس بڵاوەی لێدەکەن. جوولەکە مانای یەکگرتوویی نازانێت تەنها لەبار و کاتی نەخوازراودا نەبێت, گیانی قوربانی دان لای جوو دیارنەکەوێت تائەوکاتەی هەموو تاکێك هەست بە بوونی مەترسیەك دەکات لەسەر ژیانی. لەدووکاتدا یەکگرتن پێویست دەبێت: لەکاتی بوونی دوژمنێکی هاوبەش یان نێچیرێکی هاوبەشدا. ئەوکاتەی جووەکان خوودی من گەرەکیان لانامێنێت ئەوکات جووەکان خۆیان تەڵە بۆیەکتر دەنێنەوە و یەکتر هەڵدەلوشن.

ئەمەش مانای وایە کە کەوتوینەتە هەڵەوە گەر بڕوامان وەهابێت کە یەکڕیزی جووەکان لەبۆ تێکۆشان یان ڕووتانەوەی خەڵکە و جووەکان هەرگیز خاوەنی خووی نموونەیی نین تاڕادەی قوربانی دان لەپێناویدا. جوو ئەوەی هەیە بەتەنها خۆگەرەکی

دەگرێت ودواتر دەگوازرێتەوە بۆ ڕێکخستنەکان و ئەمجار بۆچەسپاندنی لەمێشکی هەواداراندا, ڕێکخستن سەرەتا و کۆتای پارت دیاری دەکات, جەنگێکە هەر دەبێت بکرێت, لەسەرووی ئەمەشیانەوە ڕێکخستن ئامرازە بۆ گەیشتن بە ئامانج نەوەك خوودی ئامانج ڕێکخستن بێت.

لەبەرئەوەی گێتی هەژارە بە مێشکی بیرکارەوەی ئافرێندراو ئاراستەکار ئەوا ڕێکخستن کارێکی زۆر ئاسان دەبێت لەبۆ بەرجەستەکردنی بیرۆکەیەك, هەربیرۆکەیەکیش بۆ چەسپاندنی پێویستی بەبڕینی ئەم قۆناغانەیە:

بیرۆکەیەك لەمێشکی کەسێکی خاوەن پەیامەوە سەرچاوە دەگرێت و دواتر بڵاوی دەکاتەوە و لەدەوریدا ژمارەیەکی زۆری خەڵك و لایەنگیر کۆدەبنەوە. گواستنەوەی بیرۆکە بەڕاستەوخۆیی لە خاوەن بیرۆکەوە بۆ لایەنگرانی باشترین ڕێگەیە بۆ سەرکەوتن و گەیاندنی پەیامەکەی, بەڵام ئەوکاتەی ژمارەی لایەنگرانی ڕوو لەزیادبوونە و خاوەن بیرۆکە ناچاری ناوەند بەکارهێنانە بۆ گەیاندنی بیرۆکەکانی ئەوکات هەڵە گواستنەوەی بیرۆکە کارێکی نەکرەنی نییە و کێشە دروست دەبێت, ئەمەش پێویستی بە ڕێکخستنێکی ژیرانە و بەهێزە بەجۆرێك هەموو گەل بگرێتەوە, ئەمەش ئەوەمان بۆ دیار دەخات کە نابێت پەلەبکەین لە دروستکردنی باڵەکانی ڕێکخستن پێش لە چەسپاندنی دەستەڵاتی خاوەن بزوتنەوەکە لەناوەندی خودی سەرەکی بزوتنەوەکەدا, واتا پێویستە لەپێشدا کەسانی باڵا لەسەر ئەم بۆچوونە ڕابهێنرێت ئەوکات بەرەو باڵ و شانەکانی خوارێ هەنگاوەکانی ڕێکخستن شۆڕبکرێتەوە و بهاوێژرێت. ژادووی مەکە و ڕۆما ناچاری موسوڵمان و کاسۆلیکیەکان دەکات لەنێو خۆیاندا لەپێشدا یەکگرتووبن دواتر بۆدەرێ هەنگاوبنێن, ئەمەش بەبڕوابوون بە پەیامهێنەرەکەیان دەبێت کە نیشانەی ئەم یەکێتی بوونەیە. لێرەوەش دەورگرتنی ناوچەی بیرۆکە بەخش بە خەرمانەیەك لەپیرۆزی یارمەتی باشتر سەرکەوتنی بیرۆکەکە دەدات, لەگەڵ بوونی بە نیشانەی یەکگرتنی لایەنگرانی.

لێرەوەش بۆمان ڕوون دەبێتەوە ئەو ڕێسایانەی کە ناچارین بۆ سەرخستنی جوڵەی بزوتنەوەکە لەناوخۆدا پەنای تێبگرین بریتی دەبێت لە:

١- قەتیس کردن یان چڕکردنەوەی سەرجەم چالاکیەکانی بزوتنەوەکەمان لەیەك شاردا کە ئەویش شاری میونیخە, کە زۆرێك لە لایەنگرە خرۆشاوەکانی تێدایە,

ئەمەش دەبێتە هۆی دروستكردنی فێرگەیەك بۆ گەشەپێدانی نامەی پەیامهێنەكە.
لەهەمان كاتدا پارت دەیەوێت بوونی خۆی بسەلمێنێت لەڕێگەی سڕینەوەی ئەو بیرۆكە نەرێنیانەی كەلەمێشكی زۆرینەدا لەهەمبەر پەیدابوونی بزوتنەوەیەكی نوێ چەسپێندراوە, بەوەی ئەم بزوتنەوەیە ڕەنگە لەڕووبەڕوو بوونەوەی لەگەڵ ماركسیزمدا زیان بە بەرژەوەندی چینی زۆرینەی پێكهێنەری گەل بگەیەنێت, بەوەی بەسەر كەوتنی بەسەر ماركسیزمدا بەرژەوەندی و دەستهاتەكانی ئەمانیش لەناوبەرێت.

٢- لق و شانە ناوخۆییەكانی وڵات دروست ناكرێت تاوەكو بەتەواوەتی دەستەڵاتی ئەم پارتە لەناوەندا (میونیخ) نەچەسپێندرێت.

٣- بەبێ بوونی بەڵگەی تەواو بۆ ملكەچی هەواردان بۆ ناوەندی سەرەكی پارت و پابەندبوونیان بە زانیاریەكانەوە لق و شانەی هەرێمی دروست ناكرێت. ئەمەش لەپاڵ ئەوەی كە پونێت نانی ناوەندی هەرێمی بۆ پارتەكە پێویستی بە جۆرە هەواردارگەلێكە كە پارت بتوانێت دەستەڵاتی بەڕێوەبردنی ئەم ناوچانەیان پێببەخشێت. گەر پارت توانای ئابوری بەهێزبوو ئەوكات كاربۆ كێشكردنی بیرمەندان و كەسانی بەهێزدەكات بۆ نێو پارت و دواتریش لەسەر بەرنامەكانی پارت پەروەردەیان دەكات بەمەبەستی بوون بەسەركردەی پارتەكە لەناوچەكانی وڵاتدا, ئەمە ڕێگەیەكی جێبەجێ كاری گران نییە, بەڵام بۆنەوكەسانەی كە وەك سەرۆك مەكۆی ناوچەكان یان كادر و سەرشانە دەست نیشان دەكرێن پێویستیان بەپارەیە بۆ برەودان بەم كارەیان, چون بەناچارن لەم كاتەدا دەست لەئیشەكانی پێشووتریان هەڵبگرن, بەڵام گەر باری دارایی پارت ڕێی نەدا بە بەكارهێنانی سەرۆكەكان- كارمەندان, ئەوا لەم كاتەدا بەڕێوەبردنی لق و شانەكانی وڵات بەكەس گەلێك دەسپێرێت كە پارە و داهاتی زۆریان ناوێت.

پێش لە دروست كردنی مەكۆ دەبێت سەرۆكەكەی دەست نیشان بكەیت, ئەگەر بوونی سەرۆكی ئەم مەكۆیە كێشەداربوو ئەوا باشتر وایە سەرۆكی نەبێت یان هەر لق و مەكۆ و مەڵبەندی پارت لەناوچەكەدا دانەمەزرێت؟ چونكە بوونی بوودەڵەی مێشك

پووچ لەبری قازانج زیانی بۆ پارتەکە دەبێت لەوەی نەدەتوانێت نەخشەی شایستە دابنێت نەش توانای جێبەجێ کردنی پلانە ئاراستەکراوەکانی سەرووی خۆی دەبێت.

***

داهاتووی هەر جوڵانەوەیەکی رامیاری وەستاوەتەسەر رادەی دەمارگیری هەوادارانی بۆ بزوتنەوەکە، لەگەڵ دانانی بە باشترین چەشنە بزوتنەوەی ئامانجدار. هەرکەسێك بێژێت بەیەکگرتنی دوو بزوتنەوەی هاوچەشن ئەو بزوتنەوانە بەهێز دەبن ئەوا هەڵەی کردووە، چون لەم یەکگرتنەوەیاندا گەشەی دەرەکی دەبینرێت بەچەشنێك بینەری دەرەکی واهەست دەکات بەهێزبن لەکاتێکدا بەم یەکگرتنە تۆوی هەڵوەشانەوەی ناوخۆیی دەچێنرێت، بەجۆرێك هیچ چەشنە دەرکەوتەیەکی نابێت تاوەکو لەناوکاو لەناویان دەبات. بەو مانایەی هەرچەندە ئاراستەکانی دوو بزوتنەوە لەیەکەوە نێزیك بن، بەڵام یەکبوونی راستەقینەیان زۆر دوورە و هەرگیز نابنەیەك، چون تەنانەت سروشتیش رێگە بەهاوسەرگیری دوو چەشنە رەگەزی مرۆیی نادات بەوەی بەیەکسانی بمێننەوە؛ چونکە هەردەبێ بەهێزەکەیان بەسەر لاوازەکەدا زاڵبێت و بمێنێتەوە.

رەنگە یەکگرتنی دووپارتی رامیاری هاوبۆچوون ئەنجامی باشی هەبێت، بەڵام بەتێپەڕبوونی کات ئەم ئەرێنی بوونەیان دەگۆڕێت بۆ دۆخی نەرێنی و بەرەو پوچ بوونەوەیان هەنگاویان پێدەنێت، هیچ بزوتنەوەیەك توانای فراوان کردنی دەستەڵات و ژمارەی هەوادارانی نابێت تا ئەوکاتەی لەناوخۆدا بەباشی خۆی نەچەسپێنێت. وەك دەزانرێت هێزی جوڵانەوە و ماف ژیانی گەشەناکەن گەر بە بیرۆکەیەکی تێکۆشەرانە گۆش نەکرابێتن. ئەو بزوتنەوانەی پشت بە بەستنی هاوپەیمانێتی وەگەل بزوتنەوەکانی دیکەدا دەبەستن دەتوانن بیان شۆبهێنین بەئەو رووەکانەی خێرا نەش ونما دەکەن، بەڵام هێزی تەواوی بۆ بەرەنگاربوونەوەی با و گێژەڵوکەی بەهێزی نییە.

دیرۆك هەوەمان بۆ دیاردەخات کە هێزی رێکخراوە مەزنەکان هەمیشە لەسەر بنەمای دژبەری کردنی تەواوی هەموو شتێکی دەرەوەی کاری خۆی دیارکەوتووە، لایەنگرانی هەر چەشنە بۆچونێك ئەوساتەی بەتەواوەتی دەمارگیر دەبن لەسەر بۆچوونەکە ئەوکات ئامادەی سەرخستێن تائەو رادەیەی ئامادەی خۆکردنە قوربانیشیان هەیە لەپێناویدا، لەم کاتە بەدواوە هەنگاو بۆ رووبەڕوو بوونەوەی

نەیاران دەنرێت و خەمی چەوسانەوەو ئازار ناخۆن و تاوەکو ڕووبەڕووی نەیاری بەهێزتر ببنەوە ئەوکات گەرمتر دەبن لەسەر خەبات و تێکۆشان، حەسرەتیان لەڕێگەی ئاشتگیری کردنی نێوان ئاینەکانەوە بلاُونەبوویەوە، بەڵکو لەسایەی دەمارگیری بۆ پەیامەکەوە توانی ڕێگەی خۆی بکاتەوە و دژبەری هەموو ئەوانەش بکات کە ڕووبەڕووی دەوەستانەوە.

ئەو پێشکەوتنەی بزوتنەوە یەکگرتوەکان بەدەستی دەهێنن زۆر ناخایەنێن بزوتنەوەیەکی سەربەخۆ لەکارکردن پێشی دەکەوێت، دەبێت ئەم پارتەمان لەسەر ئەو بنەمایە گۆش بکەین کە تێکۆشان ئامرازی ئامانجە ناشبێت دەستبەرداری بین، ئەو کاتەی هەوادارانی پارت بەم چەشنە پەروەردەیان بینی ئەوکات دەتوانن دژبەری دوشمن بکەنەوە و بەشێوەیەك لەم کاتەدا دوژمنیان وەها دێتە پێشچاو کە ئەمانە لەبنچینەدا دژدایەتی بزوتنەوەکەیان دەکەن، واتە دەبنە ئەندامی سەرسەختی بزوتنەوەکە.

لەبەرئەوەی درۆودەلەسە و بوهتان بۆکردن چەکی دەستی جوولەکە بووە لەڕێگەی ڕۆژنامە و دەزگاکانی دیکەی ڕاگەیاندنەوە بۆیە کەسانی نەتەوەخوازی ڕەسەنیان پێ سووك کردووە هەربۆیە نابێت ئێمە ئەم چەکە پۆخڵە بەکاربێنین(درۆ و بوهتان)، بەڵکو بەپێچەوانەوە دەبێت بزوتنەوەکەمان گەلی ئەڵمانی لەوە تێبگەیەنێت کە تەنانەت ئەوکاتەی جووەکان ڕاستیشیان کردبێت ئەوا مەبەستیان داپۆشینی درۆیەکی پێشووتریان بووە، هەر درۆ و بوهتانێك جوو هەڵی بەستبێت ئەوا مانای ڕەوشت جوانی و نەتەوەیی بوونی لایەنگرانمانە، هەر تاکێکی ئەڵمانی کەوتۆتە بەر تیری دوژمنایەتی جوولەکە ئەوا بەشێکە لەئێمەی...هەر ئەڵمانییەك جوولەکە ڕقیان لێیەتی ئەوا باشترین و نێزیك و خۆشەویست ترین دۆست ولایەنگر و هاوپەیمانی ئێمەیە.

دەبێت ئەندامانی بزوتنەوەکەمان بەباشی ئەوە بزانن ئەوکاتەی سوبحەینان ڕۆژنامەیەکی جولەکە خواز دەخوێننێتەوە و ناکەوێتە داوی هێرشێکی ئاراستەکراو بۆ ڕووخاندنی کەسێتیەك ئەوا باش بزانێت ئەو ڕۆژەی بە سەلامەتی تێ نەپەڕاندووە، چونکە هیچی وای نەکردووە تاوەکو جووەکان دژایەتی خۆیانی بۆ دیاربخەن، خۆنەگەر ئەو ڕۆژەشی بەدژایەتی کردنی جوو بەسەر برد ئەوا جووەکان بۆ ڕۆژی دواتر دەکەونە ڕیزەی و سووکی دەکەن و ناموسی لەکەدار دەکەن.

ئەوكاتەی هەوادارانمان لەم مەبەستە تێدەگەن ئەوكات بزوتنەوەكەمان ئەوەندە بەهێز دەبێت كە چیتر هیچ هێزێك ناتوانێت بیان شكێنێت.

***

ئەودەمەی دەستمان دایە پارتچێتی و كاری ڕێكخستن ڕامنەبوونی جەماوەر بۆئێمە بەڕاستی ئازاراوی بوو، بەڕاستی جەماوەریش خاوەن پاساوی تایبەت بەخۆیان بوون بەوەی حەوت كەسی نەناسراو كەهیچیان لێبەدی نەكراوە چۆن دەبێت بزوتنەوەیەك دابمەزرێنن كە ئامانجەكەی زۆر لەپارتە گەورەكانی وڵات مەزنتربێت: بوژاندنەوەی تەواوی ڕایخی ئەڵمان، ئەوكاتانەی خەڵكی گەمەیان بەم جوڵانەوەیەی ئێمە دەكرد و تەقڵی ڕێكخراوەكەمان نەدەبوون ئێمە ئەم گاڵتە پێ كردنەمان بە هاندەر دەزانی بەوەی خەڵكی وەختە دەمان ناسن و هەستمان پێدەكەن.

لەمەو پێش باسی چۆنێتی ئامادەبوونی یەكەم كۆبوونەوەی بزوتنەوەكەمانم كرد كەوەكو گوێگر لەوێ ئامادە بووم، لەوكاتەوە كۆبوونەوەكان دەستیان پێكرد و بەردەوام بوون، كۆبوونەوەكانمان لەسەر مێز و كورسی بەتاڵ بوو جگە لەخامە و قاغەزەكانمان چیترمان لانەبوو، بۆچەندین كاتژمێر سەرقاڵی گفتوگۆی هیچ بووین لەبارەی دامەزراندنی دەزگایەكی ڕاگەیاندن و چۆنێتی بانگەشەكردن بۆخۆمان، لەڕاستیدا میونیخ بێ ئاگابوو لەو كۆبوونەوانەی حەوت كەسی نەناسراو ئەنجامی دەدەن، جوڵانەوەكەمان بۆماوەیەك بەم شێوە تەسكە بەرەیە مایەوە تا ئەو كاتەی بڕیاری فراوانتركردنی بزوتنەوەكەمان دا، بۆئەمەش هەوڵی كێشكردنی خەڵكمان دەدا بۆ نێو ئەو كۆبوونەوانەی كە مانگی یەك یان دووجار دەمان بەست، هەرخۆمان بووین داوەتنامە نوس و بڵاوەكارەوەی داوەتنامەكانیش، بەڵام ئەنجامەكان هیچ دڵی خۆش نەدەكردین. هێشتاكە لەبیرمە جارێكیان بۆخۆم بەدەستی خۆم هەشتا داوەت نامەم نوسی و بڵاومكردەوە بەسەر ئەوكەسانەی كە زۆر ستایشی وەرنامەكانی بزوتنەوەكە و ئامانجی بزوتنەكەمانیان دەكرد، هاوڕاكانیشم لەمن كەمتر نەبوون لەچالاكیدا، ژمارەی نامە دابەشكراوەكان گەیشتە پێنج سەد و بیست، لەكاتی دیاری كراودا جگە لەحەوت كەسەكەی پێشووتر هیچ كەسی نوێ ئامادە نەبوو! پاش لەچاوەنواری كردنی ئێمە بۆ هاتنی جەماوەر بۆماوەی یەك كاتژمێر بەڵام هیچ كەسێكی نوێ نەهات، بۆیە سەرۆكی كۆبوونەوەكە دەستی دایە وتاردان بۆخۆمان.

دوای ئەم ڕووداوە بانگێشت نامەکانمان بە ئامێری پیت چن دەنوسیەوە, ئەمەش وای کرد کۆبوونەوەی داهاتوو تاڕادەیەك سەرکەوتووتر بێت و سیازدە کەس ئامادەی بوون کە هێندێکیشیان ئافرەت بوون, ئەم ژمارەیە بەرەبەرە زیادی دەکرد بەجۆرێك لە کۆبونـەوەی پێنجەمـدا گەیشـتە سـی کـەس, کۆبوونـەوەی شەشـەمی پارتەکـە لـە ڕۆژنامەیەکی سەربەخۆی میونیخ دا بەناوی (میـونیخر بیوباختر)دا بلأومـان کردەوە, ئەمـەش بووەهـۆی ئـەوەی ئـەنجامێکی شـیاومان دەسـت بکـەوێت, بۆیـە بـەبڕوا بەخۆبوونەوە هۆڵێکمان بەناوی (هۆفبروس کیلر) بەکرێ گرت کە سەد و سی کەسی لەخۆدەگرت, لەکاتی دیاری کراوی کۆبونەوەکەدا ژمارەی ئامادەبوان گەیشتە سەد کەس و دەخولەك پاشتر بوو بە سەد و یازدە کەس.

مامۆسـتایەکی زانکـۆی میـونیخ دەقـی گشـتی کۆبونەوەکـەی خوێنـدەوە, منـیش بۆیەکەم جار دەسـت نیشـان کرام بۆئەوەی وتـار لـەنێو جەماوەردا بخوێنمەوە, جگە لەوەی سەرۆکی پارت (هارێر) کە بە مەرام پاکیەوە بڕوای وابوو من بۆ هـەموو شتێك شـیاوم جگـە لەوتاربێـژی, بـەلأم هـارێر هەڵـەبوو لـەم پێشـبینیەیدا؛چـون بـەلای گوێگرانەوە توانیم خۆم وەکو وتاربێژی پلەیەك بسـەلمێنم, وشـەکانم کەشی هۆڵەکەی دایە بەربریسـکەی وروژێنـەر, وتارەکـەم بـە چـەپڵەڕێزان و فیـت و هـوڕەوە پێشوازی لێکـرا, ئەوکاتـەی داوا لـەئامادەبوان کـرا کۆمـەکی بزوتنەوەکـە بکـەن هەسـتی وروژێنـدراویان وای لێکردن لـەو جێگـەدا سێ سـەد فرانك دابنـێن کـە ئێمـە دیاریمان کردبوو بۆ پـارە تیاکۆکردنـەوە, ئەمـەش یارمـەتی ئاسـان بلأوکردنـەوەی بلأوکراوە و ڕێنماییە پارتچێتیەکانمان و بانگێشت نامەکانمانی داین.

سـەرکەوتنەکەمان لێـرەوە بـەکۆتا نـەهات, هەنـدێك لەوانـەی گوێبیسـتی وتارەکـەم بـوون لـەو جەنگاوەرانـە پێـك هـاتبوو کـە شـان بەشـانی یـەکتر جـەنگابووین, ئەمـەش یارمـەتی دەربـوو بـۆ ئامادەبوانیـان لـە کۆبوونـەوەکانی داهـاتووی پارتەکەمانـدا, ئەمانـەش لای خۆیانـە لای هاوڕێکانیـان باسـی جـوانی و بـەهێزی بەرنامـەکانی پارتەکەمانیان دەکرد, بەمەش تادەهات ژمارەی ئەندامانمان پتر زیاد دەبوو, ئەمانە گـەنج گـەلێك بـوون کـە بـەگیانی بەرنامـەی تایبـەت پـەروەردەکرابوون و لـەڕاژەی پێشمەرگایەتیدا خاوەنی دروشمی بەهێز بوون, لەشێوەی: هیچ شتێك لەم ژیانەدا نەکردە نییە.

پاش لە چەند هەفتەیەك لە خوێنی گەنجان بۆ لایەنگیری ئەم پارتە بەقوڵ هات، ئەمەش ئەنجامی شیاوی پێدەبەخشین.

یەکەمین سەرۆکی پارتەکەمان هەر هاریر ڕۆژنامەوانێکی ناسراوبوو، خاوەنی ڕۆشنبیریەکی باڵابوو، بەڵام تاکە خەوشی وەکو سەرۆکی پارت نەتوانینی بوو لەبۆ وتاردان بۆ قسەکردن بۆ خەڵك و بەجوانی دەرنەبڕینی ئەوەی لەناخیدا بوو. هەر درکسلر ی سەرۆکی مەکۆی میونیخیش کارمەندێکی ئاسایی و نەتوانکاری وتاردان بوو. ئەوەی سەرەنج ڕاکێش بوو بەلای منەوە دوودڵی و لاوازی ئەم سەرکردەیە بوو، ئەو دەمەی هەواڵی پێشینەیم پرسی پێیان گوتم: هیچ کات سەرباز نەبووە، ئەمەش ڕواڵەتی نەبوونی هێزی پیاوێتی ڕاستەقینە لەم کەسایەتیەی بۆ دەرخستم؛چون ئەم پیاوە بەو خوێندنگەیە ڕانەگەیشتووە کە پیاو دەئافرێنێت و باوەڕێکی بێ سنوری پێ دەبەخشێت.

هاریر و درکلسر لەیەك کانزا دروست کرابوون، ئەم دوانە بڕوایان بەخوودی خۆیان و داهاتووی جوڵانەوەکەشیان بەهێز نەبوو، ئەمانە نەیان دەزانی چۆن ئەو لەمپەرانە بڕێت کە دێتە ڕێیان، ئەو کەسانەش بهاڕن کەدەبنە لەمپەریان، ئەم چەشنە ئەرکانە پێشیاوی کەس گەلێکە کە پێشتر خوێندنگەی بەپیاوبوونی تەواو کردبێت(سەربازی) و بەپاقژیەوە لێی وەدەرهاتبێت، نەوەك ناپاکان!

خۆ منیش هەر سەرباز بوومە و لەساتر و سەنگەری جەنگدا شتێك نەبووە بەلای منەوە بەناوی نەکردەنی و مەترسیدار بێت، بەڵێ ئەم بزوتنەوەیەی ئێمە زۆر سەرکێش بووەو سەرکێشی بەدووی سەرکێشی ئەنجام دەدا، لە ئەڵمانیادا مارکسیەکان خاوەن هەڵوێست و بڕیاربوون، خاوەنی کۆڕ و کۆبوونەوەکان بوون، ئەودەمەی پارتێك ویستویەتی لایەنگرانیان بۆخۆی بەرێت ئەوکات داویانەتە سەر شوێنی کۆبونەوەی پارتە نوێیەکە و تەفروتونایان کردوون، لەڕۆژنامەکانیشدا وەهایان پیشانداون کە ئەندامانی ئەو پارتە و ئامادەبوانی نێو کۆبوونەوەکە نیگەرانیان کردوون و دەست درێژیان کردونەتەسەر، بۆیە پەلاماریان داون و هەڵیان کوتاوەتە سەریان. بەڵام ئەمانە هیچ کات چالاکیەکانی پارتە بۆرجوازیەکانیان بەمەترسی بۆسەر بەرژەوەندی خۆیان هەژمارنەکردووە،چونکە زانیویانە لایەنگری زۆریان نییە. بەڵام بەجوانی و دوربینیەوە لەهەر جوڵانەوەیەکیان دەنواڕی کە ئامانجی

کێش کردنی هەموو خەڵك بێت ، لەم کاتەدا بە ئاگر و بەئاسن هەڵیان دەکوتایە سەر ئەو بزوتنەوەیە و تیایان دەبردن، ئەم چەشنە دۆخە توشی ئێمەش هات ئەوکاتەی هەوڵی کێشکردنی کرێکار و زۆرینەی گەلمان دا. ئەوکاتەی ناوی ((پارتی کرێکارانی ئەڵمانی)مان نا لە بزوتنەوەکەمان مارکس خوازەکان دەستیان دایە دەست درێژی کردنە سەرمان، ئەمەش وای لە لایەنگرانمان کرد لەگیانی خۆیان بترسن بەوەی ڕەنگە بدرێت بەسەرماندا، بۆئەمەش بەرپرسان یەکەمین کۆبوونەوەی گشتی پارتەکەمانیان دواخست بۆ کاتێکی نادیار، بەو مەبەستەی سور پەرەستان هەڵنەکوتنەسەرمان. بەڵام من بەوپەڕی سوربوونەوە هەوڵی بەستنی کۆنگرەکەم دا لەکاتی خۆیدا، لەگەڵ کارکردن بە بەکارهێنانەوەی هەمان چەك کەدوژمن بەکاری دەهێنێتەوە بەمەبەستی لەناوبردنی دوژمنەکەی، ترس لەڕێگەی هێزەوە بەرپەرچ نادرێتەوە بەڵکو بەترس وەڵام دەدرێتەوە. پاش لەوەی بیرۆکەکەم چەسپا ئەوکات توانیمان کۆنگری گشتی پارتەکەمان ببەستین، ئەم سەرکەوتنەمان لەبەستنی ئەم کۆنگرەیە لەگەڵاڕێزانی ١٩١٩دا هانی زیادتری داین بۆ تێکۆشان و سەرکەوتن، ژمارەی وتار خوێنان لەم کۆنگرەیەدا چوار دانەبوون من سێ یەم وتاربێژ بووم، بۆماوەی یەك کاتژمێر قسەم کرد بۆ ئامادەبوان کەژمارەیان سەد و سی گوێگربوون، ئەمجار سەرکەوتنەکەم بەچەشنێك بوو خەونم پێوە دیتوە. لەم کۆنگرەیەدا ئاژاوەگێڕان هەوڵی تێکدانیان دا بەڵام یاوەرانی ئامادەمان بۆ جەنگ توانیان کارێکی وەهایان لێبەسەربێنن هەرگیز هیچ کەس ئیرەیی پێنەدەبردن. پاش لەچەند ڕۆژێك کۆبونەوەیەکمان ئەنجامدا بەئامادەبوونی سەد و حەفتا ئامادەبوی نێر و مێ، هەمدیس ئەمجار من بووم وتاربێژی سەرخاری کۆبوونەوەکە، ئەم کۆبونەوەیە هانی زیادتری داین بۆئەوەی جاری داهاتوو کۆبونەوەکانمان لەهۆڵێکی فراوانتردا ببەستین لەشەقامی (داشۆ)، بەڵام ژمارەی ئامادەبووان ئەمجار پتر نەبوو لە سەد و چل کەس، ئەمەش بووەهۆی ئەوەی کە هەندێك لە یاروەرانمان هەستی نەرێنی بەسەریاندا زاڵبێت، بەڵام من هیچ هەستێکی نەرێنم لا پەیدا نەبوو بەڵکو هەوڵی تێگەیاندنی ئەوانی دیکەشم دەدا بەوەی لەشارێکی حەوت سەد هەزار کەسیدا ڕەنگە هەفتانە لەم کاتەدا دەیان کۆبونەوەی پارتچێتی ببەسترێت بۆیە ئاساییە ژمارەی ئامادەبوانیش کەم بێت، هانی یاوەرانم دەدا بە بەرچاو ڕوونیەوە لەداهاتوو بنواڕین، تازە ئەم بزوتنەوەیەمان ڕێگەی

خۆی کردۆتەوە بۆیە سەرکەوتن چاوەڕوان کراوە. زستانی ١٩١٩-١٩٢٠ ئالیکار بوو بۆ سەرلەنوێ زیندووکردنەوەی هەستی متمانەکردن بەدەروون، ئەمەش لەڕێگەی بڕوا هێنان بە یاخی بووان و ئاشتی خواز و ترسنۆکان کە توندوتیژی یارمەتی دەرە بۆ لەناوبردنی مارکس خوازەکان و نەهێشتنی دەستەڵاتیان،لەگەڵ دەمارگیری و پێداگری کردن لەبۆ سەرخستنی ئەو بیرۆکەیەی کە بزوتنەوەکەمانی لەسەر دامەزراوە و تازە بەتازە ڕێگەی خۆی بەرەو سەرکەوتن کردۆتەوە. ئەمە وەکو بەرجەستەکردنی بڕوایەك وەهایە لەوەی دەتوانیت چیایەك لەجێگەیەکەوە بۆ جێگەیەکی دیکە بگوازێتەوە بە ڕەگەکەیەوە. بەڕاستی لەم کاتەدا چەندین ڕوودا ڕوویان دا کە یارمەتی زێدەتر سەرکەوتنی من بوون، لەوانەش: لە یەکەمین کۆبوونەوەی بەهارماندا دووسەد کەس ئامادەی بوون، لەدوووەمینیش ژمارەکە گەیشتە دووسەد و حەفتا و سێیەمیش لەهۆڵی کۆبونەوەکەدا چوار سەد کەس ئامادە بوو.

لەم کاتە بەدواوە دەستمان دایە دارشتنەوەی پەیڕەوی نێوخۆیی جوڵانەوە تازە داهاتووەکەمان، ئەمەش گفتوگۆیەکی فرەوێژانەی لەخۆگرت لەبارەی ئاریشە ڕواڵیەتەکانەوە. هەندێك لەئەندامانی بزوتنەوەکەمان ڕەخنەیان لەناوی بزوتنەوەکە هەبوو( پارتی کرێکارانی ئەڵمانی)؛ چونکە بڕوایان وابوو ئەم ناوە لە توانا و گەورەیی پارتەکە کەم دەکاتەوە چالاکیەکیەکانیشی سنوردار دەکات، بەڕاستی ئەم چەشنە ڕەخنانە مانای کورت بینی خاوەنە کانیان بوون لەداهاتوو و ئامانجی بزوتنەوەکە، پێش لەهەموو شتێك دەبێت ئەوەمان لەخەڵکان ڕاگەیاندبا کە هەموو بزوتنەوەیەك هەر پارتە تاوەکو دەگاتە دوایین ئامانجی و بەردەوامیش دەبێت لەسەری.

لەکاتی ڕێکخستنکردنی پارتەکەماندا لەڕووی ناوخۆیەوە هەمیشە ئەوانەم ڕەت دەکردە کەناوی خۆیان نابوو(ئەڵمانیە ئاپۆراییەکان)، ئەم گروپە کەسە تەواوی کاریای ئەرێنیان بەرئەنجامەکەی هیچ بووە، بانگەشە پوچەکانیان هەموو شتێکی تێدەپەڕاند. بۆ هاوڕێیانم ڕوون کردەوە: ئەم بزوتنەوە نوێیەمان پێویستی بە لەخۆگرتنی ئەو کەسانەنییە کە تاکە نزاکارانیان ئەو وتانەیانە کە باس لەوە دەکەن سی یان چل ساڵی تەمەنیان لەخزمەتی بیرۆکەیەکدا بەهەدەر داوە، ئەمەش بەهۆی ئەوەوە بوو کەچۆن دەبێت کەسێك چل ساڵی تەمەنی خۆی لەخزمەتی پارتێك یان بەرنامەیەکدا خەرج بکات کەهیچ بەرهەمێکی نەبووە، کەواتە ئەم جۆرە پیاوانە هیچ

قازانجێکیان بۆ ئەم بزوتنەوە نوێیە نییە, هەربۆیە نابێت باوەشیان بۆ بکەینەوە!چون ڕەنگە بە قسە نەرێنییەکانیان ڕیزی بزوتنەوەکەمان تێك بدەن, لەوەش نەگبەتی تر ئەم تێکۆشارە کۆنانە ڕەتی بوون بە ئەندامی ئاسایی پارتەکە دەکەن وداوای پۆستی بالآمان لێدەکەن, وەکو پاداشتێك بۆ ئەو خەباتەی پێشتر ئەنجامیان داوە! ئەم کەسانە (ئەڵمانیە ئاپۆڕاییەکان) زیادتر لەو بازرگانانە دەچوون کە بۆماوەی چل ساڵ سەرقاڵی سەرخستنی پرۆژەیەك بن, بەڵام دواتر بەهیچییەوە دەستیان لێهەڵگرتووە, جارێکی تر دەیانەوێت دەست بەهەمان پرۆژەبکەنەوە بۆ بەدەست هێنانی سەرکەوتن !

بۆ هاولآنم ڕوون کردووە کە ئەم کەسانە (ئەڵمانیە ئاپۆڕاییەکان) بەتەڤل بوونە نێو ئەم بزوتنەوەیەمان نایانەوێت خزمەتی ئامانجی بزوتنەوەکەی ئێمە بکەن بەڵکو گەرەکیانە مەبەست و مەرامی خۆیانمان بەسەردا بسەپێنن و لەڕێگەی ئێمەوە بگەنە ئەو سەرکەوتنەی کە خەونیان پێوە دیتوە! هەندێك لەم کەسانە بەتەواوەتی کاڵفام بوون لەهەنگاونان بەرەو سەرکەوتن, هەندێکی دیکەشیان بەئامانجێکی دیاریکراوی پێشتر نەخشە بۆ کێشراوەوە کاردەکات بۆ گەیشتن بەئامانجێکی مەبەست. هەندێکی دیکەشیان دەیانەوێت لەسەر ئاستی ئاینی دژبەری جوولەکە بکەن لەکاتێکدا لەهەمان کاتدا داوا دەکات چاکسازیی وڵات لەسەر بنەمای ڕەگەز پەرستانەبێت.

لەبۆ وەدەرنانی ئەم ڕەگەزپەرەستە پوچ و ترسناکانە پێشنیاری گۆڕینی ناوی پارتەکەم کرد لەبۆ (پارتی کرێکارانی ئەڵمانی نیشتمانی سۆسیالیستی) بەم کارەش ئەوکەسانە خۆیان بە کۆنە تێکۆشەر لەقەڵەم دەدا لێمان بەدوور کەوتنەوە, ئەم کەسانە دەیانویست لەڕێگەی چەکی خامە و قاغەزەوە دەیانویست خەبات بکەن و جەنگ هەڵایسێنن. ئەم کەسانە لەڕۆژنامە جووە بەکرێدراوەکاندا دەستیان دایە دژبەری کردنمان, دروشمی (بەتوندی کاردانەوەمان دەبێت لەهەمبەر ئەوانەی دەویانەوێت بمان ترسێنن)یان لە بەرامبەری ئێمەدا بەرزکردەوە, پێیان دەگوتین: ئەمانە ئاین ڕەت دەکەنەوە و توندوتیژی مەترسیداریان دەوێت. لەسەرەتای ساڵی ١٩٢٠ دا ئامادەکاریم بۆ بەستنی کۆبوونەوەی فراوانی پارت ئەنجامدا, سەرباری نارەزایی کاربەدەستانی پارت لەوەی پێیان وابوو کەمێشتاکە زووە و کاتی ئەمە نەهاتووە. ڕۆژنامەی سورخوازان گرنگیان پێدەداین و هێرشی توندیان بۆمان دەهێنا, ئێمەش بەمەبەستی ئاژاوە نانەوە بڕیاری ئامادەبوون لە زۆربەی کۆبوونەوەکانی

مارکس خوازەکانمان دا, هەریەك لەئێمە بەدڵی خۆی تێهەڵدانی خوارد, ئەمەش ئەو ڕازەی بۆ درکاندین کە ئەم سوور خوازانە لەیەکەمین کۆبوونەوەی فراواندا ئامادە دەبن بۆئەوەی بتوانن بەئاسانی کاردانەوەیان لەهەمبەرماندا ڕێك بخەن.

دەمانزانی لەکاتی بەکارهێنانی زەبر و کوتەکدا دوژمنانمان لەئێمە بەهێزترن, بەلاّم ئێمە بڕوای تەواومان بەخۆمان هەبوو بەوەی دەتوانین لەسەر هیسابی دوژمنایەتی ڕکابەرانمان ئەتوانین سەرکەوین و لایەنگرمان پتربێت؛چونکە زۆرینە هەمیشە لەگەڵ بەهێز و خۆڕاگراندایە. بەهۆی قایل نەبوونی سەرۆکی پارت بەم بۆچونانەم بۆیە هاریر دەستی لەکار کێشایەوە, لەجێگەی ئەو ئەنتوان دکلسر دانرا کە شەقامی لەپێش والاّکردم لەبۆ کاروباری بانگەشە. ڕۆژی ٢٤ ی ڕێبەندانی ١٩٢٤ مان دەست نیشان کرد بۆ بەستنی یەکەمین کۆنگرەی فراوانی پارت بەناوە نوێیەکەیەوە, بۆخۆم سەرپەرەشتیاری چاپ و بلاّوکردنەوەی هەزاران بانگێشت نامەم کرد و سووربووم لەسەر ئەوەی ناوەڕۆکی وشەکانی ئەو بانگێشت نامانە لەخۆگرتەی بنەما بنەڕەتیەکانی بزوتنەوەکەمان بێت.

پاش لەبلاّوبوونەوەی بلاّوکراوەکانمان مارکس خواز و پارتی گەلی بالاّری دەستیان تێکەڵ کرد بۆئەوەی دژایەتی ئێمە بکەن. ئەم پارتی گەلە لغاوی دەستەلاّتی لەدەستدابوو و بانگەشەی ئەوەی دەکرد کە فەرمانڕەوایەتی ولاّت لەسەربەنەمایەکی نەتەوایەتیە, دیتمان ئەم پارتە هەستا بە بەکارهێنانی هێزی ئاسایش بۆ گلێرکردنەوەی بلاّوکراوەکانمان و سوتاندنی, ڕێگەنەدان بە هۆشیاربوونەوەی ئەو کرێکار و هاولاّتیانەی کە مارکسیە دژە نیشتمان پەروەریەکان سڕیان کردبوون.

دووکەسی ناوازە لەدەستەلاّت دارانی ناوچەکە کە پێشتر هاوپەیمانی مارکسیەکان بوون هاتنەسەر ڕێبازی ئێمە ئەوانیش : ئارنست بوهنر ی بەڕێوەبەری پۆلیس و ڕاوێژکارەکەی دکتۆر فریك بوون, ئەم دوو کارمەندە پێش لەوەی کارمەندی دەوڵەت بن نەتەوەیی بوون. بوهنر کەسایەتیەکی توندوتیژی هەبوو بەلاّم کارەکەی نەبووە هۆی دوورخستنەوەی لە نەتەوەیی بوونی بەرامبەر نیشتمان, کەئەمەش پێویست بوو بۆ زیبندووکردنەوەی ناخە کوژاوەکانی گەل بەمەبەستی ئەنجامدانی ڕاپەڕین, بەڵێ بۆهنەر و ریکی ڕاوێژکاری کار پەرەست نەبوون, هیچ لەو شالاّوە درۆو دەلەسەیە

نەدەترسان کەدەکرایە سەریان لەلایەن دوژمنانی نەتەوەی ئەڵمانەوە لەرێگەی جوولەکە و مارکس خوازەکانەوە.

***

بێ گومان بووم لەوەی کۆبوونەوەی ٢٤ ی ڕێبەندان کۆبوونەوەیەکی بەرفراوان نەبێت. ئەو کاتەی ڕۆیشتمە نێو هۆڵی هۆفبرۆهۆسەوە پێش لەکاتژمێر حەوتی سەر لەئێواریێ لەخۆشیدا وەخت بوو بقڵیشێم. هۆڵەکە جمەی دەهات لەخەڵك کەژمارەیان نەگەیشتە دووهەزار کەس. بەلایەنی کەمەوە نیوەی ئامادەبوان لە لایەنگرانی سوورخواز و سەربەخۆ و مشەخۆران بوون. ئەمانە هاتبوون بەمەبەستی پاکتاوکردنی بزوتنەوەکەمان پێش لەوەی پەل بهاوێژێت.

بەلآم ئەنجامەکەی ڕێك پێچەوانەی دنەدەرانیانەوە بوو.

لەم کۆبوونەوەیەدا وتارخوێنی دووەم بووم. ئەوەی پێش لەمن وتارەکەی بەبێ کێشە خوێندەوە. بەلآم من هەر لەسەرەتای قسەکردنەوە دوژمنانمان پێیان دەبڕیم و هاوڕیێ بەهێزەکانم ڕووبەڕوویان بوونەوە و نقەیان لێبڕین. بەنێو کاتژمێر پاشتر لەبری هات و هاواری دوژمنان چەپڵەی دەست خۆشی بەرزبوویەوە. ئەوەندەی دەستم دایە شیکردنەوەی پەیڕەوی پارتەکەمان دەنگی لایەنگیری بەسەر قشەمربازاریەکاندا بەرز بوویەوە. ئەوەندەی بیست و پێنج پێشنیارم بۆ ئامادەبوان خوێندەوە بەرپەڕی قایل مەندیەوە پەسەندیان لێکردم. بەم چەشنەش بۆم دیارکەوت لەنێو ئاپۆڕایەکی نویێ و خاوەن هاوبۆچوونی مندا وتار دەڵێمەوە. هەستم بەوەکرد کە پاش لەم کۆبوونەوەیە بەتەواوەتی ناوبانگی پارتەکەمان بە وڵآتدا تەشەنەدەکات و لایەنگرانمان چەندان قات زیاد دەکات.

لەم شەوەی شوباتدا ڕەژوویەك داگیرسا کە لە گڕەکەیەوە ئەو شمشێرە وەدیارکەوت کە سیگفریدی ئەڵمانی دەگێرێتەوە بۆ ڕزگارکردنی نەتەوەی ئەڵمانی و ژیان پێبەخشینەوەی

لەم کاتەوە بەوام وابوو تارای بوژانەوە وەدیارکەوت. خوای تۆڵە هەستایەوە و ئامادەی سڕینەوەی شەرمەزاریەکەی ٩ی نۆکتۆبەری ١٩١٨ یە

نەختە نەختە هۆڵەکە بەرەو چۆڵ بوون ڕۆیشت بەلآم بزوتنەوەکە بەردەوام بوو لەسەر ڕێڕەوەکەی

## بەشی دوازده

# نوێنەرانی نەتەوە

لەکۆمبونی ٢٤ ی ڕێبەندانا جوڵانەوەکەمان مەبەست و نەخشەڕێگەی دەستەبەری دانا, لەبۆ سنوردانان بۆ بۆچوونی کەسانی نانەتەوەیی, ئەمەشی خستەبەردەست ئامادەبوانی. ئێستاکەش نۆرەی بێدارکردنەوەی چینی بۆرژوا و کەمکردنەوەی کاریگەری مارکس خوازەکانە لەسەریان. بەڕاستی فاکتەری دەست ڕاگەیشتن بەم قۆناغ و ئاستەی ئێستای بزوتنەوەکەمان هیچ ئاسان نەبوو, چاکەی ئەم سەرکەوتنەشمان دەگەڕێتەوە بۆ چاندنی بڕوای تەواو لەناخی هەوادارانمان بەوەی ئەم بزوتنەوە نوێیە هەڵگری چەمکێکی فەلسەفی نوێ و گۆڕدەرێکی بچینەیی بەهێز و سەرکەوتووە. پەیڕەوی ئێمە جودا بوو لە پەیڕەوی ئەو پارتە درۆزانانە کەلەکاتی هەڵبژاردنەکاندا بەقسەی زریق و بریق خەڵکان هەڵدەخەڵەتێنن و دواتر لەبەڵێن و پەیڕەوی بڵاوکراوەیان پەژیوان دەبنەوە, ئەدەن لەژێر هەموو قسەکانی خۆشیان و دان بە هیچ بەڵێنێکدا نانێن کە پێشتر داویانە.

ئەودەمەی پارتێکی بۆرژوا ڕێبازێکی نوێ دادەڕێژێتەوە یاخوود چاکسازیی لەپەیڕەوە کۆنەکەی دەکات ئەوا بزانە تەنها مەبەستی کێشکردنی زیادتری ژمارەی دەنگدەرانە, هەرکە گەمەکارانی سیاسەت و فرەوێژانی پەرلەمان هەست بە ڕاچڵەکینی گەل دەکەن لەبەرامبەر کارە قێزەوەنەکانیاندا, ئەودەم پارتەکان هەڵدەستن بە

کۆکردنەوەی سەرجەم کەسانی شارەزای نێو پارتەکانیان لۆئەوەی بەناخی خەڵکدا ڕۆبچن و بزانن چییان گەرەك و مەبەستە و بەچی بەڵێنێك هەڵدەخەڵەتێن و دڵخۆش دەبن. بەپشت بەستن بەو ڕاپۆرتانەی شارەزایان بۆ پارتەکانی خۆیانی دەنێرن ئەم پارتانە هەڵدەستن بە چاکسازیی کردن یان گۆڕینی ڕێڕەوتی کارکردنەکەی. هیچ دوودڵ نابێت لە گۆڕینی ئەو بنەمایانەی کە دەبێتەهۆی کێش کردنی زۆرترین دەنگدەر بۆلای خۆی. ئەم پارتانە بەڵێنی ئەوە دەدەن کە کشتیار مافی پاراستنی بەرهەمەکانی خۆی دەدرێتێ و پیشەسازوانیش بەرهەمەکەی و بە ڕکابەریش گیرفانی، مامۆستا و کارمەندانیش موچەکانیان چەند هێند زیاد دەکرێت و کرێکانیش....بەلام ئەم چەشنە بەڵێنانە بەرەوینەوەی کاتی دەنگدان ئەمانیش پوچ دەبنەوە و بونێکیان نامێنێت و دەبنەهەڵم و با دەیباتن لەم کاتە بەدواوە نوێنەرانی گەل هەڵدەستن بە خاوکردنەوەی چالاکیەکانیان و چڕکردنەوەی لە بۆ بەدی هێنانی بەرژەوەندیە تایبەتیەکانی خۆیان و پارتەکانیان ، خەڵکی هەڵخەڵە تێنراویش دەست وەگون دەردەچن و ئەوەی دەستیان دەکەوێت پاش لەهەڵبژاردن ئەوەیە کەهیچیان دەست ناکەوێت.

ئەم قەشمەربازارییە کەهەر چوار یان پێنج ساڵ جارێك ئەگێن دەبنەوە تاکە خەوشی پارتە بۆرژوایەکان نینە. زۆرێك لەهاوڵاتیە دڵپاك و سادەکان ئێژن: ئەم پارتە بۆرژوازیانە دەتوانن ململانێی مارکس خوازەکان بکەن و لەسەر گۆڕەپانی ڕامیارچێتی وەدووریان خەن، ئەو کەسانەی بۆچونیان لەبارەی دیموکراتی بەچەمکە ڕۆژئاواییەکەیەوە باشە لەبیریان کردووە کە ئەم پارتانە هیچ کات و بەئێستاشەوە بەبیریاندا نەهاتووە کێبڕکێی مارکس خوازەکان بکەن. ئەم پارتانە ئەگەر بەرژەوەندی خۆیانی تێدا ببینەوە ئەوا ئامادەی دەست تێکەلاوکردنن دگەل دوژمنانی نەتەوەدا کە دواجار قازانجەکەی بەردەستی سورخوازەکان دەکەوێت. ئەو ڕۆژەشی ئەندامانی ئەنجومەنی نوێنەران لەبۆرژوازیەکان هەستیان بەوەکرد کە بنەمای زۆرینە باشترین زەمانی مانەوەی ویستراویانە، واتە ئەو ڕۆژەی چەمکی دیموکراتیەتی ڕۆژئاوا دەبێتەوە داردەستیان ئەوکات مارکسی و جووە هاوپەیمانەکانیان نابنە هۆکارێك بۆ دەستگرتن بەسەر دەستەلاتدا لەڕێگەی زۆرینەوە و لەسایەی دیموکراتیەتی

ڕۆژئاواوە ئەوكات جوتەیەك لەم دیموكراتیە هەڵەدەن پاش لەوەی شەپازللەیەكی توندیشیان تێ سرەوتاندووە.

ماركس خوازان مامەحەمێی دیموكراتی دەكەن تا ئەوكاتەی توانای خۆسەپاندنی نەبووە و دەتوانێت بەشێوازی جیاواز ئامارە بە بەرجەستەكردنی ئامانجەكانیان بكات، ئەمڕۆش لەسەر هەمان بنەما بوونەتە هاودەستی بۆرژواكان، بەڵام ئەوكاتەی حەستیان بەوەكرد زۆرینەی ئەندامانی ئەنجومەنی نوێنەران دژبەری سورخوازان دەكەن، لەم كاتە بەدواوە وتاربێژ و وتەبێژ و ڕووپامایی كارانیان ئاراستەی قسەكانیان لە پشتگیری دیموكراتیەوە بەرەو پرۆلیتاریا وەردەچەرخێت، ململانێی نێو هۆڵی پەرلەمان نامێنێت بەڵكو لەم كاتە بەدواوە كێشمەكێشی سەرجادە و نێو كارگەكان دەست پێدەكات، لەم كاتەدا ماركسیەت زۆر بەئاسانی دەتوانێت دیموكرات خوازەكان پاكتاوبكات و لەناویان بەرێت. ئەوەی لەڕێگەی نەرم و نیانیەوە نەتوانراوە بەدی بهێنرێت دەتوانرێت لەڕێگەی باز و قۆڵی چینی پرۆلیتاریاوە بەدی بهێندرێت. ڕووداوەكانی پایزی ١٩١٨ نەزۆكی هەر هەوڵێكی پاكتاوكردنی جووی دیارخست، بەتایبەت بەبەكارهێنانی دیموكراتی ڕۆژئاوا.

تێكۆشانی ڕامیاری بەبۆچوونی پارتە بۆرجوازەكان خۆی لە بەردەست خستنی زۆرترین كورسی هۆڵی پەرلەمان دەبینێتەوە. لەم چەشنە تێكۆشانەدا ڕامیاركاران وەك چۆن پێشمەرگەیەك لەكاتی جەنگدا كراسە دڕاوەكەی دەگۆڕێت ئەمانیش ئاوها بەئاسانی بۆچوونی ڕامیاریان دەگۆڕن و شێوازێكی نوێی ڕامیارێتی گونجاو دگەڵ بەرژەوەندیەكانی خۆیان و پارتەكانیان پەیڕەودەكەن. بەڕاستی ئەم پارتە بۆرژوایانە توانای كێشكردنی جادووئاسای خەڵكیان نییە بۆ تەقل بوونە نێو پارتەكانیانەوە، خاوەنی ئەو بڕوا فەلسەفیەش نین كە بتوانرێت هەوادارانیانی پێ پرچەك بكرێت لەبەرامبەر قسەی نەیارانیاندا و پەروەردەی لەسەر ببینن. ئەگەر پارتێكی خاوەن بۆچوون بەهێز و بەرنامە پتەو-ئەگەر ئەو چەمكەی پشتی پێ بەستووە هەزار جار تاوانباریش بێت-دژبەری حكومەتی وڵاتی كرد لەبۆ لەناوبردنی ئەوا ئەم هكومەتە توتنای بەرگری لەخۆكردنی نابێت گەر خاوەنی بۆچوونێكی فەلسەفی بەهێز و پتەونەبێت، ئەمەش لای خۆیەوە دەبێتە پەلامارێكی كوشندەی هارەر. هەربۆیە ئەوكاتەی شالیارە بۆرجواكان ئەوانەی گەزافی نەتەوەیی بوون لێدەچەن و ئەو

مەكۆباڵاریانەشی ڕەخنەی هەوڵی شۆڕش هەڵیسانمان لێبکەن. ئەوا ئێمەش وەڵامەمان وادەبێت: ئەوەی ئێوە پێتان ئەوێنراوە ئەنجامی بدەن ئێمە هەنگاوی بۆ دەنێین. بەم پەیڕەوە پەرلەمانییە نامۆیەتان ئەتەوەتان گەیاندە لێواری هەڵدێری لەناوچوون ئەمەش بۆ بەهێزبوونی خۆتان. بەڵام ئێمە لەسایەی چەمكێكی فەلسەفەی وەهادا دەتوانین ڕۆژێك ئەتەوەكەمان بە پەیكەری ئازادی تەواو ئاشنا بكەین.

هەربۆیە ئێمەش لەم دۆخەدا كە بزوتنەوەكەمان هێشتاكە لەسەرتادایە دەبێت سووربین لەسەر تێگەیاندنی لایەنگرانمان بەوەی ئێمە پارتێك نین پاش لە گەیشتنمان بەدەسەڵات ئەوكات هەموومان وەرگەڕێین و تەنها ئەوەی بەلامانەوە گرنگ بێت كورسی و پارە و ناوبانگی بێت. نەخێر ئەمانە وەرنامەی ئێمە نین. یەكەمین شتێك گرنگیمان پێدا چەمكی پارت بوو لەبۆ دەوڵەت. چونكە ئەم بیرۆكەیە لەلایەن ماركس خوازەكانەوە قۆستراوەتەوە و بیرۆدۆزەكانی لە ڕاین هەڵقوڵاو شێوێنراوە.

***

پاشان هاتینەسەر دەست نیشان كردنی ئامانجەكانی پارتە نوێیەكە و دارشتنەوەی بنەما فەلسەفیەكانی. هەندێك لەهاوڵان پێشنیاری بەرجەستەكردنی ڕەگەزپەرەستیان كرد وەكو یەكێك لەبنەماكانی پارت. بەڵام من ڕەتم كردەوە لەبەرئەوەی بڕوام وابوو كە چەمكی ڕەگەز پەرەستی هێشتاكە لاستیكیە و زیاد لەمانایەكی هەیە. بۆیە بەر لەدەست نیشان كردنی مانا ڕاستەقینەكەی ناتوانرێت بۆ بەهێزكردنی بزوتنەوەكە كەڵكی لێوەربگیرێت. سەرئەنجام قایل بووین لەسەر شێوازی ڕەگەزپەرەستی پەیڕەوكراو. ئەمەش دوای ڕێككەوتنمان بوو لەسەر دەست نیشان كردنی كارەكانی دەوڵەت و شیكردنەوەی خوودی وشەی ڕەگەزپەرەستی و واتا پێدانی وەكو چەمكێكی فەلسەفی.

لەمڕۆدا زۆرێك لەچەمكە فەلسەفیە باوەكان وزەی داهێنان و بەشداربوون بەدەوڵەت دەبەخشێت بەوەی دەوڵەت لەدایك بووی پێویستیە ئابوریەكانە و هەندێك جاریش لەدایك بووی چالاكی بەهێزی ڕامیارییە. بێگومان ئەم بنەما سەرەكیە فاكتەری پشت گوێ خستنی هێزی سەرەتایی پەیوەست بەڕەگەز و كەمكردنەوەی بەهای تاكیشی بەدواوەیە. ئەو دەستەڵاتدارەی جودایی لەنێوان تاكەكان ناكات وەهەموو ڕەگەزەكان وەكو یەك سەیردەكات بەبێ ڕوانین لە ڕەگەزی باڵا لەبۆ بەدی هێنانی داهێنان و ژیاری ئەوا ئەو دەستەڵاتدارە كەسێكی كامڵ نییە. چونكە بەیەكسان ڕوانین لەڕەگەزەكان

بەوەمان دەگەیەنێت کەهەموو گەلان و تاکەکانیشی یەکسانن و هیچ جوداییەکیان لەنێواندا نییە. بەراستی ئەمە خوودی بەرنامەکانی کارل مارکس بوو کەهەوڵی پەیرەوکردنی دا و کردیە باوەڕێکی رامیارێتی بەهێز و باو. ئینجا پاشکۆکانی ئەم باوەڕەی وەها قەشەنگ کردەوە کە پێشیاوی تەنینەوە بێت. ئەمانەش هەمووی لەبۆ قازانجی جوولەکە هاوڕەگەزەکانی بوو.

مارکس خوازی پاڵفتەی نەژادێتی چەمکی رامیارێتی و فەلسەفی باوی دەوڵەتە. کەواتە هەر جوڵانەوەیەک بەم شێوەیەبێت ئەوکات ناتوانرێت لەڕێگەی جیهانی بۆرجوازیەوە ڕێگەی لێبگیرێت و لەمەترسیەکانی کێم بکرێتەوە. چون ئەم جیهانەی بۆرژوا پڕە لەو ژارەی مارکس و جووخوازان ڕشتویانە بەسەر مرۆڤایەتیدا، ئەمبۆرژوانە باوەڕیان بە بنەما گەلێکە زۆر بەکەمی لە مارکسیزم جودایە. بۆرژواییەکان مارکسین. بەڵام دەگوترێت دەتوانرێت دەست بگیرێت بەسەر دەستەیەک لە بۆرژواکاندا لەکاتێکدا مارکس خوازان هەوڵی دەستگرتن بەسەر جیهاندا دەدەن لەبۆ باڵادەست کردنی جوو.

بەڵام چەمکی ڕەگەز پەرەستی بۆ دەوڵەت-وەک ئەوەی پارتەکەمان پاشتر دیاری کردبوو-بەهایەک بۆ ڕەگەزە سەرتاییەکان دادەنێت و دەوڵەتیش لەڕووی بنەماوە بە دامەزراوەیەکی خاوەن پەیامێکی باڵا لەبۆ پاراستنی قەوارەی ڕەگەزەکانی مرۆڤ ناساندووە. ڕەگەز پەرەستی دان نانێت بە یەکسانی نێوان ڕەگەزەکان کە هەلی مانەوە بۆ باشترین ڕەگەز دەڕەخسێنێت و لاوازانیش ناچاری ملکەچ بوون بۆ بەهێزان دەکات، لەگەڵ بەکارهێنانی ڕێبازی ئەرەستۆکراتی لەهەمبەر سروشت.

ڕەگەز پەرەستی وەک چۆن هاوتایی ڕەگەزەکان ڕەخنەدەکات بەهەمان شێوەیەک یەکسانی بەهای تاکەکان ڕەت دەکاتەوە. بوونی مرۆڤیش بە باڵاییەوە بەستراوەتەوە، بەبێ بوونی نمونەی باڵایی هیچ مانایەک بۆ مرۆڤ بوون نامێنێتەوە. لەهەمان کاتدا ڕەتی مافی مانەوەی ئەو بنەما ئافرێنەرانەش دەکاتەوە کە مەترسی بۆسەر ڕەگەز دروست دەکەن و بەرگری لە بەهای باڵاتر لەمە دەکەن. لەکۆتاشدا مافی ژیان بۆ هەر ڕەگەزێکی نزم ڕەت دەکاتەوە گەر بیەوێت لەڕێگەی خۆتێکەڵاوکردنەوە لەگەڵ ڕەگەزێکی باڵادا هەوڵی تیابردنی ئەو ڕەگەزە بدات، چون جیهانێك زنجیرە ڕەگەزی قوڵ ڕەشان دایپۆشێت ئەوا پاش لە تێکچوونی مانا و چەمکەکانی ماف و فەڕ و جوانی ئەپوکێتەوە و ئەو جیهانە تیادەچێت.

# بەشی سیازدە

## دەوڵەتداری

جهانی بۆرژوا لەسالی ١٩٢٠ ەوە بەدژایەتی کردنمان دەولەتیات لێ گالدا ین و شەیپوری پارتە رامیاریەکان بانگەشەی لەناوبردنی دەکردین بەدروشمی:(( ئەو گەنجە بێزارانەی چەمکی نوێیان بۆ دەوڵەتداری و نەتەوەچێتی و جهان هێناوەتە بوونێ)) شایەنی لەناوبردنن. گەر پرسیارکارێك لە مامۆستایەکی ماف گشتی (خزمەتکاران)ی دەولەتی پرسی لەوەی چەمکی ئەم دەوڵەتداریانەیان بۆ روونبکاتەوە,ئەوا وەلامەکەیان ناروون دەبوو, خۆیان ماندوو دەکرد بۆ هێنانەوەی ئەو بیانوانەی کە ماف ئەم چەشنە دەولەت دارییەیان پێدەبەخشێت. هەڵوێستی مامۆستایانی زانکۆش لە هەڵوێستی مامۆستایانی ماف گشتی جوداتر نەبووە؛چونکە مامۆستایانی زانکۆ خۆیان بە ناپابەند دەزانن لەبۆ قسەکردن لەبارەی راستیەکانەوە تائەوکاتەی ئامانجی بوونی ئەم مامۆستایانە خزمەتکردنی ئامانجێکی دەست نیشان کریاگ بێت: پاساوهێنانەوە لەبوونی دامەزراوەیەکی مرۆیی زەبەلاح کە پێی دەگوترێت دەوڵەت.

سێ بۆچوون بۆ دەوڵەتداری هەیە :

**یەکەم:** ئەوانەی بڕوایان وایە دەوڵەت ئەنجامی کۆبوونەوەی ژمارەیەکی زۆری خەڵکە و ڕاگەیاندنی ملکەچییانە لەپێش و لەبۆ دەستەڵاتێکی دیاری کراو.

خاوەنی ئەم بۆچوونە زۆرینەن. ئەمانە دەوڵەت بە پیرۆز دەزانن و بانگەشەی دەوڵەت پەرەستی دەکەن لەخەڵك، لەگەڵ گۆڕینی ئامراز بۆ ئامانج. دەوڵەت بەلای ئەوانەوە بۆ خزمەت کردنی خەڵکی دانەمەزراوە، بەڵکو ئەوە ئەرکی سەرشانی خەڵکە ئەو دەستەڵاتەی دەوڵەت بپەرەستن کە خەڵکانێکی هاوشێوەی خۆیان سەرپەرەشتی دەکەن، بۆئەوەی ئەم دەوڵەت پەرەستیە ئەنگی تێنەکەوێت، دەوڵەت وەها پیشان دەدەن کەهۆکاری پاراستنی هاولاتی و ئارامی و ئاسایشی ناوچەکەیە. بەم کارەشیان دەوڵەت لە ئامرازەوە بۆ ئامانج دەگۆڕن.

ئەم چەمکە لەباڤاریادا پارتی ناوەند دەگرێتەوە کەناوی خۆی ناوە( پارتی گەلی باڤاری). لەنەمسادا کۆمەڵی یاسایی نوێنەرایەتیان دەکرد، مەخابن لەڕایخ دا لایەنگرانی ئەم بۆچوونە کۆمەڵەی پارێزگاران بوون.

**دووەم:** بۆچوونی ئەوانەی بوونی دەوڵەت دەبەستنەوە بە بەردەست خستنی مەرج گەلێکی دیاریکراو، ئەمانە دەڵێن بوونی ملکەچی بۆ تەنها دەستەڵاتێك بەس نییە بەڵکو بوونی یەك زمانی مەرجی سەرکی یە. دەشڵێن دەستەڵاتی دەوڵەت تاکە پاساوی بوونی نییە، بەڵکو دەوڵەت ناچاری ژیاندنی هاولاتیانی خۆیەتی لەگەڵ دەستەبەرکردنی خۆشگوزەرانی و بوژانەوە بۆیان، بەم بۆچوونەش دەوڵەت دەورنادرێت بە خەرمانەیەك لەپیرۆزیی لەبوونی، ڕێزگرتن لەڕابردووی مانای ڕەخنەگرتن لە ئێستای نییە. ئەمانە دەیانەوێت ژیانی ئابوری لەخزمەتی تاکدا بێت. ئەمەش بەزۆری لەنێو بۆرژوا ناوەندیەکان و بەتتیبەت چینەکانی ناوەندی خاوەن بۆچوونی ئازادی خوازی.

**سێیەم:** ئەوانەی دەوڵەت بە ناوەندێك دەزانن بۆ گەیشتن بە ئامانجێکی داگیرکاری یان فراوانکردنێکی بنەما ناڕوون. ئەمانە دەیانەوێت دەوڵەتێکی یەك گەلی یەکگرتوو دابمەزرێنن، کە خاوەنی زمانێکی هاوبەش بێت، بەو هیوایەی یەك زمانی ببێتەهۆی ئاراستەکردنی بیرۆکە نەتەوەییەکانی بەشێوازێکی دیاریکراو.

لەسەدەی ڕابردوودا هەندێك لە بیرمەندان و ئاراستەکاران پتر ڕاڤەی بزوتنەوەی ئەڵمان خوازییان کرد، ئەمەش فراوان بوونی بەخۆوە بینی لەبۆ باشترکردنی نیازپاکی

لەم بوارەدا، هێشتاکە ئەو گفتوگۆ نەزۆکانەم لەبیرە کەلەنێوان دوو ڕۆژنامەی ڤییەنایدا کـرا لـەبارەی ئامانجـەکانی بزوتنـەوەی ئـەڵمانی و تواناداریـەرکانی. یـەکێك لەڕۆژنامـەکان ئەوەنـدە زێـدەڕۆیی کـرد تەنانـەت بـاوەڕی بـە بەئـەڵمانی کردنـی سڵاڤییەکانی وڵات هـەبوو. زۆرێـك لەلایـەنگرانی ئـەم بزوتنەوەیـە بەهەڵەداچووبوون بەوەی بڕوایـان وانـەبوو کە مەبەستی ئەم بزوتنەوەیە کۆکردنـەوەی هـەموو ئەڵمانیـە ڕەسـەنەکانە لـەنێو یـەك دەوڵەتدا، ئەم بەئەڵمانی کردنـەش بەسـەر خەڵکدا جێبەجێ ناکرێت بەڵکو لەسەر زەویدا پیادە دەکرێت و دەچەسپێت. لـەوە گەمژەیی تر هەیە بێـژین: ئەوکاتـەی ڕەش پێسـتێك یـان چینیەك پـاش لـەفێربوونی ئـەڵمانی دەبێتـە ئەڵمانی ؟ چون بەئـەڵمانی بوون لەڕێگەی زمانـەوە ئـەنجامێکی نـەخوازراوی دەبێت، لەبەرئەوەی ئەم فاکتەری زمانە زۆرجار دەبێتـەهۆی ئاوێتەکردنی ئەڵمانـە ڕەسـەنەکان لەگـەڵ ئەوناڕەسـەنانەی کـەهیچ تایبـەت مەندیـەکی ئـەڵمانییان نییـە جگـە لـەو زمانـە نـەبێت کـە وەکـو ماسـك خۆیانیـان پێداپۆشـیوەو قسـەی پێدەکـەن. لەباسـەکانی پێشووترماندا خستمانەڕوو چلۆن ئـەم چەشـنە ئاوێتەبوونـەی نێوان ڕەگـەزی باڵا و نزم لەقازانجی نزمەکەدا کۆتایی دێت.

نەتـەوە یـان ڕاسـتتر بێـژین ڕەگەز،پەیوەسـتە بـە خوێنـەوە نـەوەك زمـان. ئەوانـەی بڕوایـان وایـە دەتـوانن تەنانـەت سلاڤیەکانیش بکەنـە ئـەڵمانی ئـەوا دەبێـت لەپێشـدا بـەدووی فاکتەرێکدا بگـەڕێن کە خـوێنی ئەمانـە بۆ ئـەڵمانی بگۆڕن،ئەمـەش کـارێکی ئەستەمە و ناکرێـت تـەنها بەتێکـەڵاوکردنی ئـەم نزمانـە لەگـەڵ ئێمـەی ئـەڵمانی بـاڵادا نەبێت، لەم کاتەدا دۆڕا و سەرکەوتوو خوێنیان تێکەڵاو دەبێت، بۆیـە هـەر بۆچوونێك لەسەر ئەن بنەمایە بێت بۆ بەئەڵمانی کردنی گەل و ڕەگەزە نزمەکانی دیکە بە ئێمـەی ئەڵمانی باڵا ئەوە ناپاکیە و لەدەوڵەت کراوە.

دەبێت زۆر بەو هەوڵە نـەخوازراوەی دووەمـی پاشـای نەمسـا دڵخۆش بین کەسـەری نەگرت، ئەگینا ئەنجامەکەی توانەوەی ئەڵمانی بوو لـەنێو ڕەگـەزە خوارەکانـدا، بـەوەی هـەوڵی بـە ئـەڵمانی کردنـی نەمسـای دەدا، بـەم کـارەش بۆماوەیـەکی زۆرتـر تەمـەنی نەمسـای درێـژ دەکـردەوە و نەیدەهێشـت بڕوخێـت. مـەخابن ئـەم چەشـنە بانگەشـە وێرانکاری لـەو نێوە نەتـەوەیی خـوازە ئەڵمانیانەشـدا بـاوە کـە هەوڵـەکانیان بـەبڕوای خۆیـان بـۆ قـازانکردنی نەتـەوەی ئەڵمانـە، ئەمانـە داوای سـەپاندنی زمـانی ئـەڵمانیان

دەکرد بەسەر گەلی پۆڵەندی نزمدا و بەم کارەش دەیانویست گەلانی ڕۆژهەلأت بکەنە ئەڵمانی ، ئەمانە ئەوەیان لەبیرچووبوویەوە کە قازانجکردنی ئەم گەلانە لەبەرژەوەندی ئەڵمانەکاندا نییە بەڵکو زیانی بۆ ڕەگەزی ئەڵمانی دەبێت، ئەم گەلانە لێرە بەدواوە بەزمانی ئێمەی ئەڵمانی بۆچوونە نامۆکانیان دەردەبڕن و لە حەزی مانەوەی نەتەوەکەمان کەم دەکەنەوە.

لەیادمە ئەو جولەکانەی ڕوویان لە ئەمریکا کرد وەکو کەسایەتی ئەڵمانی ئەمریکا وەری گرتن نەوەك جوولەکە، ئەمریکیەکان ئەم کارەیان لەسەر هێمە هەژمارد. دەبێت ئەوانەی بانگەشەی بەئەڵمانی کردن دەکەن لەڕێگەی سەپاندنی زمانەوە ئەوا لەڕێبازی باوانمان لایانداوە بەوەی باپیرانمان ئەڵمانی بوونیان بەسەر زەویە چۆڵکاندا دەسەپاند نەوەك گەلانی نائەڵمانی ، بەڵام ئەوکاتەی تێکەڵاوی خوێنی بیانی بوون تاوانیان لەهەمبەر نەتەوەکەمان ئەنجامدا و خوێنی ژەهراوییان کردە جەستە ساغەکانمانەوە.

***

لە ڕوونکردنەوەی بۆچوون و تیۆریەکای پێشتر باسکراوەماندا بۆمان ڕوون دەبێتەوە کە ئەمانە گرنگی ڕەگەز وەکو بنەمایەك بۆ دیارخستنی هێزی داهێنەرانە و بەهاکان پشت کلك دەخات، هەمدیس ڕۆڵی دەوڵەتیش لەبۆ پاراستنی ڕەگەز و بالأیی دیارناخات، ئەو ڕۆڵەی کە دیارکەوتنی بە مەرجی بنەڕەتی هەموو پێشکەوتنێك دادەنرێت. بە پشت گوێ خستنی بورژوازیەت لەبۆ گرنگی ڕەگەز و ڕۆلی بنچینەیی دەوڵەت بواری بۆ بۆچوونەکان تەرخان کردووە بۆ ڕەتکردنەوەی بوونی خودی دەوڵەتیش، بۆیە نایەقی بۆرجوازیەکان ناگرین پێش لەجەمنگ کردن لەگەڵ مارکس خوازەکاندا خۆیان بە دۆڕاو دەزانن. دوژمنەکەی توانیویەتی خالی لاوازی هەمبەری بدۆزێتەوە و بەو چەکەی خۆی بەردەستی خستووە دژایەتی خۆی پێبکات.

پیرۆزترین کاری پارتی نوێ–لەبەرئەوەی بەچەمکی ڕەگەزپەرەستی کاردەکات– ناساندنی پێناسەی دەوڵەت و دەست نیشان کردن پاساو وبیانووەکانی بونیەتی.

بنەمای سەرەکی دەست پێکردن دانانی دەوڵەتە بە ئامراز نەوەك ئاڕمانج، دواتریش دانانیەتی وەکو مەرجێکی سەرەتایی لەبۆ دیارخستنی ژیاریەك کە پێشیاوی مانەوە بێت. بەبێ ئەوەی خوودی خۆی ژیانەرەوەی ئەم ژیاریەش بێت

بەراستەوخۆیی ئەمەش بەوە دەبێت کەناتوانین پێشبینی بۆ دیارکەوتنی هیچ ژیاریەک بکەین بەبێ لەپێش چاوگرتنی رەگەزی بالاْ و توانادار بۆ داهێنان و دامەزراندنی ژیاری. دەتوانین بێژین دیارکەوتنی دەوڵەت بەمانای کۆتاهاتنی رەگەزی مرۆڤایەتی نایات گەر لەلایەن رەگەزی بالاْوە نوێنەرایەتی کرابێت. دامەزرێنەری شارستانیەتی نمونەیش بێت. چونکە نەبوونی ئەم مەرجە بێگومان مانای داڕووتانەوەی مرۆڤایەتیە لە وزەی بەرگری و شیمانە و بەهرەی ئافراندن.

زەوین لەرزەیەکی تیابەر سەرەتا بەشێوەیەکی ئاساییە بەلاْم کە دای لەاوچەیەک چی بنەمایەکی ژیاری بۆ دەمێنێتەوە؟ هیچ شتێک. بەلاْم گەر هەندێک بوونەوەری مرۆیی سەربە رەگەزێکی بالاْ مایەوە دەستەوەستان ناوەستێت تاوەکو سەرلەنوێ ژیاریەکە دەگەڕێنێتەوە باری جارانی. دیرۆک پتر لەجارێک ئەم نمونەیەی بۆ دیارخستوین بەوەی ئەو دەوڵەتەی بەدەست رەگەزێکی نزمەوەیە پاش لە فەتارەتێکی لەم چەشنە چیتر ناتوانێت شارستانیەتەکەی پونێت بنێتەوە.

کەواتە مەرجی سەرەکی مانەوەی گەلی بالاْ دروستکردنی هاوپەیمانێتی نییە لەژێر ناوی دەوڵەتدا. بەڵکو بەهرەداری خودی رەگەزە بالاْکەیە.

ئەم بەهرانە لەرەگەزەکاندا شاردراونەتەوە و دیارناکەون تاوەکو هاندەرێکی دەرەکیان نەبێت. ئەمەش دۆخی ئەڵمانەکان بووە پێش لەبوون بە مەسیحی. ئەوانەشی دەڵێن ئەڵمانەکان لەو کاتەدا دڕندەگەلێکی کێوی بوونە ئەوا ئەمانە جگەلە گێژەمێشک پوچێک زیادتر هیچی دیکە نین. بەلاْم هۆکاری ئەو نەختە دواکەوتنەیان لە دەست ڕاگەیشتنیان بە ژیاری بەهۆی دۆخی ئاوو هەوای نیوەگۆی باکور بووە بەوەی هەلی دامەزراندنی ژیاری درەنگ پێداون. ئەمەش بەهۆی درەنگ گەشەکردنی وزە داهێنەرانەکەیان بووە. خۆئەگەر لەناوچەکانی باشووردا ئاکنجیٚ بوونایە ئەوا دەیان توانی بەر لەزۆر گەلی دیکەی وەکو ئیگریک ژیاری بەهێز دابمەزرێنن ، لەرێگەی دیارخستنی ئەو وزە داهێنەرکارەی لەهەناویاندابوو.

پاڵفتەی دەقەخراوە ڕووەکانی پێشووترمان ئەم بنەمایەیە:

دەوڵەت ناوەندێکە بۆ ڕاگەیشتن بە ئامانجێکی دیاری کراو. ئامانجیشی پاراستنی ئەو کۆمەڵە مرۆڤەیە کەلەژێر سایەیدان، بەگیان و بەرجەستەیی، سەربە یەک جۆرە رەگەزن، سەرباری دەستەبەربوونی هۆکارەکانی گەشە بۆ ئەم دەستەیە لەنێو سنوری

ئەم دەوڵەتەدا. پێویستە لەسەر دەوڵەت بەپلەی یەکەم گرنگی بە پاراستنی ناوەڕۆکی ڕەگەزچێتی بدات، چونکە مانەوەی ئەم تایبەت مەندیانە لای خۆیەوە دەبێتە هۆی دیارخستنی گەشەی سروشتی و ئازادانەی لای تاکی ڕەگەزی باڵای نێو وڵات.

هەر دەوڵەتێك ئەم ئارمانجەی لەپێش چاو نەگرت ئەوا دامەزراوەیەکی پتورکاو و دەزگایەکی ناکاملە، ئێمەی نیشتمان پەروەری سۆسیالیستی دەبێت لەڕێگەی بۆچوونی نوێمانەوە بۆ ڕوانین لەجهان ئەو دەوڵەتەی چوارچێوەیەکی ڕەگەزی تایبەتی هەبێت بەجیا لە دەوڵەتەکانی دیکەی دابنێین. هەر دەوڵەتێت توانای پاراستنی لەخۆگرتوانی خۆی نەبێت ئەوا بیاوی مانەوەی بوونی نییە.

ئەو دەوڵەتەش ئێمە بە ڕەگەز پەرەستیەوە بانگەشە بۆ دیارکەوتنی دەکەیننەرکی شەونخونی کردنە لەهەمبەر مانەوەی نوێنەرانی ڕەگەزی سەرەتایی کە جهانی بە ژیارییەك لێوان لێوکردووە کە باشترین و پێشیاوترینە بۆ مانەوە. ئێمەش وەکو ئاری ڕەگەزان دەوڵەت بە دامەزراوەیەکی زیندووی دەستکەلای گەلێکی زیندوو دادەنێین، دامەزراوەیەك بنەماکانی مانەوە بۆ گەل دابین دەکات و گەشە بە بەهرەکانی دەدات. بەلام ئەو دەوڵەتی لەمڕۆدا واخەریکە بەسەرماندا دەیسەپێنن بەرهەمی قێزەوەنترین هەڵەی مرۆڤایەتیە. بێ ئاگانین لەوەی دژبەرانی بزوتنەوەکەمان کاتێکی باش تەرخان دەکەن لەبۆ پوکانەوەی ئەم جولانەوەیەمان، بەلام کوا چاکسازی ویستان گوێ بە وتەی دژبەری هاو نیشتمانیان دەدەن؟ هیچ گومانمان لەوەش نییە کە مەرامی ئەم بزوتنەوەیەمان بەبێ پێکانی وەچەی نوێ تێپەڕناکات و ئەوانیش کارەکانمان پیرۆزدەکەن و بەگرنگییەوە لێی دەڕوانن.

***

ئەودەمەی زانیمان ئەرکی دەوڵەت هێشتنەوەی باشترین توخمەکانی ڕەگەزە و کەشی گونجاو بۆ نەش و نماکردنی بۆ جدەستەبەر بوو، ئەوا بەبێ هەوڵێکی زۆر بۆمان روون دەبێتەوە کە کاری دەوڵەت هەر تەنها چاککردنی وەچە نییە، بەڵکو دەبێت وەچە تازەداهاتوان بەشێوەیەك پەروەردەبکات کە لەداهاتوودا بتوانن بەژداربن لە بەرزترکردنەوەی ئاستی کۆمەڵگە، هەروەها پێویستە ئێکەمین ئارمانجی پەروەردە پاراستنی تەندروستی تاك بێت. حەزی تەندروست لە جەستەی ساغدایە، جاربەجارێك لەم ڕێسایە لادەدرێت. لە ڕەگەزێکدا هاولاتیانی بۆگەنیان کردووە ئاسان

نییە تاکێك دیارکەوێت خاوەنی تایبەت مەندی و شێوازی بیرکردنەوەی قورس و باشتربێت لەهەموان. خۆنەگەر کەسێکی لەم چەشنەش دیارکەوێت ئەوا سەرکەوتنی نامسۆگرە بەڵکو ڕێژەییشە, چون یام ئەوەتا تاکە خراپ بووەکان لێ ناگەن یام هەوەتا حەزە لاوازەکەیان توانای دەست ڕاگەیشتنی بە داڵە بەرز فرەکە نییە.

هەر دەوڵەتێکی ڕەگەزی حەست بەم کەتوارییە بکات, تەنها لەڕێگەی بەکارهێنانی زانست لای سەرداران قایل نابێتن بەڵکی موعاوەلەی مۆرکردنی نەتەوە دەدات بە جەستەی ساغ. لێرەدا فێرکردن لەبری ئەوەی ئارمانجی سەرەکی پێگەیاندنی خوو ڕەوشت بێت گەشە بەهێزی حەز و توانای بڕیاردان دەدات, بەڵام فێرکردن بە چەمکە ڕاستەقینەکەی پلەی دووەمی گرتووە.

هەر دەوڵەتێك بیەوێت ڕەگەزی بێت ئەوا دەبێت ئەم بنەمایانەی تێدابێت:

کەسایەتی ساغ, ئاکارجوان و خواست بەهێز, نەترس, باشترین ئەنجامی کۆمەڵگەیە, ڕۆشنبیرە, کەسانی کەم ئەندام جا توانای ژیریکەی هەرچەندەبێت لەم دەوڵەتەدا جێگەی نابێتەوە. گەلێکی پڕ لە زانای پۆخڵ بوو لەجەستەوە, خوازوریستیشیان لاوازە, داوای ئاشتی ورە ڕووخێن دەکەن, هەرگەلێك ئەمەبێت خۆڕەوشتی ناگاتە ئاسمان و تەنانەت ناشتوانێت مانەوەی خۆی لەسەر زەوی بسەلمێنێت. ئەو تێکۆشانەی قەودەر بەسەر نیمەی مرۆڤدا دەیچەسپێنێت زۆر بەکی شکست چارەنوسێکی لەش ساغانە. کەسی دۆڕاو هەمیشە بەپێی زانیاریە سنوردارەکانی خۆی بڕیاری ناتەندروست دەدات بەجۆرێك پێشیاوی بەزەیی پێداهاتنەوەبێت.

دەبێت تاڕادەیەك گونجاوی لەنێوان بەرجەستە و هەستیەکاندا دەستەبەربێت.

ئەو لەشەی دووچاری گەڕی بووبێتەوە بۆنمونە هەرگیز جوانی و ڕەونەقی هزری بۆناگەڕێتەوە. جوانترین نمونەش بۆجوانی دەرخستن ئەو بەراوردەیە کە گریکەکان ئەنجامیان داوە بەوەی جوانی لەشیان بە درەوشانەوەی گیانەکان و بالأیی دەروون لەقەڵەم داوە.

گرنگی دان بە بەهێزکردنی جەستە لەوڵاتی ڕەگەزپەرەستیدا کاری تاك نییە, لەو بابەتانەش نییە کە بگەڕێتەوە بۆ بابەتی سەرەتای دیارکەوتن, چون ئەمە کاری

سەرەکی دەوڵەتە بەهۆی بوونی پەیوەندی پتەویەوە بە چاکسازی ڕەگەزی ئەوگەلەی دەوڵەت نوێنەرایەتی دەکات و دەیپارێزێت.

دەبێــت دەوڵــەتی ڕەگەزپەرەســتی لــە ڕەوتــی پەروەردەیــدا ســوود لــەو پەنــدە خۆرهەڵاتیە وەربگرێت کە دەڵێت: فێرکردن لەمنداڵیدا وەکو هەڵکۆڵینی سەر بەرد وەهایە, بەجۆرێك هەر لەمنداڵیەوە گرنگی بە پێگەیاندنی ڕەگەزی دەدرێت, ئەمەش پێویستی بە ئاراستەکردنی دیکەکانە بە ئاراستەیەکی کردارەکی لە چوارچێوەی گرنگی دان بە منداڵەکانیان لەبۆ ئەوەی بەباشترین و خاسترین دۆخدا گەورەبن و گەشەبکەن.

لەدەوڵەتی ڕەگەزچێیدا پێویستە لەسەر خوێندنگە و پەروەردە کاتێکی تەواو بۆ وەرزشی جەستەیی دابنێن. لەم ڕۆژگارەماندا خوێندنگەکان هەفتانە دوو کاتژمێر تەرخان دەکەن بۆ یاری جیانلاستیك و ئامادەبوونی خوێندکار خۆبەخشانەیە, بەڕاستی ئەمە هەڵەیە؛ چونکە بەزیادکردنی کاتەکان بۆ وەرزشی جەستەیی نەوکات هەم جەستە و هەمیش ئاوەز ساغ دەبێ و گەشەدەکات. نابێت هیچ ڕۆژێك بەسەر گەنجێکدا تێپەڕێنرێت بەبێ ئەوەی دوو کاتژمێر وەرزش بکات, جا هەر جۆر و چییەك بێت, کاتژمێرێك بەیانیان و کاتژمێرێکیش شێوان. هاوچەرخان وەرزشی شەڕەبۆکسیان ناوناوە وەرزشی کەسانی کێوی و گەمژەکان! ئەوانەی حەزیان لەم چەشنە وەرزشەیە زۆرانبازی و شمشێرکاری دەخەنە ڕیزی هونەرەوە.ئەم تازە خوزانە نازانن کە شەڕەبۆکس گیانی تێکۆشان گەشەپێدەدا و لەمەناویەیەوە نەش و نما بە ئاوەز دەبەخشێت و جەستەیش زۆر بەهێز دەکات لەکاتێکدا هیچ لەدەست نادرێت. ئایا باشتر نییە دوو دوژمن لەبری پەنابردنە بەر دەپانچە و تیغ پەنا ببەنە بەر قۆڵ و بازوویان لەبۆ شەڕکردن؟ ئەو کەسەی سورە لەسەر وەرگرتنەوەی شکۆمەندی و مەزنی خۆی ئامادەی بەکارهێنانی بازوەکانیەتی لەبۆ بەرپەرچدانەوەی دووژمن لەبری ئەوەی پەنا بباتە بەر نزیکترین حەیتەخانە. گومان لەوەدا نییە بەناو ئاشتی خوازان ئەم بنەمایەیان لا پووچەڵە, بەڵام کوا دەوڵەتی نەتەوەیی گرنگی بە ناڕازیی ئەمانە دەدات! دەوڵەت لەم کاتەدا ئەرکی پەروەردەکردنی وەچەیەکی ئاشتی خواز نییە بەوەی بێ کۆت و مەرج خۆی بات بەدەستی نەیارەوە. دەوڵەت نابێت ڕەگەزی ئێمەی ئەڵمانی بە کەس گەلێکی هاوشێوەی بۆرژوا خۆبەڕێز زانەکان و ژنە قەیرەکان

مۆربكات, بەڵكو دەوڵەت ئەركی پەروەرشیاركردنی زەلام گەلێكە نەترس و سەركێش بن و ئافرەت گەلێكیش لەخۆدەگرێت ئامادەی ناساندنی نیشتمانەكەیان بن بە خستنەوەی وەچەگەلێكی ڕاستەقینە.

گەر چینە باڵاكانی وڵات لەتەنیشت سەرقاڵ بوونیان بە وانەخوێندن و بەدەست هێنانی بڕوانامەوە سەرقاڵی وەرزشی جەستەییش بوونایە , گەر لەتەنیشت سەمارە بۆكسێنیان بكردایە, ئەوا هەرگیز ناپاكان نەیان دەتوانی ئاگری بەناو شۆڕش لەئەڵمانیا وەربدەن, ئەم شۆڕشە بەهۆی سەركەوتنیەوە قەرداری دندەرانی نییە بەڵكو بەهۆی ترسنۆكی و بێ توانایی دەستەلأتدرانی ئەوكاتی ئەڵمانیاوە سەركەوتنی بۆ نوسرابوو. ئەمانە بە بەكارهێنانی چەكی بۆچوون ڕووبەڕووی فیشەك وەستانەوە! قاوقیژ و نەرمەنەڕ بەسەر چینە باڵاكانی وڵاتدا سەركەوت؟ چونكە دامەزراوە زانستیەكان لەشێوەی پەیمانگاكان هیچ پیاوێكی ڕاستەقینەیان پێنەگەیاندووە بەڵكو تەنها پزیشك و مامۆستا و كیمیاگەر و یاسانی لێوەبەر هاتووە, كەئەمانە و پیاوبوونیش دوومانای لێك جوودان, ڕەنگە بشتوانرێت لەیەكتردا كۆبكرێنەوە بەلأم لەبار گەلێكی ناوازەدا دەبێت(لەم هەرێمەی ئێمەشدا بەئەفسووس و خەمەوە دەیڵێم: زانكۆ بووەتە لانكەی نەزانان, بێشەی ڕێویەكان, بێشكەی گەمژەكان, واتای وەرگرتنی جلی بڕوانامە و پۆشینی لەدەرەوەیە بەڕووتی !!! خیانەت كردنی گەورەیە لەبچووك , گاڵتەجاڕی بچووكە بە گەورە!! لەباربردنی ئاوەزی خوێندكارە زیرەكەكان و ناشتنی هەموو بیرۆكەكانیانە لەنێو گۆڕێكی بێكێل و وندا !! واتای غەمباركردنی قوتابیە زۆر لە مامۆستاتازا و هۆشیارەكانە!! واتای كوشتنی هەموو ئەو حەز و خواست و ویستراوەیە كە خوێندكار بەر لەوەی بێتە زانكۆ بۆی دروست دەبێت؟!! واتای دەركردن یان كپتكردنی دەنگی ڕاستبێژی و ژیرانە هەندێك لەمامۆستا داناكانە,واتای سفوركردن و پێداكەندنی ئەقڵەپۆشتەكانە !! واتای داڕووتانی ئینتیمایە لەنەتەوە !! واتای فێركردنی تاكە بۆفرۆشتنی خاكەكەی بە پاسپۆرتی وڵاتێكی بێگانەی كورد كوژ !! واتای قەدەغەكردنی پۆشینی جلی كوردیە !! واتای ناچاركردنی فێرخوازانە بۆ كفركردن بە خاك و نەتەوەو نیشتمان و دواتریش بەخوا !!!-وەرگێڕ).

پـەروەرد پەرچـوو نانافرێنێـت، ئـەوەی خـۆی ترسـنۆك بێـت پـەروەردە بـەهێز و پێشەنگی ناخات. بەڵام هەمدیس غیرەت و چاونەترسی بەکەڵکی خاوەنەکەی نایات گەر بەجوانی پەروەردەی جەستەیی و ئاوەزی نەکرێت. دامەزراوە سەربازیەکانمان زۆر بەجوانی ئەمەیان بۆ ڕوون بووەتەوە و لەسایەیدا کاریان کردووە، بەمەش توانرا سوپایەکی زۆر بەهێز و چاونەترس لەبۆ پاراستنی خاك و نەتەوەکەمان دابمەزرێت. دیتمان چلۆن لە هاوینی ١٩١٤ دا پێشمەرگەکانی ئەڵمانیا هەر شتێك دەهاتە ڕێگەیان دەیان ماڵی و بە هەنگە و پەلەوە بەپیری مەرگەوە دەچوون بەشێوەیەك دوژمن وای هەست دەکرد بۆ ئاهەنگی بووك گواستنەوە دەڕۆن واپەلەیانە! ئەم متمانە بەخۆبوونە بەرهەمی پەروەردەیەکی جەستەیی وەهایە کە کەسایەتی مرۆڤ گەشەپێدەدات و بەهرەکانی دیاردەخات، بەتایبەت گیانی تێکۆشان و نەبەردی.

لەمڕۆشدا ئەم ڕەگەزەمان کە دۆشداماوی بێ دەستەلاتی یە، نقومبووی کۆت و بەندییە، پێتڤی بەم باوەڕ بەخۆبوونە هەیە! دەوڵەتی ڕەگەزی هەڵدەستێت بە پەروەردەکردنی تازە پیاکەوتوان لەسەر بنەمای قایل کردنیان بەوەی ئەم ڕەگەزەی ئێمە لەوانی دیکە بالاترە و سەرکەوتوو تریشە، هەناوی پڕ دەکرێت لە نەتەوەیی بوون و داهاتوویەکی باشتر بۆڕەگەز و نەتەوە پاقژەکەی. هیچ کەس وانەگات کە ئەرکی دەوڵەتی ڕەگەزپەرەستی ئاسان بێت، نەخێر بەڵکو بەهۆی شکست خواردنی دەوڵەتەکەمانەوە چەندان هێندەی جارانی کاتی جەنگ ئەم ئەرکە قورستر بووەتەوە.

***

گرنگی دانی دەوڵەتی ڕەگەز پەرەست بە تاکەکان تەنها تائەوکاتانە نییە کە خوێندکار و لەسەر بۆردی پۆلەکە بۆی بنوسرێتەوە و هەستی بجوڵێندرێت ، نا، بەڵکو تاوەکو ئەو کەسە لەژیاندا مابێت پێتڤی بە پەروەردەبینینە. بێگومانین لەوەی هەنوکە دەوڵەت نەیتوانیوە ئەرکە پەروەردەییەکانی خۆی برەوپێبدات بۆ گۆشەکردنی تاك گەلێك کە ڕەگەزی ئەڵمانی لەسەرووی هەموو شتێکەوە ببینن.

بەلام مەخابن لەم ڕۆدا لاوانی ئێمە کەوتوونەتە داوی خراپەکاریەکانی تەڵەی جوولەکە و مارکس خوازانەوە و کەس شك نابەیت لەڕێگەی پێشنیارکردن و چەسپاندنی شێوە پەروەردەی کاری ئاکاری و جەستەیی بەرپەرچی ئەم شالاوە گلاوە بداتەوە.

پێویسته لەسەر دەوڵەتی ڕەگەزپەرەست ئەم ئەرکی پەروەردەکردنە بەدامەزراوە سەربەخۆکانی بسپێرێت, چون دەبێت پەروەردەی جەستەیی لەپێشی هەموو ئەنجامدراوەکانی دیکەوەبێت, لەقۆناغی ئامادەییدا گەنجان بۆ خزمەتی سەربازی ڕادەهێنرێن و پاش لە تەمەن بوونی گەنجان بۆ نێو سەربازگە و سوپا ئەرکی فێرکردنی تازە بەسەر بازبوو لەئەستۆ ناگرێت بەوەی چۆن ڕێبکات و چۆن چۆنی چەك هەڵبگرێت و ڕاست و چەپ بکات.....داواشی لێناکات پەرە بە توانا جەستەییەکانی بدات؛ چونکە پێشتر ئەم کارەی ئەنجام داوەو تەنها بەردەوامی گەرەکە. بەڵکو ئەمە وەکو پەیمانگایەکی بالآی نەتەوەیی وەهادەبێت, بەبێ ئەوەی دەست لەئامانجی ڕستەقینەش هەڵبگرێت کەسوپای کۆن هەیبوو: ئامادەکردنی کەس گەلێك بۆ سوپا کە نیشتمان شانازیان پێوەبکات. تەنها سوپا سەرباز ئامادە ناکات بۆ گوێڕایەڵی کردنی فەرمانی سەرووی خۆی بەڵکو هازری دەکات بۆ بوون بەبالآدەست لەسەر بنەمای بێدەنگی و چاوپۆشیش لەو ستەمانە بکات کە خۆی ئەنجامی دەدات لەڕێگەی هەنگاونان بۆ گەیشتن بە ئامانجەکەی. سەرباز پاش لەوەی دوا ڕۆژی خزمەتی سەربازی تەواو دەکات دوو بڕوانامەی پێدەدرێت: بەڵگەی هاولآتی بوون, کەمافی دەستکەوتنی ئیش و کاری پێدەدرێت, بەڵگەی لەش ساغی و تەندروستباری کە پێشیاوی هاوسەرگیرییە.

دەوڵەتی ڕەگەز پەرەستی لەسەر هەمان بەرنامەش ئافرەت گۆش دەکات, پەروەردەی کچان بۆ ئامادەکردنیانە بۆ ئەو ڕۆڵەی کەدەبێت بیگێڕن پاش لەوەی دەبنە دایك.

***

پاش لە پەروەدەکردنی هاولآتی ڕەگەزی بە پەروەردە کردنێکی جەستەیی ئەوکات نۆرەی پەروەردەکردنی ئاکاری دێت.

گومان لەوەدا نییە ئەوەی گرتی بە شیری هیچ نایبات لەبیری, مەگەر مەرگ. خۆپەرەست هەر خودپەرەستە و نمونەییش هەر نمونەییە, لەنێوان ئەمە و هەوەشدا هەزارن چەشنە خووی دیکە دەبینین کە سەر بەهیچ بار و بەرەیەك نین. تاوانکار هەر لە خۆرسکیەوە تاوانبارە, زۆرێك لەپیاوخراپان دەتوانرێت تاڕادەیەك چاك بکرێن بۆ کەڵك بەخشین بە نەتەوەکەیان. هەندێك لەوانەی خلیچك و گەحۆلن ڕەنگە ڕۆژێك بێت

ببنە مەترسی گەر بەجوانی پەروەردە نەکرێن. زۆرجار لە فرەوێژی بێزار دەبووین، ئەمە خوویەکی باوی نەتەوەکەمانە و پێویستە دەستی لێ هەڵبگیرێت ، لەڕێگەی گۆڕینی شێوازی پەروەردەکردنەوە. سەرکردە سەربازیەکانمان بەهۆی دەم شڕی و زۆر بلێییەوە نەیان دەتوانی بەئاسانی زانیاریە سەربازیە مەترسیدارەکان لە سیخوڕانی دووژمن بشارنەوە! بەڵام ئاخۆ پێش لەجەنگ ئێمەی ئەڵمانی لەسەر بێدەنگی ڕانەهاتبووین؟ ئایا ڕانەهاتبوین لە قێزکردنەوە لەزۆر بلێیی لە فێرگە و کارخانە و دامەزراوەکانی دەوڵەتدا؟ ئایا هەمیشە دوو ڕوویی و فرەوێژیمان بە ڕاستگۆیی ناخی دڵمان دانەنانەوە و بێدەنگیش بە بوغز و قینە؟ ئایا بەڕاست پەروەردەکارانی ئێمە بیریان لەوە کردبۆوە کە فرە وێژیی گەورەترین خەوشی دیارە، بەڕاستی بێدەنگی تایبەت مەندی هەوانەس مۆرکی پیاوەتی ڕاستەقینەیان هەس؟

پەروەشیاران گرنگی ئەوتۆیان بەم لایەنە نەداوە، گەر نەختێك بە ژیریەوە بیریان بکردایەتەوە ئەوا دەیانزانی ٩٠٪ ی ئاریشەکانی بۆهتان و لەپشتە ملەقسەکردن و تانە و تەشەی نابەجێ هۆکارەکەی فرەوێژی یان زۆر بلێیە، پیشەسازیان دووچاری شکست و زیان دەبنە؟ چون فرەوێژ و زمان نەگیراوان نهێنیەکانی ئەبەخشنەوە، تەنانەت ئامادەکاریە سەربازیەکانیش دووچاری نەهامەتیەکانی فرەوێژی ببوویەوە، بەرئەنجامەکەشی شکست خواردن بوو لەچەندین شەڕ گەلێك کەمەزاران سەربازی نەبەردی بێدەنگ بوون بەقوربانی ئەو چەند زۆر بلێ و دەم نەوەستاوانەی لەوێدابوون، نابێت ئەوە لەبیرکەین کە بۆ گۆڕینی هەر چەشنە خوو و ڕەوشتێك دەبێت لەمنداڵیەوە دەست و برد بکەین و هەوڵی گۆڕینی بدەین، ئەمەش لەڕێگەی پەروەردەیەکی ئاراستەکراوی نەتەوەیی ڕووتەوە بەرجەستە دەبێت، دار بە تەڕی زووتر و باشتر دەچێمێنی، ئەو شێوەیەی کە مەبەستتە لێی وەبەرهەم دێنی.بۆ پەروەردەکردنیش پێویستمان بە بوونی دایك و باوکی باشە ئەوجا فێرگەی بەهێز و بەجۆشە، دەبێت هەموان ئەوە باش بزانن ئەو منداڵەی حەزی لەپشتەملە قسە وتنی هەیە بە هاوڵەکانی ئەوا ئەگەر لەسەر ڕێگەکەی لانەبرێت ئەوکات بەناپاکی کردن لە هاوڵانی و دواتریش نەتەوە و ڕەگەزەکەی کۆتایی پێدێت. گەر هەندێك کەمژە بڕوایان وایە ئەم چەشنە دوو ڕوویی و زمان پیسیە کارێکی گونجاوە بۆ سیخوڕی کردن بەسەر هەندێك

لەهاوڕێکانی دیکەیەوە ئەوا باش بزانێت کە دەرئەنجامی بەردەوام بوون لەسەر ئەم کارە ناپاکی کردن و بێ ئینتیمایی بوونی کەسی دووڕووە بۆ هەموو شتێك.

لەم ڕۆژدا پەروەردەی ئاکار لە فێرگەکانی دەوڵەتدا جێ دەستی دیار نییە، بەڵام دەوڵەتی ڕەگەزی بەتەواوەتی گرنگی پێدەدات، هەموو تاکێك لەسەر بنەمای بێدەنگی و نهێنی پارێزی و ڕەوشت جوانی پەروەردە دەکرێت، لەگەڵ بێ دەنگی نواندن لەکاتی ئێش و ئازاردا، چون ئەم خو و ڕەوشتە لەداهاتوودا دەیانکاتە سەربازێکی خۆڕاگری ئاسان خۆبەدەستەوە نەداو، ئەو سەربازەی بەم شێوەیە پەروەردە بکرێت دەتوانێت لەسەختترین و ناخۆترین دۆخەکاندا ئەرکەکانی خۆی جێبەجێ بکات.

***

لە دەوڵەتی ڕەگەزچێتی دا پەروەردە کاری بریتی دەبێت لە گەشەپێدانی هێزی خوازویست و گیانی بەرەوپێشەوەچوون و بەرەنگاربوونەوەی بەرپرسیارێتیەکان.

لەپێشاندا هێزی وڵات بە بنەمای (( خاستر واسە فەرماندار فەرمان بکات لەکارکردندا نەوەك هیچ فەرمانێك نەکات)) کاریان دەکرد، لەم ڕۆشدا ناچارین گەنجان و تازەپیاکەوتوانمان بەشێوەیەکی وەها تێبگەیەنین کە زیندەق چوویی لە هەڵگرتنی بەرپرسیارێتی هۆکاری شکستەکەی ۱۹۱۸ بوو. لە سەرماوەرزی ساڵی ۱۹۱۸ دا هەموو دەستەڵاتدران ڕایان دەکرد لە وەرگرتن و هەڵگرتنی بەرپرسیارێتی، هەر لە فەرمان فەرماوە تا فەرماندە بچووکەکان. لەم ڕۆدا بەهۆی نەبوونی هێزویستەوە لەهەمبەر دوژمندا لاوازبووینە نەوەك بەهۆی نەبوونی چەکی جەنگینەوە. هیچ فەرماندەیەکی سەربازی نەیگوت: (( تاوەکو ٥١٪ی سەرکەوتن بەدەست نەهێنم هەنگاوێکی شێتانە نانێنم))؟ ئەم شێوە بیرکردنەوەیە بە ڕوانگەی ٥١٪ ی بۆمان ڕوون دەکاتەوە کەچی لەپشت فەتارەتی شکستەکەی ئەڵمانیای ۱۹۱۸ بووە. هەرکەسێك چاوەنواڕی ئەوەیە قەودەر سەرکەوتنی بۆ دەستەبەر بکات ئەوا ئەم کەسە دوایین کەس دەبێت کە چارەنوسێکی ماف خۆدەرکێشانی بۆ دەستەبەربکات، دوا کەسیش دەبێت کە دەوڵەت پشتی پێدەبەستێت.

لەڕاستیدا نەبوونی ئیرادە یان خوازویست و باڵایی گۆشەگیری و ئاسانی هەڵهاتن لەهەڵگرتنی بەرپرسیارێتیەکان سەرچاوەکەی نەشیاوی جۆری پەروەردەکەیانە لەبنەڕەتەوەو ئەمەش ئەهامەتیوکەی لای ئەوکەسانە بەزەبر و کوشندەترە کە

دەسـتەڵات دەگرنـە دەسـت وەك لـە كەسـانی بـێ دەسـتەڵات, لەڕاسـتیدا دەوڵـەتی نەتـەوەیی بەباشـی ئـەم پێشـنیارە پـێش چـاو دەگرێـت كـە, هۆكارێكـە دەتوانرێـت بەگڕبخرێت لەبۆ ڕزگاركردنی نەتەوەی ئەڵمانی لە هۆكارەكانی لاوازبوونی ئێرادە كە فاكتەری شكستەكەی ئەڵمانیا بوو.

***

لەدەوڵـەتی ڕەگەزپەرەسـتیدا سێ چەشـنە پێداچوونەوە و چاكسـازیی لەپـەیڕەوی فێركاریدا ئەنجام دەدرێت, لەم دۆخانەدا:

یەكەم: پەیڕەوی پەروەردە و فێركردنی ئەمڕۆ فێرخواز مانـدوو دەكات و مێشـكیان بە زانیـاری بـێ كـەڵك دەئاخنێـت, زۆر نابـات خوێنـدكار هـەموو زانیـارە پێـدراوەكانی لەبیردەچێتەوە؟ خۆئەگەر شتێكی كەمیشـی لـەیاد مایـەوە ئەوا بەتێپـەڕبوونی كاتێكی كـەم لەیادگـەی دەسـڕێتەوە یـان لـەكاتی گرتنـە دەسـتی هـەر ئیشـێكدا كـەڵكی لـێ نابینێت.

لایـەنگرانی ئـەم چەشـنە بیرۆكەیـە دەبێـژن: ئـەم چەشـنە زانیاریانـە خوێنـدكار بـەتواناتردەكات لەڕێگـەی بـەهێزكردنی توانـای فێربـوون و داكردنـی زانیـاری لـە یادگەیدا. ئـەم چەشـنە بـەرگری لێكردنـە تـا ئاسـتێك متیـەی پـێ قایـل بوونـە, بـەڵام شـەپۆلی فراوانـی زانیـاری مێشـكی خوێنـدكار پڕدەكـات و هەمیشـە بەمانـدوویی دەیهێڵێتـەوە و توانـای زۆر وەرگرتنـی زانیـاری لەدەسـت دەدات,سـەرئەنجام توانـای بیركردنەوەی نامێنێت. لەدەوڵەتی ڕەگەزیدا دەوڵەت سوود لەهەر كەسێك وەردەگرێت كەئامادەی بەخشینەوەی زانیاری تەندروست بێت.

جاربەجارێك دەم پرسی: كەڵكی چییە فێربوونی زمانێكی نامۆ بەزۆربێت و لەچەند ملیۆن كەسێك كـەدەیخوێنن تـەنها چەند هـەزارێكیان كـەڵی لـێ ببیـنن, ئـەوانی دیكـە نازانن باس لەچی دەكات و مەبەستی چییە و بۆچیش نوسراوە؟!

باشتر نییە كاتە تەرخان كراوەكان بۆ فێربوونی زمانی بیانی بۆ وەرزشی تـەرخان بكەین و فێربوون و یادگرتنی فرەنسی و ئینگلیزی و ئیسپانیش بە خۆبەخشانەبێت؟

دەوڵەتی نەتەوەیی پێویستە لەسـەری ئەم شێوازی فێربوونـەوەی ئێستا بگۆڕێت, ئەوكاتەی باس لە ڕووداوێكی مێژوویی دەكرێت فێرخـواز هیچی لـێ تێناگات جگەلـە ناوی پاڵەوان و شوێنی ڕوودا و بەروارەكەی بەبێ گەیشتن بە مەرامی نوسینەكەی. لە

کۆن و ئێستاشماندا کەم شارەزاییمان لە بواری مێژوودا هۆکاری شکستی ڕامیارێتی دەرەکیمان بووە؟ چونکە ئەو سەرکردەیەی دەوڵەت هیچ ئاشنای ڕووداو و ڕەوتی مێـژووی نەتەوەکـەی نـەبووبێت ئـەوا هـیچ کـات ناتوانێـت بەسـەر ئاریشـە نێونەتەوەییەکانـدا زاڵبێـت. تەنانـەت ئەنـدامانی پەرلـەمانیش زۆر بـێ سـەرووبەرن و کەس لێیان تێناگات, بەتایبەت ئەوکاتەی باس لەمێژوو دەکرێت قۆرینەیان بێدەنگ دەبن و هیچی لێنازان و خۆیان دەشارنەوە بەهۆی نەزانین و ئاشنا نەبونیانەوە بە مێژوو یام دیرۆکی نەتەوەیی.

مەبەست لەخوێندنی مێژوو ئاشنابوون بەڕابردوو نییە بەتەنها بەڵکو پەندوەرگرتنە لـەڕابردوو بـۆ دووبـارە نەکردنـەوەی ئـەو هەڵانـەی پێشـتر ئـەنجام دراون. مێـژوو وەك ئەوەی هـاوڵاتی دەبێـت ئاشـنای بێـت کارلێکی ئـەو فاکتـەرانـە دەخاتـەڕوو کـەهۆکاری دیارکـەوتنی ڕووداوەکـانن. دەوڵـەتی ڕەگـەزی مێـژوو دەکاتـە ئامرازێك بـۆ زامنکردنـی داهاتوویـەکی باشـتر بـۆ نەتـەوەی ئەڵمانی,دەوڵـەتی ڕەگـەزی کـار بـۆ دیـاری کردنـی خوێنـدن و فێربـوونی مێژوویـەکی گشـتێندراو دەکـات کـە تێیـدا گرنگـی ڕەگـەزی لـە پێشەنگدابێت.

دووهـەم: پـەیڕەوی پـەروەردە و فێرکـردن لـەمڕۆدا زۆر بەجوانیـەوە گرنگـی دەداتـە کیمیـا و بیرکـاری و زینـدەوەرزانی, بەڕاسـتی بۆخـۆم نـاتوانم لـەم سـەردەمەدا ئـەم زانستانە ڕەت بکەمەوە بەڵام هەمدیس زیندەڕۆیی کردن لەخوێنـدنیان ڕەت دەکەمـەوە, چون لەم کاتەدا وانە گەلێکی وەکو جیۆگرافیا و وێـژە و مێـژوو کـەزۆر گرنگن کـەمتر بایەخیان پێدەدرێت وەك لە زانستە ڕووتەکان, خۆئەگەر بیرکاری و کیمیا و زیندەزانی خوێندرا ئەوا لەدەوڵەتی نەتەوەییدا بەشێوەیەك دەخوێندرێت کە فێرخواز بەتەواوەتی خۆی بۆ یەك چەشنە زانست تەرخان دەکات و بەتەواوەتی ئاشنای دەبێت.

مێژوو نووسـان زێـدە ڕەوییـان کردیـە لـە باسـکردنی پاڵـەوانێتی پاشـا و کەسـانی بەناوبانگی سەرکردەی سەربازی, زۆر بەکەمیش باسیان لەسەرکردەکانی گـەل یـاخود پاڵەوانانی گەل کردووە, ئەم کەم باسکردنە دەبێت دەوڵەتی ڕەگـەزێتی بەجوانی پڕی بکاتـەوە و گرنگـی ئـەم چەشـنە سـەرکردانە دیاربخـات لـەڕۆڵگێڕانیان لـە پونیـات نـانی دەوڵەت و پاراستنی ژیارییەکەی.

سێیەم: دەبێت لەدەوڵەتی ڕەگەز خوازیدا هەڵی گەورە پیشاندانی نەتەوە بە پەروەردە و فێرکردن بدرێت. مێژووی گشتگیری و مێژووی ژیاریەکان دەبێت پێکەوە هەم ئاراستەیە بگرن. هەر داهێنەرێك کاربۆ نەتەوە نەکات لە دەوڵەتی نەتەوەییدا مێژوو نووس بە پاڵەوانی ناداتە قەڵەم.لەم کاتە و لەم دەوڵەتەدا پێویستە ڕووناکی تەواو بخرێتەسەر دەستهات و داهێنراوی گەلەکەمان بۆئەوەی هەست بە سەروەری و شکۆمەندی خۆی بکات, بۆئەوەی ئەو کەسانەشی پەیمانگا تەواودەکەن دواتر وەکو ئەڵمانییەکی نەتەوەیی و بە شانازییەوە کار بۆ پێشخستنی سەروەریەکانی ڕابردووی نەتەوەی ئەڵمان بکات.

لەدەوڵەتی ڕەگەزپەرەستیدا دەبێت مامۆستاکان ئەوە لەمێشکی خوێندکاراندا بچەسپێنن کە هیچ هاولاتیەکی ئەڵمانی مافی شانازی بەخۆوە کردنی نییە گەر هەندێك بنەالێت لەنایەکسانی و لە نەبوونیدا دەتلێنەوە, بەرام ئەوکاتەی دادپەروەری کۆمەلایەتی پەسەند دەتەنێتەوە ئەوا لەم کاتە بەدواوە هەموو هاولاتیان بڕوای پتەویان بە چارەنوسینەوەی نیشتمان دەبێت.

ئەودەمەی لەناوەزی گەنجانی ولاتدا بیرۆکەی ڕەگەزپەرەستی گەشەپێدەدرێت ئەوکات دەوڵەتی نەتەوەیی دەگاتە لوتکە وترۆپکی ئامانجەکانی خۆی, بەجۆرێك لەم کاتەدا هیچ گەنجێك ئامادەی خوێندن و کات کوشتن نابێت گەر نەزانێت بەڕاستی ئەم خوێندنەی کاریگەر دەبێت بۆ پێشخستنی باری ژیاری نەتەوەکەی.

# بەشی چواردەیەم

## دەوڵەت و پێگەیاندنی بژاردە

لەبەشی پێشووتردا هێڵەگرنگەکانی چاکسازیی پێویست لەسەر دەوڵەتی ڕەگەزپەرەستیمان ڕوون کردەوە، وەك چۆن پارتەکەمان لێی گەیشتبوو لەواری پەروەردە و فێرکردندا. لەم بەشەدا گەرەکمە ئەوە ڕوون بکەمەوە کەدەوڵەت چۆن دەتوانێت بژاردەی یان پاڵفتە گەشەپێبدات.

لەم ڕۆزگارەماندا زۆر بەکێمی ئامادەگی کەسێتی قورسایی بۆ دادەنرێت. تەنها وەچەکانی سامانداران و خانەدار و گەورەپیاوان ئامادەن بۆخوێندن بچنە زانکۆ و پەیمانگاکان. زۆر بە دەگمەن دەبینی کوڕی کشتیارێك ببێتە خوێندکاری زانکۆ، گەر هاتوو تیاشدا سەرکەوت دەروازەکانی پێشی بۆی نابنە ڕێککەوت بۆ ئامادەکردنی لەبۆ بەدەست هێنانی پلەی بەرچاوی پێشکەوتن، لەبەرئەوەی بەزۆری پلانی خوێن تایبەت کراوە بۆ سەرخستنی کوڕ و وەچەی وەزیر و گزیر و گەورەدزانی دەستەلأتدار و سەرکردە خوێنمژەکانی ڕامیارچی و کوڕانی فەرماندار و گەورەسەرکردەکانی تۆڕ مرۆڤچی. لەم ڕۆدا تەنها لەهونەردا بەهرەکان بەیەکسانی دیاردەکەوێت، دەستی کەسی لەپشت نابێ، ژێری خۆتی گەرەك دەبێ، لەم وارەدا سەرباری خوێندن بەڵام هەستی خۆش ویستنی بەهرەکەش پێشیاوی گرنگن. لەبۆ کەسێك گەر مەیلی بێت

بەهرەکانی وەپێش بخات. بەڵام سەروەت و ناوبانگی باب و داک لێرەکانێ قیمەتی نییە، توانای چارەکردنی دەردی خوێندکاری نییە.

من نامەوێت بێژم: خوێندنی باڵا و پسپۆڕی لەبۆ هەموان دەستەبەربێ بەئاسانی، بژاردەی گەل لەم ڕۆدا بووەتە ئەدگاری کۆمەڵ، خۆی دەسەلمێنێ دەسەپێنێ ودەنەخشێنێ، چون ئەوەی بەدەستی دینێ بەرهەمی ئەنجامدانی هاوسەرگیری ژیری و زانست خوازییە. دەتوانین، بەبێ هیچ گومانێک، کەسێکی ئاسایی یان ئاوەز ناوەندی پێبگەیەنین لەبۆ وەرگرتنی کۆمەڵە زانیارییەک کەلەتوانایی خۆی بەدەربێت! بەڵام لەم کاتەدا ئەم کەسە وەکو ئاژەڵێکی دەستەمۆکراو وەهادەبێت. ئەنجامی چالاکی گەلێکی وەهادەبێ بەدەر لە چالاکی ئاوەزیی خۆی دەبێ.

بێگومان دەتوانین مۆری دەوڵەت بکەین بە سوپایەکی بەهێز لەڕێگەی گەشەپێدانی ئاوەزییەوە کە لەخۆگرتەی ئەوکارمەندانەبێت کە بەشێوەیەکی خۆکردارەکی دۆخەکان بەڕێوەدەبەن، ڕێگە بەهەرماڵێک بدەین زانایەک بۆ نیشتمان پێبگەیەنێ و پێشکەش بکات، بەڵام ئەو زانستەشی ئاوەزی نائامادەکراو کێشی دەکات زانستێکی مردووە پێش لەوەی بڵێین زیندووە، بەهرە تازەداهاتووەکان بە ساوین وەردەگیرێت. لەبۆ کارکردن ئەوروژێنری بەڵام نایهێنێتە بونێوە.

ئەو قەڵەتانەی کۆمەڵی ئەڵمانی لەم وارەدا تێی دەکەوێ گەلێ فرەس. نمونەیەک بۆ بەڵگاندنی هەس: ڕۆژنامەکانمان جارناجارێک وێنەی ڕەشپێستە پیاگێک. بڵاودەکەن. لەبۆ زانینی هەوەی ئەمانەش هونەردەکەن. مۆسیک ژەنن، خاوەن بەهرەو سیاسەوت وانن. توانیویانە لەشەڕەبۆکس سپی خوێنان بدەنەبەر بۆکس و بیان بەزێنن. لەگۆڕەپانی شەڕ وەدەریان نێن. ئەمە جگە لەمەلەوانی و پاڵەوانی.... مەخابن لەم کاتەدا لەنێو ئەوانەی بیرمەندن. شانازی دەکەن بەوەی دەبەنگن. چون دەڵێن پەروەردەمان کاری تەواوی کردووە بۆمان. بەڵام ئەم نەزانانە. نەزانانە کەوتوونەتە داوی ئەو جوولەکە زانا و فێڵبازانە. ئەوداوەی نایان بووە بۆمان. لەبۆ گەیشتن بەئامانی باڵای خۆیان: بەدی هێنانی یەکسانی لەنێو خەڵک . دەستگرتن بەسەر هەموو خەلق.

گەر بۆرژوازیەتی بەناراستە لەناوچوو چیربوایە . خاوەن ئاوەز و بیرکردنەوەی دووربێن بایە. دیارکەوتنی نائامادەگیانی بەلیدانی سەوڵێک بەسەر ناوەزیاندا بەدی

نەکرد. ئایا ئەمە دژایەتی کردنی خواوەندنییە کە ئافەریدەکراوێك گەشەپێبدات کە نیوە مەیمون بێت، بەجۆرێك دواتر بتوانێت ببێتە پارێزەر یان پزیشك، لەکاتێکدا ملیۆنان کەس لە وەچەکانی زەلامی بالاّ هەس ئیش نەداران ، زۆرێکیانیش قەرزارن، ناتوانن بەئاسانی خۆراکی ڕۆژانە پەیدابکەن، چەند دینارێك لەبۆخۆیان کۆبکەن، ناتوانن خزمەتێك بەپێشخستنی ژیاریەکەشیان بکەن، لەم کاتەدا نازانن چی بکەن؟ لەئەمریکای باکوردا لەم دەساڵەی ڕابردوودا دەیان هێند ژمارەی داهێنەران زیادی کرد، چونکە بەدەست هێنانی بڕوانامەی بەرز خرابووە خزمەتی هەموو کەسێکی تواناداری بەهرەمەند لەبۆ ئافراندن و هێنانئارای داهێنراوەکانیان و دەرگامانیش لەڕووی مشەخۆراندا داخرابوو. چونکە بەهرەی داهێنان پشت بەستراوە بە زانست، بەلاّم زانستی بیٌ بەهرەی سروشتی هیچ مانایەکی نییە و زڕە.

دەوڵەتی ڕەگەزی دەبێت لەم وارەش دەست وەربدات، بەدووی بەهرەمەندان بگەڕیٌ و ئەرکەکانیان پیٌ بسپێریٌ. دەبێت دەرگای خوێندنی بالاّ بەڕووی هەموو هاولاّتیەکی بەهرەمەندد‌ا والاّ بکرێت بەبیٌ لەبەرچاوگرتنی ئاستی کۆمەلاّیەتی، بۆ سەلماندنی ئەمەش دەتوانین بگەڕێینەوە بۆ نمونە بالاّکانی بەهرەمەندانی نەتەوە لەبۆ ئافراندنی داهێنەرگەلێك کە جێگەی بایەخی هەموان بووە،ئەمەش بەدەربووە لەو بەرئەنجامە خراپەی ڕوودەدا و ڕوویداوە لەلایەن چینێکی بەناو بالاّوە کە هەموو دەستەلاّتەکان لای ئەوان قۆرخ کراوە، لەبەرئەنجامی ئەمەشدا چینێك لە بیرمەندی گۆشەگیر هاتە بوونیٌ، لە سەربانەکەیەوە دوور لەزۆرینەی خەڵك چارەی کێشەکان دەکات بۆ خەڵك، ئەمەش وای کردووە ئەم بیرمەندانە دووربن لەکێشە ڕاستەقینەکانی خەڵك، هەست بەکێشەدەروونیەکان ناکەن، هەروەها بەخشینی مافی خوێندن بە وەچەی خانەدان و کوڕانی گزیران چارەی ولاّتی ڕەشترکرد . چون هەموو شتی دەبەخشیە کەس گەلێك مانای قوربانی دان لەپێناو نەتەوە و ڕەگەز نازانن، ئەوەی دەزانن ئەوەیە هیچ نازانن، ئەوەی دەیناسن ئەوەیە بەرژەوەندی خۆیان دەناسن، ئەمەش بەهۆی ئەوەیە پەروەردە کەیان هەڵەیە، ناتەواوە نالەبارە،بەرهەم دێنیٌ کەس گەلێك هەمیشە شەرمەزراوە،شینەوارە،تەنانەت ئەو دامەزراوانەی ئەمانە خوێندیان تیادا تەواوکردووە ئەوەی پێیانیان بەخشیون ئەوەیە هیچیان پێنە بەخشیون لە ڕەفتار و ئاکار نواندن، وای ڕانەهێناون ببنە کەس گەلێك بتوانن ببنە بەرگری بۆگەلێك.

بەهرەكانی وەپێش بخات. بەڵام سەروەت و ناوبانگی باب و داك لێرەكانێ قیمەتی نییە، توانای چارەكردنی دەردی خوێندكاری نییە.

من نامەوێت بێژم: خوێندنی باڵاً و پسپۆڕی لەبۆ هەموان دەستەبەربێ بەئاسانی، بـژاردەی گـەل لـەم ڕۆژدا بووەتـە ئـەدگاری كۆمـەڵ، خـۆی دەسـەلمێنێ دەسـەپێنێ ودەنەخشێنێ، چون ئەوەی بەدەستی دێنێ بەرهەمی ئەنجامدانی هاوسەرگیری ژیری و زانست خوازییـە. دەتـوانین، بـەبێ هـیچ گومانێـك، كەسـێكی ئاسـایی یـان ئـاوەز ناوەندی پێبگەیەنین لەبۆ وەرگرتنی كۆمەڵە زانیارییەك كەلەتوانایی خۆی بەدەربێت! بـەڵام لـەم كاتـەدا ئـەم كەسـە وەكـو ئـاژەڵێكی دەسـتەمۆكراو وەهادەبێـت، ئـەنجامی چالاكی گەلێكی وەهادەبێ بەدەر لە چالاكی ئاوەزیی خۆی دەبێ.

بێگومان دەتوانین مۆری دەوڵەت بكەین بە سوپایەكی بەهێز لەڕێگەی گەشەپێدانی ئاوەزییەوە كە لەخۆگرتەی ئەوكارمەندانەبێت كە بەشێوەیەكی خۆكردارەكی دۆخەكان بەڕێوەدەبەن، ڕێگـە بەهـەرماڵێك بدەین زانایـەك بۆ نیشـتمان پێبگەیـەنێ و پێشـكەش بكات، بـەڵام ئـەو زانستەشی ئـاوەزی نائامـادەكراو كێشـی دەكـات زانسـتێكی مـردووە پـێش لـەوەی بڵـێین زینـدووە، بـەهرە تازەداهاتووەكـان بـە سـاوین وەردەگیرێـت، لـەبۆ كاركردن ئەوروژێنرێ بەڵام نایهێنێتە بونێوە.

ئەو قەڵەتانەی كۆمەڵی ئەڵمانی لەم وارەدا تێی دەكەوێ گەلێ فرەس. نمونەیـەك بـۆ بەڵگاندنی هەس: ڕۆژنامەكانمان جارناجارێك وێنەی ڕەشپێسـتە پیاگێك، بلاًودەكەن، لەبۆ زانینی هەوەی ئەمانەش هونەردەكـەن، مۆسیك ژەنن، خـاوەن بـەهرەو سیاسـەوت وانـن. توانیویانـە لەشـەڕەبۆكس سـپی خوێنـان بدەنەبـەر بـۆكس و بیـان بـەزێنن. لـەگۆڕەپانی شـەڕ وەدەریـان نـێن، ئەمـە جگـە لەمەلـەوانی و پاڵـەوانی....مـەخابن لـەم كاتـەدا لـەنێو ئەوانـەی بیرمەنـدن، شـانازی دەكـەن بـەوەی دەبـەنگن. چـون دەڵـێن پەروەردەمان كاری تـەواوی كردووە بۆمـان، بـەڵام ئـەم نەزانانـە. نەزانانـە كەوتوونەتـە داوی ئـەو جوولەكـە زانـا و فێڵبازانـە، ئـەوداوەی نایـان بـووە بۆمـان، لـەبۆ گەیشـتن بـەئامانی بـاڵای خۆیـان: بـەدی هێنـانی یەكسـانی لـەنێو خـەڵك ، دەسـتگرتن بەسـەر هەموو خەڵق.

گـەر بۆژوازیـەتی بەئاراسـتە لەناوچـوو چیربوایە ، خـاوەن ئـاوەز و بیركردنـەوەی دووربین بایە. دیاركـەوتنی نائامادەگیانی بەلیدانی سـەوڵێك بەسـەر ئاوەزیانـدا بـەدی

نەکرد. ئایا ئەمە دژایەتی کردنی خواوەندنییە کە ئافریدەکراوێك گەشەپێبدات کە نیوە مەیمون بێت، بەجۆرێك دواتر بتوانێت ببێتە پارێزەر یان پزیشك، لەکاتێکدا ملیۆنان کەس لە وەچەکانی زەلامی بالا هەس ئیش نەداران، زۆرێکیانیش قەرزارن، ناتوانن بەئاسانی خۆراکی رۆژانە پەیدابکەن، چەند دینارێك لەبۆخۆیان کۆبکەن، ناتوانن خزمەتێك بەپێشخستنی ژیاریەکەشیان بکەن، لەم کاتەدا نازانن چی بکەن؟ لەئەمریکای باکوردا لەم دەساڵەی رابردوودا دەیان هێند ژمارەی داهێنەران زیادی کرد، چونکە بەدەست هێنانی بڕوانامەی بەرز خرابووە خزمەتی هەموو کەسێکی تواناداری بەهرەمەند لەبۆ ئافراندن و هێناناری داهێنراوەکانیان و دەرگامانیش لەڕووی مشەخۆراندا داخرابوو. چونکە بەهرەی داهێنان پشت بەستراوە بە زانست، بەلأم زانستی بێ بەهرەی سروشتی هیچ مانایەکی نییە و زڕە.

دەوڵەتی رەگەزی دەبێت لەم وارەش دەست وەربدات، بەدووی بەهرەمەندان بگەڕێ و ئەرکەکانیان پێ بسپێرێ. دەبێت دەرگای خوێندنی بالا بەڕووی هەموو هاولأتیەکی بەهرەمەنددا والا بکرێت بەبێ لەبەرچاوگرتنی ئاستی کۆمەلأیەتی، بۆ سەلماندنی ئەمەش دەتوانین بگەڕێینەوە بۆ نمونە بالأکانی بەهرەمەندانی نەتەوە لەبۆ ئافراندنی داهێنەرگەلێك کە جێگەی بایەخی هەموان بووە،ئەمەش بەدەربووە لەو بەرئەنجامە خراپەی ڕوودەدا و ڕوویداوە لەلایەن چینێکی بەناو بالأوە کە هەموو دەستەلأتەکان لای ئەوان قۆرخ کراوە، لەبەرئەنجامی ئەمەشدا چینێك لە بیرمەندی گۆشەگیر هاتە بوونێ، لە سەربانەکەیەوە دوور لەزۆرینەی خەلك چارەی کێشەکان دەکات بۆ خەلك، ئەمەش وای کردووە ئەم بیرمەندانە دووربن لەکێشە ڕاستەقینەکانی خەلك، هەست بەکێشەدەروونیەکان ناکەن، هەروەها بەخشینی ماف خوێندن بە وەچەی خانەدان و کوڕانی گزیران چارەی ولأتی ڕەشترکرد . چون هەموو شتی دەبەخشیە کەس گەلێك مانای قوربانی دان لەپێناو نەتەوە و ڕەگەز نازانن، ئەوەی دەزانن ئەوەیە هیچ نازانن، ئەوەی دەیناسن ئەوەیە بەرژەوەندی خۆیان دەناسن. ئەمەش بەهۆی ئەوەیە پەروەردە کەیان هەلەیە، ناتەواوە نالەبارە،بەرهەم دێنێ کەس گەلێك هەمیشە شەرمەزراوە،شێنەوارە،تەنانەت ئەو دامەزراوانەی ئەمانە خوێندیان تیادا تەواوکردووە ئەوەی پێیانیان بەخشیون ئەوەیە هیچیان پێنە بەخشیون لە ڕەفتار و ئاکار نواندن، وای ڕانەهێناون ببنە کەس گەلێك بتوانن ببنە بەرگری بۆگەلێك.

ئەمامەتی بەردەرگای بەنەتەوەکەمان گرت و چوینە شەڕی مان یان نەمانەوە لەبۆ برەودان بەژیان لەم کاتەدا ڕاوێژکاری ڕایخ فەیلەسووف بوو، هەموو کەس بڕوای پێی بوو، بەڵام کەڵکێکی ئەوتۆی نەبوو. بۆیە گەر ئەڵمانیا ڕێگەی بەلاوەکانی بدایە، وەچەیەکی بەهێز و جوامێر و ژیر و شارەزا لەکاروباری میر ببێتە ڕاوێژکار ئەوکات بەشکست نەدەبووین دووچار، خوێنی سەربازانمان بەفیڕۆ نەدەچوو لەنەوەی هەژار.

لەم وارەدا کڵێسەی کاسۆلیکی پێشەواو نمونەیە، سورە لەسەر بەهێزی پیاوەکانی، بنەمای پاکی و خواپەرەستی کاردارانی لە ڕۆڵەکانی گەلەوە هەڵبژێردری، چونکە تواناداری لەبۆ دامرکاندنەوەی حەز و هەوەس، غیرەتی گرتنی ئارەزوەکانی خۆیان هەس، لەم ڕێگەیەوە کڵێسا پەیوەستەیی خۆی دگەڵ زۆرینەدا برەوپێدا، لەم زۆرینەیەوە وزە و هەستی سەرکەوتنی بەسەر نەیاندا وەرەوپێشدا. ئەمەش وادەکات کڵێسا، هەمیشە بەگەنجێتی بمێنێتەوە، نوێ بێتەوە ، ببوژێتەوە، نەرمی و نیانی و حەزی پۆلاینی بۆ بمێنێتەوە.

ئەمەش مانای وایە پێویستە دەوڵەتی ڕەگەزخواز هەمیشە سوربێت لەسەر نوێکردنەوەی گەنجێتی چینە ڕۆشنبیرەکان بەخوێنی گەنج کە خوێنی چینەکانی خوارەوەیە. دەبێت هەمی دانیشتوانی وڵات لەبێژەنگ لەبۆ بەدەست هێنانی پاڵفتەیەکی مرۆیی بەهرەدار و بەکارخستنی ئەمانە لە خزمەتکردنی کۆمەڵگەدا. بیانووی بوونی دەوڵەت و دەزگاکانی تەنها دابینکردنی خەرجی و سامان نییە بۆ چین گەلێکی تایبەت، بەڵکو بیانووی بوونی دەوڵەت ئەنجامدانی کارە پێ سپێردراوەکانیەتی، ئەمەش تەنها لەکاتێکدا دەبێت کۆمەڵێك کەسی باشی بۆئەم بوارە پێگەیاندبێت.

ڕەنگە چەسپاندنی ئەم چەشنە چاکسازیی کارێکی ئاسان نەبێت لەم کۆمەڵگەیەی ئێستەی ئەڵمانیاماندا، لەکاتێکدا بورژواکان نارەزایی و تێبینیان هەبێت و بڵێن: لەکوێ بووە وەچەی خانەدان و گەورەفەرمانبەران کرێکاری دەستی بن بۆ ئەوەی لەجێی ئەوان لە زانکۆ و پەیمانگەکانی بالآدا کوڕە کشتیار و بەردەستەکاران خوێندکاربن، تەنها بەبیانووی ئەوەی ئەمانە لەوان ئامادەترن ، ئەمەش لای خۆیەوە چەشنێکە لەڕێگری. بەهۆی نرخداری کاری دەستی لەکۆمەڵگەی ئێمەدا دەبێت دەوڵەتی ڕەگەزی بەتەواوەتی ڕێزی ئەم پیشەیە بگرێت و بەهاکەی بەرزتربکاتەوە.

ستەم نییە نوسەرێکی گەوج یان ڕۆمان نوسێك لەکرێکارێکی شارەزا پلەکەی بەرزتربێت بەس لەبەرئەوەی بەحساب نوسەرە؟ ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ لەپێش چاو نەگرتنی بەهای تواناداریی ڕاستەقینەی کەسەکان.

کار دوو بەهای دیاری کراوی هەیە: بەرجەستە و هزری یان هەناوی. بەرجەستەکە خۆی دەبینێتەوە لەبەرجەستەکردنی گرنگی کار لە ڕووی کاریگەری لەسەر ژیانی کۆمەڵدا. تاوەکو ژمارەی هاولاتیانی سوود وەرگرتوو لەکارەکە سوودمەندبن ئەوەندەی تر بەهای کارەکە بەرزتر دەبێتەوە. بەلام بەهای هزری یان هەناوی کار بە گرنگی بەرهەمی کار دیارناکەوێت، بەڵکو لەڕێگەی پێویست بوونەوە دیاردەکەوێت. بێگومانین لەوەی داهێنانێك قازانجەکەی چەندان هێندە لە کاری کرێکارێك بەسوودتر و زیادترە، هەمدیس خزمەت گەیاندنی کرێکارێك بەکۆمەڵگە بەسوودتر و لەپێشترە وەك لەخوودی داهێنانێك کەبەبێ کرێکاری پێشیاو هیچ قزانجێکی نابێت. لەدەوڵەتی ڕەگەزیدا دەبێت هەموو کارەکان بەخاوەن بەهرەکان بسپێردرێت و کەسی نەشیاو لەپۆست و پێگەی بالا و نزمیشدا دانەنرێت. بەهای ڕاستەقینەی تاکیش بەپێی ئاستی سەرکەوتنی لەوکارەی ئەنجامی دەدات دەست نیشان دەکرێ، ئەمەش دوابەدوای ڕاهێنانێکی شیاوی تاك لەبۆ ئەنجامدانی کارەکەی. هەموو تاکێك نرخ و پێوەر بۆ داهات پێدانی دەبێت بەپێی بەهای بڕی زانست و کاری پێشیاوبێت لەوەی چەندە خزمەتی ڕاستەقینەی ڕەگە یان نەتەوەکەی دەکات ئەوەندە پاداشت بدرێتەوە، خەلاتی هزریش لەڕێگەی ڕێز گرتن لەکەسی خاوەن بەهرەوە دەبێت کە ڕاژی کۆمەڵی کردووە و کاری لەبۆ زێدەتر پێشخستنی نەتەوەکەیدا کردووە.

# بەشی پازدە

## خەڵکی دەوڵەت و هاووڵاتی

هەر وڵاتێک دووجۆر خەڵق لەخۆدەگرێت: گروپی هاوڵاتی و گروپی بێگانە. هاوڵاتی ئەوکەسەیە کە لەسایەی شوێنی بوونی یان ڕەگەزنامەیەوە ماق شڤیلی بۆدەستەبەرە. بیانیش هەمان ماق هەیە بەڵام لەوڵاتی خۆیدا. لەنێوان ئەم دوو پۆلە خەڵکەدا گروپی هایمتلۆز هەن ، ئەمیش ئەوکەسانەن تاوەکو ئێستا ئابڕووداری بۆ لایەنگیری لەبۆ دەوڵەتێکیان پێنەبڕاوە. ئەوانەشن خاوەنی ماق سڤیلی نین لەو وڵاتەی لەسەر زەویەکەیدا ئاکنجیٚ نە.

یانی ژیانکردن بەشێوەیەکی سڤیلیانە لەچوارچێوەی دەوڵەتێکدا و چێژڵێ بینی بەسە بۆمرۆڤی تەواو. لەم وارەدا ڕەگەز و خێنی هاوبەش چ کاریگەرییەکی نینە، بەپێی یاسا کارپێکراوەکانی وڵات ئەو منداڵە ڕەشپێستەی کە باوکی خۆی گەیاندۆتە ئەڵمانیا بەهۆی ئەوەی سەربە یەکێك لەداگیرگەکانی ئەڵمانە لەم کاتەدا منداڵەکەی ماق بوون بەهاوڵاتی ئەڵمانی پێدەدرێت، ئەم مافە بۆهەریەکە لە لەبەهاوڵاتی دانراوە جوولەکە و پۆلۆنی و ئەمریکی و ئاسیاییەکانیش وەکو یەکە و هەرکامێکیان لەخاکی ئەڵماندا منداڵ بخەنەوە دەبنە هاوڵاتی ئەڵمانی.

ڕێگەیەکی دیکەی هۆکار بۆ بەدەست هێنانی ڕەگەزنامە لەئەڵمانیادا لەبووندایە و کاری پێدەکرێت, ئەمەش بەپێی چەند مەرجێك دەبێت: داواکار بۆ بەدەست هێنانی ڕەگەزنامەی ئەڵمانی دەبێت نەدزبێت نەش بازورگانی کۆیلە, خاوەنی پاشەڵێکی ڕامیاری کێشەدروستکارنەبێت بەوەی لەداهاتوودا بتوانێت سەرەنجی خەڵقی بۆلای خۆی ڕابکێشێت, هەروەها دەبێت بتوانێت کاربکات و ژیانی خۆی دابین بکات و نەبێتە چەل بەسەر ملی دەوڵەتەوە. لەم کاتەدا بابەتی ڕەگەزخوازی هیچ گرنگیەکی ئەوتۆی نابێت. لەئەڵمانیای ئێستادا بوون بەئەڵمانی لەڕێگەی ڕەگەزنامە بەدەست هێنانەوە زۆر قورس نیە. داکاری ڕەگەزنامە خواز داواکاری بوون بەهاولاتی پێشکەشی شوێنی مەبەست دەکات, ئەویش لای خۆیەوە پاش لێوردبوونەوەی بۆسەرووی خۆی بەرزی دەکاتەوەو زۆرجاریش پشتگیری پێدانی ڕەگەزنامەدەکات بە هاوولاتیە تازەکە. چەند ڕۆژی داهاتوو بەوەی بە هاولاتی ئەڵمانی بووە مۆژدەی دەدرێتێ.

ئەم ئیشە جادووکارانەی کە سەرۆکی دەوڵەت بڕیاری لەسەرداوە ئەوکارەیە کەخواوەند خۆی لێی نزدیك نەکردۆتەوە بەلأم ئەوەتا ئەم بوونەوەرە بە نوکی قەڵەم لێدانێك ژینگە و داهاتووی کەسێك و نەتەوەیەك بەهۆیەوە دەگۆڕێت. بەم چەشنە کارە لەماوەی یەك شەوورۆژدا کەسێکی مەغۆلی دەبێتە هاوولاتیەکی ١٠٠٪بەناو پوختی ئەڵمانی. لەم کاتەدا ڕەگەزی ڕەگەزنامەخواز و باری تەندروستی کەسەکە بەلای کاربەدەستانی دەوڵەتەوە هیچ هیسابێکی بۆناکرێت و ئەوەی بەلای ئەمانەوە گرنگە ئەوەیە ئەم تازە هاولاتییە نەبێتە باربەسەر شانی دەوڵەتەوەو لەڕووی ڕامیاریشەوە کێشەی ئەوتۆیان بۆدروست نەکات.

لەو چەشنە ولأتەی ئێمەدا هاولاتی ڕەسەن و بێگانە هەمان ماف بوون بەکارمەند و دامەزراندنیان هەیە, چونکە ئەوانیش لەڕێگەی ڕەگەزنامەوە بوونەتەوە هاولاتی ئەڵمانی. ئەوانەی لایەنگیری ئەم دۆخەن دەڵێن ئەوە دیمۆکراتیە دانی بەم بارەدا ناوە, لێرەوەش من بەم کەسانە دەڵێم : بڕۆن بن بە هاوولاتی هەرێمە یەکگرتوەکانی ئەمریکا لەکاتێکدا ئەوان پێش لەئێمە ماف هاولاتی بوونیان دەبەخشیەوە وائێستەش ئەوان ناهێڵن هیچ کەس ببێتە هاولاتیان و کەسی نوێ وەرناگرن,ناساغ ڕەت

نەکەنەوە و کەسانی ڕەنگاوڕەنگ وەرناگرن، ئەمەش مانای وایە وڵاتەکە بەرەو ڕەگەزچێتی هەنگاوەنێت، بۆیە ئێمەش ماف خمانە ڕەگەزخوازبین.

دانیشتوان لەدەوڵەتی ڕەگەزپەرەستدا سێ دەستەن: هاووڵاتی و خەڵك و بیانی. تاکە جودایی نێوان هەردوو چەمکی خەڵك و بیانی ئەوەیە کە بیانی لەوڵاتێکی دانیشتووە. دەوڵەتی ڕەگەزی هەرکەسێك لەسەرخاکەکەی لەدایك بوو ئەوا بە هاووڵاتی خۆی دەزانێت، بەڵام تەنها بوون بەخاوەن ڕەگەزنامە مانای تەواوەتی بەدەستهێنانی ماف بەشدارێتی ڕامیاری و توانادارییی بۆ ئەنجامدانی کاری گشتی نییە، هەموو ئەڵمانییەکی ڕەسەن تەنها یەکێکە لە خەڵکی دەوڵەتی ڕەگەزی ئەڵمانیا و بەس. هیچ کەسێك ماف بوون بەهاولاتی ئەڵمانی نادرێتێ تائەوکاتەی خوێندنگا و پاشان سوپا لە مەنجەڵی نەتەوەبووندا هەڵینەکوڵێنێت، سەربازی فێرگەی پیشاندانی هاولاتیانە بەڵام ئەگەر خاوەنی تەندروستیەکی ساغ و ڕەوشتێکی جوان و بێ خەوش نەبێت ئەوکات بۆی نابێت داوای بوون بەهاولاتی بکات، یاخوود وڵاتی ئەومافەی پێنابەخشێت.

گەورەترین بڕوانامە لەدەوڵەتی ڕەگەزیدا بڕوانامەی هاولاتی بوونە، چونکە ئەم بەڵگەنامەیە ئاماژەی هاولاتی بوونی کەسی شیاوە و چێژ وەردەگرێت لەتایبەت مەندییەکانی ئەم بڕوانامەیە. هەمدیس دگەڵ وەرگرتنی بڕوانامەی هاولاتی بووندا کەسە نوێیەکە سوێند دەخوات و سۆزدەدات بەنەتەوە و دەوڵەت بەوەی بەوپەڕی ڕاستگۆیانە و بەنەمەکەوە خزمەتی کۆمەڵگە و نەتەوە و دەوڵەتەکەی بکات.

بەڵام هەرکەسێك لەو تاقیکردنەوانەی دەوڵەتی ڕەگەزی دەرنەچوو بەتایبەت دز و تاوانبار و ترنۆك و...هتد ، ئەمانە هەمدیس دەگەڕێندرێنەوە بۆ نێو چینە عەوامەکەی کۆمەڵگە یاخوود دەبنەوە بەخەڵکی نێو دەوڵەتی ڕەگەزی بەبێ ئەوەی هاولاتیش بن.

هەر ئافرەتێك مێرد نەکات نابێتە هاووڵاتی ئەڵمانی، تەنها مەگەر ئافرەتێك ناچاربێت کاربکات لەبۆ پەیداکردنی ڕۆزی خۆی و بەم هۆیەوە بواری شووکردنی کەم بێتەوە.

ڕوانگەی دەوڵەتی ڕەگەزی لەهەمبەر تاك بینیندا ڕێك پێچەوانەی مارکس خوازانە . بەوەی ئەمانە بانگەوازی یەکسانی ڕەهادەکەن لەنێوان سەرجەم دانیشتوان یان

خەڵکانی وڵاتدا. بەڵام لەدەوڵەتی نەتەوەییەدا بەڕوونی هەست بەجیاوازی نێوان خەڵکان دەکرێت بەتایبەت لەڕووی ڕەگەز و توخمی خوێنەکانەوە.

لەنێو دەوڵەتی ڕەگەزیدا دەبێت بەباشی توخمە باڵاکان بدۆزینەوە، کەئەمەش گران نییە. ئەمە تەنها ڕاستییەکە و دەتوانرێت لەڕێگەی لەبێژەنگدانی کەسانی سەرکەوتووەوە کەسانی بژاردە و باڵا دەست نیشان بکەیت و ئەرکی تەواو گونجاویان پێشکەش بکەیت. لەدەوڵەتی نەتەوەییدا لەڕێگەی هەڵبژاردنی کەسەکان لەلایەن زۆرینەی کەم زانەوە سەرکردەکان دیاری بکرێت ڕەتکراوەیە، چون ئەم کارە زۆرینەی کەسانی بەتوانا پشت کلك دەخات و کەم توانا خاوەن دەزگاکانی ڕاگەیاندنیش پێشەبەر، بێگومان هەڵبژاردن لەدەوڵەتێکی نەتەوەیدا لەکارخراوە گەر مەبەستی دەست گرتن بێت بەسەر هەموو جهاندا. لەڕێگەی ئەنجامدراوەکانی دەوڵەتەوە کە بوار بەکەسانی مشەخۆر و بازرگانانی ڕامیارکاری نادات دیاربکەون ئەوکات کەسانی خاوەن توانای ڕاستەقینە و هێزبەخش بەدەوڵەتی نەتەوەیی دیاردەکەون.

ئەوانەی بڕوایان وایە کە تاکە جوداییەك هەبێت لەنێوان دەوڵەتی ڕەگەزی نیشتمانی سۆسیالیستی و دەوڵەتانی دیکە بریتی بێت لە باری ئابووری ئەوا ئەمانە بەهەڵەداچوونە، لەکاتێکدا دەوڵەتی ڕەگەزی هەڵدەستێت بە هێنانەدی هاوسەنگییەکی گونجاو لەنێوان سامان و بەشخوراندا دێنێتە کایەوە، یان چاککردنی ئاستی ئابوری چینە داماوە نەدارەکان، یان لەڕێگەی باشترکردنی کرێ و بەهای بەرهەم و کاری دیکەی لەم شێوەیەوە. ئەوکەسانەی زیادتر لەئەنجامدانی کاری ئاسایی چاوەنواڕ لە بزوتنەوەکەمان ناکەن و هیچ بیرۆکەیەکیان نییەلەبارەی ئامانجە ڕاستەقینەکانمانەوە، ئەوکات ئەمانە هیچ کات بۆیان نییە ڕەخنەی بزوتنەوەکەمان بکەن. هەرگەلێك لەڕێگەی ڕێکخستنێکی ڕووکەشیانەوە دڵ شاد و پێی بەس بێت لەبۆ چاکسازیی کردنی دۆخی ئەوا ئەم گەلە نەشیاوە و شایەنی بوون نییە و ناتوانێت شارستانیەت بئافرێنێت.

لەدەوڵەتی ڕەگەزی سۆسیالیستی دا سەرباری چاکسازیی کردنی بنچینەیی کەخۆی بە ئافرێنەر و چەسپێنەری ئەم چاکسازییە دەزانێت توانای دیاری کردنی بژاردەکان و کارپێدان و ئاراستەکردنیشیانی هەیە، ئەمەش وادەکات دەوڵەت ببێتە دەزگایەکی گونجاو لەبۆ نەش ونماکردنی کەسایەتی هاووڵاتی.

لەبۆ تێگەیشتنی گونجاو لەنارەمانجی لڤینەکەمان خاستر واسە سەرلەنوێ دیرۆک بێنینە ناخاوین، چونکە ئەم ڕێگەیە دەتوانێت بەها و ڕۆڵی تاک لەدامەزراندنی شارستانیەتدا دیاربخات.

هەنگاوی یەکەمی جیاکاری نێوان مرۆ و هاژەڵ داهێنان بوو لەلایەن مرۆڤەوە، بۆئەمەش هەرچی لەتوانایدابوو ئەنجامی دا لەشێوەی گزی و تەڵەکەبازی لەبۆ پاراستنی خوودی خۆی.

ئەم داهێنانە سەرەتاییانە ڕووکەشیەکان وای ڕوون دەکەنەوە کە ئەمانە دەسپێکی ئەو حەزانەبووە کەلە مرۆڤی دابڕاودا دیارنەکەوتووە، بەڵکو لەو کۆمەڵە مرۆیەوە سەرچاوەی گرتووە کە خوویان بەیەکترەوە گرتووە و دواتر کەوتونەتە کێشەوە و بەناچاری پەنایان بۆهەموو ڕێگەیەك بردووە لەبۆ خۆڕزگارکردن لەم ئاریشە فەتارەتاوییە. بەلأم وردکاران پێچەوان ئێژنەوە، دەڵێن: چالاکی مرۆیی لەهەرجۆرێکی بێت ئەوا بەرهەمی تاکە و بەس، هەرچی داهێنانیش هەیە کەڕاژەی بوونەوەرەکان دەکات تەنها کەسێك پێوەی سەرقاڵ بووەو بەس. ئەم دەسپێشخارییەی وەکو ئاماژەی جولآندنی ئەوانی تریش وەها بووە. ئەوانەی ئێژن سەرچاوەی داهێنانەکان کاری دەستەییە ئەوا بەهەڵەداچوونە، چوونە ئاژەڵ لەبۆ پاراستنی خۆی هاندەرێکی حەزی و هەستیاری تاکی هەیە. نمونەش بۆئەمە. ئەو شێوازەی ڕانە بزنێك لەبۆ خۆپاراستن لە ئاژەڵێکی مەترسیدار ئەنجامی دەدات هەمان چەشنە جوڵەی پێشووتری تاکە بزنێکی نێو ڕەوە بزنەکە بووە کەبەتێپەڕبوونی کات هەموویان لەوەوە فێری بوونە لەبۆ خۆپاراستن.

هەنگاوی تاکێکی بەهرەدار کاریگەری گەورەی بەسەر کۆمەڵی مرۆڤایەتیەوە دەبێت، ئەودەمەی تاکێك بۆیەکەمین جار ئامرازێکی لەبۆ خۆپاراستن داهێنا ئەمەی بۆ هەموو مرۆڤایەتی داهێنا ئەوەك بەتەنێ بۆخۆی، ئەوەی ئەنجامدراوە و دەدرێتەوە بەزۆری برەوپێدانی کاری بەهرەمەندێکی پێشووترە بەناوێکی نوێترەوە، واتا بۆهەرچەشنە بوارێك داهێنەری تایبەت بەخۆی هەیە.

ئەمجار مرۆڤ کەوتە داهێنان لەبۆ دەست گرتن بەسەر ئەو بوونەوەرە زیندوانەی دیکە کە هەم لەمرۆڤ دەترسان هەم مەترسیش بوون لەبۆ مرۆڤ. مرۆڤ بەردەوام بوو لە ڕێگە دۆزینەوە تاوەکو ئەمانەی دەستەمۆکرد، ئەوکاتەی بەهرە داهێناناویەکەی

دیارکەوت ئەوکات خۆی زیندەتر برەوپیندا. بەردی تیژ و لووسکرد. ئاژەڵی ماڵی و بەخێوکرد. چەکی بڕیەند و ئاگرینی دروستکرد...هتد. هەموو ئەم داهێنانە بەرئەنجامی کاری تاک گەلێکی خاوەن بەهرە بوونە نەوەك کۆمەڵ. زۆرینە هیچ مانایەکی نییە. هەروەها عەوامیش. چونکە نەخشەدانان و ڕێکخستن بەکۆمەڵ دروست نابێت و سەرناگرێت.

ئەوکاتەی بواری ڕێکخستن ڕەخسا بۆ هێز و توانای داهێنەرانی وڵات ئەوکات ئەو دەوڵەتە لەڕووی گەشەکردنەوە دەگاتە ترۆپك و ئەم هێزەش دەتوانرێت لەخزمەتی نەتەوە و کۆمەڵدا بەگڕبخرێت. پێش لەهەر ئەرکێکی دیکەی دەوڵەتی ڕەگەزی نیشتمانی سۆسیالیستی لەبێژەنگدان و دیارخستنی کەسانی بەهرەمەندە لەبۆ خزمەت کردن بەنیشتمان و خاك و نەتەوە و ڕەگەزەکەیان. دۆزینەوەی کەسانی بژاردەش ئاسان نییە . چونکە ئەمە تێکۆشانە لەپێناو مانەوە و ئەمەش کاتی زۆری دەوێت. هەرکەسێك لەلێواری جادەکاندا پاڵکەوت یان بەر لەگەیشتن بەشوێنی مەبەست شانی داهێلاو دەستی لێهەڵگرت ئەوکات ئەمانە خاوەنی توانایی نین لەبۆ بوون بەسەرکردە. بەڵام ئەو کەسانەی تا دوا هەناسە بەرگەدەگرن و خۆیان بەدەستەوە نادەن ئەمانە شایەنی بژاردەبوونن. بژاردەکان هەمیشە لەو لقانەی دەوڵەتدا بەدی دەکرێن کە سەرکردە خاوەن سەرەاترین و دوابڕیارە لەشێوەی سەربازگەکانی سووپا. لە سەربازی و سوپادا هاوڵاتی خاوەن توانا بۆ سەرکردەکەی خۆی دەسەلمێنێت. خۆنەگەر ئەم کەسە بەهۆی ئاشتی یەوە وون کرابوو ئەوکات لەسایەی جەنگەوە دیاردەکەوێت و بەکاتێکی کەم دەتوانێت پێشیاوی خۆی بسەلمێنێت.

لەم ڕۆژگارەماندا بەهۆی کاریگەربوون و سەرکەوتنی پیلانەکانی جوولەکەوە تواناداری تاك بۆ سەرکردایەتی ڕاستەقینە وون بووەو . کەسی سەرداری وڵات لەلایەن زۆرینەیەکی هەڵخەڵەتێنراوەوە دەست نیشان دەکرێ و لەم کاتەشدا تاکی ڕەسەن و پێشیاوی سەرۆکایەتی لەم گەردوونەدا لەسایەی کاری نەزانانەوە وون دەبێت. ئەمەش وای کردبوو وەرنامە پونێت نارەکانی ئاری نەژاد بوونێکی نەمێنێت. ئەو بەرنامەیەی بژاردەکانی بە کۆڵەکەی گەل و توخمی کارا لەبۆ داڕشتنی بەرنامەکانی وڵات و داهێنان کاری دیاری دەکات دەست نیشان دەکرد. لەبری ئەمەدا بەرنامە کاولکارەکانی جوولەکە تەشەنەی سەند. کە ئارمانجی پیسکردنی خوێنی گەلان و

ڕەگەزکانیشە دگەڵ داڕووخانی کۆڵەکانی ژیاری ڕەگەزەکان بەیەکجاری. مارکس خواز کاربۆکاری جوولەکە بوو. چون بەم کارە بژاردەو کاریزما بوونی نامێنێت و تاک وەکو سەرکردە خاوەنی ڕێزنابێت و هەموو دەستەلاتێك لای زۆرینەی نەزاندا کۆدەبێتەوە. ئەمەش وای کرد هەردوو بەرەی جوولەکە و مارکس خوازی یەك بنچینە گرنگی بە پەیڕەوی پەرلەمانی بدەن. بەدرۆش زەحمەت کێشەکان گۆشبکەن. سەندیکاکان کراون بەناوەندێکی ئاژاوەنانەوە بەناوی داواکردنی مافەوە. ئەمەش بووە هۆی ملکەچ بوونی ئابووری نەتەوەیی بۆ حەز و خواستەکانی ئەو زۆرینەیەی کە هاندەرە کەسێتیەکانیشی لەدەستداوە لەکاتێکدا پێشتر وەکو هاندەرێك بۆپێشەوەی هەنگاو پێدەنا.

مارکسیەکان تەنها دەتوانن بەڵێن بدەن و بۆچوونی ئاڵۆز بخەنەڕوو لەبۆ گێژاندنی خەڵکانی عەوامی کەم زان. دگەڵ خوارکردنەوەی کۆڵەکەکانی ئابوری نیشتمانی.

مارکس خوازان لەبۆ لەقکردنی بنەماکانی دەوڵەت تەنها بەڵێن بە زۆرینەی کۆمەڵ دەدەن و بە پەیمانی درۆیینە هەڵیان دەخەڵەتێنن. لەبۆ خوارکردنەوەی کۆڵەکەکانی ئابوری نەتەوەیی دەوڵەتیش هەمان شت بەکاردێنێتەوە. هەبۆیە بزوتنەوەکەمان بەکاری خۆی دەزانێت کرێکار لەم هەڵەیە مەترسیدارانە ئاگاداربکاتەوە کە مانگرتن و ئاژاوەگێڕییان لەپێش چاواندا بەجوانترین شێوە دەڕازێنێتەوە و هانی ئاژاوەگێڕییان دەدات. ئەم چەشنە کارانە بەتەنها نابێتە هۆی کەمبوونەوەی داهاتی گشتی بەڵکو فاکتەریشە لەبۆ لەناوبردنی زیندەییەتی گەلەکەمان و ئیفلیج کردن و لەچالاکی خستنی. دەستەبەرکردنی خۆشگوزەرانی بۆ هەموان لەڕێگەی پێدانی پشکی ڕۆژانەی هاولاتیانەوە دەبێت لەوداهاتە گشتیەی کە بەرهەمی کاری هەموانە.

ئەم لڤینەی ئێمەی ڕقابەری مارکس خوازان نییە. هەربۆیە ناچارین لەبۆ دیارخستنی جیاوازی دیای نێوان چەمکە ڕەگەزیەکان لای ئێمە و ڕوانگەی مارکس خوازان بۆ دەوڵەت و نەتەوە و ڕەگەز. دەوڵەتی ڕەگەزچێتی نیشتمانی سۆسیالیستی بابەتی ڕەگەزخوازی پێگەی تایبەتی خۆی هەیە و دانیش بە بەهرەداری کەسایەتیدا دەنێت و بژاردەکان دەکاتە بنچینە لەبۆ ئەنجامدانی هەر کارێکی ئەرێنی پۆنیاتنار. خۆگەرهاتوو ئەهامەتی وای لێکردین لڤینەکەمان ئەم بنەمایەی لەبیرکرد و ئەژادێتی لەپێش چاوان نەگرت، ڕەزامەندبێت بەو شێوازە و بە بنەمای زۆرینە قایل بێت، ئەوا

لەم کاتەدا ئەم لڤینەمان دەبێتە پارتێك یان دەستەیەکی تایبەت کە دامەزراوە لەبۆ دژبەری کردنی مارکس خوازان و هیچی تر، ئەمەش وادەکات لەکۆتاییدا بیانووی دامەزراندنی لەدەست دەربچێت و چیتر وەکو لڤینێکی خاوەن باوەڕێکی فەلسەفی لێی نەڕوانرێت.

لەدەوڵەتی ڕەگەزخوازیدا دان بە بەهرەی تاك کەسیدا دەنرێت و خۆشگوزەرانی بۆ کۆمەڵیش دابین دەکرێت ئەمەش لەڕێگەی پترکردنی بەرهەم و داهاتی تاکی نێو کۆمەڵەوە دەبێت. ئەمەش بەتەنها لەڕێگەی خۆ قوتارکردن لەپەیڕەوی پەرلەمانیەوە دێتەدی: بەرنامەی زاڵێتی زۆرینە، بەومانایەی دەستەی سەردار و فەرمانڕەوا ملکەچ و چاوەنواڕی دەنگی زۆرینە و عەوامن. زۆرینەش زۆرجار هەڵخەتێنراوە و لغاوی فەرمانداریێتی ناداتە دەست بژاردەی ڕاستەقینە و ژیر و نەترسەوە.

هەردەوڵەتێك لەسەر بنەمای ڕەگەزی نیشتمانی سۆسیالیستی بێت ئەوا شتێك بەناوی بڕیاری زۆرینەی کۆمەڵەوە بوونێکی نییە، لێرەدا سەرۆکی وڵات بەرپرسە لەهەموو کارێکی ئەنجام دراوو ڕووداوێك، وێژەی ڕاوێژ مانای بنچینەییەکەی خۆی دەستەبەردەکاتەوە، سەرۆکی وڵات خاوەنی کەسانی لێهاتووە بۆ ڕاوێژکردن بەڵام خۆیشی خاوەنی دوابڕیارە و بەس. لەبابەتی سوپایشدا دەوڵەتی ڕەگەزی گەر بتوانێت هەمان ڕێچکەی سوپای پروسیای پێشوو بگرێتەوە بەر ئەوکات سەرکەوتنی زیادتر دەبێت: فەرماندە دەستەڵاتی تەواوی بەسەر ئەوانەی خوار خۆیەوە هەیە و دەست و پێوەندەکانیش بەرپرسن لەبەردەم فرماندەکاندا، پەرمان هەموو دەستەڵاتێکی لێدەسەندرێتەوە و دەگۆڕێت بۆ ئەنجومەنێکی ڕاوێژکاری و بەس، لەم کاتەدا ڕۆڵی ئەم دەزگا و دازراوانە لەجاران بەهێزتردەبێت، چونکە دەبنە ناوەندێك بۆ پەروەردە بینینی کەسانی بەهێز و دواتریش دیارکەوتنیان لەسەر گۆڕەپانی نیشمانی. لەدەوڵەتی ڕەگەزی نیشتمانی سۆسیالیستیدا دەتوانین ڕۆڵی پەرمان بەم شێوەیە بخەینەڕوو:

لەدەوڵەتی ڕایخ دا پەرلەمانێك نییە ببێتە ناوەندی بڕیاردان و هکومەتیش جێبەجێ کار، بەڵکو بەتەنها ئەنجومەنی ڕاوێژکاری بوونی هەیە و هەڵدەستێت بە شیکردنەوە ئەنجامدان بۆئەو پرسانەی لەلایەن سەرۆکەوە ئاراستەی کراوە. دەوڵەتی ڕەگەزخوازی هەرگیز بواری ئەوەنادات کە کێشە زیندەییەکان-بۆنمونە ئابوریەکان-بە کەسانی

نەشیاو بسپێردرێت لەبۆ دەست تێوەردانی، هەربۆیە لەم کاتەشدا ئەنجومەنی ڕامیاری و ئەنجومەنی ئالیکاری دێتە بوونێ، لەبۆ بەرهەمدانی کاری هەروەزی نێوان ئەم دوو ئەنجومەنە ڕۆڵی بڕیاردانی کۆتایی بە ئەنجومەنی پیران دەبەخشرێت. کەواتە ئەم ئەنجومەنانە ناوەندی دەنگ لەسەردان نین ، بەڵکو ناوەندی بەدواداچوون و ڕێکخستنی کار و پرسەکانن.

***

کورتکردنەوەی کارەکانی پەرلەمان لە خوێندنەوە و هەموارکردنی پرسەکاندا ناتوانین بەداهێنانێکی پارتەکەمان لەقەڵەم بدەین، چون بەرنامەی زۆرینە زۆربەکەمی کاری پێکراوە لەمێژووی دروست بوونی دەوڵەت لەسەر زەویندا. زۆربەی کات کارکردن بەم بنەمای زۆرینەیە فاکتەربووە لەبۆ ماڵوێرانی و تیاچوونی دەوڵەتانی جهان. ئەم دۆخ گۆڕانەی پارتەکەمان بانگی بۆ دەدات تەنها لەرێگەی دەمەوە بەرجەستە و چێ نابێت، بەڵکو پێتڤی بە هەوڵ و تێکۆشانێکی زۆرە لەبۆ چەسپاندنی، ئەم ئەرکەش لەلایەن پارتەکەمانەوە( پارتی نیشتمانی سۆسیالیستی) کاری تەواوی بۆکراوە لەبۆ چەسپاندنی لەژیان و باری کەتواری و ڕاستینەدا.

## بەشی شازدە

# چەمکی فەلسەفی پارت و ڕێکخستنمان

دامەزراندنی دەوڵەتی ڕەگەزی تەنها لەڕێگەی زانینی بنەماکانیەوە نابێت. ئەوەندە بەس نییە بزانین ئەم دەوڵەتە چۆن بێت، بەڵکو دەبێت چێی بکەین. پارتە ڕامیارەکانی دیش هیچ ڕۆڵێکیان نابێت لەو کارە پوونیاتنەرەی کە بزوتنەوەکەمان هەنگاوی بۆدەنێت، چلۆن دەگونجێت ئەم پارتانەی هەنوکە پاچەکانیان بەکاربێنن لەبۆ بارگۆڕانی ئەو دۆخەی خۆیان ئافراندوویانە لەشێوەی گەندەڵبوونی دۆخی ئێستامان؟ ناشبێت ئەوەمان لەبیربچێتەوە کە ئاراستەکارانی پارتەکانی هەنووکە زۆرینەیان جوولەکەن، بۆیە گەر لەنێو خوودی خۆماندا کەس گەلێکی بەهێز دیارنەکەون لەبۆ دەستبرینی گەل بەناو بژاردەی جوولەکە، ئەوا هیوا درێژخایەنەکەیان دێتە دی، کە دەبێژێت: گەلی جوولەکە دەست دەگرێت بەسەر هەموو دانیشتوانی سەرگۆی زەویندا و دەبێتە سەرداری بێ بەرگریشیان.

بەڵێ، کەواتە پارتە بۆرجوازی و چەپڕەوەکان چلۆن دەتوانن دژبەری ئەمانەبکەن کە گاڵتەمان پێدەکەن لەبۆ بەدی هێنانی ئامانج و بەرژەوەندیەکانیان؟

لەسایەی ئەو بۆچوونە باوەی نێو کۆمەڵگەی ئەمڕۆمانەوە دەوڵەتی ڕەگەزی بەئاسانی دروست نابێت، مەگەر هێزێکی ئاسنینی نوێ دەستی تێوەربدات و

تێبکۆشێت لەبۆ گەیشتن بە نمونەی بالاّ. ئەمەش مانای وایە کاری دەسپێکمان دامەزراندنی بنەماکانی دەوڵەتی ڕەگەزخوازی نییە بەڵکو لەناوبردنی دەوڵەتی جوولەکەیە,مێژوومان پێمان دەڵێت: گرانی هەر گران ئیشییەك لە چەسپاندنی دۆخێکی نویٚ نییە, بەڵکو لەفراوانکردنی بواری کاریگەری دۆخەکە و بەرنامە نوێیەکەیە, بۆیە پێویستە لەسەر سەربازانی ئەم بزوتنەوەیەمان بەوپەڕی ژیری و چاونەترسیەوە کار بۆ سڕینەوەو وەرچەرخانی دۆخی باوی ئێستابکەن.

لاوانی خاوەن بۆچوونی نویٚ دەبێت تێبکۆشن لەبۆ چەسپاندنی بۆچوونەکانیان, لەڕێگەی هەڵگرتنی چەکی ڕەخنە لەهەمبەر دوژمنانیاندا. لەمڕۆدا لەبەناو ڕەگەزخوازانی ترساوەوە گویٚ بیست دەبین کە ئێژن, بەهۆکار و بیٚ هۆکاریش: ئەوان زۆر لەوەی بەڕێزترن فیشەکی ڕەخنە ئاراستەی کەسگەڵی دیکە بکەن کەمەبەستی باشترکردنی دۆخەکە بێت. ئەم بەناو ڕەگەز پەرەستانە لەمێژوو تێناگەن, تەنانەت لەمێژووی ئەو چەرخەی تێیدا دەژین هیچ نافامن؛ مارکسیەت لەهەوڵدانیان بۆ زاڵکردنی جوولەکە بەسەر جیهاندا-کاری پونیات نانی بەهێزە-لەڕێگەی ڕەخنە و تانە و درۆوە لەهەمبەر دووژمنەکانیاندا بۆماوەی حەفتاو پێنج ساڵ تێکۆشاون, ڕەخنەکانیان سوتێنەربوون, پشوودرێژ, بەردەوام بوو لەسەر کارەکەی تاوەکو لەم دەوڵەتە پیرەدا کۆڵەکەکانی لاوازکرد و دواتریش خۆی بوو بەسەرداری. مارکس خوازان زۆر بەباشی هەستیان بەوەکردبوو کەلەگەڵ دیارکەوتنی پێغەمبەرێکی خاوەن پەیامی نوێدا ئەمانە بەئاسانی پووچ نابنەوە, زۆرجار دۆخی نویٚ هاتۆتە ئاراوە, بەلاّم دواتر تەسك بووەتەوە بۆ چوارچێوەیەکی پارت گەرەکی و ئینجا لاوازبوونی زیادتری, ئەمەش بەهۆی ئەوەوە یە کەخاوەنی بۆچوونی تایبەت هەرگیز گیانی لێبووردن نازانێت مەگەر لەخزمەتی خۆیدا نەبێت, بۆیە کەسی خاوەن پەیام و پەیڕەوی ڕاستەقینە ئەوپەڕی هەوڵی خۆی دەدات لەبۆ چەسپاندنی بنەما بۆچوونیەکانی, لەگەڵ لەناوبردنی ڕژێمی کۆن گەر توانی بێتی بەسەریدا زاڵبێت.

ئەمەش دۆخی ئاینەکان بووەو وەهاش دەبێت.

حەسرەتیان بەتەنها لەڕێگەی چەسپاندنی بوونی خۆیەوە دانەمەزرا, بەڵکو پشت ئەستوربوو بەلەناوبردنی بنەمەکانی بت پەرەستی. ئەگەر ئەم ڕەگەزچێتیە کوێرانە

نەبوایە ئەوا بڕوابوون بە حەسرەتیان مۆرنەدەکرا بەگیان بەخشینی کۆمەڵێك جەنگاوەری بەهێز.

ڕەنگە یەکێك ناقایل بێت بەوەی هەمان چەکی جووەکان بەکاربێنینەوە و بڵێت: دەمارگیری و خۆپەرەستی دوو ناتەواوی تایبەت بەجوولەکەن و نابێت ئێمە بەکاریان بێنینەوە. ئەم قسەیە تاڕادەیەکی زۆر باش دروستە, ئەم دۆخەی شڵەژاوەی هەنوکەمان لەڕێگەی گرتنەبەری شێوازی ئاساییەوە ناگۆڕێت. بۆیە هەر بۆچونێك گەر لەسەر بنچینەی دەمارگیری و خۆپەسەندی بێت بەتەنها لەڕێگەی بەکارهێنانەوەی ئەو چەکەی خۆی بەکاری هێنانەوە بۆ خۆبەهێزکردنی دەتوانی بەکار بهێنیتەوە بۆ لاوازکردنی, ئەمەش دگەڵ دۆخی ڕستینەدا هاوتایە و هیچ نەشیاو نییە. لەبیرمان چوویەوە حەسرەتیان توندوتیژی و ترسی ڕۆمانی دگەڵ خۆیدا هێنابوو؟ چون باش دەیزانی بەبێ بەکارهێنانی ترس هیچ ترسێك لەناوناچێت. گەرچی پارتە ڕامیارکان بڕوایان بە ڕێککەوتن هەیە لەبۆ چارەکردنی کێشەکان بەڵام بنەما فەلسەفیە ڕاستەقینەکان هەرگیز ڕێگەبەم چەشنە کێشەچارەکردنی نادەن.

ئەوکاتەی پارتە ڕامیاریەکان دەست بەچالاکی دەکەن و بەئارەزووی وروژاندنی دەستەڵات کاردەکەن لەبۆ بوون بەدەستەڵات دار لەڕێگەی کێشکردنی جەماوەرەوە لەسایەی ڕێبازێکی فەلسەفی دیاریکراوەوە, بەڵام بەتێپەڕبوونی کات لەم بنەما فەلسەفیانەی لادەدات بۆ زیادکردنی ژمارەی لایەنگران, ئیدی لێرە بەدواوە دەروونی لاواز تەڤلی بزوتنەوەکە دەبێت کە هیچ کەڵکی تێکۆشانیان نییە.

گەر ئەم پارتانە بۆماوەیەکی زۆر بمێننەوە ئەوکات دووچاری هەرەوەزکاری ئەرێنی دەبنەوە لەبۆ سوود وەرگرتن لەو ئەنفالانەی جێماون, پاش لەمەش کاری ڕادەوەستێت. بەڵام ئەگەر ڕقابەرێکی بەهێز لەخوانەکەی دووریخستەوە ئەوکات دەگەڕێتەوە دوا بەشی کاروانەکە و ئەمەش دۆخی دەبێت تا ئەوکاتەی هەلێکی بۆ دەرەخسێتەوە بەمەبەستی گەڕانەوە بۆ هەمان جێگەی پێشووی لەسەر خوانەکە.

بەڵام خاوەن بنەمای فەلسەفی ڕاستەقینە هەرگیز دان نانێت بە هەروەرز و هاوپەیمانی پارتەکان, خۆی بە جەنگاوەری دژە دۆخی نەخوازراو لەقەڵەم دەدات و بەردەوام دەبێت لەسەر ڕەوتی خەباتکردن تائەوکاتەی دەگاتە ئامانج.

ئەم چەشنە تێکۆشانە کە هەوڵی خوارکردنەوەی هەموو بنەما کۆنەکان دەدات پێویستی بە تێکۆشەر و بژاردەی ڕق ئەستور و نەبەرد و نەترسی بەهێزە. لفینی بۆچوون خوازی ناتوانێت ئارمانجەکانی بەدی بهێنێت مەگەر لەڕێگەی بەسەربازکردنی بەهێزترین و چالاکترین ئەندامانی گەل نەبێت، لەگەڵ کۆکردنەوەیان لەنێو یەك ڕێکخراوی بەهێزی خاوەن دروشمی خەبات گێڕ، هەرخاڵێك لە فەلسەفەکەی بنەماگەلێکی دیاریکراوی ڕوون نەکردەوە ئەوا بەوانی ڕوونی دەکاتەوە و لەتێگەیشتنی ئاپۆڕای نزدیك دەکاتەوە، دەیدونجێنێت بۆئەوەی شیاوبێت لەبۆ بوون بە یاسایەك کە بڕوای لایەنگرانی زیادتر بچەسپێنێت.

وەرنامەکانی پارتێکی ڕامیاری وەك ڕەچەتەیەك وایە کە ڕامیاری کاران لەبۆ بەدەست هێنانی زۆرترین دەنگی هەڵبژاردن دایدەڕێژنەوە، هەربۆیە دامەزراندنی هەرلفینێکی نوێ لەم کاتەدا وەك جەنگ ڕاگەیاندن وەهایە لەهەمبەر پارتی دەستەلاتدار. مەرج نییە هەموو ئەوانەی سەربە لفینێکی بۆچووندارن هەموو نهێنی و ئامانجەکانی پارت و سەرۆکەکەیان بن، گرنگ ئەوەیە ئاشنای کۆمەڵێك بنەمای هاندەری بنچینەیی بن، لەگەڵ بڕواداری بەسەرکەوتنی پارت و بەرنامە و پیرۆزگیراوەکانی و هەوڵدان بۆ بەرگری لێکردنی.

چ قازانجێکی هەیە سوپایەك زۆرینەی پلەبەرزان پێکی هێنابێت، هەرچەندە بەتوانشبن؟ هەرپارتێکی زۆرینەی ئەندامەکانی کەسانی درەوشاوەو دیاربن ئەوکات چاوەنواڕی قوربانی دانی لێناکرێ لەبۆ بەرگری کردن لە بۆچوونەکانی، لەبۆ سەرکەوتنی پارت یان بزوتنەوە و بۆچوونەکەی خاستر وایە سەرکردەیەکی بیرقوڵ و زرنگی هەبێت و سوپایەکی بەهێزیشی هەبێت کەلەڕێگەی سۆزی لایەنگیری کوێرانەوە ئاراستەبکرێن.

دەستەیەکی سەربازی پێك هاتبێت لە دووسەد کەسی ژێر لغاوکردنیان زۆر گرانترە وەك لەوەی لە سەدو نەوەد کەسی ئاسایی و دەکەسی ژێر پێکهاتبن و ئەو دەکەسە بکرێنە سەردار و ئاراستەکاریان. لفینی سۆسیال دیموکراتی ئەم ڕاستیەی زانی و کاری پێکرد، ئەم پارتە تاڕادەیەك دەستەلاتی بەخشیە نوێنەرانی گەلی چەکدار کە بڕیار و پەیمانی گوێڕایەڵ بوونیان بۆ پارتەکە داوە، ئەم پارتەمان خستویانێتیە ژێر کاریگەری پەیڕەوێکەوە کە توندوتیژیەکەی کەمترنییە لە پەیڕەوی سەربازی،

دواتـریش دروسـتکردنی سـەرکردە و فـەرمان وەرگـر بـۆ بـەڕێوەبردنی کاروبـاری داهـاتووی وڵات. کرێکـاری ئـەڵمانی بووەتـە سـەربازێکی کـارای پـارت، کەسـێکی هزرمەنـدی جووڵەکـەش بووەتـە ئەفسـەرێکی نەشیاو کەپێویسـتە لەسـر پۆسـتەکەی لابرێت.

لەو دەمەی پارتە بۆرژوازیەکان دروشمی باڵام بریتی بوو لەوەی ئەمانە لەخۆگرتەی ژیرتـرین کەسـانی وڵاتـن، لەهـەمان کاتـدا تەشـەیان لـەمارکس خـوازان دەدا بـەوەی گەمـژەکانی کۆمەڵگـەیان لـەخۆگرتووە، هەربۆیـە ژیرخـوازانی وڵات یـان لایـەنگرانی بۆرژواکان سەرکەوتنی مارکسیەکانیان بۆ هەڵخەتاندنی عەوامان دەگێڕایەوە. هەروەها بۆرژواکان لەخۆگرتەی نەوەی خانەدان و دەوڵەمەند و ژیـران بوونـەو ئـەمان ئینتیمـا و لایـەنگری تاکۆتایـان بـۆ هـیچ پـارت و لایـەنێك نییـە و زۆرجـاریش دان بـەهیچ سیسـتمێکی فـەرمانڕەوادا نانێـت. بـەڵام پارتـە مـارکس خـوازان و هاوڕێکاکـانی، توانیویـەتی لەرێگـەی تفـاقێکی مرۆیـی دیـاری کـراوەوە ئاسـۆیەکی سوپائاسـا پێـك بهێنێـت و لغـاوی سـەرکردایەتی کردنـی بداتـە دەسـت جووەکـان یـان جووپەرەسـتە کوێرکراوەکان.

بۆرجوازیـەکان نابینـابوون لەهەمبـەر مەترسـی بەرئەنجامـەکانی ئـەو چەشـنە ڕێکخسـتنە-هـیچ کـات بیری نەکردۆتـەوە لـە خوێندنـەوەی هـەناوی جـەماوەر-هـیچ هـەنگاوێکی نـەنا لـەبۆ کێشـکردنی زۆرینـەی کۆمەڵـدا، بەپاسـاوی ئـەوەی هـەرپارتێك پشت بە خانەدانەکان ببەستێت بەئاسانتر دەتوانێت بگاتە دەستەمۆکردنی دەستەڵات وەك لەو پارتەی پشت بەزۆرینەی نەفام ببەستێت. بۆرژوازیەت ئەوەی لەیاد کردبوو کە هەرپارتێکی ڕامیاری سەرکەوتنی بەندنییە بە زیرەکی زۆرینەی ئەندامەکانیەوە بەڵکە لەپێشـەنگدا بەنـد و پەیوەسـتە بـە ژێـری سـەرکردەی بـاڵا و گوێڕایـەڵی ئەنـدامانی بـۆ بڕیارەکانی سەرکردە و سەرکردایەتی.

ئەودەمـەی بنەمایـەکانی تێکۆشـان کۆدەکەینـەوە ئـەوکات ئامـادەی دەسـتەڵات وەرگرتن دەبین سەرکەوتنیش ئەستەم دەبێت بەبێ بوونی سەرمایەی مرۆیی دەمارگیر بۆ بیرۆکـەی پارتەکـە. هـەرکات ویسـتمان فاکتـەری سـەرکەوتن بـۆ لقینەکـەمان دابین بکەین ئەوکات بانگدانی پارتەکەمان ئاراستەی ئەو چینە دەکەین کەنەترسن و هیچ لـە تێکۆشان ناترسێن. مەبەستمان چینی کرێکارانە. بەگرتنەبەری ئەم چەشنە ڕێچکەیە

بڕیاری نوسینەوەی بیست و پێنج بنەمای سەرەکیم دا لەبۆ پارتەکەمان، بۆئەوەی هەموان بزانن مەرامەکانی ئەم پارتەیەمان چییە. لەم ڕێگەیەشەوە هەم ئامانجی پارتەکەمان بۆ خەڵکی ڕوون دەبێتەوە هەم لایەنگرانمان پتەوتر تێدەکۆشن لەبۆ سەرخستنی وەرنامەکانی ئەم پارتەیەمان و گەیشتن بەئامانجە ڕاستەقینەکانی.

گرنگ ئەوەنییە ڕێبازەکانی پارتەکەمان بەبۆتەیەکی جوان برازێنینەوەو پیشان بدەین، بەڵکو گرنگ داڕشتنەوەی بنەما ڕاستەقینەکانی پارتەکەیە بەشێوەیەکی تەندروست، بەجۆرێك پێشیاوی شیکردنەوەی هەڵەنەبێت. بۆتە دەتوانرێت دەستکاری بکرێت، بەڵام ناوەرۆك پێویستە بەجێگیری بمێنێتەوە. چون گۆڕانی ماوەیەك بۆ ماوەیەکی دی هۆکاری کەرت بوونی لایەنگرانی پارتەکەیە. لەم بوارەشدا باشتر وایە شێوازی پەیرەوکراوی کڵێسای کاسۆلیکی وەربگرین کە بەو پەڕی سەرسەختیەوە ڕەتی پاشگەزبوونەوەی دەکات لەهەر پیتێکی تایبەت و پەیوەست بە ڕێبازەکەیەوە، لەکاتێکدا ئەم ڕوونیەی کڵێسا لەڕووی ڕێبازییەوە زۆرجار پێکدادەدات دگەڵ زیادتر لە خاڵێکی زانستی یان لۆژیکیدا. لەڕێگەی ئەم ڕەتکارییەوە کڵێساوە دەستەڵات و لایەنگیری خۆی پەرەپێدەدات، بۆیە پێویستە لەسەر هەرکەسێك گەر مەبەستێتی بزوتنەوە ڕەگەزچێتیەکەی سەرکەوتووبێت خاوەنی ئەم بیرۆکەیە بێت: بزوتنەوەی دیارکەوتوو پێویستی بە داڕووخاندنی هەموو لەمپەرەکانی پێشی هەیە، بۆئەمەش پێویستی بە داڕشتنەوەی ڕێبازێکی ڕوونە، ئەو بۆتەیەی لەخۆگرتەی بنەماکانیەتی باشتر وایە بەجوانی بیپارێزێت و نکوڵی لەمیچ دەقێکی نەکات ئەوکاتەی دەست بەجەنگ دەکات، هیچ کاتیش گۆڕانگاری لەناوەڕۆکی ڕاستەقینەی بەرنامەکانی پارتەکەدا ناکرێت، چون ئەگەر ئەم کارە ئەنجام بدرێت پاش لەیەکەم هەنگاونان لەبۆ تێکۆشان ئەوا ئەو گۆشتە لەناودەبات کەبەهۆیەوە هەموو هیوادارانی پارتەکە لەدەوری کۆبوونەتەوە، ئەمەش مانای تەفربوونە، هەمدیس هۆکاریش دەبێت لەبۆ لاوازکردنی گیانی تێکۆشان.

پارتی کرێکارانی ئەڵمانی نیشتمانی سۆسیالیستی بیست و پێنج خاڵ بەرنامەکانی پێکدەهێنا، بووە بڕوای سەرەکی لەبۆ تێکۆشان. بۆیە پێویستە لەسەر هەموو پارتێك بەجوانی ڕێبازەکانی بپەرۆزبکات و ڕێگە لەڕەخنە لێگرتنی بگرێت و

هەرگیز دەستکاری لە بنەما ناوەرۆکیەکانی پارتەکەیدا نەکات. تائەوکاتەی دەگاتە دوانامانجی

پارتەکەمان مافی خۆیەتی. بەڵکو ئەرکیشیەتی خۆی وەکو هەڵگری پەیامی ڕەگەزچێتی پیشان بدات. پێشتر خەڵکانی دیکە هەوڵی گەیاندنی ئەم پەیامەی ئێمەیان داوە. بەلاَم بنەما پشت پێبەستراوەکانیان ناڕوون و پەرت بوون و هیچ پەیوەستەییەکیش لەنێوانیاندا نەدەبینرا. لەم ڕۆدا ژمارەی ئەوپارت و بەرانەی تەنانەت حیز بە گەورەکانیش- هانی دروستکردنی دەوڵەتی ڕەگەزی دەدەن. ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ڕاستی و توندی پەیامەکەی ئێمە -پارتی نیشتمانی سۆسیالیستی- لەوەی بەجوانی فاکتەرەکانی دروست و گەشە و مانەوەی دەوڵەت و دەوڵەتداری ڕاستەقینەی تێگەیاندوون جا لەڕووی لۆژیکەوە بووبێت یان مێژوو. پێش لەدیارکەوتنی لقینەکەمان هیچ یان و پارت و بزوتنەوەیەکی ڕەگەزخوازی بوونێکی نەبوو. بەلاَم پاش لەدیارکەوتنی پارتەکەمان زۆربەجوانی ئەم دروشمە گەشەی سەند و هێزی هزری دیارکەوتن و کاریگەریشی لەسەر پێناکردنی ڕاستەقینەی دەوڵەت دیارخرا. پارتەکانیش تەنها ئەم بۆچوونەی ئێمەیان وەرگرت و هەوڵی پەرەپێدانیان نەدا. نەوەك لەبەرئەوەی بڕوایان پێیەتی . بەڵکو زانیان نانیان بۆ دەستەبەردەکاتەوە و بەجوانی سەرکەوتنیان پێدەبەخشێتەوە و بەخێرایی تەشەنەدەکات.

پارتە بۆرژواکان تاوەکو هەشت ساڵ بەر لەئێستا نەیان دەزانی ڕەگەزچێتی مانای چییە. تەنانەت حەوت ساڵ بەرلەئێستا هەرکە باسی وشەی ڕەگەز پەرەستی دەکرا سەرکردەی بۆرژواکان دەپچڕان لەپێکەنینەدا. ئەمجا کەزانیان دۆخە ڕاستەقینەیە بڕیاری دژبەری کردنمانیان دا بەبێ سڵ کردنەوە لەبەکارهێنانی هەرچەشنە ئامرازێك. وا بۆ سێ ساڵ دەچێت دەستەلاَتداران دەستیان داوەتە چەوساندنەوەی هەڵگرانی ئەم بۆچوونە. بەلاَم ئەم چەشنە هەنگاوە ستەمکاریانە هۆکاری زیادبوونی لایەنگرانی لقینەکەمان و پتر دەنگدانەوەی بوو. ساڵی ڕابردوو بۆرژواکان دەستیان دایە خاوەندارێتی لێکردنی ئەم بنەمای بۆچوونە لەبۆ ئەوەی شەمەندۆفێرەکە بەجێیان نەهێڵێت. بەلاَم مەبەستیان لەبەکارهێنانی تەنها زیادکردنی دەنگەکانیان و لەناوبردنی دوژمنەکانیانە لەداهاتوودا.

چەندین پارت هەن بەجوانی لەڕەگەزچێتی تێگەیشتوون، بەڵام ڕێکخستنی تەواویان بۆ تێکۆشان لەپێناویدا نەکردووە، لەکاتی داڕشتنەوەی ئامانجەکاندا پەنایان گرتبووە ڕێبازی ناڕوون و دەقی خەوشداری تێکدراو، هەمدیس داوای چێکردنی دەوڵەتێکی نمونەییان دەکرد بەبێ بەکارهێنانی توندوتیژی!

لەبۆ پیشاندانی لاوازی پارتەکان، لەبۆ بەئەنجامگەیاندنی ئەو ئەرکەی کە پارتەکەمان خۆی بۆ یەکلایی کردبۆوە، دەبێت بگەڕێینەوە بۆ ئەو ڕۆژگارەی بزوتنەوەکەمان جەماوەری هەژاند بەڕاگەیاندنی ئامانج و بەرنامەکانی لەڕێگەی شانۆی ڕامیارچێتی یەوە.

# بەشی حەڤدە

## کاریگەری وشە

سەرکەوتنی ئەو کۆبوونەوەیەی کە پارتمان لە ٢٤ ی ڕێبەندانی ١٩٢٠ دا بانگەشەی بۆدەکرد هۆکارێکی دیکەی هاندەرمان بووە لەبۆ بەستنی کۆنگرەی خولی گەل, پاش لەوەی دەترساین لەبەستنی یەك کۆنگرەی مانگانە وائێستا لەهەفتەیەکدا زۆربەئاسانی کۆبوونەوەیەکی بەرفراوان دەبەستین و ژمارەی ئامادەبوانی چەندان هێند ژمارەی کۆبوونەوەکانی پێشووترە, لەنێوان کۆبوونەوەی یەك و دووەمدا هەمیشە بەپەرۆشەوە چاوانواڕی وەڵامی ئەوپرسیارەبووین کە بەمێشکماندا دەهات, ئەویش: تۆبڵێی خەڵکان بەدەم بانگێشتنامەکەی ئێمەوەبێن و تاکۆتا وشەمان ئامادەی گوێگرتن بن؟ هەفتانە ژمارەی کۆبوونەوە سەرکەوتوەکانمان زێدەتر دەبوون و ڕێزی زیادترمان لێدەنرا, تادەهات ژمارەی ئامادەبوانیش لەزیادبووندابوو.



**هتلەر لەکاتی وتارداندا**

لەڕێگەی بەهێزی و خرۆشداری وتاربێژەکانمانەوە کێشەی گوێنەگرتن و کاڵفامی و هەڵەتێگەیشتنی جەماوەر چارەسەر کرابوو. وتاربێژانمان دەستیان دایە دیاری کردنی بەرپرسانی ڕاستەقینەی جەنگ و خستنەڕووی نەهامەتیەکانی پەیمان نامەی ڤەرسای، ئەم دووبابەتە پارتەکەمان ساتێك ناکاتێك دەیوروژاند. چون بەتەنها گەڕانێکی ئاسایی یان لێوردبوونەوەیەکی ساکاری ئەمانە تێدەگەیشتن کێ ناپاکی لەکۆماری ئەڵمانیا کردووە یاخوود بوونی خوودی کۆماری دەخستە ژێر پرسیارەوە و بە دەرکەوتەیەکی دواکەوتووی دژە پاشای سەرکەوتوو لەقەڵەم دەدا. ئەوانەشی مارکسیەت ڕێی لێ وێڵ کردبوون، ئەوکاتەی مارکس خوازێك دەیبیست ڕەخنەمان لە پەیمان نامەی ڤرسای دەگرت . قسەکەی پێ دەپچڕاندین و بەهاوارەوە دەیگوت: ((

ئەی پەیمان نامەی برست لیتۆفسك؟ ))، لەسەرەتاوە دووچاری نەهامەتییەکی زۆر بووین لە تێگەیاندنی خەڵکی لەوەی بۆچی پەیمان نامەی ڤرسای نەهامەتی بۆ ئەڵمان هێناوە. ئەم پەیمان نامەیە ئابڕووبەرییەکی وەهای بە ئەڵمانیاوە لکاندبوو کە بەئاسانی نەدەتوانرا لەبیربکرێت و بسڕدرێتەوە. بەڕاستی کاردنەوەی زۆرینەی خەڵك لەم بوارەدا نەرێنی بوو، بۆیە ناچار بووین یان ئەوەتا بەردەوام دەبین و زۆرینە دەتۆرێنین لەخۆمان یام ئەوەیە دەست لەم شالاوی هۆشیارکردنەوەیە هەڵدەگرین و زۆرینە بۆخۆیان کەسپ دەکەین. بڕوام وابوو باشترین ڕێگە بۆئەمە بەردەوام بوونە تەنانەت گەر جاماوەریش لێمان وەدوورکەوێتەوە و هەموو تۆمەتێکیش بخەنە دوامان، پارتی نیشتمانی سۆسیالیستی دەبێت سەردارێتی بکات نەوەك شوێت قسەی ژێردەستخراوەکان بکەوێت. دەبوو ئێمە جەماوەر ئاراستەی ڕێگەی ڕاستی بکەین، خۆئەگەر لەسەر هەڵەکانی ئەوان بەردەوام بووینایە ئەوکات بیانووی دامەزراندن یان دەرکەوتنمان پووچ دەبوویەوە و نەدەبوینە لڤینێکی چاکسازیی خوازی ئەڵمانی و پتەوکاری کۆڵەکەی دەوڵەت لەسەربۆچوونی دروست.

بەڕاستی لەوکاتەدا دروست وتن بۆ گەل کارێکی مەترسی داربوو، هەر پارتێك بە پێچەوانەی تەوژمی بۆچوونی لایەنگرانی باوەڕیەوەبێت ئەوکات سەرکێشیمان یان سەرکەوتنی تەواومان ئەنجام دەدات. دەمان دیت بۆرژواکان نێزك ناکەونەوە لە ئاوێتەبوون بە زۆرینە، لەکاتێکدا دەستکەلاکانی جوو هەوڵی بەلادا ڕێبردنی فرەیینەی گەلیان دەدا. لەهەمبەر ڕق لێبوونەوەمان لەلایەن خەڵقی ئەڵمانییەوە ئەوەندی تر سووربوونمان لەبۆ سەرکەوتن پتەوتر بوو، بەردەوام بووین لەسەر پلانەکەمان لەبۆ سڕینەوەی ئەو گوتەیەی کەدەڵێت: پەیمان نامەی ڤەرسای پەیمان نامەیەکی دیمۆکراتیانە و بێ زیان بوو. ئەوەم دەزانی لەهەڵمەتەکانماندا لەبۆ دژدایەتی کردنی پەیمان نامە بەناو دیمۆکراسیەکاندا پارەتەکەمان لایەنگرێکی زۆری لەدەست دەدات، بەلأم باش ئەوەشم دەزانی سەرئەنجام هەردەبێت گەلی ئەڵمانی هەست بەم هەنگاوە ڕاستانەی ئێمە بکەن، لەو کاتەشدا ڕق لێبوونیان بۆ ئێمە دەگۆڕێت بۆ خۆشویستن و بڕوای تەواوی بە بزوتنەوەکە دەبەخشێت و کەمتەرخەمیش ناکات لەبۆ قوربانی دان لەپێناو زێدەتر سەرخستنی بەرنامە تەندروستەکانی بزوتنەوەکەمان.

هەروابووە, هیچ پارتێکی سەرکەوتوو ڕاستەوخۆ لەلایەن جەماوەر و زۆرینەوە پێشوازی لێنەکراوە, تائەوکاتەی ڕاست و دروستی دەق و ئامانجەکانی پارتەکەیان بۆدیارکەوتووە, چون بۆچوونی پارتی نوێ زۆرجار پێچەوانەی بۆچوونی خەڵکی عەوامە, دژە بە ئارەزووەکانی. بۆخۆم لەئێکەم گردبوونەوەی هەوادارانماندا هەستم بەم دۆخە ڕاستەقینەکرد, لەدەسپێکەوە زانیم ڕووی من لەکەس گەلێکە دگەڵ چەمك و بۆچوونی مندا پێچەوانەن, دەبوو بە وتای دوو کاتژمێری بنەماکانی پشت پێبەستوویان داڕووخێنم لەبۆ کێشکردنیان بۆ تەقل بوونە نێو پارتەکەمان و هەڵگرتنی بنەما و ئایدیاکانی ئێمە لەهەمبەر هەموو شتێکدا.

بەڵێ, ئەرکێکی قورس لەسەر شانمان بوو, ئێمە خۆمان تەقلی جەنگێك کردبوو کەناچاربووین دژی کۆمەڵگە بووەستینەوە لەبۆ تێگەیاندنیان و گەیاندنیان بە ڕاستیەکان بەبێ هیچ پاساوێکی هەست و سۆزی. لەڕێگەی کۆبوونەوەکانی دەسپێکمانەوە زانیم لەڕێگەی دامالینی دووژمن لەوچەکەی پێیەتی دەتوانین ئەم کێشەیە ئەموەنتربکەینەوە. هەستم بەوەکردبوو کە مارکسیەکان هەربەیەك شێوە قەوان دەژەنن, بۆیە ئەگەر ئاوەزەکەیان لێتێکبدەیت ئەوکات ناتوانن هیچ بەدەست بێننەوە, بەم کارەشم توانیم هەرلەسەرەتای قسەکردنمەوە هەستی ئەوانە بۆلای خۆم ڕاکێشم کەنیازیان پاکە و هەڵخەڵەتێنراون.

لەدرێژەی شالاوەکەم بۆسەر پەیمان نامەی ڤرسای دەستم دایە ڕوونکردنەوەی ڕگەکانی پەیمان نامەی برست لیتۆڤسك, چون باش دەمزانی هەموو ئەوانەی قینیان لە پەیمان نامەی برست لیتۆڤسکە هیچی لێنازانن و بەلاڕێدا براون بەهەڵە تێگەیاندنیان. مارکس خوازە هەڵخەڵەتێنەرەکان وای بەگوێی خەڵکیدا دەدایەوە کە بەهۆی ئەوەی ئەڵمانیا پەیمان نامەی برست لیتۆڤسکیان بەسەر ڕووسیادا سەپاندووە بۆیە ڕووسەکانیش هەستاوان بە سەپاندنی ئەم پەیمان نامەیە بەسەر ئەڵمانیادا. دەبوو هەموو گوتەیەکی مارکس خوازان بەدرۆبخەمەوە بەبەراوردکردنی هەردوو پەیمان نامەکە. لەکۆبونەوەیەکدا کە دووکاتژمێری خایاند توانیم ناباشیەکانی پەیمان نامەی ڤرسای و باشیەکانی پەیمان نامەی برست لیتۆڤسك بخەمەڕوو, لەپاش هەر کۆبوونەوەیەکی ڕاوێژکاریم دەمتوانی هەزاران خەڵکی لەداوی مارکس خوازان ڕزگاربکەم و ڕاستیان بۆ ڕوون بکەمەوە.

لەڕێگەی کۆبوونەوە بەردەوامەکانەوە بوومە ڕاوێژکاری سەرەکی پارتەکەمان و فێری چۆنێتی وروژاندنی هەستی جەماوەر بووم. دەمتوانی لەڕێگەی وشەوە تێبکۆشم و هەنگاو بەرەو سەرکەوتن بنێم.

نەوەستاین بە وتاربێژی و ڕۆشنبیرکردنی خەڵك، بەڵکو هەنگاومان بەرەو بڵاوکردنەوەی بڵاوکراوەکان هاویشت، دگەڵ ئاماژەکردن بە بۆچوونی پارتمان لەهەمبەر پەیمان نامەکان و ئەو هۆکارانەی بوونە هۆی هەڵایسانی جەنگ. هەموو شتێکەمان لەڕێگەی وشەوە دەردەبڕی و کاریگەربوونی جەماوەریشمان بۆ خۆمان پتردەکرد، لەسەر ئەو بنەمایەی سەرجەم ڕووداوەکانی دیرۆکی کەونارا وشە ڕێگەخۆشکاربووە بۆسەرکەوتن، ئەمەش لەڕێگەی وتاردانی ڕاستەوخۆوە بووە نەوەك خوێندنەوەی پەرتووك و ڕۆژنامەکانەوە.

چەند هەفتەیەك پێش لەئێستا ڕۆژنامە ناوخۆییەکان گاڵتەجاڕی خۆیان بەم هەنگاوەمان دەردەبڕی، ئەم هەنگاوەی ئێمە زۆر کاریگەر توو وەك لەهەنگاوی ئەوکەسانەی لە تەلارە بەرزەکان و سەرنوێنە نەرمەکاندا دەژین و لەڕێگەی پێنوسەکانیانەوە دەیانەوێت خەڵکی ئاراستەبکەن، بەبێ ئەوەی لەناخی خەڵك تێگەیشتبن و بزانن دەرونیان چی تێدایە.

بۆرژواکان لەبیریان چووبەیەوە وتاربێژ لەڕێگەی ڕوانین لە ڕووخساری بیسەرانی ڕادەی کاریگەری وشەکانی خۆی بۆ دیاردەکات و بەردەوام لەهەوڵی نوێدا بۆ بەکارهێنانی باشترین و بەهێزترین وشە، وتاربێژی ڕاستەوخۆ لەڕێگەی ڕوانین لە ڕووخساری بینەر و بیسەرانی دەزانێت بەردەوامی پێویستە یان کۆتایی پێهێنان... بەڵام نوسەر هەرچی لەدڵیایەتی دەینوسێتەوە و دەیخاتەبەردەست خوێنەرێك کە نایناسێت و نلزانێت کاردانەوەکانی چییە لەهەمبەر نوسینەکانی، ناشتوانێت بەدڵی خۆی خەڵکی بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ ئاراستەبکات. مرۆڤ هەمیشە دژبەری خوێندنەوەی ئەو دەقانە دەکات کە حەزی لێی نییە و دگەڵ بۆچوونی ویدا یەك ناگرنەوە . خۆنەگەر نڤیسیارێت ویستی زۆرینە بۆلای خۆی کێش بکات ئەوکات پێویستی بە نوسینی کورت هەیە لەشێوەی بەیان نامە و تاڕادەیەکیش نامیلکە. ونکە جەماوەر بەزۆری حەزیان لەخوێندنەوەی سەرپێییە و نایانەوێت زۆر کات بەو بابەتانەوە بکوژن کە حەزیان لێی نییە، هەروەها بەیان نامەی کورتیش پێویستە

بەزۆری لەشێوەی دەقی وێنەدار و کەم وشەبێت بۆئەوەی بەکەمترین وشە زۆرترین مانا ببەخشین. لەهەمان کاتدا نوسەر هاوشێوەی گوتاربێژ بەتوانایە لەبۆ یاری کردن بە هەستی جەماوەر. گەر بە جۆش و خرۆشەوە بنوسێت و رووله جەماوەر بکات و بێژە نوسراوەکانی بەشێوەیەك بێت خەڵکی عەوام لێی بگەن. جیاوازی نوسەر و وتاربێژی ڕاستەوخۆ ئەوەیە کە:

وتاربێژ لە بینەر و بیسەرانی دەڕوانێت و لەچاوی کاردانەوەی ئەوانەوە هەڵسەنگاندن بۆخۆی دەکات. هەروەها گرنگە بەلایەوە ڕاستەوخۆ کاردانەوەی قسەکانی خۆی ببینێت. بەڵام قسە و بێژەی نوسەر پشوودرێژی پێویستە. خۆئەگەر وتاربێژ هەستی کرد ئامادەبوان لێی ناگەن ئەوکات شێوازێکی نوێ پەیڕەودەکات لەبۆ وتاردان و سەرەنج ڕاکێشانی خەڵك و کارتێکردنیان. خۆئەگەر هەستی کرد زمانی بەکارهێنراو بۆ وتاردان قورسە ئەوکات شێوازێکی نوێ و ئاسانتر بەکاردەهێنێت. خۆئەگەر هەستی بە ناقایل مەندی ڕووخساری جەماوەرکرد بە گوتەکانی ئەوکات پەنادەباتە بەر ڕوونکردنەوەی زیادتری بێژەکانی بەمەبەستی ڕەتکردنەوەی نارەزایەتیەکانی ئامادەبوان. بۆئەمەش پاساوەکانی لەڕێگەی بەکارهێنانی بەڵگەی زیندووەوە پتەوتر دەکات و بەردەوام دەبێت تاوەکو ئەو ڕقەی لەناخی ئامادەبواندایە نایهێڵێت.

ئەو کەسانەی دەبێت لەم دۆخەدا ئەنجام بدرێت بەهۆش هێنانەوەی ئەو هاوڵاتیانەیە کە بانگەشە هەڵەکان ئاراستەی ڕێڕەوتی هەڵەی کردوون. ئیتر لەم کاتەدا ئاوەز زاڵ دەبێت بەسەر سۆز وهەستەکاندا... بێگومان تێپەڕاندنی ئەم کۆسپانەی کە دوژمن ئافراندوونی لەناخی دانیشتواندا چەندان جار سەخت ترە لە ڕاستکردنەوەی تیۆریەیەکی زانستی. دەتوانین لەڕێگەی فێرکردنی نەخوێندەواران و نیوچە خوێندەوارانەوە بتوانین نەختێك خەڵکی هۆشیار بکەینەوە. بەڵام ناتوانین ناخی دژخواز بەهەمان ڕەوت چارەبکەین. لەم کاتەدا ناچاری بەکارهێنانی ئەو بەمرانەین کە کاریگەریەکانیان جادووئاسا و ڕاستەوخۆنە.

چەندین بەڵگەی دیارمان هەیە کە ئاماژەی کاریگەری وتنی وشەمان بۆدیاردەخات لەچاو نوسراودا. لەئەڵمانیادا ڕۆژنامە بۆرژواییەکان ڕۆژانە چەند ملیۆنێکی لێ دابەش ئەکرێت. بەڵام ئەم بڵاوبوونەوەی ڕۆژنامانە کاریگەرییەکی ئەوتۆی نەبووە

لەسەر گرد بوونەوەی زۆرینەی خەڵك لە چواردووبەری دژە بۆرژوازیەکاندا. نوسراوی نێو ڕۆژنامەکان و بۆچوونی بیرمەندانی بۆرژوا بەسەر چەندین ملیۆن هاولاتی ئەڵمانیدا هەڵدەخلیسکا لەشێوەی هەڵخلیسکانی ئاو بەسەر سەهۆڵی چەوردا, واتە هیچ کاریگەرییەکیان نەدەبوو لەسەر ئاراستەکردنی دانیشتوان, ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ دوو هۆکار: یام ئەوەتا بۆچوون و بەرئەنجامی نوسراوەکانی بیریاران و هزرمەندانی بۆرژوا زرە و هیچی پێ نییە لەبۆ گەیاندنی بە کۆمەڵگە, یان بێژە نوسراویەکانیان لاوازن و ناتوانن کار لەهەناوی خەڵك بکەن.

جارێکیان ڕۆژنامەیەك کەلەبەرلین دەردەچوو لەنوسراوێکیدا هاتبوو: ((وێژەی مارکسیزم و نوسراوەکانی کارل مارکس کاریگەرییەکی جادوو ئاسایان هەیە لەسەر هەناوی زۆرینەی گەل)), بەڕاستی بڕوام وایە ئەم قسەیە هیچ لەدۆخی ڕاستینەوە نزیك نییە, چون ئەگەر بڕوانین دەبینیت ئەوەی چینی ڕەنجکێشی لەم چەند ساڵانەی کۆتاییدا لەدەوروخولی مارکسیەکان کۆکردبۆوە کاریگەری وتاربێژان بووە نەوەك نوسراوەکانی کارل مارکس و جووە ژەهر ڕژێنەکان. بەڕاستی پەرتووکەکەی کارل مارکس بۆئەوە نەنوسراوەتەوە لەپێش دەستی زۆرینەدابێت, بەڵکو وەکو پەیڕەوی سەرەکی لڤینی جووخوازی نوسراوەتەوە کە کار لەپێناو دەستگرتن بەسەر هەموو کونجەکانی جهاندا دەکات, ئامانجی ڕاستەقینەی گوێرایەڵی هەموو گەلانی جهانە بۆ گەلی بەربژاردەی جوولەکە. ڕۆژنامەکان تەنها ئەرکی بانگەشە کردن بۆ بەرنامەکانی گرتە ئەستۆ, بەئامانجی جوانکردنەوەی دەقەکانی مارکس و بەلاڕێدا بردنی چینی ڕەنجبەر و زەحمەت کێش و بەکارهێنان لەبۆ خزمەتکردنی زایۆنیزم.

بەڕاستی سەرکەوتنی ڕاستەقینەی مارکسیزم دەگەڕێتەوە بۆ ئەو هەزاران وتاربێژەی دروستکراوە لەبۆ خزمەتکردنی ئەم بەرنامەیە. هەموان لەخزمەتی مارکسیزمدا بوون جا سەرکردەکان بێت یان کرێکاری بێبەش, جا ئاژاوەگێربێت کە قسە بە گوتاربێژ دەبڕێت خوودی گوتاربێژی مارکسی . ئەمەش سەرباری ئەوەی گوتاربێژان هەموو جارێك ئەو قسانەیان دەکرد کە خەڵکان پێیان خۆشە و دەیان زانی چییان دەوێت و مەبەستە, بۆیە ئەوانیش بەو پەڕی تواناوە وشەی وروژێنەری ئەو بوارەیان ئامادە دەکرد و بەئامادەبوانینیان دەفرۆشتەوەو ناخیانیان دەوروژاند, سەرباری ڕێکخستنی ڕێپێوان و خۆپیشاندانی دەیان هەزارکەسی کە هانی جهان

دەدات لەبۆ هەست کردنە بەوەی لەئەڵمانیادا کرێکار توانای ڕووخانی حکومەتی هەیە و کەی بیەوێت بەپێی بنەماکانی مارکس ملکەچی دەکات، ئەمەش وای کرد ڕۆژ لەدوای ڕۆژ هەزاران کەسی نوێ تەقلی نێو بزوتنەوەی مارکس خوازی بێن.

مارکسیزم زۆر ژیرانە توانیبوی سەربازانی بانگەشەی نوسراو دەست نیشان بکات. بەڕاستی ڕۆژنامەکانیان زیادتر لە وتاربێژ دەچوون وەك لەدەقی نوسراو. لەوکاتەی بوێژ و بیرمەندان و مامۆستایانی بۆرژوا جاربەجارێك حەزی قسەکردنیان بۆ دروست دەبوو، بەڵام مارکسیەکان جاربەجارە ئارەزووی نوسینی زانستییان لا دروست دەبوو، واتە ڕێك پێچەوانەی یەکتر بوون، ئەو جولەکەیەی ئەرکی بانگەشەکردنی بۆ مارکسیزم لەئەستۆ دەگرێت ئەوەندە پشت ئەستورە بەدرۆ و بۆهتان ئەوەندە پابەند نابێت بەدەقی نوسراوەکەیەوە، واتە ئەوەندە هەوڵی شاردنەوەی ڕاستیەکان دەدات ئەوەندە هەوڵی خستنەڕووی ڕاستیەکانی نەدەدا. ئەمەش مانای وایە کە ڕۆژناکە بۆرژواکان لەئاست گەیشتن بە لغاوی جەماوەر خۆبەکەم زان بووە لەئاست ڕۆژنامەکانی جوولەکە و مارکس خوازدا. ئەوکاتەی بڕیاری بەستنی کۆنگرەکانم دا بەشەو مارکس خوازەکانیش هەمان کاریان ئەنجام دایەوە، چونکە کاریگەری وشە بەشەو بەهێزترە وەك لەڕۆژ. لەبیرم نەچوەتەوە کە جارێکیان لەمەیخانەی کادنکر لەمیونیخ ، کەخەڵکێکی زۆر ئامادەبوون بانگەشەکان بۆ پارتەکەمان دەکرد، ئەوکاتەش کاتژمێر دەی سەر لەبەیانی بوو، ئامادەبوان زۆربوون، چونکە ڕۆژی شەممەبوو ، بەڵام ئامادەبوان هیچ لەمن تێنەدەگەیشتن و کاردانەوەیان نەبوو، نەوەبوو چپلەی دەست خۆشیم بۆ لێبدەن نەش فیت و هوری نارەزایی دەربڕن. بەڕاستی نیگەران بووم، نەم دەزانی چۆن ئامادەبوان بوروژێنم، هەر کۆبوونەوەیەکمان بەڕۆژ ئەنجام دەدرا هیچ ئەنجامێکی دڵخۆشکاری نەبوو.

بۆیە ناچاری گۆڕینی کاتی کۆبوونەوەکان بووین. بەڕاستی یەکەمین وتارم کەلە کاتی شەودا بۆ ئامادەبوان ووت، وەکو وابوو ئاگر لەپووش وەربدەی، وەها هەستی ئامادەبوانی خرۆشاند. دەمدیت ڕووخساریان نیشانەی ووروژاندنی پێوە دیارە، بۆیە منیش ئەوەندی تر بە جۆشەوە بیژەکانم دەردەبڕی. بەڕاستی سەیرم لێدەهات، باشە نە وتاربێژ و نەش زۆربەی بیژەبیستان نەگۆڕاون، تەنها کاتەکەی نەبێت، کەواتە بۆچی وشەکانم لەم کاتەدا ئەوەندە ئاگرینن؟ سەرچاوەی ئەم کات گۆڕینەمان

دەگەڕێتەوە بۆئەوەی جارێک گوێبیستی هاوڕێیەکم بوو کەبۆ هاوڕێیەکی دیکەی قسەی دەکرد و دەیگوت: جارێکیان بەڕۆژ شانۆگەری (گەلی ئازادبوو)ی کردووەو جارێکیش بەشەو، بەلام تام و چێژ و کاریگەری ئەوەی شەو زۆر لەوەی ڕۆژ قوڵتر و بەهێزتر بووە.



هتلەر، لەهۆڵی وتارداندا

لەم کاتەدا وتەیەکی برەختی مامۆستام بیرکەوتەوە، کەدەیگوت: هێزی خوازویستی مرۆڤ لەڕۆژدا بەرگری دەکات لەهەمبەر هەر بۆچوونێکی نوێ کە بیەوێت بیخاتە ژێر ڕکێفی خۆیەوە، بەلام بەشەو کەمترە، بۆیە باشتر وایە بەشەو هەوڵبدەین لەبۆ

دەستەمۆکردنی ئاوەز و هەستی کەسی بەرامبەر، چونکە لەشەودا هێزی بەرگری لای مرۆڤ لەم بوارەدا لەئێوارەوە دەست دەکاتە کەمبوونەوە، بۆنمونە کڵێسای کاسۆلیکی بەهەمان شێوە هەمیشە هەوڵی تاریك هێشتنەوەی هۆڵەکانی وتاردانی دەکات لەبۆ گونجاندنی دۆخەکە بۆ گوێگرتن و کاریگەری بەشێوەیەکی جوان و کاریگەری، ئەم کەشە دۆخێکی وەها بۆ بڕواداران دەڕەخسێنێت کە بەئاسانی تێبگەن و لەڕێگەی ئامۆژگاریەکانیەوە یاری بە دەروونی ئامادەبوان بکات.

***

لەساڵانی ١٩١٩ و ١٩٢٠ و ١٩٢١ دا ئامادەی کۆبونەوەکانی بۆرژوازیەکان دەبووم، بەتایبەت ئەو کۆبوونەوانەی کە دیمۆکراتی خوازان و گەل ویستان و نەتەوە گەراکانی ئەڵمانیا دەیان بەست. بەڕاستی سەیرم لەخۆم دەهات بەوەی تەنها من ناچمە دەرەوە تا دواکەس لەقسەکانی دەبێتەوە، هەموان سەرقاڵی باوێشکدان بوون، زۆرێکیان شێوازی ڕەفتاریان وەهابوو وەکو ئەوەی لەمەیخانەدا دانیشتبێت و یاری کۆنکان بکات، بەڕاستی سەیربوو، وەکو ئەوە وابوو وتاربێژ بۆ ئەم ئامادە بوانە نەکات.

جارێکیان لە داغز لە میونیخ ڕۆشتم بۆ کۆبوونەوەی پارتێك کە هەموو کەس دەیتوانی ئامادەبێت، لیژنەی پراکتیکاری پارت یەکێك لەمامۆستاکانی زانکۆیەکی دیاری کردبوو بۆ دەسپێکی وتاربێژی و قسەکردن لەبارەی مەبەستی کۆبوونەوەکەوە، لەدەوروبەری مێزی وتاربێژەکەوە سێ کەسی جل ڕەش دانیشتبوون هەستم کرد ئەمانەن جێبەجێ کاری کۆبوونەوەکە.

گوتارەکە پێشتر نوسرابوو، مامۆستاکە دەستی دایە خوێندنەوەی ، بیست خولەك تێپەڕی نەکردبوو بەرە بەرە خەڵکان دەڕۆشتنە دەرەوە، باوێشکدان دەستی پێکرد، سێ کەس لەبەردەممدا دانیشتبوون وادیاربوون کرێکاربن، دیتم لەنێوان خۆیاندا ،دەستیان دابووە گەمەکردن، زۆری نەخیان تا ئەوانیش خۆیان لەهۆڵەکە دزیەوە. پاش لە تەواوکردنی وتارەکە کەسێك لە جێبەجێ کاران بەناوی ئامادەبوانەوە سوپاسی وتارخوێنەکەی کرد و داوای لەهەموان کرد سرودی نیشتمانی ئەڵمانیا بێژنەوە، هەموان هەستان بۆ وتنەوەی سرودی نیشتمانی، ڕێپێوان بەرەو دەرگاکە دەستی پێکرد. ئەمەش بۆئەوە نەبوو ڕێپیوانەکە بۆ جوانکردنەوەی وتنەوەی سرودی

نیشتمانی ئەڵمانی بێت، بەڵکو بۆ خۆ دزینەوە بوو لە کۆبوونەوەکە و هەڵمژینی هەناسەکی ئازادی.

بەڕاستی ئەم دۆخە بەسەر کۆبوونەوە شەوبەستراوەکانی ئێمەدا نەهات و نەبوو، وتاربێژانی ئێمە وشەکانیان زۆربەهێز و کاریگەر بوو، سۆز و ناخی ئامادەبووی دەوروژاند و نەیارانی دەحەپەساند.

بێگومان پارتی شیوعی دەیان ئاژاوەگێڕی دەناردەکۆبوونەوەکانمان بۆئەوەی لەگەڵیاندا بەشەڕ بێن و پۆلیس بانگێشت بکەن و کۆبوونەوەکانمان لێتێك بدەن و دوای بخەن.

زۆرێك لەمارکس خوازان ئامادەی کۆبونەوەکانمان دەبوون و بڕوایان وابوو کۆبوونەوەی شیوعیەکانە، بەهۆی ئەوەی ڕەنگی پەڕۆی دروشمەکانمان سووربوون. بۆرژواکان بەهۆی بۆچوونەکانیانەوە ڕەتی هەڵدانی لافیتەی سوریان دەکردەوە، نەیان نەدەویست بڵێن: ئێمەش مارکسن و چەواشەی خەڵکی دەکەین، واتا ئەوان بەم شێوەیە لەئێمەیان دەنواڕی، بەڵام مەرامی ڕاستەقینەی ئێمە لەم ڕەنگە سوورە قۆستنەوەی کەسە توندڕەوە چەپەکانە لەبۆ تەقل بوونە نێو کۆبونەوەکانمان با ئاژاوە گێڕیش بێت گرنگ نییە، گرنگ ئەوەیە ئامادەبێت و نەختێك گوێبگرێت و دواتر چیدەکات با بیکات، ئەمەش باشترین شێوازێك بوو لەبۆ بڵاوکردنەوەی بەرنامەکانمان لەنێویاندا.

مارکس خوازان کەوتنە ئەم داوەوە، کرێکارانی نێر و مێ ئامادەی کۆبوونەوەکانمان دەبوون، زۆری نەخایاند تائەوکاتەی ژمارەیەکی زۆر لە بەلشەفیك دووركەوتنەوە و تەقلی بزوتنەوەکەی ئێمە بوون و ئەوانەشی کاریگەریان بەسەریانەوە هەبوو لەگەڵ خۆیاندا پەلکەشی نێو بزوتنەوەکەمانیان کرد. لێرە بەدواوە سەرکردەکان ئامادەبوونی ئەندامانیان لە کۆنگرەی پارتەکانی دیکەدا هەڵوەشاندەوە و بڕیاری ئەوەیان دا، کە ئەندامەکانیان دەبێت بەشداری کۆبوونەوەی پارتەکانی دیکەبکەن و بە هێزی بازوو هەڵیان بووەشێنێتەوە، چونکە هەر کۆبونەوەیەکی دژە ئەوان بەلایەنگیری پاشاخوازی و کۆنەپەرەستی لەقەڵەمیان دابوو. نیو کاتژمێر بەر لەدەست پێکردنی کۆبوونەوەکەمان بە فەرمی هۆڵەکە لەکرێکار ئاخنرابوو، بەگومانەوە ئەهاتنە پێشەوە لەبۆ تێکدانی دەنگ گوێزەرەوەکان و کورسی

کۆبوونـــەوەکانیان دەشـــکاند و هەنـــدێك جـــاریش بـــەگومان کـــردن لـــەمارکس و بۆچوونەکانی دەڕۆیشتنە دەرێ.

بەڕاستی ئەنجامی ئەم کارە لەقازانجی ئێمە و زیانی سەرکردەی مارکسیەکان بوو، ئەمجارەش بێ هیوای کردنەوە. بەڕاستی ئەم کۆبوونەوانەی ئێمە بۆچوون و بنەما کارپێکراوەکانی کرێکارانی مارکس خوازی لەق کرد و ئەو چوارچێوە پتەوەی شکاندن کە تەوقی دابوون لەبۆ پاراستنیان لەکاریگەری وشە و دروشمی دەرەکی.

سەرکردەکانی بزوتنەوە مارکسیەکان گەڕانەوە بۆ پلانی یەکەمیان: یاساغی ئامادەبوونی کرێکاران لە کۆبوونەوەکانمان بەوەی ئەگەر ئامادەبن لەئیشەکانیان دەردەکرێن و نانبڕدەکرێن. ئەمەش هەلی زیادتری بۆ ئێمە ڕەخساند لەبۆ کارکردنە سەر دەروونی ئامادەبووان، چونکە ئەو مارکس خوازانەی ئامادەی کۆبوونەوەکانی ئێمە دەبوون لەترسی نان نەبڕینیان بەناچاری بە هێمنی دادەنیشتن و تەنها گوێیان دەگرت و وردە وردە لەبۆچوونە کۆنەکانیان پاشگەز دەبوونەوە. ئەمەش وای کرد بەئاسانی وتاربێژانمان بتوانن زاڵێتی خۆیان بەسەر بەرنامەکانی جووگەرەکی جیهانی دا بسەپێنن و دیواری دەور لێدەریان داڕووخێنن.

دواتر شێوازی پەیڕەوی سەرلێ تێکچوومان بینی لەڕۆژنامەی سورخوازان لە هێرشەکانیان بۆسەر ئێمە. بەرە بەرە سارد بوونەوە لەدژایەتی کرنمان ، بەڵام پاش لەبەهێز بوونمان سەرجەم لاپەڕەی و سەردێڕی یەکەمین لاپەڕەکانی ڕۆژنامەی سورخوازان تەرخان دەکرا بۆ دژایەتی کردنی ئێمە. ڕۆژنامەکانیان هەر ڕێگەیەکیان دەگرتە بەر بۆ دژایەتی کردنمان کەڵکی نەدەبوو، تەنانەت درۆ هەڵبەستن بۆمان و ناوبرندنمان بەگەحۆڵ و نازانستیش دادی نەدان، گەوجێتی بزوتنەوەکەمان هیچ ڕێگرییەکی بۆ ڕۆژنامە مارکس خوازەکان نەخستە پێش لەوەی ئێمە بەهاوشێوەی ئەوان بە بێ ئابڕوانە دژیان بوەستینەوە. ئەمەش لای خەڵکی پرسێکی دروستی هێنایە گۆڕێ بەوەی: ئاخۆ لڤینی نیشتمانی سۆسیالیستی چی کردبێت وا ئەمانە بەو شێوەیە لەشان و شەوکەتیان کەم دەکەنەوەو خۆنەم مارکسیانە خۆیان بەزانستی و نامرۆڤانەش هێرشیان دەکەنەسەر؟ ئەمەش بەسەر مارکسیەکاندا شکایەوە. ئەمجار پیلانی ماوەدرێژی جوولەکەیان بەکارهێنا. پیلانی تانە و تەشە و ناوزەندکردنیان بە تیرۆریست و هاندەر لەبۆ تێکدانی ئاسایشی وڵات و وەرگـوڕانی خەڵك. بەڵام ئەم

هـەنگاوەش هـیچ کاریگەرییـەکی ئـەوتۆی نەکردەسـەر گەشـەکردنی لقینەکـەمان و بەرنامەکانی. بەهۆی بوونی لایـەنگری باشمـان لـەنێو بزوتنـەوەکانی دیکـەدا کەکاری هـەوالگریان بـۆدەکردین لەگـەڵ فرەویـژی خـوودی سـەرکردەکانی سـورخوازەکان، نەمـانتوانی هـەموو کۆبوونـەوەکانمان لـەکاتی خۆیـدا ئـەنجام بـدەین. ئێمـە بـەر لەرووداني هەر رووداوێك هەموو شتێکمان دەزانی، بۆیە بەباشی خۆمان بۆ کاردانـەوە ئامـادە دەکـرد. هـەرگیز پـەنامان نـەدەبردە بـەر پـۆلیس بـۆ چارەکردنی کێشـەکەمان، چونکە هاتنی پۆلیس بۆ کۆبوونەوەکان لەبۆ ڕێگرتن لەئاژاوە مانای هەڵوەشاندنەوەی کۆبوونەوەکە دەبێت.

پـۆلیس هـیچ یاسـایەکی نـەدەزانی، هەرکـە بیـان بیسـتبایە کۆمـەڵێك ئـاژاوەگێر دەیانـەوێت کۆبوونـەوەی پارتێـك تێکبـدەن لـەبری دەسـتگیرکردنی ئـاژاوە گێـران کۆبوونەوەکـەیان هەڵدەوەشـاندەوە. بـەهۆی ئـەم پـەیڕەوە ژیرانـەی پۆلیسـەوە هـەر چەقووەشێنێك دەیتـوانی کۆبوونـەوە لـە ئـابڕووداترین پیـاوانی وڵات تێکبـدات یـان بنەمایەکی تایبەتی خۆی بەسەر کەشی کۆبوونەوەکەدا زاڵ بکات. هەرکە کەسی ستەم لێکـراو پـەنای دەگرتـە پـۆلیس ئـەوکات لـەبری دەسـتگیرکردنی تاوانکـار پـۆلیس ئامۆشیاری کەسی ستەم لێکراوی دەکرد بەوەی چیتر خۆی نـەدات لەپێکدادان لەگەڵ کەسانی خوێڕی و دەمارگیر و چەقۆکێشدا.

بەمەش هەستمان کرد دەستەڵاتی وڵات ناتوانێت چالاکیەکانی پارتمان بپارێزێت هەربۆیە ناچارین خۆمان خۆمان بپارێزین، تەنانەت گەر دەستەڵات پۆلیسیشی ناردە کۆبوونەوەکانمانەوە بۆ پاراستن ئەوکاتیش هەمدیس پشت بەخۆمان دەبەستین بۆ بەرگری کردن، چونکە پشت بەستن بە پۆلیس مانای خۆبەدەستەوەدان و لاوازیی ئـەنجامی پارتەکە دەگەیـەنێت، وەك چۆن ڕووناکی پەپوولە پەلکێشی خۆی دەکات هێزیش جەماوەر ڕاکێشی خۆی دەکات.

وەك چۆن کەسێکی بوێر دەتوانێت دڵی ئافرەتێك داگیربکات ئاوهاش پارتێکی بوێر و نەبـەرد دەتوانێـت حـەزی جـەماوەر بۆخـۆی کـێش بکـات، گـەر ژیرانـە ڕەفتـارە نەبەردانەکانی بەکار بهێنێت، بەم شێوەیەش توانیمـان خۆمان بڕیاری خۆپاراستنی خۆمان بدەین بەهۆی ئەو دەستە ئاسنینەی هـەمان بوو کەهـەردەم ئامادەی جەنگان بـوون لەپێناوماندا و بـوونی کارگێڕییـەکی بـەهێز و ئازایەتیـەکی نەبەردانـەش لای

هەموو ئەندام و سەرکردەکانی پارتمان پارمەتی ئەم سەرکەوتنەی داین. گەر ئەمان زانیبایە بەتەواوەتی دەستەلآتمان بەسەر کۆبوونەوەکەدا دەشکێت هیچ کۆبوونەوەیەکمان نەدەبەست . تەنانەت لەکاتی لاوازیشماندا دەمان توانی بەئاسانی کۆبوونەوەی پارتەکەمان بپارێزین لەگێرە شێوان.

بەراستی شایەنی گوتنە بەر لەدانانی پەیڕەوی فەرمی پارتەکەمان لە ڕێکخستن و بەڕێوەبردنی کۆبوونەوەکانماندا چاودێری و لاسایی بورژوا و مارکسیەکانمان دەکردەوە.

بەهۆی ئەوەی لایەنگرانی بۆچوونی مارکس خواز هەمیشە بەتەواوەتی فەرمانی سەرکردەکانیان جێبەجێ دەکرد هەربۆیە پەکخستنی کۆبوونەوەی مارکسیەکان لای بورژواکان هەرگیز جێگەی بایەخ پێدان نەبووە. بەلآم مارکسیەکان هەمیشە هەوڵی تێکدانی کۆبوونەوەی بورژواکانیان داوە. ببوونەوە ئاوەزی سەندیکا و هەرکۆبوونەوەیەك لەدژی مارکسیەکان ببەسترایە کرێکاری چینی ڕەش و ڕووت هەڵیان دەکوتایە سەر و تێکیان دەدا. ڕۆژنامە مارکس خوازەکان هانی دەستەلآتیان دەدا لەبۆ قەدەغەکردنی بەستنی کۆبوونەوە و بەتایبەت هی بورژواکان بۆئەوەی ڕووداوی نەخوازراو ڕوونەدات. لەکاتێکدا پاشان هەمان ڕۆژنامە ئاراستەی ئێمە کرا بۆ دژایەتی کردنمان. بەلآم ستایلێکی نوێترەوە. هانی کرێکارانی دەدا بۆ تێکدانی کۆبوونەکانمان و پاکتاوکردنی پارتمان.

بەراستی بورژواکان لەهەمبەر جووەکان زۆر لاواز بوون؛ چونکە زۆرینەی کۆبوونەوەکانیان لەترسی کرێکاران دوادەخست. خۆئەگەر کۆبوونەوەکەش دوا نەخرابایە ئەوکات سەرۆك وتەیەکی پێش کەش دەکرد و داوای لەنەیارانی دەکرد بەوەی خۆشحاڵە کە هاتوون و لەڕیزی ئامادەبواندا گوێدەگرن و دواتریش تکای تێکنەدانی کۆبوونەوەکەی لێدەکردن. بەوەی دەیگووت: ئەم کۆبووونەوەیە کورت و کەم خایەنە و دژایەتی هیچ لایەنێکی تێدا ناخرێتەڕوو و لەئامانجی هیچ ڕکابەرێکمانیش نادەین و سوکیان ناکەین. بەلآم سورخوازان مانای ئاشتی خوازییان نەدەزانی. هەرکە وتاربێژ یەکەمین وشەی دەردەبڕی هەراو هۆسە دەستی پێدەکرد و نەیان دەهێشت کەس بزانێت ئەو وتاربێژە باس لەچی دەکات. هەموویان بەیەکەوە جمانیان دەدا. ناچار کۆبوونەکە تێکدەدرا. ئەمەش بەهۆی نەبوونی توانادارى

بۆرژواكانەوە لەبۆ هەنگاو نان بۆ دژایەتی كردنی میوانە نەخوازراوەكان و بەشەق دەركردنیان لەهۆڵەكە، بەڵكو لەم كاتەدا بۆرژواكان هەموویان پێكەوە بەرەو دەرگای رزگاربوون رایان دەكرد و هیچ كاردانەوەیەكمان لەهەمبەر ئەم ئاژاوە گێرانەدا نەدەبوو.

ئەوكاتەی سورخوازان هەستیان كرد ئێمە دەزانین چۆن دژایەتی ئەوان دەكەین، زۆریان سەیر لێهات و نەیان دەزانی كام رێگە بەكاربێنن بۆ لەناوبردنمان. هەرلەیەكەم كۆبوونەوەمانەوە ئەوەمان بە ئامادە بوان راگەیاندووە كە ئاسایشی پارت رێگە بەهیچ ئاژاوەچییەك نادات كۆبوونەوەكەمان لێتێك بدات و ئەوەشی هەنگاوی ئاژاوەگێرانە بنێت بەشەق و تێهەڵدان لەهۆڵەكە دەكرێتە دەرەوە، جا هەركێ و چەند كەسیش بن.

ئێمە ئاسایشی بەهێزی مەشق پێكراومان هەبوو لەبۆ دەم كوتكردنی ئاژاوەچییەكان. بەلآم كۆبوونەوەی بۆرژواكان هەمیشە پاراستنی هۆڵەكان بە كەسانی پیر دەسپێردرا بەو ئومێدەی ئاژاوە گێران رێزی ئەو ریش سپییانە بگرن و كۆبوونەوەكەیان لێتێك نەدەن! بەلآم سوور خوازان ئەوەی بەلایانەوە گرنگ نەبوو بەهای مرۆڤی دژبەر بوو جا تەمەنی هەرچەندێك بێت.

لەدەسپێكی دامەزراندنی لقینەكەمانەوە دەستەی ئاسایشی پاسەوانی پارتمان دامەزراند، كەپێك هاتبوون لە دەیان سەربازی پێشووتر و دەیان لایەنگری خرۆشاوی ئامادە بۆ شەڕكردن. هەموویان گەنجی بەهێز و بازوودابوون. سووربووم لەوەی تێیان بگەیەنم ئەو شەڕەی ئەمان ئەنجامی دەدەن بۆ كەسی تایبەت نییە و كێشەیەكی نیشتمانی پیرۆزە و پێویستی بە خۆكردنە قوربانی و جەنگانە، ئەوانیش دواتر سوێندی دڵسۆزیان بۆ خواردین، تێم گەیاندن ترس تەنها بەترساندن چارە دەكرێت، نەك بە قسەی خۆش، بۆیە ئەگەر دەتانەوێت سەربكەوین ئەوكات دەبێت بەرگریكارێكی بەتوانای پارتمان بن و ئاسایشمان بپارێزن.

بەڕاستی لەسایەی پارچەبوونی گەلەكەمانەوە توانیومان سەركەوتن بەدەست بێنین و بگەینە بەدەست هێنانی هەزاران لایەنگیر، ئەمەش بەهۆی پەرتەوازەیی پلانی بەگڕخراوی بۆرژواكان و چالاكی ئێمەوە بوو لەهەمبەر ماركس خوازان و بەدرۆ خستنەوەیان، بوونی سەركردەی ژیر و سەربازی بەتوانا و جێبەجێ كاریش هاندرێكی فەرمی سەركەوتنەكانمان بووە.

ئەوکاتەی هانی سەربازانمانم دەدا لەبۆ بەرگری لێکرنمان بەڕاستی ئەوەندی تر متمانەیان بە ئێمە پتەوتر دەبوو، دەورووژان، ئامادەی جەنگان بوون. پێم ڕادەگەیاندن کە ئەم بیرۆکانەمان هیچ چارەنوسێکی سەرکەوتنی نییە گەر هێز و بازووی ئێوەی لەگەڵدا نەبێت، هیچ ئاشتی کردنێك ئاکامی باشی نابێت گەر هێزی پشتیوانی لەدواوە نەبێت. لەبیرم ناچێتەوە ئەو دیمەنانەی کە دەمدیت چۆن ئاسایشانی پارتمان پڵنگ ئاسا هێرشی دوژمنمانیان دەکرد، بێ ئەوەی گوێ بە ژمارە و زۆرییان بدەن، هیچ گوێیان بەمەترسی نەدەدا، تەنها ئەوەیان لەیاد بوو کە ئەمانە ئەرکی تەواوی پاراستنی جوڵانەوەکەمانیان لەئەستۆیە و دەبێت ئەرکەکانی خۆیان بەباشی ئەنجام بدەن.

***

لڤینەکەمان لەبەهاری ساڵی ١٩٢١ ەوە چوارچێوەی ئەنجامدراوو چالاکیەکانی گەشەپێدا. بۆیە پێویستمان بە پتر ژێر کردنەوەی دەستەی ئاسایشمان بوو. سەرلەنوێ ڕێکخستنەوەی دەستەکانمان بەرەو کێشکردنی بابەتێکی نەژادی کێشی دەکردین کە قاوقویەکی زۆری لەسەربوو، ئەویش نەبوون و دیاری نەکردنی هێما و ئاڵابوو بۆ بزوتنەوەکەمان، من بۆخۆم هەر لەدەسپێکەوە هەستم بە گرنگی لایەنی دەروونی کردبوو لەم وارودا، ئەوکاتەی بڕیارماندا لۆگۆ و ئاڵای خۆمان هەبێت پێشنیارێکی زۆرمان بۆهات، یەك بەیەك لەهەموو پێشنیارەکانمان کۆڵیەوە هیچیان کەڵکیان نەبوو، تا ئەوکاتەی پزیشکێکی دگان پێشنیارێکی جوانی پێشکەش کردین، بەڵام ڕەنگە پێشنیارکراوەکانی پێکەوە نەدەگونجان، من بۆخۆم ڕەنگەکانم گونجاند و ئاڵای پارتم خستەپێش هاوڵانی دامەزرێنەری پارت. بازنەیەکی سپی لەسەر پارچەیەکی سوور، لەناوەڕاستی بازنەکەدا خاچێکی چەماوەی ڕەش هەیە. هاوڵانم ئەم هێمایانەیان پەسەند کرد و ئەمەش بووە هێمای بزوتنەوەی نیشتمانی سۆسیالیستی، هەر لەوکاتەشدا شێوازی هێما کانزاییەکە و لۆگۆی سەربالی هاوڕێیانی ئاسایشی بزوتنەوەکەمان دیاری کرد.

بێگومان ئاڵاکە هێمای لڤینەکەمان و ئارمانجە مومبارەکەکانی بوو. ڕەنگی سوور لایەنە کۆمەڵایەتیەکانی بزوتنەوەکەمانە، سپی چەمکی نەتەوایەتی، خاچی چەماوەش هێمای تێکۆشانی درێژخایەنە لەپێناو سەرکەوتنی ئاری و سەرخستنی

بیرۆکـەی کـاری بەرهـەمهێن. لەسـاڵی ١٩٢٢ دا ئەوکاتـەی ئاسایشـەکانمان کـردە ناوکرۆکی یەکەیـەکی شـەڕوان کـە لەخۆگرتـەی هـەزاران گـەنج بـوو، بـۆ ئـەم یەکـەی ئاسایشە ئاڵاّ و هێمای تایبەتمان بۆ تەرخان کردن.

پـاش لـە فراوانبـوونی بازنـەی چـالاکیەکانمان ژمـارەی کۆبوونـەوە فراوانـەکانمان زیـادکرد، لەهەفتەیەیەکـدا سـێ کۆبوونـەوەمان لەگـەورەترین هۆڵـەکانی میـونیخ دا دەبەست، پۆلیس هەمووجارێکدەستی وەردەدا کۆبوونەوەکانمانەوە لـەبۆ ڕێگرتن لـە زۆربـوونی ڕەشـەباڵغی لەڕێگـەی داخسـتنی دەرگـای کۆبونـەوەکان و گێڕانـە دواوەی خەڵکە زیادەکە بۆ ئەو جێگەیەی لێوەی هاتوون.

لە زەمستانی ١٩٢١ دا ئەڵمانیا خۆی لـەپێش کۆمـەڵێك نەهامـەتی گـەورەدا دیتـەوە، لەندەن و پاریس ئاگاداریان کردەوە کە پێویستە سەد ملیار مارکی زێـر کەلەسـەری ڕێك کـەوتبوون بدات بەئەوان. لـە ٢١ ی بـەفرانباری هـەمان ساڵدا پارتـە بـەناو ڕەگـەز پەرەسـتەکان داوای ڕێکخسـتنی خۆپیشـاندانیان دەکـرد لـە میونیخـدا لـەژێر دروشمـی دژایەتی بۆ هاوپەیمانان، داوایان لەپارتەکەی ئێمەش کرد نوێنەری خۆمان بهەنێرینە کۆبوونەوەکانی لیژنەی ڕێکخستنەوە. لیژنەکە بڕیاری ڕێکخستنی خۆپیشـاندانی دا لە گۆڕەپـانی کونسینگ و دواتـر بڕیـاری دیاری کردنـی گۆڕەپـانی فلدنهالیـدا ، پـاش چل و هەشت کاتژمێر بڕیـاری ڕێکخسـتنی خۆپیشـاندانێکی بـەرفراوان درا لـە هـۆڵی کنوکیلز. لیژنەکە بەردەوام بوو لەسەر ڕاڕایـی. خـۆم یـەکێك بـووم لەنوێنـەرای پـارت و داوام لێکردن پێش لە یەکی ڕێبەندان بڕیاری کۆتـایی بـدات، داوایـان لێکـردم تـاڕۆژی چوارشەمە مۆڵەتیان بدەم منیش وام کـرد، هەمـدیس ڕاڕاییمـان لێیـان بـەدی کـردەوە، پاش لـەوەی هـاوارم کردە سـەر نوێنـەرانی پارتـەکانی دیکـە و پێیانمـان گـووت: ئێمـە بۆخۆمان گردبوونەوەکان ڕێکدەخەین، ئەو کۆبوونەوانەمان بەجێ هێشت.

ڕۆژی چوارشـەممە ٢ی ڕێبەنـدانی ١٩٢١ بلاّوکـراوە بەشـاردا بلاّوبوویـەوە کـەداوای گربوونەوەی دەکرد لە ٣ ی ڕێبەنداندا لە یاریگای کرۆن. ئـەم دەسـت پێشـخارییە لای خۆیـەوە هـەنگاوێکی مەترسیداربوو لـەبۆ ئێمـە. یاریگاکـە گەورەیـە، فراوانـە، گومـان هەیـە لـەوەی بتـوانین ئەوەنـدە خـەڵك کێشـی ئـەویَ بکـەیت بـۆ ئـەوەی جمـەی بێت.هەمدیس پیاوانی پاسەوان لـە میونیخ دا ئەوەندە زۆر نین کە بتوانن ئاسایشی کۆبوونەوەکە بپارێزن.

دەمـان زانـی ڕەنگـە دوژمـن ئـەم هەلـە بقۆزێتـەوە زەبرێکـی کوشـندەمان تـێ بسرەوێنێت, بـاش ئاگامـان لـەوە بـوو کەتێکـدانی یـەك کۆبوونـەوەمان مانـای تـەواو داوەشاندنی بزوتنەوەکەمانە.

لە گزەنگی ڕۆژی کۆبوونەوەکەدا ئاسمان هەوراوی بوو, با بەتوندی هەڵی دەکرد, بارانی توند داباری, بۆیە ڕەشبینی لەنێو ئەندامانی پارتدا بڵاوبوویەوە لەبەرئەوەی لەم کۆبوونەوەیەی کە خراوەتە ڕۆژێکی وەها گێژەڵوکەوە خەڵکێکی کەم ئامادەی دەبن. پاش نیوەڕۆ کەش ڕەویەوە ونەختێك خۆش بوو, بۆیەپێشنیاری ئەوەم بۆ هاوڵانم کرد کە ترۆمبێلێکی باری بەکار بێنین بۆ بڵاوکردنەوەی بڵاوکراوەکانمان و تێیدا داوا لەخەڵکی دەکرد بێنە کۆبوونەوەکەمانەوە, ئەمەش لەڕێگەی بیست گەنجی کوڕ و کچەوە ئەنجام دەدرێت. لیژنەکە پێشنیارەکەمی وەرگرت و بۆیەکەمین جار خەڵکی ترۆمبێلی ئاڵاداریان دیت کە مارکسیەکان لێیان نەدەخوڕی, بۆرژواکان وەستابوون و لەدوورەوە لەم دیمەنەیان دەنواڕی, بەڵام مارکسیەکان ڕقێکی زۆریان لەناخدا دروست بوو, چون ئەم کۆبوونەوەیە دژدایەتی ئەوانی سوور خواز دەکات.

کاتژمێر حەوتی ئێواریٚ پەیوەندیم بە یاوەرانمەوە کرد لە یاریگای کرۆن, گوتیان هۆڵی سەرەکی پڕبووە و جمەی دێت و هۆڵەکانی دیکەش خەریکە پڕدەبێت لەخەڵك. ئەوکاتەی لە کاتژمێر ٨ ی ئێوارەدا گەیشتمەوە یاریگاکە دیتم لە یاریگای دەرەوەش ژمارەیەکی زۆری خەڵکی وەستاو و ئامادەن, هەستم دەکرد شوێنەکە بچووکە و ئامادەبوان ناگرێت, بۆیە پیاوانی ئاسایشمان ناچاربوون ڕێگە بە سەدان کەس نەدرێت بێنە ژووریٚ. هاوڵێکم پێی ڕاگەیاندنم کە پەنجەرەی پلیت فرۆشانمان پێنج هەزار و پێنج سەد پلیتی فرۆشتووە, زیادتر لە هەزارکەسی بێکاریش بەبیٚ پلیت هاتونەتە ژووریٚ.ئەمەش مانای وایە ژمارەی ئامادەبوان گەیشتۆتە شەش هەزار و پێنج سەد کەس.

بابەتی قسەکردنم بەناونیشانی ((دەبێت سوبحەی بنافرێنین یام خۆمان وون بکەین؟)). گوتارەکەم دووکاتژمێر و نیوی خایاند, هەر لەساتی یەکەمەوە هەستم کرد پەیوەندییەکی توندوتۆڵ لەنێوان وشەکانی من و گوێی بیسەراندا هەیە, هەندێك دەیان ویست قسەکانم پیٚ بپچڕێنن, بەڵام بیست خولەك پاشتر سیٚ هەزار کەس بە

فیکە دەستیان دایە پچڕاندنی قسەکانم. هەر وشەیەك لەزارمەوە دەردەهات بە جۆش و خرۆش و بڕواوە وەردەگیرا.

سەرکەوتنی ئەم کۆبوونەوەیە بۆماوەی هەفتەیەك تاکە بابەتی گرنگی باس لێکراوی میونیخ بوو. ڕۆژنامە سەربەخۆکان وێنەیەکی ئەم سەرکەوتنەیان خستەڕوو، بەڵام بۆرژوازیەکان بەسەرەپێیی ئاماژەیان بۆ کردبوو. بە ئەنقەست ناوی وتاربێژەکەیان نەنوسی بوو.

لەسەر داواکاری من بۆ قۆستنەوەی ئەم هەلە بڕیاری بەستنی کۆبوونەوەیەکی دیکەمان دا لەهەمان کات و گۆڕەپاندا. ئەمجارە ژمارەی ئامادەبوان حەوت هەزاری تێپەڕاند. پێنج سەد کەسیان لە گۆڕەپانی دەرێ وەستابوون و ئێمەش دەرگاکانمان بەکراوەیی هێشتبۆوە بۆئەوەی گوێیان لەقسەکانمان بێت. هەرجارێك سەرکەوتووبوونایە ئەوەندی تر بەخرۆشەوە کۆبوونەوەی نوێمان ئەنجام دەدایەوە و لەهەرکۆبوونەوەیەکی نوێتریشدا ژمارەی ئامادەبوان هەمیشە لەزیادبووندا بوو.

لەم کاتەدا دوژمنانمان دەستە وەستان نەوەستا بوون. بەڵکو دوو چەشنە پیلانیان لەهەمبەرماندا جێبەجێ دەکرد: پیلانێك بۆ گەوج پیشاندانی بزوتنەوەکە و پیلانێکیش بۆ دژایەتی کردنی. هەرکە بەهێز بووین و چالاکیەکانمان فراوانتربوون، هەنگاوی دووەمیان لەسەرمان تاقی کردەوە. بڕیاری ترساندن و تۆقاندنمانیان دا بەجۆرێك ئیتر نەتوانین کۆبوونەوە ببەستین.

دوژمنانمان پیلانە تیرۆستانەکانیان دەست پێکرد. جارێکیان پەنێکیان داو ویستیان بەسەر ئێمەدا بیشکێننەوە و ئێمەی لێ بکەنە بەرپرسیار. لە بۆنەیەکدا کەسانێکی نەناسراو تەقەیان لە نوێنەری سۆسیالیستی دیمۆکراتی(ئێرهارد ئەویر) کرد. بەڵام فیشکەکە نەی پێکا و تاوانبارانیش هەڵهاتن. لەڕۆژی دواتردا ڕۆژنامە جولەکە و مارکس خوازان هانی دەستەڵات دارانیان دەدا لەبۆ ڕێگرتن لە چالاکی چەقۆکێش و جەردە تیرۆریستەکان کە سەرقاڵی نانەوەی ئاژاوەن لە میونیخ دا،ئەمەش مەبەست لە پارتەکەی ئێمەبوو. ڕۆژنامەکە لەسەر زوبانی پارتی سۆسیالیستی باڤاریەوە دەیگووت: هەموو ڕێوشوێنێکی پێویست و توند دەگرینە بەر بۆ لەبنچك دەرهێنانی درەختەکانی ئاسمان. دەستی کرێکاران بە تەورەکانیان ملی ئەم درەختانە دەبڕنەوە و پشتی لەزەوی دەدەن.

چەند ڕۆژ پاشتر دوژمنەکەمان هەنگاوی خۆی نا, بەڵام درختە نەرمەکان بەزەویدا نەکەوتن.

لە ٢ خەزەڵوەری ١٩٢١ دا بانگەشەی کۆبوونەوەیەکما کرد کەلە ٤ ی پاش نیوەڕۆ لە هۆڵی هۆفبروهوس ئەنجام دەدرێت. نیو کاتژمێر پێش دەست پێکردن بە کۆبوونەوە ئاگادار کراینەوە کە سورەکان سوورن لەسەر تێکدانی ئەم کۆبوونەوەیەمان, بۆئەمەش چەند سەد کرێکارێکیان ئامادەی جەنگین کردووە. کاتی زۆرمان نەبوو, بەڵام توانیومان شەست گەنجی بەباز و قۆڵ بەکار بێنین بۆ پاراستنی ئاسایشی هۆڵەکە, هەرکە گەیشتمە هۆڵەکە بەرپرسی ئاسایشی پارتمان پێی ڕاگەیاندنم هۆڵەکە ئەوەندە ئاژاوە گێڕی تێدایە ئەوەندە لایەنگیری ڕاستەقینەمانی تێدانییە, تەنانەت هەندێك لەژاوەژاو دروستکاران وەکو هێزی یەدەگ لەدەرەوە چاوەنواڕن, لەسەر ئەم بنەمایە پیاوانی پاسەوانم لە هۆڵێکی دیکەدا کۆکردەوە و ڕێنمایی پێویستم پێدان, پێم ڕاگەیاندن کە ئەوان هەرچەندە زۆرن بەڵام لاواز و بێدەست و بردن و لەکاتی جەنگیشدا سەرکەوتن هەبۆخۆمانە, هەستم کرد قسەکانم کاریگەری خۆی کرد, ئەوکاتەی ڕۆشتمە هۆڵەکەوە دیتم پڕە لەخەڵك, ئەوانەی دەیان ناسیم بە هەلهەلە و پیاهەڵدانەوە پێشوازیان لێکردم, گوێشم لە جنێوی زۆر ناخۆش بوو, تەنانەت دەیان گووت: ئەمڕۆ هیسابتان پاقژ دەکەینەوە و تەفر و تواناتان دەکەین, سنورێك بۆفرەوێژیتان دادەنێین و ئەڵمانیا لەدەستی ئێوە ڕزگار دەکەین...هتد.

لەکاتی دیاری کراودا کۆبوونەوەکە دەستی پێکرد, من لەپشتی مێزێکەوە وەستام و دەستم دایە وتار خوێندنەوە, هیچ شتێك نەبوو لە سەربازانی سوورم بپارێزێت, ئەوان ئەوەندەیان خواردبۆوە بەڕووکەشیانەوە توڕەبوونیان پێوە دیاربوو.

یەك کاتژمێر بەتەواوەتی قسەم کرد و کەس نقەی لێوە نەهات, وام هەست دەکرد دەستم گرتووە بەسەر دۆخەکەدا, بەڵام زۆری نەبرد هەڵەیەکی دەروون ناسیم کرد لەڕێگەی توڕەبوونم لەیەکێك لە ئاژاوە گێڕان, ئەوانیش ئەمەیان بەهەل زانی و مێز و کورسیەکانیان هەڵچەرخاند و پەلاماریان داین بەشووشە بەتاڵەکانی خواردنەوەیان, تەڕ و وشك بەیەکەوە دەسوتا, قاو قیژ بەرزبوویەوە بۆ فەلەك. بەڵام من بۆ خۆم جێگەکەی خۆم جێنەهێشت, بەڵکو لە پاڵەوانانی هێزی ئاسایشمانم دەنواڕی کە

چۆن بەرپەرچی دوژمنانمان دەدەنەوە، پەلاماریان دەدەن وەکو ئەوەی گورگ پەلاماری ڕانە مەڕێك بدات، بەڵام لەناکاو گوێم لە زرمەی تەقینەوەی نارنجۆکێك بوو کە دیتم پێنج ئاسایشمان کەوتنە بەزەویدا، ئەمەش هەستی لایەنگرانمانی پتر خرۆشاند، تەنانەت ژن و پیرانیش کەوتنە ویزەی نەیاران و هاتنە هانای ئاسایشە بریندارەکانمانەوە و بەهەموویانەوە توانییان هۆڵی کۆبوونەوەکە لەو ئاژاوە گێڕانە پاقژبکەنەوە، ئەمەش پاش لەوەبوو کە نۆ لە ئاسایشی ئێمە بریندار بوو، بیست و سێ سەربازی سوریش بریندار بوون. لەوکاتەی هاولاتانم سەرقاڵی گواستنەوەی بریندارەکانمان بوون بۆ نەخۆشخانە هیرمان ئایسەری سەرۆکی کۆبوونەوەکە پێی ڕاگەیاندم: کۆبونەوەکە بەردەوامە و تەواو نەبووە، دواتر داوای لێکردم بەردەوام بم لەوتاربێژیەکەم و تەواوکردنی قسەکانم، ئەم کارەم ئەنجام دا و دواتر بۆ چڕینی سرودی نیشتمانی نەتەوەیی چوومە پێشەنگی ڕیزی پێشەوە و دەستم دایە وتنی سرودەکەم.ڕازگرەکەم لێم نێزیك بوویەوە و گووتی ئەفسەرێکی پۆلیس و هێزێکی زۆر گەیشتن. لەوکاتەدا ئەفسەرەکە هاتە ژوورێ و بەدەنگی بەرز هاواری کرد بەفەرمانی دەستەڵات کۆبوونەوەکە تەواو بوو.

# بەشی هەژدە

## هێزدار سەرچاوەی هێزەکەی خۆیەتی

لەبەشی ڕابردوودا تیشکم خستەسەر بوون و دیارکەوتنی گیانی هاریکاری تەواو یام نیوچەیی لەنێوان ڕێکخراوە ڕەگەز پەرەستەکانی میونیخدا، بەجۆرێك هەموو ڕێکخراوەکان پێکڤە کاردەکەن لەبۆ گەیشتن بە ئامانجێکی هاوبەش.

گومانی تێدانییە بوون و دیارکەوتنی هاریکاری لەنێوان بزوتنەوە یان دامەزراوە ئامانج لەیەك نزیکەکان کارێکی خوازراوی بەخێرهاتن کراوە. بەڵام هەرکەسێك بڕوای وابێت لەم ڕێگەیەوە تواناداری بۆ ئەنجامدانی کاری بەهێزتر لۆ دەستەبەر دەبێت ئەوە هەڵەیە؛ چون کاری هاوبەش تەنها بۆ قازانجی یەکێکیان نییە بەڵکو هەموویان کێبڕکێ دەکەن لەبۆ ئەو پەڕی سوود لێ دیتن لەم هەنگاوە، بەداخەوە پارتەکەمان پاش قوربانی دان فێری ئەوە بوو کە، گەر بزوتنەوەیەك بیەوێت بگاتە ئامانجێکی بومارەك ئەوکات دەبێت بیرۆکەکانی پێشەنگی هەنگاوەکانی بێت و شوێنی کەس نەکەوێت، ئەو پارتانەشی لە پەراوێزی بزوتنەوەکەدا بوون چاوەنواڕی هەلێك بوون کەلە شکستی ئێمەوە سەرچاوە بگرێت بۆسەرکەوتنی ئەوان، واتە ئەگەر پارتی سەرەتا و خاوەن ئامانجی دیاری کراو شکستی هێنا ئەوا پارتەکانی دیکە ماف تەواوکردنی ڕێبازەکەیان هەیە، بەڵام گەر هاتوو پارتی یەکەم زاڵبوو بەسەر بۆچوون و

لەپەرەکانی دژبەریدا ئەوکات. ئەوا لەم کاتەدا نابێت ڕێگە بەهیچ بزوتنەوەیەکی دیکە بدرێت بۆ تەقڵ بوونە نێو بەرهەمەکانی کاری ئەم بزوتنەوەیە و خواردنی بەرهەمەکانی.

لە ساڵی ١٩٢٢ دا هاریکاری نێوان بزوتنەوە ڕەگەزپەرەستەکانمان ئەزموانا، پشت بەست بە یەکخستنەوەی پلانەکانمان بۆ گەیشتن بە ئامانجی هاوبەش، کات زۆر تێنەپەری بوو، تاوەکو هەڵەی خۆمانمان زانی! چونکە هاوپەیمانانمان لەسەر هیسابی ئێمە سەرقاڵی خۆ پتەوکردن بوون، بەرئەنجامیش تەنینەوەی کێشە لەنێو ریزەکانمان و وون بوونی بەرپرسیارێتیەکان دەبوو، تەماعی خوودی ڕۆڵێکی نەرێنی بینی لە بەلارێدا بردنی بزوتنەوە یەکگرتوەکان، هەر لەم کاتەدا ئامۆچیاری پارتم کرد لەوەی پێویستە سنورێك بۆئەم بەرەو شکستەمان دابنێین، کەبەدەستی خۆمان واخەریکە خۆمان لەناودەبەین و سەرکەوتنەکانمان بەوانی دیکە دەبەخشینەوە، بەبەڵگەی ئەوەی پارتێکی بەهێز بە یەکگرتنی لەگەڵ پارتێکی لاوازدا خۆیشی بەرەو لاوازی دەبات، سەردارانم هاوەدار کردەوە لەو ئامانجە شاردراوانەی کە سەرکردەی بزوتنەوەکانی دیکە شاردویانەتەوە، پێم گووتن ئەمانە دەستەیەکی رامیاری کاری بەهێزن، بیرۆکەکەی ئێمەیان لا پەسەندە و هەوڵی قۆستنەوەمان دەدەن، ئەمانە لەباتی ئەوەی تەقلی بزوتنەوەی نیشمانی سۆسیالیستیمان بن و کاربکەن بۆ سەرخستنی هەستاوان بەدامەزراندنی پارتی جودا، ئەوکاتەش زانیان وەکو ئێمە سەرکەوتوو نابن بەناچاری هانایان بۆ هێناین، بەلأم لەژێر دروشمی یەکگرتن و تێکۆشان بۆ یەك ئامانج، بەلأم ئەمانە هەمووی فرت و فێڵی پۆخڵە و دەیەوێت ئێمە بەکاربێنێت.

زۆری خایاند تاوەکو توانیم هاولأنم قایل بکەم بەم ڕاوبۆچوونانەم، لەدەسپێکدا پشتیوانم نەبوون، جگە لە چەند هاوڵێك، بەلأم ئەو کاتەی بڕیاری ئەنجامدانی خۆپیشاندانمان دا لەهەمبەر قەرەبوو کردنەوەی بەریتانیا و فەرەنسا هوپەیمانانی ئێمە ڕاڕا بوون، لێرە بەداوە مقۆمقۆی کشانەوە لەو هاوپەیمانێتیە سەری هەڵدا، ئینجا هەموو هاولأنم هەستیان بەوەکرد گەر بزوتنەوە یان لقێنێك خۆی خاوەنی بەرنامە و چەمکی فەلسەفی تایبەت بێت بۆ کار ڕاپەڕاندن ئەوکات چ پێویستی بە هاوپەیمانێتیە، لەم کاتە بەدواوە دەبێت جولأنەوەکەمان خۆی پشت بەخۆی ببەستێت

و لەنێو دڵی نەیارانیشیدا جێگەی خۆی بکاتەوە و تاوەکو گەیشتن بە دوندەی سەرکەوتن نابێت بوەستێت بەتێکۆشان.

***

بەر لە ساڵی ١٩١٨ دەوڵەتداری لەئەڵمانیادا پشتی بە سێ بنەما بەستبوو, ڕژێمی پاشایەتی و سوپا و فەرمانبەرانی کارگێڕی , پاش شۆڕشی ١٩١٨ کۆڵەکەی پاشایەتی نەما و سوپا بەرەڵاکرا و فەرمان بەرانیش دووچاری گەندەڵکاری بوون, بەمەش ئەوەی پێی دەگوترا بنەما و کۆڵەکەی دەوڵەت بۆ سەپاندنی دەستەڵاتی بوونێکی نەما و هەموو تونا بوو.

بنچینەی هێزی دەستەڵات بەزۆری پشت بەستراوە بەجاوەر,بەڵام ئەم دەستەڵاتە زۆر لاواز دەبێت ئەوکاتەی پشت بەیەك جۆر جەماوەر دەبەستێت؛ چونکە هەر حکومەتێك کاتێك جەماوەر تەنها پشتیوانی بێت ئەوکات ئاسایش و ئارامی زۆرجار دەستەبەر نابێت. بۆیە کۆڵەکەی دووەمی دەستەڵات لێرەدا هێزە, لەکاتێکدا چانسی بۆ هێنانەدی ئارامی باشتر نییە لە چانسی پشتیوانی گەلز بەڵام گەر ئەم دوانە پێکەوە دەستەبەرکران: جەماوەر و هێز, ئەوا بەتێپەڕبوونی کات ئەوەی پێی ئێژن نەریت ئەوە دێنێتە بوونەوە, لەم سێ پایەشەوە دەتوانین دەستەڵاتێکی زۆر بەهێز و کۆڵەکەدار دابمەزرێنین.

هەڵایسانی شۆڕش بووەهۆی ئەوەی کە دەستەبەربوونی ئەم سێ کۆڵەکەیە نەکردەنی و نادەستەبەربێت, شۆڕش هەموو تواناکانی نەریتی تەفرکرد لەڕێگەی لەناوبردنی دەستەڵاتی پاشایەتیەوە؛چونکە لەسایەی شۆڕشەوە هێمنی و ئۆقرەیی بۆ هەموان دەستەبەر نییە, سەرجەم ئاماژەکانی ئاکار جوانی کارمەندانی خستە نێو تەنەکەی زبڵەوە بەتایبەت ئەوکاتەی ڕامیارکاران دەست کراوە بوون لە دامەزراندن بە دڵی خۆیان و دانانی لایەنگران و مامۆستاکارانیان لەو پۆست وجێگایانەی خۆیان دەیان ویست, بەدڵی خۆیان کارمەندیان دادەنا و دەگواستەوە یان دوور دەخستەوە, هەموو کێشەکانی وڵات بوون بەوەی چۆن پارتێك زۆرترین لایەنگر بۆ خۆی پەیدا بکات جا ئەو ڕێگایانەی دەگرتە بەر بۆئەم کارە هیچ گرنگ نەبوو چۆن و چی دەبوو, ئەوکاتەی شۆڕش هەستا بە واڵاکردنی دەستی سوپا و لێنەپرسینەوەی ئەوکات بنەمای هێزی دەوڵەتی لەدەستدا, بەم کارەس کۆڵەکەی دووەمی دەستەڵات بوونی

ئەما، بەڕاستی بەناو شۆڕ گێڕان بەم کارەیان گەلی ئەڵمانیایان کرد بە پەندی بۆ گەلانی دیکە بۆئەوەی هەرگیز شکست نەخۆن، ئەگینا وەکو ئەڵمانیا یان لێدێت.

هەموو گەلێك لەسێ گروپە خەڵك پێکدێت: گروپی بژاردەی خاوەن هەستی نیشتمان پەروەری و توندڕەو، ئەمانە بەدڵسۆزترین چینی هاوڵاتیانی وڵاتن، گروپێکی دیکەی تر پێکدێن لە دەستەی خوێڕی و مامەحەمێ کار و ترسنۆك و تاوانکاران...لەنێوان دەستەی باڵای کۆمەڵگە و سوکترینندا چینێکی مام ناوەندی هەیە کە لە سووکەکان بەنرخترە و لە باڵاکانیش خوارترە، ، ئەوکاتەی دەستەیەکی گەل بەرەو سەرکەوتن هەنگاو دەهاوژوێن ئەوا بزانە پشتیوانی دەستەی یەکەمی کۆمەڵگەی لەپشتەوە، خۆئەگەر گەل گەشەیەکی ناوەندی کرد لەدۆخێکی سروشتیدا ئەوا بزانە کاریگەری چینی دووەمی ناوەنجی باڵایە کە ئارەزووی میانگیری هەیە، بەڵام هەرکاتێك نرخی مرۆڤەکان داڕمان و پرۆزیەکان قێزەوەنکران ئەوا بزانە چینە سوکەکەی کۆمەڵگە بوونەتە خاوەن دەستەڵات و واخەریکە گەل بەفەتارەتی توانەوەدا دەدەن.

وەك ئاشکرا چینی ناوندی زۆر بەکەمی دەتوانێت ببێتە خاوەنی دەستەڵات مەگەر بەهۆی کێبڕکێی زۆری نێوان دووچینی باڵا و سوکدا نەبێت کە هیچ کامێکیان ڕێگە بەوی تر نەدەن بچێتە سەر دەستەڵات، بەڵام پاش لە سەرکەوتنی بەریەك لەم دوو دژە ئەوکات زۆرینەی چینی ناوەند گوێڕایەڵەی بەرەی سەرکەوتوو دەبێت، هیچ ڕاڕا نابێت لەپشتیوانی کردنی بەرەی سەرکەوتووی باڵا، بەڵام هەرکاتێك زۆرینە بۆی دیارکەوت چینی سوکی پارە و بەرژەوەندی خۆ خواز سەرکەوتووە ئەوکات نەڕاستەوخۆ پشتگیری لێدەکەن ئەش دژبەری دەوەستنەوە، چونکە ئەم دەستە زۆرینەیەی کۆمەڵ خاوەنی گیانێکی تێکۆشانی نییە.

جەنگ بووەهۆی داڕمانی هاوسەنگی نێوان ئەم سێ چینەی کۆمەڵ، بژاردەکان تا دوا دڵۆپی خوێنیان دەجەنگان و هەزاران پڕلەی چینی ناوەندی کۆمەڵیش تیاچوون لەوکاتەی چینی سوکەکان لەپشتەوە چەقۆی ژەهراوی شۆڕشیان دژ بە ئەڵمانیا تیژدەکرد. بەپرسانی وڵات لەمێڵەکانی ئاگرەوە بانگەشە دوای بانگەشە داوای خۆبەخشیان دەکرد، کێ دەتوانێت خۆبەخشانە پۆستە بگەیەنێت؟ ئەی کێ توانای بوون بەسەر بازی دەریایی یان ئاسمانی و وشکانی هەیە؟ کێ گەرەکیەتی فەرمانەکان

لەنێوان هێڵەکاندا بگوازێتەوە, کێ توانای ڕازدۆزی کردنی هەیە....ئەم داواکارییە بۆماوەی چوار ساڵ بەردەوام بوو, بەزۆری لاوانی خوا حەقدەساڵ و پیرانی سەرووی پەنجا بەهانای ئەم بانگەوازانەوە دەچوون, کە هەموویان نیشتمان یەك ئامانج کۆی کردبوونەوە کەئەویش نیشتمان پەروەرییەکی ڕاست گۆیانە بوو. فیشەك و ئاگری دووژمن هەزاران گەنج و خۆبەخشی تیابرد, لەهەمان کاتدا لەدەشتەکانی فلاندەر بە خوێنی هەزاران گەنجی تازە پێگەیشتوو ئاوی خاکەکەی دەدرا کەبەبێ مەشقێکی تەواو ئاراستەی ناوچەکە کرابوون و ببونە نێچیری فیشەکانی دووژمن, کەچی لەپشتەوە دوژمنانی نیشتمان سەرقاڵی دەگەدان و دارمانی ئەڵمانیا بوون, ئەمان کارێکیان کرد دوژمن لەبەرەی جەنگدا پێی نەکردین.

هەموو ئەوانەی لە جەنگەکانی ١٩١٤ موە کەوتن لە وەچەی چینی ناوەندی وبالأبوون, واتە بەدەر بوون لە لەخۆگرتنی سوکەکانی ولأت. بەم جۆرەش جەنگ هەر لەدەسپێکیەوە بە قازانجی کەسانی خوێڕی ولأت شکایەوە, چونکە پەیڕەوی سەربازگرتن و لاوازی دەستەلأتی دەسەلأتداران لەنێوخۆی ولأتدا بواری تەواوی بۆئەم مشەخۆرانە ڕەخساندبوو بۆ بەرپاکردنی شۆڕش لەبەرژەوەندی خۆیان. لەگەڵ یەکەمین دۆڕانی جەنگیماندا دوژمنانی ولأت لەناوخۆدا تۆوی شۆڕشیان چاند, کاتی هەلأیسانی شۆڕشیش چینی بالأ ئەوەندە ماندوو ببوو نەی دەتوانی خۆی لەپێش چینی فێڵبازان و بێ ئابڕواندا بگرێت.

هەریەکێك بێژێت شۆڕشی ١٩١٨ ی ئەڵمانیا شۆڕشێکی گشتگیری جەماوەری بوو ئەوا هەڵەی کردووەو ناڕاستی وتووە, چونکە کۆمەڵی ئەڵمانی خۆی نەبوو کە شۆڕشی هەلأیساند و خۆی دابەزاندنە چینی خوارەوە, ئەوانەی وایان کرد دوشمنی نەتەوەو گەلی ئەڵمانین, شۆڕش هەڵگیرسێنەران پێك هاتبوون لە سەربازە هەڵهاتوەکان و ناپاکانی دوژمن خواز و هەڵخەڵەتێنەرانی دەم لووس, لەکاتێکدا ئەم کەسانە خۆیان فاکتەر و هۆکاری شکستی جەنگ بوون کەچی بۆ پاقژکردنەوەی خۆیان کەسانی دیکەیان تۆمەتبارکرد, لەڕێگەی هەڵگیرساندنی شۆڕشەوە.

زۆرینەی سەربازان خۆشحاڵ بوون بە تەواوبوونی ئەو جەنگە خوێناویەی دووچاری هاتبوون, حەزیان لەگەڕانەوەبوو بۆ ژێنەی باوانی, بەلأم هەرگیز متمانەیان بەشۆڕش و ئامانجەکانی نەبوو؟ چونکە ڕێکخارانی شۆڕش و دنەدەرانی گومانیان

هەبوو لەسەربازە ڕاستەقینەکان ، هەروەها سەربازانیش ئەو گاڵتە جاڕیانەیان لەبیرنەکردبوو کە پارتە ڕامیاریەکانی وڵات ئەنجامیان دابوو لەکاتی جەنگدا, ئەو کەسانەشی خۆشحاڵی تەواوبوون بە هەڵایسانی شۆڕش پێشوازیان لە دروشمە زلەکانی شۆڕش کرد نەوەك خوودی شۆڕش, شۆڕش بەتەنها پشتی بەکەمینەیەکی کەم بەستبوو, ئەمەش زیانی زۆری بە مارکسیەکان گەیاند, بەجۆرێك چەند مانگێك پاش شۆڕش مارکسیەکان ناچاربوون بەدووی کۆڵەکەیەکی بەهێزدا بکەڕێن بۆ خۆ پتەوکردن, بەرلەوەی تاخمە باڵاکانی وڵات خۆیان یەکبخەنەوە و وڵات لەدەست ئەم ئاژاوە چییانە ڕزگاربکەن.

پەیڕەوی کۆماری لەدەسپێکی ۱۹۱۹ دا گەلێك لە بەدیهێنانی ئۆقرەیی بەدوور بوو, پاڵەوانانی شۆڕش باش ئەیان زانی کە لەگەڵ دەسپێکی هەڵکردنی ئێکەمین گێژەڵۆکەی یەقیکردنەوەدا پێگەی جەماوەرییان دادەرمێت و تیادەچن, بۆیە بەناچاری بەدوای کەسانی چەقۆکێشەوە بوون کەلەڕێگەی بەکارهێنانی هێزەوە بتوانێت ئەم کۆمارەی ئەوان دایان مەزراندووە بیپارێزن لە تیاچوون.

بێگومان پاش لەوەی کۆمار هەستا بە بەرەڵاکردنی سوپا, هەستی کرد زیادتر لەجاران پێویستی بەهێزی سەربازییە بۆ خۆپاراستن لەدوژمنانی, لەم کاتەدا تەنها ئەوەی هەیبوو لایەنگیرە هەڵخەڵەتێنراوە جەماوەریەکەی بوو, بەڵێ ئەم کۆمارە بەو کەسانە سپێردرا کە هیچ مانای دەوڵەتدارییان نەدەزانی و تەنانەت بەباشی بەشداری ئەو شۆڕشەشیان نەکرد کە دواتر دەستیان بەسەردا گرت, ئەمانە نەیان دەتوانی تاکە کەسێك ئاراستەی بەرگری کردن لەشۆڕش بکەن ، نەیان دەزانی دەوڵەت چۆن ڕێك دەخرێت, تەنها ئەیانویست سیستمی پاشایەتی وڵات لەناوبەرن و هەموو شتێك وێران بکەن, بەڵێ ئەمانە کەس گەلێکی بێ ناوەزی شەڕانگێزبوون, دروشمیشیان پاش لە هەڵایسانی شۆڕش ببووە تاڵانکردنی ئەو خوودی ئەو کۆمارەی کە لەسەر پاشماوەکانی دەوڵەتی پاشایەتی دامەزراوەو خۆیان بە خاوەنی دەزانن!

ئەو هات و هاوارەی کە لە نوێنەرانی ڕاستەقینەی گەلەوە دەردەپەڕی هیچ کاریگەرییەکی ئەوتۆی لەسەر ئەو دەستە بێ ئابڕووە نەدەبوو, چۆن دەگونجێت ئەوانەی خۆیان خودی کۆمارەکەیان لەگەندەڵی و بێڕەوشتیدا نوقم کردووە هەوڵی دەربازکردنی بدەن لەو کێشانەی دووچاری دەبێتەوە؟ نوێنەرانی ڕاستەقینەی گەل

دەنگ و نالەیان بەرزبوویەوە, چون باش دەیان زانی زەوینی ژێر پێیان واخەریکە لەدەست دەدەن و دەبێتە هیچ, دەیانزانی گەلی ئەڵمانی دەستی داوەتە نارەزایەتی دەربڕین, چەندین کەس هەن بە ئاشکرا داوای ئەنجامدانی کۆدەتا دەکەن بەسەر ئەم سیستمەی حوکمڕانیەدا لەبۆ سنوورداانان بۆ ئەم گەندەڵی و دزی و ستەمەی کەلەلایەن خەڵکانی دەستەلأتدارەوە ئاراستەی خەڵکی ئاسایی دەکرێت و ئەوانیش بەکارە پۆخڵەکانیان تێوە دەگلێنن.

بەلأم ئەوانەی بەدەم ئەم بانگەشەیەوە هاتن لە زستانی ١٩١٩ دا جلکی سەربازییان لە دۆلأبەکانیان دەرهێنایەوە بۆ هەڵگرتنەوەی چەك و لەسەر کردنی کلأو ئاسنی جەنگ لەبۆ تەواوکردنی ئەو ئامانجەی چەکیان بۆی هەڵگرتبوو, پاڵنەریشیان بۆئەم کارە نیشتمانی پەروەری خۆیان بوو نەوەك پاراستنی کۆمارە بۆگەنەکە. ئاسایش و ئۆقرەیی ولأت پێتقی بە کەس گەلێکی بەهێز بوو لەبۆ پاراستنی لە دوژمنانەی ناوخۆ پێش لە دوژمنانی دەرەکی, ئەم جەنگاوەرانە بەخۆبەخشی یەکیان گرتەوەو یەکە و تیمیان پێکهێنا و دەستیان دایەوە پاراستنی نیشتمانەکەیان,ئەمانە هاولأتیانیان دەپاراست و ڕقیشیان لەخوودی ئەو کۆمارە دەبوویەوە کە سوکەکان دروستیان کردبوو.

جووخوازی جهانی کە ڕێکخاری فەرمی شۆڕشەکە بوو هەستی بەم ڕاستینەیە کرد کە گەلی ئەڵمانی وەکو ڕووسیەکان دانەبەزێنە نێو زەلکاوی بەلشەفیکیەوە لەبۆ خۆخنکاندن و لەناوبردنی خوود, ئەوەی وای لە جووخوازانی نوێنەری بەلشەفیکی ڕووسی کرد سەرکەوتوو نەبن لەکارەکانیاندا یەککرتنی هەموو ئەڵمانیەکان بوو لەژێر دروشمی یەك ڕەگەزیدا, ئەم ڕەگەزە بیرمەندانی ڕاستەوخۆ بەکرێکارانەوە دەبەستەوە, ئەمەش دیاردەیەکی باوە لەولأتانی ئەوروپای ڕۆژئاوادا بەلأم لەڕووسیادا بوونێکی نییە, بەجۆرێك نوسەران لە بورجێکی عاجیندا دەژین , چونکە ئەوان نامۆن بە گەلی ڕووسی, هەست بە کێشەکانی چینی ڕەنجدەران ناکەن و نەشیان چێشتووە. لەڕووسیادا هیچ چینێك یان ناوەندێك بوونی نەبوو لەبۆ پێکەوە گرێدانی نوسەران و ڕەنجبەران, لەکاتێکدا ئاستی زانست و زانین بەر لەجەنگ زۆر نزم بووە, هەربۆیە دنەدەران زۆر ماندوو نەبوون لەهەڵخەڵەتاندنی خەڵك و ئاراستەکردنیان بەو شێوەیەی خۆیان دەیانەوێت, لەبۆ دامەزراندنی ئیمپراتۆریەتی مارمێلکە یان هەژاران.

بەڵام ئەوەی لە ئەڵمانیادا ڕوویدا ئەوەبوو کە: گەر سوپای ئەڵمانی لەبەریەك هەڵنەوەشایەتەوە ئەوە هیچ کات شۆڕش سەرکەوتوو نەدەبوو, بەڵام ئەمەش مانای وانییە کە ئەو سەربازەی لەمێڵی ئاگری جەنگدا بووە هۆکاربێت لەبۆ هەڵوەشاندنەوەی سوپا و سەرگرتنی شۆڕش. ئەوانەی شۆڕشیان هەڵایساند و گیانی پوکانەوە خوازییان لەناخی سوپادا چاند ئەوانە بوون کە هەرگیز نەچووبوونە ڕیزی سووپاوە, بەڵکو ئەمانە وەکو بەرپرسی کارگێڕی بەباشی خۆیان چەسپاندبوو و پێگەکانیشیان بەزۆری کاروباری ئابووری و دارایی بووە لەبۆ ئەوەی هەموو کات دەوڵەت پێویستی پێیان بێت و نەیان نێرێتە جەنگەوە. بەیەککگرتنی ئەمانە و ئەو هەزاران هەڵهاتووانەی بەرەکانی جەنگ کەلەسایەی یاساکانی چاوپۆشینەوە پارێزراوبوون هەڵایسانی جەنگی ناوخۆ ئاسانتربوو.

مردن ترسنۆك دەترسێنێت, ئەم مردنە لە گۆڕەپانەکانی جەنگدا ڕۆژانە بەچەندین شێوە خۆی پیشان دەدات. لەبۆ ڕێگرتن لە سەربازە ترسنۆکەکان لەوەی هەڵنەیەن لەشوێنەکەی خۆیان تەنها یەك ڕێگە هەیە: پێویستە هەڵهاتووان تێبگەیەندرێت کە ڕاکردنی هیچ دادی نادات و ناچارە سەربازی تەواوبکات و ئەوەی لێی دەترسێت ناچارە ڕووبەڕووی بووەستێت. لەبەرەی جەنگدا ڕەنگە پیاوی بەتوانا بکوژرێت, بەڵام هەڵهاتوو کوشتنی گوماناوی نییە.

کارێکی باشە وا هەست بکەین کە تواناداریین لەبۆ شەڕ هەڵایسان و بەرگری کردن لەم قەوارەیەی هەمانە تا کۆتا هەناسە, بەپشت بەستن بەو پاکدامێنی و خۆشەویستی و بڕوایەی کە هاوڵاتیان بە ئەم بابەتەی حکومەتەکەیانەوە هەیانە.

لەبیرمان نەچێت ئەرك ئەنجامدان کارێکی ئەوەندە شکۆمەندانەیە کە هیچ هاوڵاتیەکی ڕاستەقینە خۆی لێی نادزێتەوە, هاوڵاتی نمونەیی ئەوەیە کەپاش لەوەی فەرمانێکی بۆ دێت ڕاستەوخۆ جێبەجێی دەکات, ئەمە دۆخی هاوڵاتی ئاسایی نییە, هەربۆیە بوونی هاندەری وروژێنەر لەڕێگەی ترسەوە لەم کاتەدا زۆر پێویستە.

بۆنمونە ئەو یاسایانەی کە ژێبەر ڕیشەکێشکردنی دزی و جەردەیی و سزادانەوەی دزان پەیڕەو دەکرێت, ئەوا:

ئەم یاسایە لەبۆ ترساننی چینی باڵای هاوڵاتیان نییە بەڵکو بۆ لاوازە بێ خوازویستەکانە,ئەوانەی بێ توانان لەهەمبەر دژایەتی کردنی ئارەزو و حەز و

تاقیکردنەوەکانیاندا، ئەگەر یاسای سزادان نەبوایە لەبەرامبەر ئەم چینە سوکەدا ئەوکات پیاوانی بەئابروو و بالاّ بە گەمۆژ تەماشادەکران، لەو کاتەدا بڕوای باو ئەوەبووە کە پیاو باشتر وایە دزی بکات وەك لەوەی دەست بەتاڵ و بێ نان و دەرەتان بێت.

کورتبینی لە ئەندێشەبوونی بەرپرسانی ولأتدا بوو لەوەی چاوپۆشیان کردبوو لەو خۆئامادە کردنانەی کە هەموان دەیان زانی پێویستە، لەجەنگدا هەموو شتێك وا دیاردەکەوت کە ئەم جەنگە بەخێرایی کۆتایی پێنایات و درێژخایەن دەبێت.من گومانم لەوەدا نییە کە جێبەجێ کردنی سزای کوشتن لەو کاتەی شەڕوانان هەموویان پاڵەوانانن و بۆ تەواوکردنی ئەو کاتەی ماویانە لە ئامێزی نیشتماندا بەسەری بەرن پێویست نییە، بەلأم ئەوکاتانەی کە شەڕوانان تێکەلأوییەك دەبێت لەنێوان پاڵەوانە خۆبەخشەکان و هاولأتیانی ئاساییدا کە بڕیاری هەڵگرتنی چەکیان داوە، لەڕیزی ئەمانەدا کۆمەڵێك لە خوێڕی و بیرتەسك و خۆپەسەند و بیرنەرێنی دەبینین کە دەیانەوێت تەنها نەمرن و چی ڕوودەدات هیچ بەلایانەوە گرنگ نییە، لەم کاتەدا دەستگرتن بەسەر ماڵ و دارایی کەسی ترسنۆکدا هیچ قازانجێکی ئەوتۆی نابێت بەڵکو سزای مردن تاکە پاداشتی کەسی ترسنۆکە و دەبێت چەند دانەیەك لەسێدارە بدرێت بۆئەوەی ئەوانی دیکەش نەوێرن هەڵبێن.

ئەوکاتەی سزای مەرگ جێبەجێ نەکرا ژمارەیەکی زۆری سەربازانمان هەڵهاتن بۆ بەرەکانی دواوە، بۆیە دوژمنانمان زانیان چۆن دەتوانن دەست بگرن بەسەر ئەم ترسنۆکانەدا و بەهەوەسی خۆیان هەڵی بسوڕێنن، بەهۆیانەوە ئاگری شۆڕشی ۱۹۱۸ یان داگیرساند ، بەلأم ئەوانەی بە دڵ و گیانەوە دەجەنگێن ئەوانە نامۆبوون بە شۆڕش، بەئامانج و هاندەر و فاکتەرەکانی، ئەمەش وای لەمارکس خوازان کرد گومان لە هەڵوێستی سوپا بکەن لەهەمبەریاندا.

ئەوکاتەی ئاشتی کرا و هەموان هاتنەوە بۆ نیشتمانی خۆیان، شۆڕش هەلأیسێنان خەمیان بوو لەوەی بۆچوونی دواتر ئەم سەرباز و جەنگاوەرانە چی دەبێت کە بۆماوەیەکی زۆر جەنگاون و ئێستا هەموو دەستکەوتەکانیان بەبادراوە، ئایا ئەمانە دەیانەوێت تەڤلی ئەم هاریکاری و پەیمان نامە نوێیە بن یان نا؟ لەسێ هەفتەی سەرەتای گەڕانەوەی سوپا بۆ نیشتمان شۆڕش وانان زۆر بەژیرانە توانیبویان

دۆخەکە بەشێوەیەکی جوان پیشان بدەن لەبۆ ئەوەی سوپا نەتۆرێت و ئەم کۆمارە لەناوبەرێت, چون تەنها ئەگەر یەك گەورەدەستەی سوپا دەستی دایە جولانەوە لەدژی شۆڕش ئەوا بەچەند ڕۆژێك هەموو سوپا شوێنی دەکەون, بۆیە لەم کاتەدا دروشمی باوی جولەکە و مارکس خوازانی شۆڕش هەلایسێن ببووە: هێمنی و ڕێکخستن.

لێرەوەش ستایش و پیاهەڵدان بە سەرکردە و کارمەندانی پێشووی ولاتدا لەلایەن دەستەلاتەوە دەستی پێکرد بۆئەوەی وا هەست بکەن ئەمانیش بەشداردەبن لە بەڕێوەبردنی ولات و هەستانەوەی ئەلمانیا لەم شکستەی. بەڕاستی جوولەکە و هاوپەیمانانیان تەنها بۆماوەیەکی کاتی پێویستیان بەیارمەتی ئەم کەسانە هەبوو, ئایا بەڕاست ئەوە سووپا و کارمەندان نین کە دەستەلاتی دەوڵەت پێکدەهێنن؟ شۆڕش داوای یارمەتی لێکردن ئەوانیش بەدەنگیەوە چوون, هەرگیز بڕوایان وانەبوو ڕۆژێك دێت ئەم خزمەتکردنەیان بۆ دژایەتی کردنی ڕاستەقینەی کۆمارەکەیە؛ بەوەی تەنها بۆ چینێکی دیاری کراو کاربکات و زۆرینە بکاتە کۆیلەی خۆی.

بەڕاستی ئەم حۆلکردنە جولەکەیە لەبۆ سەرخستنی پیلانەکانیان زۆر بەژیرانە سەرکەوتوو بوو, وادیارکەوت کە شۆڕش لەدروستکراوەکانی چەقۆکێش و دزان و جەردەکان نەبوو, پێشکەوتنی شۆڕش ئومێدی ئەمانەی تاڕادەیەك پوکانەوە, ئەمانە پاش تەقل بوون هەستان بە بەلاڕێدابردنی ئامانجی شۆڕشیش, ئەمانە هەمووی بۆچوونی ڕامیاریانەی جولەکەی لەپشت بوو. لەم کاتەوە نۆرەی توندڕەوەکان هاتن و ویستیان دەستەلاتی تەواوبگرنە دەست بە پۆشینی جلکی قەشە و گرتنە دەستی لایەنەکانی دانایی و یەکسان خوازی, بەم کارەیان ویستیان لەهەمبەر ئەم ئاراستە نوێیەدا بوەستنەوە و تەفری بکەن, بەلام جووەکان توانیان هێزی گەورەترین پارتی مارکس خوازی ئەوکات (سۆسیالیستی دیموکراتی) لەبەرژەوەندی خۆیاندا پەرت بکەن لەڕێگەی دروستکردنی ئاژاوە و دووبەرەکی نانەوە, هەندێك بوونە لایەنگیری ئەم ئاراستە نوێیە و هەندێکیش دژبەر, ئەمەش بووەهۆی دروست بوونی دوو سەربازگەی دژبەیەك, سەربازگەیەك دروشمەکەی ڕووخانی ئەم سیستمە نوێیەبوو, سەربازگەیەکی تر داوای توندو و تیژی دەکرد لەبۆ چەسپاندنی ئاراستە نوێیەکە, پێویست بوو لەسەر بۆرژوازیەت خۆی یەکلایی بکاتەوە و ببێتە لایەنگیری یەکێك لەم

بەرانە، پاش لەوەی خۆی نزمکردەوە بۆئاستی خوارتر لەمانە پارتەکانیشیان بوون بەبەرەیەکی ناوەندگیر.

کەواتە بۆچوون و هەڵوێستەکان لە زستانی ١٩١٩ دا بەم شێوەیە بوو:

شۆڕش بەرئەنجامی کەمینەیەکی درندەبووە، لەسایەی ئەم کەمینەیەوە مارکسیەکان بوون بەخاوەن دەستەڵات، بەڵام ئەو پارتانەی بوونە خاوەن دەستەڵات بڕیاری پەیڕەوکردنی میانڕەویان دابوو، بۆیە ئەمەش بووە هۆی وروژاندنی توندڕەوەکان و لە سەر زەوی وڵاتدا پەلاماری چەندین باڵەخانەیان دا و لەبۆ بەرژەوەندی خۆیان دەستیان بەسەردا گرت، بەمەش دەستەڵاتدارانی کۆن و نوێ ناچاری یەکگرتن بوون لەبۆ لەناوبردنی ئەم توندڕەوانە کە تیرۆر دەکەنە ڕێگە بۆ بەدەست هێنانی ئامانجەکانیان، دیتمان دواتر دوژمنانی خوودی ئەم کۆمارەش لەبۆ دژدایەتی کردنی ئەم کۆمارە خۆیان یەکدەخەن و دەستی یارمەتی بۆ دژبەرانی دیش درێژدەکەن، چون واخەریکە لەم کاتەدا وڵات نوقمی کێشەی مەترسیدارتر دەبێتەوە کە خۆی لە ئاژاوەگێڕی و گەندەڵیدا دەبینێتەوە.

لەدەکەس نۆ کەس لەلایەنگرانی دەوڵەتی کۆن و نوێ لایەنگیری ئەم هاوپەیمانێتیە بوون، واتا زۆرینە ملکەچی کەمینە بوون و مەرجەکانی خۆیانیان بەسەر زۆرینەدا سەپاند.

لەوکاتەی هەردوو گرووپی توندڕەو لە لادێ و دەڤەر و بازێڕەکانی وڵاتدا سەرقاڵی کوشت و بڕی یەکتربوون، زۆرینەی میانڕەو سەرقاڵی دەستەڵات گرتنە دەست بوو. لەم کاتەدا مارکسی و بۆرژواکان تارادەیەک لەیەک نزیک بوونەوە لەبۆ پێکهێنانی حکومەتێک پێکەوە، بەڵام بەر لە هەڵبژاردن بۆرژواکان لەبۆ بەدەست هێنانی دەنگی پارێزکاران سۆزیان بۆ حکومەتی پاشایەتی پێشووتر دەربڕی.

***

وەک زووتر وتمان شۆڕش هەڵایسێنان کە هەستان بە تەفرکردنەوەی سوپای ئەڵمانی ناچاری بەکارهێنانی هێزێک بوون بۆ خۆپاراستن لەدوژمنانیان. لەبەر ئەوەی لەنێو خۆیاندا پیاوی ڕاستەقینە بوونی نەبوو بۆیە بەناچاری پەنایان گرتە بەسەربازکردنی ئەو کەسانەش کە دژایەتی شۆڕشیان دەکرد. چونکە غیرەت و هیمەت لای ئەماندا لەترۆپکدا بوو

گەر یەکێك بپرسێت : ئەوکاتەی شۆڕش هەل سەرکەوتنی نەبوو ئەی چۆن سەرکەوتو بوو؟ ئەوا ئێمەش دەڵێین:

١-ئێمەی ئەڵمانی لەو کاتەدا بۆچوونمان لەبەرامبەر ئەرك و ملکەچیدا پووچ بوو.

٢-لاوازی و کەم توانایی پارتەکانی ئۆپۆزسیۆنی شۆڕش یان پارتە پارێزگارەکان.

ئەم خەمساردی و نەزانینەمان دەگەڕێتەوە بۆ هەڵەیی پەیڕەوکردنی چەمکی پەیروەردە لەبۆ خزمەتکردنی نەتەوە و دەوڵەت, ئەم خەوشەش هۆکارەکەی کەمتەرخەمی دەستەلآت و خوودی کۆمەڵیش بوو, نەیان دەزانی ئامراز و ئامانج جیابکەنەوە, نابێت ئەوەمان لەیاد بچێتەوە کە تەنها بەگوێڕاڵی کردن لەبۆ جێبەجێ کردنی فەرمانەکان دەستەلآت دروست نابێت, چونمە ئارازی دیکەش هەن لەبۆ گەیشتن بە ئامانجە ڕاستەقینەکان, خۆئەگەر ئەمەمان بەسەردا تێپەڕ نەبوایە ئەوکات هەستمان بەم هەڵەیە نەدەکردکە زیانێکی زۆری بەنەتەوەکەمان گەیاند, لەم کاتەدا کە گەلەکەمان گیرۆدەی دەستی کۆمەڵێك لە جەلاد و خوێن مژی خوێڕی و سووك ببون گەر فەرمانەکان جێبەجێ نەکرانایە ئەوا دووچاری ئەم بێ ئابڕوویەی ئێستا نەدەبووینەوە.بەلآم فێڵی بۆرژوازیەت لەهەمبەر دەوڵەتداری چۆنە؟ کوێرانە گوێڕایەڵی کردنی فەرمانەکان بەنرخترین تێڕوانینە بەلای بۆرژواکانەوە لەژیانی گەلدا, بەلآم ئێمەی نیشتمان پەروەری سۆسیالیستی ئەوا ئێمە گوێڕایەڵبوونی خۆمان بۆ کۆمەڵ زۆر بەلاوە پەسەندترە وەك لەسەرکردەی لاواز, هەروەها دەبینین کە بەرپرسیارێتی تایبەتی لەهەمبەر نەتەوەدا لەدۆخە ناوازەکاندا دەبێتە جوانترین ئەرك.

باباس لە دیاردەیەکی دیکەش بکەین: نەرێتی پارتە پارێزگارەکان:

لەناوچوونی گەنجانی ڕاست ڕەوخواز لەجەنگدا بووە هۆی کەمبوونەوەی تواناداری پارتە ڕاست ڕەوەکان لەبۆ پاراستنی ئەو دەستەلآتەی کەخۆی بەخاوەنی دەزانی, ئەودەمەی بۆرژواکان چەکی داراییان لەدەستدا هەنگاویان بەرەو بەکارهێنانی هێزی هەزری نا, بۆئەوەی لەم ڕێگەیەوە بتوانن بەردەوام بن لەتێکۆشان و گەیاندنی پەیامەکانیان. بۆرژواکان لەکاتێکدا چەکی هەزری هەڵبژارد کە باش دەیزانی دوژمنەکانی چەکی ڕاستەقینە و بازوو بەکاردێنێت بۆ بەرپەرچدانەوە. لە دوو هەفتەی سەرەتای خەزەڵوەری ١٩١٨ دا پارتە مارکس خوازەکان توانیان بیسەلمێنن کەلە دوژمنەکانیان بەهێزتر و دووربین ترن, لەسایەی مقۆمقۆ و ئاژاوە و فیت و هوڕی

سورەکاندا زمان لووسی پەرلەمانتارە بۆرژواکان شاردرایەوە. دوای شۆرش بۆرژواکان بەناوی نوێوە هاتنە مەیدانی خەبات و تێکۆشانەوە و لەکونە تاریکەکانیان هاتنە دەرەوە,بەلأم بەهەمان چەکی کۆنەوە دەستیان دایەوە تێکۆشان, تاکە چەکی دەستی ئەمانە زمان و تاکە ئارمانجیشیان کورسی دەستەلأت بوو.

بۆرژواکان دووچاری شکستێکی مەترسیداربوون لەژێر سایەی قوچەکی پەرلەمان و لە شەقامیشدا, تەنانەت پاش لەجەنگ و شۆرشیش. ئەوکاتەی هکومەت پرۆژەی یاسای پاراستنی کۆماری خستە بەردەست رایشتاخ لەبۆ لێکۆڵینەوە و پەسەندکردنی, وتەبێژانی پارتە راست رەو و ناوەندیەکان زۆر بەتوندی بەرپەرچیان دایەوە, ئەوکاتەی بۆ مارکس خوازان روون بوویەوە ئەم پرۆژەیە زیادتر لەسێ یەکی دەنگی ئەندام پەرلەمانەکان بەدەست ناهێنێت هانی لایەنگرانیان دا لەبۆ گردبوونەوە لەپێش باڵەخانەی ئەنجومەنی نوێنەرانی ولأتدا, لە پوشپەری ۱۹۲۲ دا دووسەد هەزار مارکس خواز لەدەوری رایشتاخ کۆبوونەوە و دروشمی هەمەجۆریان دەوتەوە, دژبەرانی ئەم پرۆژەیە ترسان و کشانەوە لە رەتکردنەوەی, بۆیە بەزۆرینەی دەنگ پرۆژەکە پەسەندکرا و ئەندام پەرلەمانە نەتەوەییەکان پشت گوێ خران و بەم کارە کوتەکێکیان تێ سرەواندن.

بەم شێوەیە دەوڵەتی نوێ بەبێ بوونی هیچ جۆرە بەرەنگاری بوونەوەیەکی راستەقینە هەنگاوەکانی دەنا, بریاری دەدا و جێبەجێش دەکرا. بەلأم ئەو رێکخراو و بزوتنەوانەی کە بوێری ئەوەیان تێدابوو دژبەری مارکس خوازان بکەن بریتی بوون لە: گروپە ئازادەکان و پاسەوانی سڤیلی و کۆمەڵەی پاراستنی نەریتەکان و کۆمەڵەی جەنگاوەرانی کۆن .

وادیارکەوت ئەم بزوتنەوانە هیچ کاریگەرییەکی ئەوتۆیان نەبووە, بەهۆی ئەوەی کە:

هیچ پارتێکی میانرەو یان راسترەو بەهۆی بەدەری لە لەخۆگرتنی توخمەکانی خەبات گێریەوە هیچ دەستەلأتێکی لەولأتدا نەبووە. رێکخراوە راسترەوەکان یەکە گەلێکی بەرپەرچی رێکخراوبوون, بەلأم کاریگەریان کەم بوو, چونکە خاوەنی بنەمایەکی دیاری کراو نەبووە و ئامانجێکی سیاسی روونیشی نەبووە لەبۆ پێگەیشتنی.

مارکسیەکان توانییان سەربکەون لەسایەی باش گۆشکردنی لایەنگرانی خۆیان و کارکردن بە درندەیی. خۆنەگەر ئەڵمانییە نەتەوەییەکان بیان توانیبایە بەباشی خربنەوە و کۆربەندیکی تۆقێنەر دروست بکەن ئەوکات دەستەلاتی ولات لەدەستی مارکسیەکاندا خر نەدەبووە.

پارتە نەتەوەییەکان خاوەنی خوازویست یان ئیرادە بوون، بەلام هێزی چەسپاندنیان نەبوو. بەلام ڕێکخراوەکان هێزیان هەبووەو دەیان توانی شەقام بجولێنن و دواتریش دەست بگرن بەسەر دەوڵەتدا، بەلام کێشەی نەبوونی فەلسەفەیەکی دیاری کراو لەبۆ کارپێکردن و ئامانجی دیاری کراوی ڕامیاری بووە. جووەکان ئەم جووت خەوشیەیان قۆستەوە. هەوڵی قایل کردنی دوژمنانی خۆیان دەدا لەوەی لەمان باشتر کارناکەن و زیادتریان پێ ناکرێت و باشتر وایە دەست هەڵبگرن و تەقلی بزوتنەوەکانی ئەوان بن یان خۆیان هەڵبوەشێنەوە و دەست لەپارت چێتی هەڵبگرن. بە ئامارە پەنجەیەکی جوو ڕۆژنامەکان دەستیان دایە سووک کردنی پارت و ڕێکخراوە ڕاسترەوەکان، هەروەها جووەکان دژبەری ئەوانەشیان کرد کە چەکی هزری بەکاردێنن بۆ بەرپەرچدانەوەی دوژمنان. ملیۆنان ئەڵمانی ئەم بۆچوونە پوچەیان وەرگرت، لەبیریان چوو بوو کەئەمە کلاواتێکی جوولەکەیە و ئەوان پشت بەبیرۆکەی ژیان یان بۆ ژیان یان بۆنەمان دەبەستن وهەموو جۆرە چەکێك بەکاردێنن لەبۆ گەیشتن بە ئارمانجەکانیان. بەم کارەش جووەکان هەموانیان لەچەك داماڵی و خستنیانە ژێر سایەی دلۆڤانی خۆیانەوە.

ڕوونکردنەوەیەکی دی بۆ پیشاندانی لاوازی پارتە بۆرژواکان و ڕێکخراوە ڕاسترەوەکان هەیە، ئەمانە بەبێ بوونی کەسایەتی و باوەڕی نمونەیی چوونە جەنگەوە، دیرۆك گەواهی دەری کورتخایەنی ماوەی جەنگینە لەگەڵ ئەم چەشنە بزوتنەوانە. ئەمان گیانی تێکۆشانیان هیچە و نازانن لەکۆتادا ئامانجیان چییە. بڕوا پەیوەستە بە هەلی سەرکەوتنەوە و هێشتاش هەر وەهایە، بە بانگەشەی نێردەکان بۆ چەسپاندنی بیرۆکەکانی دەتوانرێت پەنا ببرێتە بەر توندوتیژترین ڕێگەش.

شۆڕشی فەرەنساوی سەرکەوت، چونکە بانگەشەی مافی هاولاتی بوونی بۆ هەموو ئەوانەدەکرد کەلەسنوری فەرەنسادان، ئەمەش لای خۆیەوە توندڕەوی و دەمارگیری هێنایە بوونێ، خەڵکانێك هەبوون لەپێناویدا دەجەنگین. شۆڕشی ڕووسیش زۆرینە

بڕوایان پێی هەبووەو بۆخۆیان سەرکەوتوو بوو. فاشیزمیش نامەکەی لەڕێگەی چاکسازییەوە گەیاند.

***

لەگەڵ دامەزراندنی پارتی نیشتمانی سۆسیالیستی لەئەڵمانیادا شێوازێکی نوێی نەبەردیی هاتە کایەوە, بەجۆرێك پێشتر لەم جۆرە خەباتە لەوسەردەمەدا نەدیترابوو, بزوتنەوەیەك ئامانجی دووبارە دروستکردنەوەی دەوڵەت بوو لەسەر بنەمای ڕەگەزپەرەستی. هەر لەیەکەم ساتەوە پارت بڕیاری بەکارهێنانی چەکی هێزی دا لەبۆ گەیاندنی پەیام و بنەماکانی پارتەکە, لەهەمان کاتدا بڕیاری بەکارهێنانی هێزی توندوتیژیدا لەکاتی پێویستدا, لەبۆ بەگری کردن لە بلاَوکارانی بیرۆکەکانی پارت, بەمەبەستنی خۆ پاراستن, ئەمەش لەسایەی بوونی بڕوای تەواوە لەوەی ئەو بابەتەی پارت بەرگری لێدەکات زۆر بومبارەکە.

لەبەشەکانی دەسپێکدا گوتم ئەو بزوتنەوانەی تیرۆر و ترس پشتیوانیەتی ناتوانێت لەناوببرێت تەنها لەڕێگەی بەکارهێنانەوەی هەمان چەشنە چەکی خۆیەوە نەبێت, بۆیە ئێمەش بڕیاری بەکارهێنانی توندوتیژیماندا لەبەرانبەر ئەم پارتانەدا.

بەدرێژایی حەفتا ساڵ دەوڵەتی ئەڵمانیا ببووە سەخت ترین قەلاَی پەلاماردراوی مارکسیەت, هێرشەکانیان سەرکەوتوو نەدەبوو, هەرچەندە شێوازی نوێی تاقیدەکردەوە هەر شکست بەرئەنجامی بوو, لەهەمان کاتدا خوودی دەوڵەتی ئەڵمانیاش نەیتوانی ئەم مارکس خوازانە ڕیشە کێش بکات, چون دەوڵەت زۆر بە ناژیرانە بەرهەڵستی ئەم مارکس خوازانەی دەکرد و نەیدەزانی چۆن بەتەواوەتی بنەبڕیان بکات. دەوڵەتی ئەڵمانیا کەلە ٩ ی خەزەلوەری ١٩١٨ دا خۆی دابەدەستەوە, بواری تەواوی بەمارکس خوازان دا لەبۆ گرتنە دەستی لغاوی دەستەلاَتی ولاَت, تەنانەت بڕواش بەوە نەمابوو کە ئەگەر بێتو بۆرژواکانیش بگەنە دەستەلاَت ئەوا هیچ هیوایەك بەوەی ناکرێت لەبۆ بوژانەوەی ئەڵمانیا بە گیانێکی نەتەوایەتیەوە لە ساڵی ١٩٢١ ەوە بۆرژواکان بەبیانووی تووڕە نەکردنی زەحمەتکێشان خۆی لە دژایەتی مارکسیەکان دوور دەخستەوە, ئەم تێکەڵاویە پتەوەی نێوان مارکسی و ڕەنجبەران هۆکاری یارمەتی دەربوو لەبۆ پۆشینی سەرجەم شکستەکانیان و قۆستنەوەی دەوڵەت لەبەرژەوەندی خۆیان.

بەهۆی گوێڕایەڵی تەواوی دەستەڵاتی هەنوکەی ئەڵمانیا لەبۆ مارکس خوازان بۆیە بزوتنەوەی نیشتمانی سۆسیالیستیمان بڕیاری ڕزگارکردنی وڵاتی داو بۆی تێکۆشا, لەڕێگەی پلانی ژیرانەی خۆیەوە توانی ڕووبەڕووی پیلانی ئاژاوەگێڕە سور خوازەکان ببێتەوە. وەك لەپێشتردا ڕوونم کردەوە کە بۆ پاراستنی کۆبوونەوەکانمان دەستەیەکی تایبەتمان دامەزراند کە دواتر ناومان نا (پاسەوانی تایبەت) یان ئاسایشی تایبەت, ئێمە لەمەدا لاسایی بزوتنەوە ڕاست ڕەوەکانمان کرد کە دەستەی پاسەوانیان هەبوو بەناوی (ڕێکخراوی بەرگری), بەلاّم ئەم لێکچوونە تەنها ڕووکەشیانە بوو. ڕێکخراوە راستڕەوەکان بەبێ بوونی هیچ چەشنە ئامانجێکی نەگۆڕی ڕامیاری دیاریکراو کاری دەکرد و دەجولاّیەوە, دەمان دیت بزوتنەوە ڕاست ڕەوەکان بە داننان بە گەندەڵیدا لەچوارچێوەی دۆخی نوێدا دەجولاّیەوە, دژایەتی مارکسیزمی دەکرد کە سەرسەخترین دوژمن بوو بۆ ئەو بەبیانووی پاراستنی کۆمارەوە. بەلاّم پاسەوانانی تایبەتی ئێمە ئامانج لەدامەزراندنیان پاراستنی بزوتنەوە نەتەوەییەکانی ئێمەبوو لەگەڵ ڕەتکردنەوەی گوێڕایەڵی بۆ دۆخی باو و تێکۆشان لەپێناو دروستکردنی ئەڵمانیایەکی نوێ.

لەڕاستیدا ناتوانین ئەوە بشارینەوە کەئەم هێزی پاسەوانانەمان لەسەرەتادا هەمان کاری پۆلیسی ئەنجام دەدا لەبۆ پاراستنی هۆڵەکانی کۆبوونەوە و ڕێگرتن لە فێتنەگێڕان لەوەی قسەی وتاربێژ نەبڕن و کۆبوونەوەکان تێك نەدەن, بەپەیڕەوکردنی شێوازی هێرش بردن نەوەك ناوبژیوانی و بەرگری, لەم کاتەدا دوژمنانمان درۆیان بەدەم ئەم دەستەیەمانەوە هەڵدەبەست و بە کەمیان لەقەڵەم دەدا, بەلاّم ئێمەش پێیانمان ڕاگەیاند باشترین بەرگری لای ئێمە هێرشە, چونکە باشترین بیرۆکە و هزر دەتوانرێت لەڕێگەی لێدانی خاوەن بیرۆکە بە کوتەکێك یان دارێك لەناوببرێت.

دەستەی پاسەوانانی سەر بەپارتەکەمان هەرگیز ئامانجی بەرپاکردنی توندوتیژی نەبووە, بەڵکو پاراستن بووە, بەمانای بەرگری کردن لە پەیامبەرانی نیشمانی سۆسیالیستی , چونکە بڕوای تەوای بە بەرنامەکانی پارتەکە هەبوو, بەلاّم هەر لەدەسپێکەوە خۆی بەدوورگرت لە پاراستنی ئەو دەوڵەتەی نەتەوەکەی خۆی ناپارێزێت, بۆیە بڕیاری پاراستنی نەتەوەی دا لەڕێگەی لەناوبردنی دژبەرانی گەل و نەتەوەوە.

***

دوای ئـەوەی دووچـاری شـەڕی هـۆڵی هۆڤمبرهـۆس بووینـەوە نـاوی دەسـتەی پاسەوانی تایبەتیمان گۆڕی بۆ (سوپای هێرش بەر)، لەم کاتەدا مارکس خوازان باش دەیان زانی دووچاری گوون ڕەشی خۆیان دەبنەوە. بۆیە جارێك بە ترس و جارێك بەبەکارهێنانی دەستەڵاتی دەوڵەت هەوڵی پەکخستن وتێکدانی کۆبونەوەکانمانیان دەدا. لەهەمان کاتدا ڕۆژنامەکان و هەمووپارتە مارکس خوازەکان هانی خەڵکیان دەدا لەبۆ هێرش کردنە سەرمان و لەناوبردنمان پێش لەوەی سەردەربێنین. ئەم ڕۆژنامانە چەپکیان لێدەدا لەبۆ هەوڵەکانی پەکخستنی ئێمە. بەلأی ئەی پارتە بۆرژوان بۆ کە دڵخۆش دەبوون لەوەی ئێمە لاوازبکرێین لەڕێگەی مارکسیەکانەوە؟ ئەمەش تەنها ئیرەیی بوو بەوەی چۆن بزوتنەوەیەکی تازە دیارکەوتوو دەتوانێت بەسەر ئەو پارتە بەهێزەدا زاڵبێت کە ئەوانی بەزاندووە. ئەی کارمەندان و بەڕێوەبەرانی پۆلیس و شالیارە بەناو نەتەوخوازەکان چی بێژین کە شاگەشکە دەبوون بەلاوازبوونی ئێمە، ئەوپەڕی هەوڵیان دەدا لەبۆ قایلکردنی مارکس خوازان.

ئەم چەشنە بیرکردنەوە ناساغانە وای لە بەڕێوەبەری پێشووی پۆلیس( بۆهنەر) کرد بەوانەی هەوڵی کرینی ویژدانیان دەدا بلێت: ((لەهەموو ژیاندا ویستومە پێش لەوەی کارمەندبم ئەڵمانی بم، من وەکو ئەڵمانیەك لەناخەوە هەرگیز ڕێگە بەهیچ کەسێك ناجەم بۆگەنم بکات، خۆئەگەر کارمەند گەلێك هەبن کە بەرتیل وەربگرن، دەبێت باش بزانن کەئەمانە خوێڕی ترین و سوکترین و چاوچنۆك وێڵ و بێ ئەمەکترین دەوڵەت نشینانن، ئەو خوێنەی لەجەستەیاندا تێپەڕدەبێت خوێنێکی پاقژی ئەڵمانی نییە)).

بەڕاستی هیچ کات ئومێدمان بەگیانی ئالیکاری نەبوو بەو کەسانەی گەندەڵ و پۆست بەدەستبن. بۆیە ناچاربووین بەدەستی خۆمان خودی خۆمان بپارێزین، لێرەوەش گرنگیدانمان بە سوپای هێرش زیادی کرد، بەتەواوەتی خۆمان تەرخامن کرد لەبۆ جوان پەروەردەکردنی ئەندامانی ئەم سوپایە و گۆشکردنیان بە باوەڕی نمونەیی نیشمانی سۆسیالیستی ، ئەم هێزەمان شێوازی دەستەیەکی نهێنی یان ڕێکخراوەکانی بۆرژوا خوازی پەیڕەو نەدەکرد لەبۆ ئامانجی بەرگری کردن.

ئەم پابەندیەمان-پابەندی من بەتایبەتی- لەسەر ئەم بنەمایانە بوو:

پەروەردەی سەربازی هەر گەلێك ناتوانرێت لەڕێگەی ڕێكخراوە تایبەتیەكانەوە ئەنجام بدرێت گەر دەوڵەت كۆمەكی نەكات لەڕێگەی دارایی زۆرو زەبەندەوە. سەرباری ئەمەش ڕێكخراوی تایبەتی بە چەسپاندنی ئارەزوومەندانەی بۆچوونەوە خۆیان دەبەستنەوە، ئەمەش وادەكات ئامرازی سەرەكیان لەدەست دەربچێت لەبۆ سەردارێتی، ناتوانرێت ئەوە سزابدرێت كە دەبێت سزا بدرێت. لەبەهاری ١٩١٩ دا دروستكردنی ئەوەی پێی دەگوترا دەستەی ئاماد ئاسان بوو، چونكە ژمارەیەكی زۆری جەنگاوەر تازە بەرەڵاكرابوون، ئەم جەنگاوەرانە فێرگەی ملكەچی و سیستمیان تەواوكردبوو، واتە سوپای ئەڵمانی. بەڵام گوێڕایەڵی و سیستم لەو تایبەت مەندیانە نەبوون كە پیاوانی بەرگری كار لە بۆرژوازیەت هەیان بوو، بۆرژوا پارێزەكان ژمارەی جەنگاوەرانی ڕاستەقینە و تازە بەرەڵاكراو لەنێو ڕێكخراوەكانیاندا دە لەسەدی تێپەڕ نەدەكرد، تەنانەت سیستمە ئارەزومەندانەكەشی هەمیشە خۆی لەپێش پەلاماردایندا دەدیتەوە و دەیویست لە ئەركەكانی هەڵبێت. لەبیرمان نەچێت مەشق لە ڕێكخراوە ئارەزوو مەندانەكاندا تەنها بەناو بووە و هیچی تر، ئەو تازە سەربازەی كە تاوەكو ئێستا هیچ كات چەكی هەڵنەگرتووە بۆماوەی شەش مانگ مەشقی پێدەكرا و لەهەر هەفتەیەكدا دوو كاتژمێر بەڕاستی ڕاهێنانی پێدەكرا.

ئێمەی سەربازی دوێنێ باش لەبیرمانە كە فیشەكەكانی دوژمن چۆن ئەو لاوانەی لەناودەبردین كە بەباشی مەشقیان پێنەكرابوو. تەنانەت ئەوانەشی بەباشی مەشقیان دیتبوو لەیەكەم جەنگینەكانیادا دەپەشۆكان و تاوەكو هاوڕێكانیان بەجوانی بۆیان ڕوون دەكردنەوەو غیرەتیان پێدەبەخشینەوە. چەندە هەنگاوێكی گوڕانەیە كە بۆرژوازیەت دەویەوێت لەڕێگەی شەش كاتژمێر لە مانگێكدا مەشق بەسەربازەكانی بكات و ئەمانە بكاتە هێزێكی نیشتمانی بۆ پاراستنی خۆی و بەرژەوەندیەكانی.

بەم ڕێگەیە دەمان توانی بەئاسانی ژمارەیەكی باش لە جەنگاوەرانی كۆن كۆبكەینەوە و چەشنێك لە یانە یان نیوچە هاریكاری پێكبێنین...بەڵام گرنگ تەقل كردنی لاوانی بەهێز و خرۆشاو بوو بۆ نێو ئەم هێزە، بەڵام چۆنیان بەدەست بهێنین!

ئەوكاتەی هاوڕێیانم داوایان لێكردم ڕێكخراوە هێرش بەریەكەمان بەنهێنی بهێڵینەوە بەتوندی ڕەتم كردەوە، چونكە بزوتنەوەی نهێنی توانای بەرفراوانكردنەوەی ڕووبەر و سنوری كارەكانی نییە، بۆئەوەی بۆ هەموان

دەرنەکەوێت کەئەمە سەربەکێ یە، دەستەڵاتدارانیش لەڕێگەی هەڵوەشاندنەوەیەوە مامەڵەی لەگەڵدا دەکەن. نابێت لەبیرمان بچێتەوە گەلەکەمان زۆری حەز لە فرەوێژییە بۆیە شاردنەوەی نهێنی زۆر سەخت دەبێت، نهێنی پاراستن گرانترین کارە لەبۆ ئێمەی ئەڵمانی فرەوێژ، هەروەها دەستەڵات و پۆلیسیش خاوەنی سوپایەکی گورەی ڕازگرین و هەردەزانن کە ئەم بزوتنەوەیە سەربەکێیە و مەرامی چی و بۆچییە. بە هاوڵاتم گووت ئەم بزوتنەوەیەمان پێویستی بە سەد یان دووسەد پیلانگێڕی بەهێز نییە، بەڵکو پێویستی بەهەزاران تێکۆشەری گەنج و ڕاستەقینەیە. هەروەها دووپاتی کارکردنی ئەم سوپایەمانم دا بەڕۆژی ڕووناك و سەرەنجی هەموان بەلای خۆیدا کێش بکات، ئەم بزوتنەوەیەمان هەست بەسەرکەوتن ناکات تائەوکاتەی بەتەواوەتی شەقام لەدەست سورخوازان دەربازدەکەین، دەبێت بۆ هەموانی بسلەمێنین کە نیشتمان پەروەرانی سۆسیالیستی گوندەی شەقامن و هەر ئەو ڕۆژە دێت کە دەستەڵات بگرینە دەست.

دەتوانن لەم ڕۆژگارەماندا بەڕوونی بەدیاردە بوونی مەترسی ڕێکخراوە نهێنیەکان هەست پێبکەین. ئەندامانی ئەم ڕێکخراوانە زۆر بەکەمی هەست بە گەورەیی کارەکەیان دەکەن، زۆر بەکی ئەوەیان بەیاددا دێت کە ڕەنگە بەهۆی تاوانی کوشتنی کەسێکەوە چارەنوسی گەل سەروژێر بێتەوە.

ئەوکاتەی گەل دەخرێتە ژێر کاریگەری دەستەڵاتی خوێن مژەوە هەست بەم بۆچوونە دەکەین، ڕەنگە لەم کاتەدا کەسێکی بەهێز لەڕیزی نەتەوە دیاربکەوێت و تیغەکەی بەسکی دوژمنەکەیدا بکلت، شیلەریش لە (غلیۆم تل) تاوانی لەم جۆرەی بەشکۆمەندی لەقەڵەم داوە.

ترسێکی زۆر هەبوو لەوەی لەنێوان ساڵانی ١٩١٩-١٩٢٠ دا ڕێکخراوە نهێنیەکان دەست بکەنە تۆڵەسەندنەوە لە فەتارەت دروستکارن و ئەوانەشی دەوڵەتیان بەم پەندەداوەو قوتی خۆیانی لەڕێگەوە بەدەست دێنن، خۆئەگەر لەم کاتەدا ئەم ڕێکخراوانە ئەم کارانەیان ئەنجام دابایە ئەوکات تۆڵەسەندنەوەکەیان هیچ قازانجێکی نەدەبوو. چون خوودی مارکسیەت لەڕێگەی ژێری سەرکردەکانیەوە سەرنەکەوت بەڵکو بەهۆی چۆڵکردنی گۆڕەپانی سیاستەوە لەلایەن بۆرژواکانەوە بۆ مارکسیەکان بووەهۆی سەرخستنی مارکسیەکان و بەهێزبوونیان بەم شێوەیەی هەنووکە. ئاشکرایە کە بۆرژواکانی فەرەنسا لەبەرامبەر پیاوانی وەکو دانتۆن و ڕۆبسێر و مارادا

چۆکیان دادا بەڵام بۆرژوای ئەڵمانی لەبەرانبەر نیوەکوڕانی وەکو شیدمان و ئازر و برجر و فریدریك ئەلبێرت و بنە پیاوەکانی دیکەدا چۆکی دادا, لەم کاتەدا لە ئەڵمانیا هیچ کەسێك نەبوو هەموو شتێکی بەدەستەوەبێت کە بەکوشتنی دەوڵەت هەڵبوەشێنەوە. بۆیە پشت بەست بەم باوەڕە دژایەتی تەواوی نهێنی بوونی سوپاکەمانم کرد. گیانی تۆڵەکردنەوەشم یاساغ کرد لەبەرامبەر ئەو ڕێکخراوانەی کە هەڵخەڵەتێنراون. بۆیەی ڕقیان لەناخدا نەچێنین. بەڵکو بەم کارەمان ئاگری هەناویان بکوژێنینەوە و لەناوبەرین. پاش لەوەی بڕیارمان دا ئەم سوپایەمان بەوئاشکرا بناسێنینە و دووری بخەینەوە لەئەنجامدانەوەی هەمان هەڵەی ڕێکخراوەکانی دیکەی لەم جۆرەی پارتە لاولاز بووەکان. بڕیارماندا بۆئەم سوپایە تیشك بخەینە سەر سێ کۆڵەکەی سەرەکی : مەشق و ئاشکرایی سەربازان لە کۆبوونەوەکان و جلکی تایبەت.

لەڕووی مەشقەوە بەتەواوەتی مەشقی سەربازیمان پێنەدەکردن. بەڵکو مەشقی پارت پارێزیمان پێدەکردن. بەزۆری یاری وەرزشی بەهێزکارمان پێدەکردن لەبری کەشقی قورسی سەربازی. هەمیشە بڕوام وابوو کە بۆکسێن و شەڕەلەقەی ژاپۆنی باشترین چەکن بۆ لایەنگرە سەربازەکانمان لەبەرپەرچدانەوەی دووژمن.

لەبۆ داڕووتانەوەی سوپای هێرش لە مۆرکی نهێنی بوونی بواری کار و چالاکیەکانیمان فراوانترکرد. لەهەمان کاتدا ڕۆشنبیریشمان دەکرد و فێری چۆنێتی پلاندانان و بەرچەدانەوەی پیلانیشمان دەکردن. ئەمانە وەها گۆش دەکران کە وایان هەست دەکرد تەنها خۆیانن پشتیوانی ڕاستەقینەی وڵات و هەموان لەسەر ڕێگەی هەڵەن و ئەم کارەشیان تەنها بۆ خزمەتکردنی وڵات و نەتەوەیە و هیچی تر.

سەبارەت بەجلکیش هەوڵی گونجلندیماندا لەگەڵ چەشنی کار و ئەنجامدراوەکانیاندا.

لەکۆتایی وەرزی هاوینی ساڵی ١٩٢٢ سێ بۆنە هەبوون کە لەم کاتە بوار بە تاقیکردنەوەی هێزی سوپاکەمان درا و توانیان ئەم ئەزمونە بەجوانی و لەقازانجی خۆماندا بئەزمون.

سێ بوونەکەش بریتی بوون لە:

١-ئەو گردبوونەوەیەی دامەزراوە نەتەوەییەکان لە گۆڕەپانی کوینفس لە میونیخ ئەنجام درا لەبۆ ناڕەزایەتی دەربڕین لەهەمبەر یاسای پاراستنی کۆماری.

پارتی نیشتمانی کۆماری لەم خۆپیشاندانە بەشداربوو، بەشداربوانیش لەژێر سایەدا بە پتەوی و خۆڕاگریەوە دروشمەکانیان بەرز دەکردەوە، دەستەکانی هێرش لەمیونیخ زۆر بەجوانی پێشکەوتنی بەخۆوە دەدیت و پێشەنگایەتی خۆپیشاندانەکەبوون، لەسەر شانی ئەمانەشدا پانزە ئالا دەشەکایەوە. ئەو دەمەی نیشتمان پەروەرە سۆسیالیستیەکان چوونە خۆپیشاندانەکەوە بەجوانی پێشوازییان لێکرا، گەورەیی قسەکردن بەناوی پارتەوە بەمن بەخشرا و لەوێدا وتارێکی خرۆشێنەرم بۆ شەست هەزار ئامادەبوو خوێندەوە.

لەم کاتەدا ئەندامی سور خواز هەوڵی تێکدانی ئەم خۆپیشاندانەیان دەدا بۆیە سەربازانی ئێمەی باش ئامادەکراو هاتنە دەست لێیان و لەماوەیەکی زۆر کەمدا سورەکان هەڵهاتن و بەم کارەش توانیمان بۆچوونی خەڵکی میونیخ لە سورەکان وەرچەرخێنین بەقازانجی خۆمان، ئەمەش هەلی ئەوەی پێداین بە ترسێکی کەمتر لەجارانەوە دابەزینە نێو شەقامەکان و ئەو ناوچەیە لەدەست دووژمن بسەنینەوە.

ئەم ئەنجامە دڵخۆشکارەی ئەو ڕۆژە گۆڕی زیادتری پێداین لەبۆ پتر سووربوون بۆ سەرکەوتن.

٢-سەردانی کردنی بازێڕی کوبورغ

ڕێکخراوانی ڕەگەزپەرەستی ئەڵمانی بڕیاری بەستنی کۆبوونەیەکیان دا لەشاری کوبرغ. بۆخۆم بانگێشتی ئەم کۆبوونەوەیەکرام لەگەڵ داواکردنی هێنانی کۆمەڵێك لە لایەنگرام لەگەڵ خۆمدا بۆئەوشارە، بۆیە منیش بڕیارمدا دگەڵ خۆمدا هەشت سەد جەنگاوەری بەتوانا بەرم کەلە چوار دەستە پێك هاتبوون، لەڕێگەی شەمەندۆفێرەوە لەمیونیخەوە گواستمانیانەوە بۆ کوربورغ. بەخێرایی نامەمان بۆ لایەنگرانی پارتەکەشمان کرد لەبۆ خۆئامادەکردن لەو ناوچانەی کەشەمەندەفەرەکە پێیدا تێدەپەڕێت. لەهەموو وێستگەیەکدا دەستەیەك لە هەوادارانی نیشتمان پەروەرانی سۆسیالیستی ئامادەبوون، ئالآکانیان هەڵکردبوو، ئەمەش کاریگەری تەواوی لەسەر دەروونی دانیشتوانی ئەو ناوچانە هەبوو.

لیژنەی ڕێکخستنی کۆبوونەوەکە پێی ڕاگەیاندین: سەندیکای ناوخۆیی و پارتی سۆسیالیستی سەربەخۆ و پارتی شیوعی و دەستەڵاتی ناوخۆیی شارەکە بڕیاریاندا لەڕێگەی ڕێککەوتن لەگەڵ دەستەی بەڕێوەبردنی کۆبوونەوەکەدا-لێرەوە ئامۆبوون

دیاریدهکەوێت-کە لەکاتی چوونە ژوورەوەمان بۆ نێو شار نابێت بەهیچ شێوەیەك نە ئالاَ هەڵبکەین و نەش گروپ ڕێکبخەین و نە مۆسیکی دروشمیش بژەنین....هتد.
بەبێ هیچ ڕاڕاییەك ئەمەم ڕەتکردەوە. ئەم مەرجانە نامۆبوون. بێ هیچ دوودڵییەك بێ ئابڕوویی ئەم قسە و ڕێککەوتنەم لەبۆ لیژنەکە ڕوون کردەوە. بە سەرۆکی لیژنەکەم گووت کە: هێزەکانی سوپای هێرش هەنوکە خەریکە تەقلی نێو شار دەبن و لەڕێگەی ژەنینی مۆسیك و هەڵکردنی ئالاَ و وتنەوەی دروشمەوە دەچینە نێوشارەکەوە.
هەر وەشمان کرد.
پێش لەوەی لە گۆڕەپانی وێستگەکە بجولێین هەستم بە کۆبوونەوەی ژمارەیەکی زۆر خەڵك کرد. لەوەی ئامادەی تانە لێدانمانن بۆنەمەش چاوەنواڕی ئاژەی پەنجەی دوژمنانمان دەکەن. زۆریان جنێو پێدایەن. بەلاَم ئێمە هیچ گوێمان لێنەدان و ڕیزی سوپاکەمان تێك نەچوو. لەڕێڕەوتی ڕۆیشتنمان بۆ هۆڵی هۆفمبرهۆس دا کە دەکەوتە ناوەڕاستی شارەوە خەڵکێکی زۆر لەدەورمان کۆبوونەوەو جنێویان پێدەداین. ئێمە وەها خۆمان پیشان دەدا هیچ نابیستین. پۆلیس لەم کاتەدا بەبیانووی دروست نەبوونی شەڕ و پەلامار نەدانمان لەلایەن خەڵکەوە دەرگای هۆڵەکەی لێ توندکردین. بەلاَم من بەخێرایی هاوارم کرد کە ئێوە دەرگاکە بکەنەوە و هەقتان نەبێت ئێمە بۆخۆمان ئامرازی گونجاوی بەڕێوەبردنی کۆبوونەوەمان هەیە و دەتوانین خۆمان بپارێزین. بۆیە پۆلیسیش بەناچاری دەرگاکەی کردەوە. لەکاتی نزیك بوونەوەی کاتی کۆبوونەوەکە تێم گەیاندن کە ئێمە دەبێت بڕۆین بۆ ناوەندی پارت لە کوربۆرغ. بۆیە هەمدیس ڕێگەی نوێمان گرتەوە پێش بەئاراستەی ناوەند و سرودی نیشتیمانیمان دەگوتەوە. ئەوکاتەی سورخوازان و هاوڕێکاکانیان( بانگەشەکارانی : سۆسیالیستی و برایەتی و یەکسانی) زانیان جنێو کارمان تێناکات دەستیان دایە بەرد تێگرتنمان، ئەمە سەربازانمانی توڕەکرد و هەڵمەتیان بۆبردن و لەماوەی کەمتر لە دەخولەکدا کۆلاَن و شەقامەکان چۆڵ بوون لە ئاژاوە گێڕان.
شەویش پێکداداني زۆر توند ڕوویدا لەزۆر ناوچەی کوبورغ. سورەکان هێرشیان کردبووە سەر هەواداران و براکانی دانیشتوی ئەم شارەمان و زۆریان تێهەڵدابوون و دۆخیانیان تێکدابوو. هەرکە ئەم هەواڵە گەیشتە ناوەندی پارتمان هێزی تەواومان

نارده نێو شەقام و کۆڵانەکانی شارو توانیمان لەم خوێن ڕێژانە شار پاك بکەینەوەو هەموویانمان تیابرد, بەم کارەش توانیمان تاڕادەیەك شەقامەکانی کوربورغ لە سورخوازان بسێنینەوە کە بۆ ماوەیەکی زۆر بوو بۆ خۆیان داگیریان کردبوو.

بەلاّم مارکس خوازان پەندیان لەم دوو شەڕەی دوێنێ وەرنەگرت بۆ ڕۆژی دواتی بڕیاری خۆپیشاندانیان دا لەدژی ئێمە و بۆئەمەش ژمارەیەکی زۆری کرێکاریان کۆکردەوە و ناونیشان و دروشمەکانیان بریتی بوون لێ: (نیشتمان پەروەرە سوسیالیستیەکان بۆئەوە هاتونەتە نێو شارەوە بۆئەوەی لەکرێکاری بەدەبەخت و بێ دەستەلاّت بدەن و بیان ترسێنن). هەرکە هەواڵم پێگەیشت فەرمانم بەسوپا کرد کە دەستە و یەکە و تیپەکانیان کۆبکەینەوە بەجۆرێك ژمارەی سەربازانمان بگاتە هەزار و پێنج سەد سەربازی بەتوانا و ئامادەی کتەك وەشاندن, لەپێشی ئەم هێزەوە بەرەو ناوچەی خۆپیشاندانەکان ڕۆیشتم, بەنیازی ئەوەی نەختێك ئەمانە بەچە ترسێن بکەین و بزانن ئێمە کێین. بەلاّم لەم گۆڕەپانەدا هیچ کەسێکی لێ نەبوو جگە لە سەدان پیری پەککەوتە و منداڵ و ژنی بێدەستەلاّت, بۆیە بڕیارمان دا هیچ هەنگاوێکی شەڕوانی نەنێین و بەئاشتی بەلایاندا تێپەڕین, مۆسیقامان لێدەدا و دروشمی خۆمان دەوتەوە.

بەڵێ ئەم خۆپیشاندانەی ئێمەش سەرکەوتوو بوو, توانی مەی بداتە دەروونە ماندووەکان, پاش اەوەی دانیشتوانی شارەکە تاڕادەیەك لێمان تێگەیشتن لەسەر شۆستەکان دەوەستان و فیت و هوریان بوو , واتە خۆشحاڵیان بۆ دەردەبڕین, لەشەودا ژمارەیەکی زۆری خەڵك وەکو لایەنگر بەرەو وێستگەی شەمەندەفەر بەڕێیان کردین, بەلاّم لەوێدا شتێکی سەیرتر هەبوو, ئەویش ڕەتکردنەوەی کارمەندانی تایبەت بە شەمەندەفەر بوو بەوەی نایانەوێت بمان گوێزنەوە بۆ میونیخ, ئەمەش لەرێگەی هاندانی سەندیکا مارکس خوازیەکانەوە بوو, دنەدەرانم بەباشی تێگەیاند- کە لەشوێنێکدا کۆببونەوەو چاوەنوڕای کاردانەوەیان دەکردین-من گوێم لەوە نییە کە بەدەیان کەس لەئێوە لەگەڵ خۆمدا ببەمە نێو شەمەندەرەکەوە بە زۆر و خۆشمان ئەوکات شەمەندەفەرەکە لێدەخوڕین, سەرباری ئەوەی ناشزانین لێی بخوڕین, لەم کاتەدا بۆیە ئەگەر شتێك ڕوویدا ئەوە بەتەنها ئێمە تیاناچین بەڵکو ئێوەش دەمرن و

هەمان چارەنوسی ئێمەتان دەبێت, ئەمەش ڕێك بەپێی یاساكانی ئێوەی ماركسی گونجاوە.

بەڕاستی ئەم هەڕەشەم كاریگەری خۆی كردە سەر هەناوی سورخوازان, قیتارەكە لەكاتی خۆیدا دەستی دایە جوڵە و لەوێستگەی كوربرغەوە بەرەو میونیخ بەڕێ كەوتینەوە و بۆ ڕۆژی دواتر بە سەلامەتی گەیشتینە زێدی خۆمان, میونیخ.

پاش لەڕوداوەی كوربورغ سەربازانمان بەگیانێكی خۆبەخشانە و متمانەیەكی زیادتر لەجارانەوە بە خۆیان و پارت و سەركردەكانیان ڕەفتاریان دەكرد, ئەمەی وای كرد ئەوانەی باوەڕیان بە بزوتنەوەی نیشتمانی سۆسیالیستی هەبوو بڕوا بەوە بێنن كەڕۆژێك دێت ئەم بزوتنەوە یان پارتە دەبێتە خاوەن دەستەلاتی تەواوی وڵات و سنورێك بۆئەم پەتایەی مارسیەت دادەنێت.

بەلام دیموكراتی خوازان بە نیگەرانیەوە لێمانیان دەنواڕی لەوەی ڕێگەی هەڵمان هەلبژاردووە بۆ بەرپەرچدانەوەی سەركسیە سورەكان, بەوەی لەڕێگەی بەكارهێنانی هێزەوە هێزیانمان لەناوبردووە, چونكە ئێمە لەولاتێكی دیموكراتیدابن نابێت ئەم شێوازە پەیرەو بكرێت, ئەمە و چەندان قسە و ڕەخنەی دیكەی لەم شێوەیەیان ئاراستە دەكردین.

سەركەوتنەی كوربورغ هانی داین كون بەكون و شاربەشار و دێ بەدێ بەدووی ماركسیەكاندا بگەڕێن و پاكتاویان بكەین لەگوندایەتی و دەستەلاتدارێتیان بخەین, بەم كارەشمان پارتەكەمان توانی هەناسەی ئازادی بۆ باڤاریا بگەڕێتەوە هەموان بەبێ ترس بتوانن بپەیڤن و كۆبوونەوە ئەنجام بدەن. لەساڵی ١٩٢٢دا چەندین دەستەی دیكەی شەڕوان تەڤلی سوپاكەمان بوون, بەمەش تادەهات ئێمە بەهێزتر و ماركسیەكانیش لاوازتر دەبوون.

٣-ئەوكاتەی فەڕەنسیەكان ناوچەی ڕۆهەریان گرت لە ڕەشەمێی ١٩٢٣ دا , پارت و ڕێكخراو و بزوتنەوە نەتەوەییەكان كۆبوونەوە و بڕیاری بەرپەرچدانەوەی داگیركاریان دا. ئێمەش ئەم هەلەمان قۆستەوە لەبۆ تاقیكردنەوەی سوپاكەمان وەكو سوپایەكی بەرگری كار لە نیشتمان, هەركە ئامانجەكانمان پێكا سوپاكەمان گێڕایەوە بۆ باری پێشووتری: سەربازی بزوتنەوە, ئامادەی بەهێزی و پارێزەری بالاكانن.

# بەشی نۆزدە

## ماسکی فیدراڵیەت

لەنێوان ساڵانی ١٩١٩-١٩٢٠ دا پارتە تازە دامەزراوەکەمان ناچاری دەست نیشانکردنی هەڵوێستی خۆی بوو لە هەمبەر ئاریشەیەکدا کە مقۆمقۆیەکی زۆری لەسەربوو.

لەبەشێکی لەمەوپێشی ئەم پەرتووکەدا فاکتەرەکانی شکست خواردنی وڵاتەکەمم خستەڕوو لەکاتێکدا سەرقاڵی کێبڕکێی دوژمنێکی زۆر مەترسیداربووین، تیشکم خستە سەر ئەو حۆڵاتەی کە دەزگاکانی ڕاگەیاندنی بەریتانی و فەڕەنسی پەنای تێگرتبوو لەبۆ ئافراندنی جیاوازی لەنێوان هەردوو بەشی باکور و باشوری ئەڵمانیا. لەبەهاری ١٩١٥ دا بڵاوکراوەکانی هاوپەیمانان بەسەرماندا داباری‌ن کە تێیدا پروسیا بە تاوانبار و هەڵایسێنەری جەنگ دەزانن و زستانی ١٩١٦ دا ئەم تۆمەتە ئاراستەی باشوری ئەڵمانیا کرا و هانی قوتاربوونیان دەدان لە ژێر دەستەڵاتی پروسیەکان. ناچارین دان بەوەشدا بنێین کە ڕووداوەکانی پێکدادانی نێوان باکور و باشوری ئەڵمانیا هەڵبەستراو نەبوونە.... ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ڕەفتاری بەستووی دەستەڵاتدارانی ئەڵمانیا و بەتایبەت باڤاریا لەوەی هیچ هەنگاوێکیان نەنابوو لەبۆ دژایەتی کردنی ئەو ڕۆژنامە ئەڵمانیانەی کە داوای جودابوونەوەیان دەکرد. تورەیی

گەل لەهەمبەر پروسیا و بنەماڵەی دەستەڵاتداری باڤاریا یەکەم جار لەمیونیخ ەوە دەستی پێکرد، ئەمەش بەهۆی خراپی بنەماڵەی فەرمانڕەوای وڵاتەوە بووە، ئەگینا ئەگەر گەل هەست بەچاکی دەستەڵاتێك بکات بۆچی دەیڕوخێنێت، لەم کاتەدا ئابوری نەتەوەیی لەلوتکەی خەوشداریدا بوو، تاکە دەستەڵاتیش لەبەرلین بوو، کە خەڵکانی ئاسایی بە پروسیای لەقەڵەم دەدەن.

گەل باش ئاگای لەوەبوو کە((بەرژەوەندیەکانی هەڵایسانی جەنگ)) کە بڕیاری لەسەر دەدرێت هەمووی لەبەرلیندا کۆبووەتەوە، بەڵام نەیان دەزانی ئەوانەی ئەم بەرژەوەندیانەیان ڕێکخستوەخەڵکانی بەرلینی و پروسیش نین، تەنانەت زۆرینەشیان هەر ئەڵمانی نین...بەڵام حکومەتی باڤاریادەوری لەهەموو شتێك دابوو، واتە ئاگاداری ئەم ڕەوشە بوو، بەڵام سەرباری ئەمەش خۆی گێل دەکرد لە تەوژمەکانی دژە پروسی لەبری ئەوەی بەڕوویدا بوەستێتەوە و ئەندێشە گەمژانەکانی یادگەی خەڵکی بپوکێنێتەوە.

بەڵام ئەو جولەکە فێلاویانەی کە((بەرژەوەندی جەنگ)یان دروست کردبوو، بۆئەوەبوو لەم کاتەدا گیرفانی هەموو خەڵك بڕن، هەستیان کرد گەر بێت و گەل بەمە بزانێت ئەوا چنگ دەخاتە بیناقاقای و دەیخنکێنێت بۆیەبڕیاری گواستنەوەی تۆوی دووبەرەکی دا لەنێو هاوڵاتیانی نیشتماندا، باڤاریای توندکرد لەهەمبەر پروسیادا، هەردووکیان کەوتنە دژبەری کردنی یەکتر، هەمووان زەرووە نێودەوڵەتیەکەیان لەبیر چووبوویەوە کە خوێنی خەڵکی دەمژن...

ئەم دۆخە بۆماوەیەکی زۆر بەم شێوەیە مایەوە تا ئەوکاتەی تۆوی شۆڕش وەرگیرا، جوولەکە و بەلشەفیکیەکان قۆستیانەوە لەبۆ هەڵوەشاندنەوەی نیشتمانی ئەڵمانی و داڕووتانەوەی لەهێز. ڕێکخەرانی شۆڕشی باڤاریا خۆی وەکو بەرژەوەندی بینی باڤاری دەدیت، لەکاتێکدا ئەمانە دواین کەس بوون کەماڤ ئەوەیان پێبدرێت بەناوی گەلی باڤاریەوە بدوێن، ئەمانە جولەکانی ڕۆژهەلاتی پاشەڵ لێڵ بوون.

ڕێکخەری شۆڕشەکەی باڤاریا، کورس ئەمیزر، گرنگی بەوەدابوو کە پێویستە ئەم بزوتنەوەیە شێوازێکی هێرش بەری وەربگرێت لەناوچەکانی دیکەی ڕایخ دا، لەگەڵ پێداگری لەوەی دەرئەنجامی ئەم شۆڕشە هاوتای بەرژەوەندی جولەکە ڕەسەنەکان

بێت، جێبەجێ کاری ڕێنماییەکانی جولەکەی جیهانی بێت کە بروای وابوو بەر لەوەی هەوڵی بەلشەفی کردنی ئەڵمانیا بدات نەتەوەی ئەڵمانی هەڵبوەشێنێتەوە.

ئەوکاتەی هێزەکانی ئەڵمانیا باڤاریایان لەچنگی لایەنگرانی بەلشەفی قوتارکرد، ئەمانە بانگەشەی خەباتی سوریان کرد لەپێناو هێشتنەوەی دەستەلآتیان، بەوەی دەیان گووت:(( نەبەردیی کرێکارانی باڤاریا لەدژی سەربازگەی پروسیە)). ئەم بانگەشە ئامانجدارانە دەنگدانەوەیەکی بەهێزی نەرێنی هەبوو لەبۆ ڕق ئەستوربوونی باڤاریەکان لەپروسیەکان و بەپێچەوانەشەوە.

لەم ساتە هەستیاریەدا بۆخۆم هاتمە گۆڕەپانی ئەم ململانێیەوە و کارم دەکرد لەبۆ ڕق لێنەبووەی هاوڵاتیانی ئەڵمانی لەیەکتر و داوام لێدەکردن هەوڵی یەکگرتنەوەیان بەهێزتربێت وەك لە جوداخوازی، بەڕاستی ئەرکێکی قورسم خستبووە سەرشانم، لە دەڤەر و گوند و شارە باڤاریەکاندا ئاستی ڕق لێبوونەوە لە پروسیەکان گەیشتبووە ترۆپك، ئەم سورخوازانە لەهەموو کونجێکی وڵاتدا ناوەندێکیان کردبۆوە کە ئەرکی تەنها دنەدانی خەڵك بوو لەبەرامبەر پرۆسیادا.

بڕیاری لەناوبردنی ئەم تەوژمەجودا خوازییەم دا، بۆیە چوومە کۆبوونەوەیەکی جودا خوازەکانەوە کەلە هۆڵی لۆفن -بروکلر لە میونیخ بەستبوویان، لەم کاتەشدا چەند هاوڵێکم لەگەڵدا بوو. پاش لەوەی یەکەم وتاربێژ قسەکانی تەواوکرد لەجێگەی خۆم لەنێو ئامادەبووانەوە هەستامە سەرپێ و باسی خراپیەکانی جوداخوازیم بۆ کردن و تێم گەیاندن لەوەی جودا بوونەوە تەنها بەقازانجی جولەکە و مارکسیە سورخوازەکانە و هیچی تر و هەر ئەمانیشن پیلان گێڕ و دنەدەران لەبۆ سەرکەوتنی ئەم نەخشەیەشیان هەموو کارێك دەکەن، ڕوونی قسەکانم ئامادەبوانی جوداخوازی توڕەکرد و چەندین جار جنێوی ناشرینیان پێدام و هەوڵی بڕینی قسەکانیان دام، لەم کاتەدا هاوڵە بۆکس وەشێنەکانم لەهۆڵەکە تەوقیان دام و نەیان هێشت هیچ کەسێك ئازارم پێبگەیەنێت و بردمیانە دەرەوە.

بەردەوام بووم لە پووکانەوەی ئەم هەوڵە جودا خوازییە، بەمەش تادەهات لایەنگیرم زیادتر دەبوو، جاربەجاریش جودا خوازان زۆر بەتوندی هێرشیان کردوینەتەسەر و هەندێك لەهاوڵانیشم لەهۆش براونەتەوە و بەپەلکێشان فڕێ دراوەتە دەرەوەی هۆڵەکەوە، واتە جەنگ بوو جەنگی ڕاستەقینە.

دوای ئەوەی لەساڵی ١٩١٩ و مانگەکانی سەرەتای ١٩٢٠ دا پارت بۆچوونەکەی منی لەئەستۆگرت و ئەم ئەرکەی بەتەنها لەسەر شانی خۆم نەهێشت, هەموو هەنگاوێکمان بەیارمەتی ڕۆڵە باڤاریەکان بوو کە سنگی خۆی دەخستە بەر گوللەی قسە هەڵبەستراوەکانی جودا خوازان و ئەیان دەهێشت هەوڵە کوشندەکەیان سەربگرێت.

ئەوکاتەی پارتەکەمان بەچڕییەوە خۆی تەرخان کرد لەبۆ دژبەری کردنی ئەم هەڵمەتە, جووەکان و یارمەتی دەرانیان پەنایان گرتە نەخشەیەکی نوێتر و بۆ تێپەڕاندنی ئەم نەخشە گلاوەیان دەیان گووت: ئەم جموجۆڵانە تەنها بەمەبەستی دامەزراندنی دەوڵەتی ڕایخ بووە لەسەر بنەمای فیدراڵەت , واتە پارچە پارچە کردنی و یەککگرتنی لەسەر بنەمای یەکێتی و فیدراڵیەت, ئەمەش بۆ نەهێشتنی مەترسیە لەسەر وڵاتانی دراوسێ, ئامانج لێرەدا تەنها پروسیایە, بەم هەنگاوە زانیمان جووەکان چیان لەژێر سەردایە و کارەکەی ئێمەیان ئاسانترکرد. پاشان ڕووداوەکەی دۆرتن دیارکەوت, کە ڕێنانی ئاپاك هەوڵی جوداخوازی دا, بەم کارەش پەردە لەسەر چاوی خەڵەتاوانی باڤاری لاچوو, هەستیان کرد کە سەرکردەکانی بزوتنەوەی جوداخوازی و فیدراڵیەت دوو چەشنە سەرکردەی لەیەك جودان, ئەمانە بەکرێ گیراوانی دەوڵەتانی بیانین, کاربۆ فەرەنسا و ئینگلیز دەکەن.

تێبینی ئەوەشمان کرد, کە هەڵمەتە دڕندانەکە بەزۆری چڕکرابۆوە لەسەر دەستە پارێزگارەکان نەوەك دەستەکانی تریش, لەبەرئەوەی پارێزگاران هەستان بە ڕەتکردنەوەی دەستورەکەی فیمار کە باشوریە ئەڵمانیەکان و جووەکان دایان ڕشتبۆوە, ئەو دەمەی جووەکان هەستیان کرد لقێنە جودا خوازیەکەیان بەرەو تیاچوون هەنگاو دەنێت, وازیان هێنا لە قۆڵبڕینی خەڵك و گەندەڵی کرد, کەوتە وێزی پارێزگاران و باڤاریاەکان و پروسیەکان و هەوڵی خۆشکردنی ئاگری جەنگیان دەدا لەنێوانیاندا.

سەرباری هەموو ئەمانە کەچی گەل هێشتاکە بەخەوەر نەهاتبۆوە و هەر لەبێشکەی گێژکاری جوولەکەدا خەوێنرابوون,ئەیان دەزانی جووەکان گەمەیان پێدەکەن. لە زستانی ١٩١٩ من و یاوەرانم هەوڵی ئاگادارکردنەوەی خەڵکم دا لەمەترسیەکانی جوولەکە بەڵام خەڵکی عەوام ئەم بۆچوونانەی ئێمەیان ڕەت کردەوە بەبیانووی ئەوەی

ئێمە ڕەگەز پەرەستین. دەبێت دان بەوەشدا بنێین کە چاکەی وروژاندنی دژە جوولەکە دەگەڕێتەوە بۆ ڕێکخراوی ((کۆمەڵەی بەرگری و هێرش)) کەلە هەمان ساڵدا دامەزرابوو. هەرکە پارتی نیشتمانی سۆسیالیستی ئەم بیرۆکەیەی وەرگرت و کردیە تەوەری کاری بزوتنەوەکەی خەڵکێکی زۆر شوێنی کەوتن. بەلام جووەکان زۆر سەگانە ئاسان بۆنی ئەم مەترسیەیان کرد و خۆیان بۆ بەرگری کردنی توند ئامادەکرد، کە پشتی بە پیلانگێڕی کۆن بەستبوو. لەسێ ڕۆژنامەی بەکرێ گیراودا کێشەی ئاینی لەنێوان پرۆتستانتی و کاسۆلیکی خرایە ڕوو، ئەمەش وای کرد هەموان لەنێو خۆیلندا دووبارە دابەش ببنەوە.

بەم کارەش جووەکان توانیان جارێکی دیکە سەرکەوتن بەدەست بێنن، خەڵکی بەلاڕێدا ببەن. لەنێوان نێوارە و گزەنگێکدا حەسرەتیان جووی دوژمنی هاوبەشیان لەبیرکرد و کەوتنە وێزی یەکتر، ئەم کەسە ناموٚ قژ ڕەش و لووت درێژەیان لەبیرچوویەوە کە بووەتە بار بەسەریانەوە و پیلانیان لەدژ دەگێڕێت و خوێنی پاکی ئاری پیس دەکات، لەبیریان چوو کە ئەوە جووەکانن دوژمنی سەرسەختی لەمێژینەی حەسرەتیان، جووەکان جیاوازی ناکەن لەدژایەتی کردنی کاسۆلیك و پرۆتستانت، جووەکان دوژمنی کەوناى ئاری خوێن پاك بووە، لەناوبەری ژیاری و هەڵگرانی مەشخەڵی شارستانی بووە.

هەموو ئەو ڕوونیانەیان نەدەبینی و هەنگاویان بەرەو مقۆمقۆیەکی زۆر نا کە دوور بوو لە ناوەڕۆکی ئاینەوە بەدووری نێوان زەوی و ئاسمان، ڕۆژنامە مارکسی و کافرەکان خۆبەخشانە بڕیاریاندا زەیت بکەنە سەر ئاگرە داگیرساوەکەوە لەڕێگەی بلاوکردنەوەی بۆچوونی ترۆلەوە.ئەوەی ڕەگەز پەرەستان سنورێك بۆئەم ناکۆکیە ناپێویستە دابنێت هاتنە نێو جەنگەکە و شەڕیان لەڕەگەزە گۆڕی بۆ مەزەب و ئاین. لەم کاتەدا جووەکان لەنێزکەوە لە پیسبوونی خوێنی ئێمە و بێ ئابڕوو بون و تێکدانی بەرژەوەندیەکانمایان دنواڕی، لەم کاتەدا دوژمنانی دەرەکی ئەڵمانیا سەرقاڵی دابەشکردنی زەوی و دەستکەوتەکانی جەنگ بوون و گەمەیان بەئێمە دەهات لەوەی سەرقاڵی جەنگێکی ناوخۆیی بێ ئەنجام و زۆر لە دەستکەوتنین.

***

پارتی نیشتمانی سۆسیالیستی هەنگاوی نا بەرەو دەست نیشانکردنی کێشە بنچینەییەکانی هۆکار لەم ململانێیەی نێوان لایەنگرانی فیدراڵی و ناوەندخوازان, پێویست بوو بەبێ ئەوەی ڕاستەوخۆ دەستی تێوەربدات بەشداربێت لەچارەکردنی ئەم کێشەیە و بۆچوونی خۆی لەبارەوە بخاتەڕوو, خەڵکان لە بیروبۆچوونی خۆی ئاگاداربکاتەوە لەهەمبەر دەوڵەتی یەکێتی (فیدراڵی) و دەوڵەتی یەککرتووی ناوەندی.

دەبوو بەتەواوەتی چەمکی دەوڵەتی یەکێتی دەست نیشان بکەین, چونکە ئەم چەمکە تەنانەت لەخوودی سەردەمی بسمارکیشدا بەهەڵە ڕاڤەی بۆکرابوو.

دەوڵەتی یەکێتی یان یەککرتوو چییە ؟

پێکدێن لە کۆمەڵێك دەوڵەتۆچکەی شکۆمەند کە بڕیاری یەککرتنیان داوە و دەستیان هەڵگرتووە لەهەندێك لەمافەکانیان و پێکەوە یەکێتیەکی بەهێزیان دروستکردووە.

بەڵام ئەم شێوە شیکردنەوەیە لەهیچ دەوڵەتێکی یەکێتی دا جێبەجێ نەکریاکە, هەرێمە یەککرتوەکانی ئەمریکا بەرئەنجامی ڕێککەوتنی کۆمەڵێك دەوڵەتی شکۆمەند نەبووە, واتا ئەو هەرێمانەی کە ئەم ولأتەی ئێستا پێکدەهێنن هیچ کاتێك بۆخۆیان خاوەنی دەوڵەتی سەربەخۆ نەبوونە و دەستیشیان لەهیچ مافێك هەڵنەگرتووە, بەڵکو بەسروشتی یەکیان گرتووە.

دەتوانین بڵێین ئەوە هەرێمەکان نەبوون یەکێتیان پێکهێناوە بەڵکو یەکێتیەکە بوو چەندین هەرێمی دیکەی هێنایە بوونەوە, هیچ هەرێمێك بە ئارەزووی خۆی دەستور دانانێت و ڕەفتارناکات , بەڵکو هەموو ولأت یەك دەستوری هەیە بەلأم بەپێی ناوچەکان گرنگی زیادتری پێدراوە.

هەمدیس شیکردنەوەی دەوڵەتی یەککرتوو بەسەر ئەڵمانیادا ناچەسپێت, لەبەرئەوەی سەرباری ئەوەی ئەم دەوڵەتانەی ئەم یەککتنەیان پێکهێناوە پێش لەیەککرتنە دەوڵەتۆچکەی سەربەخۆ بوونە بەلأم خوودی ڕایخی ئەڵمانیش بەرئەنجامی ڕێککەوتنی نێوان ولأتۆچکە ئەڵمانیەکان نەبووە, بەڵکو بەهۆی هێزداری پروسیاوەبووە, لەوەی توانیویەتی بەهێزی خۆی هەموویان بۆ یەك دەوڵەت ملکەچ بکات.

پارتی نیشتمانی کۆماری لەم خۆپیشاندانە بەشداربوو، بەشداربوانیش لەژێر سایەدا بە پەتەوی و خۆڕاگریەوە دروشمەکانیان بەرز دەکردەوە. دەستەکانی هێرش لەمیونیخ زۆر بەجوانی پێشکەوتنی بەخۆوە دەدیت و پێشەنگایەتی خۆپیشاندانەکەبوون، لەسەر شانی ئەمانەشدا پانزە ئالا دەشەکایەوە. ئەو دەمەی نیشتمان پەروەرە سۆسیالیستیەکان چوونە خۆپیشاندانەکەوە بەجوانی پێشوازییان لێکرا، گەورەیی قسەکردن بەناوی پارتەوە بەمن بەخشرا و لەوێدا وتارێکی خرۆشێنەرم بۆ شەست هەزار ئامادەبوو خوێندەوە.

لەم کاتەدا ئەندامی سور خواز هەوڵی تێکدانی ئەم خۆپیشاندانەیان دەدا بۆیە سەربازانی ئێمەی باش ئامادەکراو هاتنە دەست لێیان و لەماوەیەکی زۆر کەمدا سورەکان هەڵهاتن و بەم کارەش توانیمان بۆچوونی خەڵکی میونیخ لە سورەکان وەرچەرخێنین بەقازانجی خۆمان، ئەمەش هەلی ئەوەی پێداین بە ترسێکی کەمتر لەجارانەوە دابەزینە نێو شەقامەکان و ئەو ناوچەیە لەدەست دووژمن بسەنینەوە.

ئەم ئەنجامە دڵخۆشکارەی ئەو ڕۆژە گوڕی زیادتری پێداین لەبۆ پتر سووربوون بۆ سەرکەوتن.

٢-سەردانی کردنی بازێری کوبورغ

ڕێکخراوانی ڕەگەزپەرەستی ئەڵمانی بڕیاری بەستنی کۆبوونەیەکیان دا لەشاری کوبرغ. بۆخۆم بانگێشتی ئەم کۆبوونەوەیەکرام لەگەڵ داواکردنی هێنانی کۆمەڵێك لە لایەنگرام لەگەڵ خۆمدا بۆئەوشارە، بۆیە منیش بڕیارمدا دگەڵ خۆمدا هەشت سەد جەنگاوەری بەتوانا بەرم کەلە چوار دەستە پێك هاتبوون، لەڕێگەی شەمەندۆفێرەوە لەمیونیخەوە گواستمانیانەوە بۆ کوربورغ. بەخێرایی نامەمان بۆ لایەنگرانی پارتەکەشمان کرد لەبۆ خۆئامادەکردن لەو ناوچانەی کەشەمەندەفەرەکە پێیدا تێدەپەڕێت، لەهەموو وێستگەیەکدا دەستەیەك لە هەوادارانی نیشتمان پەروەرانی سۆسیالیستی ئامادەبوون، ئالاکانیان هەڵکردبوو، ئەمەش کاریگەری تەواوی لەسەر دەروونی دانیشتوانی ئەو ناوچانە هەبوو.

لیژنەی ڕێکخستنی کۆبوونەوەکە پێی ڕاگەیاندین: سەندیکای ناوخۆیی و پارتی سۆسیالیستی سەربەخۆ و پارتی شیوعی و دەستەلاتی ناوخۆیی شارەکە بڕیاریاندا لەڕێگەی ڕێککەوتن لەگەڵ دەستەی بەڕێوەبردنی کۆبوونەوەکەدا-لێرەوە ناموبورد

دیارەکەویت-کە لەکاتی چوونە ژوورەوەمان بۆ نێو شار نابێت بەهیچ شێوەیەك نە ئالا هەلبکەین و نەش گروپ ڕێکبخەین و نە مۆسیکی دروشمیش بژەنین....هتد.

بەبیٚ هیچ ڕاڕاییەك ئەمەم ڕەتکردەوە. ئەم مەرجانە نامۆبوون. بیٚ هیچ دوودڵیەك بیٚ ئابڕوویی ئەم قسە و ڕێککەوتنەم لەبۆ لیژنەکە ڕوون کردەوە. بە سەرۆکی لیژنەکەم گووت کە: هێزەکانی سوپای هێرش هەنوکە خەریکە تەڤلی نێو شار دەبن و لەڕێگەی ژەنینی مۆسیك و هەڵکردنی ئالا و وتنەوەی دروشمەوە دەچینە نێوشارەکەوە.

هەر وەشمان کرد.

پێش لەوەی لە گۆڕەپانی وێستگەکە بجولێین هەستم بە کۆبوونەوەی ژمارەیەکی زۆر خەڵك کرد. لەوەی ئامادەی تانە لێدانمان بۆئەمەش چاوەنواڕی ئاژەی پەنجەی دوژمنانمان دەکەن. زۆریان جنێو پێدایین. بەلأم ئێمە هیچ گوێمان لێنەدان و ڕیزی سوپاکەمان تێك نەچوو. لەڕێڕەوتی ڕۆیشتنمان بۆ هۆڵی هۆفمبرهۆس دا کە دەکەوتە ناوەڕاستی شارەوە خەڵکێکی زۆر لەدەورمان کۆبوونەوەو جنێویان پێدەداین. ئێمە وەها خۆمان پیشان دەدا هیچ نابیستیت. پۆلیس لەم کاتەدا بەبیانووی دروست نەبوونی شەڕ و پەلامار نەدانمان لەلایەن خەڵکەوە دەرگای هۆڵەکەی لیٚ توندکردین. بەلأم من بەخێرایی هاوارم کرد کە ئێوە دەرگاکە بکەنەوە و هەقتان نەبێت ئێمە بۆخۆمان ئامرازی گونجاوی بەڕێوەبردنی کۆبوونەوەمان هەیە و دەتوانین خۆمان بپارێزین. بۆیە پۆلیسیش بەناچاری دەرگاکەی کردەوە. لەکاتی نزیك بوونەوەی کاتی کۆبوونەوەکە تێم گەیاندن کە ئێمە دەبێت بڕۆین بۆ ناوەندی پارت لە کوربۆرغ. بۆیە هەمدیس ڕێگەی نوێمان گرتەوە پێش بەئاراستەی ناوەند و سرودی نیشتیمانیمان دەگوتەوە. ئەوکاتەی سورخوازان و هاوڕێکاکانیان( بانگەشەکارانی : سۆسیالیستی و برایەتی و یەکسانی) زانیان جنێو کارمان تێناکات دەستیان دایە بەرد تێگرتنمان. ئەمە سەربازانمانی تووڕەکرد و هەڵمەتیان بۆبردن و لەماوەی کەمتر لە دەخولەکدا کۆڵان و شەقامەکان چۆلْ بوون لە ئاژاوە گێڕان.

شەویش پێکداداانی زۆر توند ڕوویدا لەزۆر ناوچەی کوبورغ. سورەکان هێرشیان کردبووە سەر هەواداران و براکانی دانیشتوی ئەم شارەمان و زۆریان تێهەڵدابوون و دۆخیانیان تێکدابوو. هەرکە ئەم هەواڵە گەیشتە ناوەندی پارتمان هێزی تەواومان

نارده نێو شەقام و کۆڵانەکانی شارو توانیمان لەم خوێن ڕێژانە شار پاك بکەینەوەو هەموویانمان تیابرد. بەم کارەش توانیمان تارادەیەك شەقامەکانی کوربورغ لە سورخوازان بسێنینەوە کە بۆ ماوەیەکی زۆر بوو بۆ خۆیان داگیریان کردبوو.

بەلاَم مارکس خوازان پەندیان لەم دوو شەڕەی دوێنێ وەرنەگرت بۆ ڕۆژی دواتی بڕیاری خرپیشاندانیان دا لەدژی ئێمە و بۆئەمەش ژمارەیەکی زۆری کرێکاریان کۆکردەوە و ناونیشان و دروشمەکانیان بریتی بوون لێ: (نیشتمان پەروەرە سوسیالیستیەکان بۆئەوە هاتونەتە نێو شارەوە بۆئەوەی لەکرێکاری بەدەبەخت و بێ دەستەلاَت بدەن و بیان ترسێنن). هەرکە هەواڵم پێگەیشت فەرمانم بەسوپا کرد کە دەستە و یەکە و تیپەکانیان کۆبکەینەوە بەجۆرێك ژمارەی سەربازانمان بگاتە هەزار و پێنج سەد سەربازی بەتوانا و ئامادەی کتەك وەشاندن, لەپێشی ئەم هێزەوە بەرەو ناوچەی خۆپیشاندانەکان ڕۆیشتم, بەنیازی ئەوەی نەختێك ئەمانە بەچە ترسێن بکەین و بزانن ئێمە کێین. بەلاَم لەم گۆڕەپانەدا هیچ کەسێکی لێ نەبوو جگە لە سەدان پیری پەککەوتە و منداڵ و ژنی بێدەستەلاَت, بۆیە بڕیارمان دا هیچ هەنگاوێکی شەڕوانی نەنێین و بەئاشتی بەلایاندا تێپەڕین. مۆسیقامان لێدەدا و دروشمی خۆمان دەوتەوە.

بەڵێ ئەم خۆپیشاندانەی ئێمەش سەرکەوتوو بوو, توانی مەی بداتە دەروونە ماندووەکان, پاش اەوەی دانیشتوانی شارەکە تارادەیەك لێمان تێگەیشتن لەسەر شۆستەکان دەوەستان و فیت و هوریان بوو , واتە خۆشحاڵیان بۆ دەردەبڕین, لەشەودا ژمارەیەکی زۆری خەڵك وەکو لایەنگر بەرەو وێستگەی شەمەندەفەر بەڕێیان کردین, بەلاَم لەوێدا شتێکی سەیرتر هەبوو, ئەویش ڕەتکردنەوەی کارمەندانی تایبەت بە شەمەندەفەر بوو بەوەی نایانەوێت بمان گوێزنەوە بۆ میونیخ, ئەمەش لەڕێگەی هاندانی سەندیکا مارکس خوازیەکانەوە بوو, دنەدەرانم بەباشی تێگەیاند- کە لەشوێنێکدا کۆببونەوەو چاوەنوڕای کاردانەوەیان دەکردین-من گوێم لەوە نییە کە بەدەیان کەس لەئێوە لەگەڵ خۆمدا ببەمە نێو شەمەندەرەکەوە بە زۆر و خۆشمان ئەوکات شەمەندەفەرەکە لێدەخوڕین, سەرباری ئەوەی ناشزانین لێی بخوڕین, لەم کاتەدا بۆیە ئەگەر شتێك ڕوویدا ئەوە بەتەنها ئێمە تیاناچین بەڵکو ئێوەش دەمرن و

هەمان چارەنوسی ئێمەتان دەبێت، ئەمەش ڕێك بەپێی یاساكانی ئێوەی ماركسی گونجاوە.

بەڕاستی ئەم هەڕەشەم كاریگەری خۆی كردە سەر هەناوی سورخوازان، قیتارەكە لەكاتی خۆیدا دەستی دایە جوڵە و لەوێستگەی كوربرغەوە بەرەو میونیخ بەڕێ كەوتینەوە و بۆ ڕۆژی دواتر بە سەلامەتی گەیشتینە زێدی خۆمان، میونیخ.

پاش لەڕوداوەی كوربورغ سەربازانمان بەگیانێكی خۆبەخشانە و متمانەیەكی زیادتر لەجارانەوە بە خۆیان و پارت و سەركردەكانیان ڕەفتاریان دەكرد، ئەمەی وای كرد ئەوانەی باوەڕیان بە بزوتنەوەی نیشتمانی سۆسیالیستی هەبوو بڕوا بەوە بێنن كەڕۆژێك دێت ئەم بزوتنەوە یان پارتە دەبێتە خاوەن دەستەڵاتی تەواوی وڵات و سنورێك بۆئەم پەتایەی مارسیەت دادەنێت.

بەڵام دیموكراتی خوازان بە نیگەرانیەوە لێمانیان دەڕوانی لەوەی ڕێگەی هەڵمان هەڵبژاردووە بۆ بەرپەرچدانەوەی سەركسیە سورەكان، بەوەی لەڕێگەی بەكارهێنانی هێزەوە هێزیانمان لەناوبردووە، چونكە ئێمە لەوڵاتێكی دیموكراتیدا این نابێت ئەم شێوازە پەیڕەو بكرێت، ئەمە و چەندان قسە و ڕەخنەی دیكەی لەم شێوەیەیان ئاراستە دەكردین.

سەركەوتنەی كوربورغ هانی داین كون بەكون و شاربەشار و دێ بەدێ بەدووی ماركسیەكاندا بگەڕێین و پاكتاویان بكەین لەگوندایەتی و دەستەڵاتداریتیان بخەین، بەم كارەشمان پارتەكەمان توانی هەناسەی ئازادی بۆ باڤاریا بگەڕێتەوە هەموان بەبێ ترس بتوانن بپەیڤن و كۆبوونەوە ئەنجام بدەن. لەساڵی ١٩٢٢دا چەندین دەستەی دیكەی شەڕوان تەقلی سوپاكەمان بوون، بەمەش تادەهات ئێمە بەهێزتر و ماركسیەكانیش لاوازتر دەبوون.

٣-ئەوكاتەی فەرەنسیەكان ناوچەی ڕۆهەریان گرت لە ڕەشەمێی ١٩٢٣ دا ، پارت و ڕێكخراو و بزوتنەوە نەتەوەییەكان كۆبوونەوە و بڕیاری بەرپەرچدانەوەی داگیركاریان دا. ئێمەش ئەم هەلەمان قۆستەوە لەبۆ تاقیكردنەوەی سوپاكەمان وەكو سوپایەكی بەرگری كار لە نیشتمان، هەركە ئامانجەكانمان پێكا سوپاكەمان گێڕایەوە بۆ باری پێشووتری: سەربازی بزوتنەوە، ئامادەی بەهێزی و پارێزەری بالاكانن.

# بەشی نۆزدە

## ماسکی فیدرالیەت

لـەنێوان سـالانی ۱۹۱۹-۱۹۲۰ دا پارتـە تـازە دامەزراوەکـەمان ناچـاری دەسـت نیشـانکردنی هەلوێستی خۆی بوو لـە هەمبـەر ئاریشـەیەکدا کـە مقۆمقۆیـەکی زۆری لەسەربوو.

لەبەشێکی لەمەوپێشی ئەم پەرتووکەدا فاکتـەرەکانی شکسـت خـواردنی ولاتەکـەمم خسـتەڕوو لەکاتێکـدا سـەرقالی کێبڕکێـی دوژمنێکـی زۆر مەترسـیداربووین. تیشـکم خسـتە سـەر ئـەو حۆلاتـەی کـە دەزگاکـانی ڕاگەیانـدنی بـەریتانی و فەرەنسـی پـەنای تێگرتبوو لەبۆ ئافراندنی جیاوازی لەنێوان هەردوو بەشـی باکور و باشـوری ئـەلمانیا لەبەهاری ۱۹۱۵ دا بلاوکراوەکانی هاوپەیمانان بەسەرماندا دابارین کە تێیـدا پروسـیا بە تاوانبار و هەلایسـێنەری جـەنگ دەزانن و زسـتانی ۱۹۱٦ دا ئـەم تۆمەتـە ئاراسـتەی باشـوری ئـەلمانیا کـرا و هـانی قوتاربوونیـان دەدان لـە ژێـر دەسـتەلاتی پروسـیەکان. ناچـارین دان بەوەشـدا بنـێین کـە ڕووداوەکـانی پێکـدادانی نێـوان بـاکور و باشـوری ئــەلمانیا هەلبەســتراو نەبوونە ئەمــەش دەگەڕێتــەوە بــۆ ڕەتــاری بەســتووی دەسـتەلاتدارانی ئـەلمانیا و بەتایبـەت باڤاریا لـەوەی هـیچ هـەنگاوێکیان نـەنابوو لـەبۆ دژایەتی کردنی ئەو ڕۆژنامە ئەلمانیانـەی کـە داوای جودابوونـەوەیان دەکـرد. تـوڕەیی

گەل لەهەمبەر پروسیا و بنەماڵەی دەستەڵاتداری باڤاریا یەکەم جار لەمیونیخ ەوە دەستی پێکرد، ئەمەش بەهۆی خراپی بنەماڵەی فەرمانڕەوای وڵاتەوە بووە، ئەگینا ئەگەر گەل هەست بەچاکی دەستەڵاتێك بکات بۆچی دەیڕوخێنێت، لەم کاتەدا ئابوری نەتەوەیی لەلوتکەی خەوشداریدا بوو، تاکە دەستەڵاتیش لەبەرلین بوو، کە خەڵکانی ئاسایی بە پروسیای لەقەڵەم دەدەن.

گەل باش ئاگای لەوەبوو کە((بەرژەوەندیەکانی هەڵایسانی جەنگ)) کە بڕیاری لەسەر دەدرێت هەمووی لەبەرلیندا کۆبووەتەوە، بەڵام نەیان دەزانی ئەوانەی ئەم بەرژەوەندیانەیان ڕێکخستوەخەڵکانی بەرلینی و پروسیش نین، تەنانەت زۆرینەشیان هەر ئەڵمانی نین... بەڵام حکومەتی باڤاریادەوری لەهەموو شتێك دابوو، واتە ئاگاداری ئەم ڕەوشە بوو، بەڵام سەرباری ئەمەش خۆی گێل دەکرد لە تەوژمەکانی دژە پروسی لەبری ئەوەی بەڕوویدا بوەستێتەوە و ئەندێشە گەمژانەکانی یادگەی خەڵکی بپوکێنێتەوە.

بەڵام ئەو جولەکە فیلاویانەی کە((بەرژەوەندی جەنگ)یان دروست کردبوو، بۆئەوەبوو لەم کاتەدا گیرفانی هەموو خەڵك بڕن، هەستیان کرد گەر بێت و گەل بەمە بزانێت ئەوا چنگ دەخاتە بیناقاقای و دەیخنکێنێت بۆیەبڕیاری گواستنەوەی تۆوی دووبەرەکی دا لەنێو هاوڵاتیانی نیشتماندا، باڤاریای توندکرد لەهەمبەر پروسیادا، هەردووکیان کەوتنە دژبەری کردنی یەکتر، هەمووان زەرووە نێودەوڵەتیەکەیان لەبیر چووبوویەوە کە خوێنی خەڵکی دەمژن...

ئەم دۆخە بۆماوەیەکی زۆر بەم شێوەیە مایەوە تا ئەوکاتەی تۆوی شۆڕش وەرگیرا، جوولەکە و بەلشەفیکیەکان قۆستیانەوە لەبۆ هەڵوەشاندنەوەی نیشتمانی ئەڵمانی و داڕووتانەوەی لەهێز. ڕێکخەرانی شۆڕشی باڤاریا خۆی وەکو بەرژەوەندی بینی باڤاری دەدیت، لەکاتێکدا ئەمانە دوایین کەس بوون کەماڤی ئەوەیان پێبدرێت بەناوی گەلی باڤاریەوە بدوێن، ئەمانە جولەکانی ڕۆژهەڵاتی پاشەڵ لێڵ بوون.

ڕێکخەری شۆڕشەکەی باڤاریا، کورس ئەمیرنر، گرنگی بەوەدابوو کە پێویستە ئەم بزوتنەوەیە شێوازێکی هێرش بەری وەربگرێت لەناوچەکانی دیکەی ڕایخ دا، لەگەڵ پێداگری لەوەی دەرئەنجامی ئەم شۆڕشە هاوتای بەرژەوەندی جولەکە ڕەسەنەکان

بێت, جێبەجێ کاری ڕێنماییەکانی جولەکەی جیهانی بێت کە بروای وابوو بەر لەوەی هەوڵی بەلشەفی کردنی ئەڵمانیا بدات نەتەوەی ئەڵمانی هەڵبوەشێنێتەوە.

ئەوکاتەی هێزەکانی ئەڵمانیا باڤاریایان لەچنگی لایەنگرانی بەلشەفی قوتارکرد, ئەمانە بانگەشەی خەباتی سوریان کرد لەپێناو هێشتنەوەی دەستەڵاتیان, بەوەی دەیان گووت:(( نەبەردیی کرێکارانی باڤاریا لەدژی سەربازگەی پروسیە)). ئەم بانگەشە ئامانجدارانە دەنگدانەوەیەکی بەهێزی نەرێنی هەبوو لەبۆ ڕق ئەستوربوونی باڤاریەکان لەپروسیەکان و بەپێچەوانەشەوە.

لەم ساتە هەستیاریەدا بۆخۆم هاتمە گۆڕەپانی ئەم ململانێیەوە و کارم دەکرد لەبۆ ڕق لێنەبووەی هاوڵاتیانی ئەڵمانی لەیەکتر و داوام لێدەکردن هەوڵی یەکگرتنەوەیان بەهێزتربێت وەك لە جوداخوازی, بەڕاستی ئەرکێکی قورسم خستبووە سەرشانم, لە دەڤەر و گوند و شارە باڤاریەکاندا ئاستی ڕق لێبوونەوە لە پروسیەکان گەیشتبووە ترۆپك, ئەم سورخوازانە لەهەموو کونجێکی وڵاتدا ناوەندێکیان کردبۆوە کە ئەرکی تەنها دنەدانی خەڵك بوو لەلەرامبەر پرۆسیادا.

بڕیاری لەناوبردنی ئەم تەوژمەجودا خوازییەم دا, بۆیە چوومە کۆبوونەوەیەکی جودا خوازەکانەوە کەلە هۆڵی لۆفن -بروکلر لە میونیخ بەستبوویان, لەم کاتەشدا چەند هاوڵێکم لەگەڵدا بوو. پاش لەوەی یەکەم وتاربێژ قسەکانی تەواوکرد لەجێگەی خۆم لەنێو ئامادەبوانەوە هەستامە سەرپێ و باسی خراپیەکانی جوداخوازیم بۆ کردن و تێم گەیاندن لەوەی جودا بوونەوە تەنها بەقازانجی جولەکە و مارکسیە سورخوازەکانە و هیچی تر و هەر ئەمانیشن پیلان گێڕ و دنەدەران لەبۆ سەرکەوتنی ئەم نەخشەیەشیان هەموو کارێك دەکەن, ڕوونی قسەکانم ئامادەبوانی جوداخوازی تووڕەکرد و چەندین جار جنێوی ناشرینیان پێدام و هەوڵی بڕینی قسەکانیان دام, لەم کاتەدا هاوڵە بۆکس وەشێنەکانم لەهۆڵەکە تەوقیان دام و نەیان هێشت هیچ کەسێك ئازارم پێبگەیەنێت و بردمیانە دەرەوە.

بەردەوام بووم لە پووکانەوەی ئەم هەوڵە جودا خوازییە, بەمەش تادەهات لایەنگیرم زیادتر دەبوو, جاربەجاریش جودا خوازان زۆر بەتوندی هێرشیان کردوینەتەسەر و هەندێك لەهاوڵانیشم لەهۆش براونەتەوە و بەپەلکێشان فڕێ دراوەتە دەرەوەی هۆڵەکەوە, واتە جەنگ بوو جەنگی ڕاستەقینە.

دوای ئەوەی لەساڵی ١٩١٩ و مانگەکانی سەرەتای ١٩٢٠ دا پارت بۆچوونەکەی منی لەئەستۆگرت و ئەم ئەرکەی بەتەنها لەسەر شانی خۆم نەهێشت، هەموو هەنگاوێکمان بەیارمەتی ڕۆڵە باڤاریەکان بوو کە سنگی خۆی دەخستە بەر گوللەی قسە هەڵبەستراوەکانی جودا خوازان و نەیان دەهێشت هەوڵە کوشندەکەیان سەربگرێت.

ئەوکاتەی پارتەکەمان بەچڕییەوە خۆی تەرخان کرد لەبۆ دژبەری کردنی ئەم هەڵمەتە، جووەکان و یارمەتی دەرانیان پەنایان گرتە نەخشەیەکی نوێتر و بۆ تێپەڕاندنی ئەم نەخشە گڵاوەیان دەیان گووت: ئەم جموجۆڵانە تەنها بەمەبەستی دامەزراندنی دەوڵەتی ڕایخ بووە لەسەر بنەمای فیدراڵەت ، واتە پارچە پارچە کردنی و یەکگرتنی لەسەر بنەمای یەکێتی و فیدراڵیەت، ئەمەش بۆ نەهێشتنی مەترسیە لەسەر وڵاتانی دراوسێ، ئامانج لێرەدا تەنها پروسیایە، بەم هەنگاوە زانیمان جووەکان چییان لەژێر سەردایە و کارەکەی ئێمەیان ئاسانترکرد. پاشان ڕووداوەکەی دۆرتن دیارکەوت، کە ڕێنانی ناپاك هەوڵی جوداخوازی دا، بەم کارەش پەردە لەسەر چاوی خەڵەتاوانی باڤاری لاچوو، هەستیان کرد کە سەرکردەکانی بزوتنەوەی جوداخوازی و فیدڕاڵیەت دوو چەشنە سەرکردەی لەیەك جودان، ئەمانە بەکرێ گیراوانی دەوڵەتانی بیانین، کاربۆ فەرەنسا و ئینگلیز دەکەن.

تێبینی ئەوەشمان کرد، کە هەڵمەتە دڕندانەکە بەزۆری چڕکرابۆوە لەسەر دەستە پارێزگارەکان نەوەك دەستەکانی تریش، لەبەرئەوەی پارێزگاران هەستان بە ڕەتکردنەوەی دەستورەکەی فیمار کە باشوریە ئەڵمانیەکان و جووەکان دایان ڕشبۆوە، ئەو دەمەی جووەکان هەستیان کرد لقێنە جودا خوازیەکەیان بەرەو تیاچوون هەنگاو دەنێت، وازیان هێنا لە قۆڵاّبڕینی خەڵك و گەندەڵی کرد، کەوتە وێزی پارێزگاران و باڤاریاەکان و پروسیەکان و هەوڵی خۆشکردنی ئاگری جەنگیان ئەدا لەنێوانیاندا.

سەرباری هەموو ئەمانە کەچی گەل هێشتاکە بەخەوەر نەهاتبۆوە و هەر لەبێشکەی گێژکاری جوولەکەدا خەوێنرابوون،نەیان دەزانی جووەکان گەمەیان پێدەکەن. لە زستانی ١٩١٩ من و یاوەرانم هەوڵی ئاگادارکردنەوەی خەڵکم دا لەمەترسیەکانی جوولەکە بەڵام خەڵکی عەوام ئەم بۆچوونانەی ئێمەیان ڕەت کردەوە بەبیانووی ئەوەی

ئێمە ڕەگەز پەرەستین. دەبێت دان بەوەشدا بنێین کە چاکەی وروژاندنی دژە جولەکە دەگەڕێتەوە بۆ ڕێکخراوی ((کۆمەڵەی بەرگری و هێرش) کەلە هەمان ساڵدا دامەزرابوو. هەرکە پارتی نیشتمانی سۆسیالیستی ئەم بیرۆکەیەی وەرگرت و کردیە تەوەری کاری بزوتنەوەکەی خەڵکێکی زۆر شوێنی کەوتن. بەلأم جووەکان زۆر سەگانە ئاسان بۆنی ئەم مەترسیەیان کرد و خۆیان بۆ بەرگری کردنی توند ئامادەکرد، کە پشتی بە پیلانگێڕی کۆن بەستبوو. لەسێ ڕۆژنامەی بەکرێ گیراودا کێشەی ئاینی لەنێوان پرۆتستانتی و کاسۆلیکی خرایە ڕوو، ئەمەش وای کرد هەموان لەنێو خۆیلندا دووبارە دابەش ببنەوە.

بەم کارەش جووەکان توانیان جارێکی دیکە سەرکەوتن بەدەست بێنن، خەڵکی بەلاڕێدا ببەن. لەنێوان ئێوارە و گزەنگێکدا حەسرەتیان جووی دوژمنی هاوبەشیان لەبیرکرد و کەوتنە وێزی یەکتر، ئەم کەسە نامۆ قژ ڕەش و لووت درێژەیان لەبیرچوویەوە کە بووەتە بار بەسەریانەوە و پیلانیان لەدژ دەگێڕێت و خوێنی پاکی ئاری پیس دەکات، لەبیریان چوو کە ئەوە جووەکانن دوژمنی سەرسەختی لەمێژینەی حەسرەتیان، جووەکان جیاوازی ناکەن لەدژایەتی کردنی کاسۆلیك و پرۆتستانت، جووەکان دوژمنی کەوناى ئاری خوێن پاك بووە، لەناوبەری ژیاری و هەڵگرانی مەشخەڵی شارستانی بووە.

هەموو ئەو ڕوونیانەیان نەدەبینی و هەنگاویان بەرەو مقۆمقۆیەکی زڕ نا کە دوور بوو لە ناوەڕۆکی ئاینەوە بەدووری نێوان زەوی و ئاسمان، ڕۆژنامە مارکسی و کافرەکان خۆبەخشانە بڕیاریاندا زەیت بکەنە سەر ئاگرە داگیرساوەکەوە لەڕێگەی بلأوکردنەوەی بۆچوونی ترۆڵەوە.ئەوەی ڕەگەز پەرەستان سنورێك بۆئەم ناکۆکیە ناپێویستە دابنێت هاتنە نێو جەنگەکە و شەڕیان لەڕەگەزە گۆڕی بۆ مەزەب و ئاین.

لەم کاتەدا جووەکان لەنێزکەوە لە پیسبوونی خوێنی ئێمە و بێ ئابڕوو بون و تێکدانی بەرژەوەمدیەکانمایان دنواڕی، لەم کاتەدا دوژمنانی دەرەکی ئەڵمانیا سەرقاڵی دابەشکردنی زەوی و دەستکەوتەکانی جەنگ بوون و گەمەیان بەئێمە دەهات لەوەی سەرقاڵی جەنگێکی ناوخۆیی بێ ئەنجام و زڕ لە دەستکەوتنین.

***

پارتی نیشتمانی سۆسیالیستی هەنگاوی نا بەرەو دەست نیشانکردنی کێشە بنچینەییەکانی هۆکار لەم ململانێیەی نێوان لایەنگرانی فیدراڵی و ناوەندخوازان، پێویبست بوو بەبێ ئەوەی براستەوخۆ دەستی تێوەربدات بەشداربێت لەچارەکردنی ئەم کێشەیە و بۆچوونی خۆی لەبارەوە بخاتەڕوو، خەڵکان لە بیروبۆچوونی خۆی ئاگاداربکاتەوە لەهەمبەر دەوڵەتی یەکێتی (فیدراڵی) و دەوڵەتی یەکگرتووی ناوەندی.

دەبوو بەتەواوەتی چەمکی دەوڵەتی یەکێتی دەست نیشان بکەین، چونکە ئەم چەمکە تەنانەت لەخوودی سەردەمی بسمارکیشدا بەهەڵە ڕاڤەی بۆکرابوو.

دەوڵەتی یەکێتی یان یەکگرتوو چییە ؟

پێکدێن لە کۆمەڵێك دەوڵەتۆچکەی شکۆمەند کە بڕیاری یەکگرتنیان داوە و دەستیان هەڵگرتووە لەهەندێك لەمافەکانیان و پێکەوە یەکێتییەکی بەهێزیان دروستکردووە.

بەلأم ئەم شێوە شیکردنەوەیە لەهیچ دەوڵەتێکی یەکێتی دا جێبەجێ نەکریاگە، هەرێمە یەکگرتوەکانی ئەمریکا بەرئەنجامی ڕێککەوتنی کۆمەڵێك دەوڵەتی شکۆمەند نەبووە، واتا ئەو هەرێمانەی کە ئەم ولأتەی ئێستا پێکدەهێنن هیچ کاتێك بۆخۆیان خاوەنی دەوڵەتی سەربەخۆ نەبوونە و دەستیشیان لەهیچ مافێك هەڵنەگرتووە، بەڵکو بەسروشتی یەکیان گرتووە.

دەتوانین بڵێین ئەوە هەرێمەکان نەبوون یەکێتیان پێکهێناوە بەڵکو یەکێتییەکە بوو چەندین هەرێمی دیکەی هێنایە بوونەوە، هیچ هەرێمێك بە ئارەزووی خۆی دەستور دانانێت و ڕەفتارناکات ، بەڵکو هەموو ولأت یەك دەستوری هەیە بەلأم بەپێی ناوچەکان گرنگی زیادتری پێدراوە.

هەمدیس شیکردنەوەی دەوڵەتی یەکگرتوو بەسەر ئەڵمانیادا ناچەسپێت، لەبەرئەوەی سەرباری ئەوەی ئەم دەوڵەتانەی ئەم یەکگتنەیان پێکهێناوە پێش لەیەکگرتنە دەوڵەتۆچکەی سەربەخۆ بوونە بەلأم خوودی ڕایخی ئەڵمانیش بەرئەنجامی ڕێککەوتنی نێوان ولأتۆچکە ئەڵمانیەکان نەبووە، بەڵکو بەهۆی هێزداری پروسیاوەبووە، لەوەی توانیویەتی بەهێزی خۆی هەموویان بۆ یەك دەوڵەت ملکەچ بکات.

لەوکاتەدا پروسیا گەورەترین دەوڵەتی ئەڵمانی بووە لەڕووی ڕووبەرەوە، لەواری میهرەبانیشدا پێشەنگ بوە، تواناداربووە لەبۆ لەئەستۆگرتنی ئەرکی دامەزراندنی دەوڵەتێکی ئەڵمانی یەکگرتوو. هەروەها ئەو شکۆمەندیەی دەوڵەتۆچکە ئەڵمانیەوکان هەیان بوو تەنها بەناو هەیان بوو، واتە هەرخۆیان لاواز و هیچ بوونە و چاوەنوارِی هێزێك بوونە هەموویان یەك بخاتەوە بۆ ئەوەی بەهێزبنەوە.

لەمێدا واری وەنییە باس لە چۆنێتی دروستبوون و گەشەکردنی هەرێمە ئەڵمانیەکان بکەین. لەم سەردەمەدا زۆرینەی هەرێمەکانلەوپەڕی دۆخی لاوازیدا بوونە و بەرەو دارِمان چوونە.

ئەوکاتەی بسمارك هەستا بەدامەزراندنی ڕایخی ئەڵمان ئەم قسانەمان ڕاستی بوونی خۆی سەلماندبوو، بەپێی گرنگی و بەهێزی هەرێمەکان نوێنەر دەنێردرا بۆ ئەنجومەنی (بۆند سرات)، کە ژیری و میانڕەوی پەیڕەودەکرد لەبۆ بەهێزکردنی دەستەلآتی ڕایخی لەسەر یارمەتی دەوڵەتۆچکە پێکهێنەرەکانی، لەگەڵ ڕێزگرتن لە نەریتی باوی هەرێمەکان. ئەوانەی ئێژن تەنها بسمارك بەم چەشنە یەکگرتنە دەستە وەستان وەستا و هەوڵی بەهێزتربوونی یەکێتیەکەی نەدا ئەوا ڕاست ناکەن. ڕوانێژکاری پۆلآینی ئەڵمان ئەوەی ئەنجامی دابوو ئەنجامی داو باقیەکەشی بۆ سەرکردەیەکی دیکە بەجێ هێشت بۆئەوەی ئەرکەکە تەواوبکات، چونکە قەڵەم بازی گەورە بەرئەنجامی مەترسی داری هەیە، بەم ڕێگە ڕاستەی توانی ژیری و دووربینی و ڕاست لۆژیکی خۆی بسەپێنێت و ببەڵگێنێت. ڕۆزگار هەمان ڕەوتی بسمارکی بۆ تەواوکردین،لەوەی تادەهات ڕایخ بەهێزتردەبوو لەڕێگەی لەخۆگرتنی دەوڵەتۆچکەکانی دیکەی ئەڵمانییەوە. هەرکە ڕژێمەیپاشایەتی توایەوە بەهۆیشکستی جەنگەوە سەرجەم دەوڵەتۆچکە ئەڵنایەکانیش هێزیان لەبەر برا، هەندێك لەم دەوڵەتۆچکە خەیالآویانەمان دیت کەچلۆن پاش هەڵوەشاندنەوەی پاشەیەتی چوونە پاڵ دەوڵەتانی داگیرکار و خۆیان پێوە هەڵواسین و بوون بەبەشێك لەوان.

هەرچەندە شکستی جەنگ گورزێکی بکوژی ئاراستەی یەکریزی گەلی ئەڵمانی و هاوپەیمانێتیەکانی کرد، ئەمەش بەهۆی پەیمان نامەیەی ئاشتی بەسەرئێمە سەپێنراو بوو، بەلآم هەمدیس بەهۆی زۆری پێویستی دەوڵەت بەدارایی بەناچاری

ڕایخ دەستی گرتەوە بەسەر سەرجەم بەشەکانی پێشووی خۆیدا و هەموو سامان و دەرامەتەکانی لەهەموو ناوچەکانی وڵاتەوە بردەوپێدا. لەبەرئەنجامی ئەمەشدا خۆماڵی کردنی هێڵی ئاسن و پۆستە هاتە ئاراوە ئەگەر پارتە ئەڵمانیەکان بیان زانیبایە چۆن دەتوانن بەئارەزووی خۆیان کۆتایی بەجەنگ دەهێنن ئەوکات ڕایخیش نەدەبووە سەرداریان.

فرمێسک ڕژێنە تیماسحیەکان هەر ئەو کەسە شکست خواردوانەن کە هۆکاری شکستەکە بوون و دەیانەوێت بە فرمێسک ڕشتن پەردەپۆشی کارە گەنەکیانیان بکەن ئەمانە چالاکانە بەشداربوون لەلەناوبردنی ئەو بنەمایانەی کە بسمارکی ڕاوێژکار دایڕشتبوویەوە لەبۆ دروستبوونی دەوڵەتی فیدراڵی. لەم کاتەشدا ڕایخ بە خوود پەرەست تۆمەتباردەکەن. ئامانجیشیان لەمە تەنها خۆجوانکردنە لەبۆ بەدەست هێنانی زۆرترین دەنگەکانی جەماوەر لەوەش خراپتر هەندێک لە پارتە بەدەکان گەرەکیانە ڕقی ناخی جەماوەر لە حکومەتە یەککگرتوەکەی بەرلین بگێڕنەوە بۆ ئەوەی کە جەماوەر ڕقیان لە ڕایخ ە' چونکە دەستی گرتووە بەسەر باری دارایی هەموو هەرێمەکاندا و بەئارەزووی خۆی بەکاری دەهێنێت

ئا بێگومان گەل ئەڵمان ڕقی نییە لەڕایخ مان؛ تەنها لەبەرئەوەی دەسەڵاتی لەهەرێمەکانی وەرگرتوتەوە. بەڵکو بەهۆی ئەوەوە ڕقی لێی دەبێتەوە کە ئاوات و ئارەزووەکانی بەدی ناهێنێت ئەم ڕایخەی هەنووکە،ڕایخی دوای شکستی جەنگ، بەدووره لەدڵگیرکردنی ئەڵمانەکانەوە. گەرچی یاسا توند وهێزە شەرخوازەکان کۆمارەکەش دەپارێزن بەڵام هەرگیز ناتوانێت ئەم دامەزراوەیە لەدڵی یەک ئەندامی ڕاستەقینەی گەلی ئەڵمانیدا خۆشەویست بکات

ئەمەش بەهۆی ئەوەوەیە کە هەرگیز هیچ گەلێك لفاوی خۆی ناداتە دەستی دەسەڵاتێکەوە کە خۆی گوێڕایەڵی هێزە شکست پێهێنەرە دەرەکیەکانە ئەو دەوڵەتانەی سەرچاوەی هەموو ئەهامەتیەکانی وڵاتن ' پێشتر گەلی ئەڵمانی بەشداربیەوە دەبێکووت سەربە ڕایخ م چون ڕایخ لەناوخۆدا هەموو هەوڵێکی دەدا ئەو دامەزراوەیی خۆش گەرمایی لەوڵاتدا و لەدەرەوەشدا نیشانەی بەهێزی و گەورەیی پێوە دیارەوە بەڵام ئەم کۆمارە ڕێك پێچەوانەیە لەناوەوە گەل کوژە و لەدەرەوە بەدەرووبەی ناوبرێت و ملکەچی هەموانە ئەمەش ماتای وایە هەرکەسێ

نەختێك ژێربێت هەرگیز بەم دۆخە قایل نابێت. دەوڵەتێك نەتەوەیی بێت پێویستی بەیاسا و مادە وبڕگەی یاسایی ئاڵۆز و زۆر نییە, چونکە هەموان ڕێزی دەگرن و کەم سەرپێچی ئاڵۆز دەکەن, بەڵکو پشتیوانیشی لێدەکەن و نابنە هۆی بۆگەن بوونی ناوی دەوڵەتەکەیان لەدەرەوە. بەڵام هەر وڵاتێك مۆرکێکی نێودەوڵەتی بەسەرەوەبێت ئەوا ئەهامەتی تەنها بۆ هاوڵاتیانی خۆی دێنێت و بۆ بچووکترین کاری هێزی کوشندە بەکاردەهێنێت, چینێك دەبنە باڵادەست و ئەوانی تریش کۆیلە و ژێردەست, بەڕاستی ئەم حکومەتی ئێستای ئەڵمانیا درۆدەکات کە گەل بەهاوڵاتی ئازاد لەقەڵەم دەدات, بەڵێ لەڕایخی پێشوودا هاوڵاتی ئازادبوو, بەڵام لێرە تەنها کۆیلەن و هیچی دی, تەنانەت خوودی گەورە و سەردارانی ئەم کۆمارە خۆشیان کۆیلەی بێگانەکانی دەوڵەتانی دەرەوەن, لەم وڵاتە هاوڵاتی بوون نەبوونە و ئاڵای نەتەوەیی نییە لەبوونە. ئەو نیشانەیەشی ئەم کۆمارە هەڵی بژاردەوە گەل دانی پێدا نانێت و لێی بێزار و جارسە.

ئەم کۆمارەی ئێستا تەنها بۆ دەستکەوتی دارایی دەست درێژی ناکاتە سەر هەرێمەکان بەڵکو بەپاڵنەری چەندین فاکتەری دەروونی ئەم کارە دەکات, لەگەڵ پەیڕەوکردنی ڕامیاری باجی زۆر هەڵدەستێت بە بەرتەسك کردنەوەی ئازادی ڕادەربڕین بەزۆر, چون باش دەزانێت ڕقێکی زۆر لەهەناوی جەماوەردا لەدژی کۆبووەتەوە و ڕەنگە ڕۆژێك بێت و شۆڕشێك لەدژی هەڵایسێنن, ئەم کۆمارە واخەریکە بەتەواوەتی دەستەڵات لەدەست هەرێمەکانی وەردەگرێتەوە و لەهەموو چەشنە دەستەڵاتێك دایان دەڕووتێنێتەوە.

هیچ گومان لەوەدا نییە کە دەوڵەتە خاوەن ژیاری و شارنشینەکان بەرەو ناوەندگیری پەنادەبەن, ئەمەش بۆ ئەڵمانیا نەشیاو نییە. کەواتە لەم کاتەدا زۆر گەمژانەیە خووبگرینەوە بە دەوڵەتۆچکە ئەڵمانیەکانەوە لەبەڕێوەبردنی وڵاتدا کە پێشتر پشت بەستوو بە بە حکومڕانیەتی پاشایەتی, هەروەها سیستمی فیدڕاڵیەت بۆئەو کاتانە گونجاو بوو کە ئامرازەکانی گواستنەوەو گەیاندن لەسەرخۆبوون. بەڵام لەمڕۆدا هۆکاری گواستنەوەی خێرا ڕێگاکانی کورت کردۆتەوە و لە میونیخ ەوە بۆ بەرلین بەچەند کاتژمێرێك ڕێگەکە دەبڕێت.

کەواتــە هــەنگاونان بــەرەو ناوەنــدێتی پێشــکەوتنێکی گەورەیــە و دەبێــت پەیڕەوبکرێت. بەڵام لەم کاتەدا بۆئێمەی نیشتمانپەروەری سۆسیالیستی ناچارین دژایەتی ئەم حکومەتە ناوەند خوازەبکەین! چونکە بەهەڵە و بۆمەبەستی هەڵە ناوەندبوون بەکاردەهێنێت...ئەم ڕایخەی ئێستا هەڵنەستاوە بە خۆماڵی کردنی ڕێگەی ئاسن و پۆستە و..هتد لەڕێگە و مەبەستی نەتەوەییدا, بەڵکو ئەم کارەی ئەنجامدا لەبۆ خزمەتکردنی هاوپەیمانانی و دژایەتی کردنی دژبەرانی. ئەمەش وای لێکردووین پارتەکەمان سەنگەری دژە ناوەندخوازی هەڵبژێرێت, هەروەها فاکتەرێکی دیکەش هەیە کە وادەکات ناوەندخوازی ناپەسەند و ناماقوڵ بێت, ئەویش, ئەمە دەبێتە هۆی پشت ئەستووورکردنی شێوەیەکی حوکمڕانی کە لەکۆن و ئێستا و داهاتوشدا پشت گوێخاری نەتەوەی ئەڵمانی یە. لەبەرئەوەی ئامانجە بەراییەکانی پارتەکەمان لەناوبردنی سیستمی (دیمۆکراتی-جووخوازی) ی و دامەزراندنی دەوڵەتێکی ڕەگەزیە کە تێیدا هەموو کەسێکی گونجاوی تێدا دەستەبەربێت لەبۆ داهێنان و کارکردن. بۆیە بڕیارمان دا لەگەڵ ئەو پارتانەی ڕایخدا هاوکاری یەکتر بکەین کەدژە ئەم حکومەت و شێوە حوکمڕانیەی ئێستان و هەوڵی دامەزراندنی ڕایخێکی نوێ دەدەن. بۆئەمەش ئەوپەڕی هەوڵدەدرێت ئەم کێشەیە بەهەموان بناسێندرێت و بکرێتە بابەتێکی نەتەوەیی و ئەڵمانی، نەوەك بەو شێوەیەی کە (پارتی گەلی باڤاری)دەیەوێت. کە کێشەکە بە کێشەیەکی ناوخۆیی سادە و خاوەن ڕێچکە تایبەت لەقەڵەم دەدات.

سەرباری ئەو دوو هۆکارەی پێشوو، هۆکاری سێیەمیش لەبووندایە, کە گرنگیەکەی لەوان کەمتر نییە. بێگومان بووین لەوەی کە جووەکان لەپشتی هەنگاوەکانی حکومەتی بەرلینەوەن لەبۆ بوون بە دەستەڵاتێکی ناوەندخوازی ڕەها, کە پێیان دەگووت: ( خۆماڵی کردن بۆ بەرژەوەندی ڕایخی ئەڵمانی). ئەمەش بۆئەوەبوو دەستەڵاتی تەواو لە حکومەتە بچکۆلانەکانی هەرێمەکان وەربگیرێتەوە و جووکان خۆیان ببنە وەبەرهێنەری سەرەکی ناوچەکان و بەهەوەسی خۆیان کاری وەبەرهێنان بکەن و هەموو شتێك لەوناوچەیە بەتەنها بەلایەنگرانی خۆیان ببەخشن و ئەوانی تریش لاوازبکەن. پاش لە خۆماڵی کردنی پۆستە حکومەتی ڕایخ هەستا

بەلابردنی کۆنە کارمەندەکانی پۆستە و لەجێگەیاندا کارمەندی لایەنگیری خۆیانی دانایەوە، جووەکان سێ لەسەر چواری سەرپەرشتە کاربەدەستەکانیان پێکدەهێنا.

دژبەری کردنی ئێمە بۆ ناوەندخوازی هیچ کاتێك مانای ئەوەنییە کە ئێمە بەتەواوەتی ئەم بنەمایەی فەمانڕەوایەتی ڕەت دەکەینەوە، نەخێر، بەڵکو ئێمە مەبەستمان فراوانترکردنی دەستەڵاتی ڕایخە. لەبەرئەوەی دەوڵەت لەڕوانگەی ئێمەوە تەنها دەوڵەت لەشێوەیەکی خراوە ڕوو زیادتر نییە کە گەل لەخۆ دەگرێت. بەرژەوەندی دەوڵەت دەبێت ببەسترێتەوە بەبەرژەوەندی گەلەوە و پێکەوە بگونجێندرێن. لەبەرئەوەی هەر دەوڵەتۆچکەیەکی ئەڵمانی خاوەنی نەریتی جودابووە و ئەمەش کێشە و ململانێی پەیداکرد لەوڵاتدا بۆیە ئێمە لەم کاتەدا دان بەم دەوڵەتۆچکانەدا نانێین و ناشهێڵین بەسەربەخۆیی کاروباری دەرەوە ئەنجام بدەن، چونکە ئەم کێشە ناوخۆییە لەپایتەختی ولآتانی تری بێگانە و دژە ئەڵماندا لاوازی ڕایخ دیاردەخات و حەزی چاوبرسیان بەئەڵمانیا پتر بەهێزتر دەکات.

ئەو دەوڵەتە نەتەوەییەی ئامانجمانە پونێتی بنێین یەك دەوڵەتی یەککگرتوو دەبێت، بەڵام هەمدیس ناوەندخوازی بۆ ستەمکردن بەکارناهێنین، هەمدیس بۆ دژایەتی کردنی تایبەت مەندیەکانی باڤاری و ڕۆڵەکانی ساکسی و پروسیەکان و..هتد بەکاری ناهێنین بەڵکو هانی مانەوەی میونیخ دەدات وەکو پایتەختی هونەری ئەڵمانی باڵا و لیبزیغ یش پایتەختی زانست، بەڵام هەرگیز دان بەوەدا نانێت کەباڤاریا و ڕۆڵەکانی ساکس بۆخۆی خاوەنی سوپایەکی جلك و مەشق و تایبەت مەندی جودابێت. سوپای ئەڵمانی لەدەوڵەتی نەتەوەییدا دەبێت بەدووربێت لەهەر تایبەت مەندییەکی ناوچە و هەرێم خوازی، بەجۆرێك لەدەوڵەتی نەتەوەییدا هەموو نەریت و حەز و خواستە تایبەتیەکان دەتوێنەوە، سەربازی باڤاری لەبیری دەچێتەوە خاوەنی دوو نیشتمانە: باڤاریا نیشتمانی بچووك و ڕایخ نیشتمانی گەورە، تەنها خۆی بۆ خزمەتکردنی نەتەوەی ئەڵمانی تەرخان دەکات.

گووتم پارتی نیشتمانی سۆسیالیستی دژی حکومەتی ناوەندخوازی ئێستایە کە بەهەڵە ئەم دەستەڵاتە بەکاردەهێنێت.

بەڵام هەر هەنگاوێك کەتایبەت بێت بە ناوەندی کردنی سوپا ئەوا ئێمە پشتگیری لێدەکەین. نابڕووبەری نییە کە سەربازانی باڤاری تەنها کار بۆ میونیخ بکەن و

لەسەربازگەکانی ئەویندابن و وەچەکانی وارتەمبورخیش لە سەربازگەکانی شتوتگارتدابن و هاوڵاتیانی میرنشینی فرنکونی لەسەربازگەکانی نورمبرغدابن" چاکتر نییە ئەگەر سوار بەڤاڵاریەکان بدرێت کونج بەکونی وڵاتەی بگەڕێت و سەیری ڕینانیا و ستاڤالیا و ناوچەی دەریای باکور بکات و ڕێگە بە ڕۆڵەکانی هامبورگ بدرێت ئەلپ ببینن و ڕۆڵەکانی پرسیاش بۆماوەیەک لە میونیخدا ببیننەوە "

ئیمە داوای دەوڵەتێکی ناوەند خوازی وەها دەکەین کەتەواوکاری ئەنجامدراوەکانی بسمارک بێت. گرنگی بەهەموو وڵات بدات بەبێ زاڵکردنی چەشنە کلتورێک بەسەر هەمویاندا ئەمەش لەڕێگەی یەکخستنی سوپا و پێدانی ماف بەهاوڵاتیان و ڕێگەدان بە ئازادی ڕادەبڕین لەبۆ خزمەتکردنی نەتەوەکەیانەوە دەبێت.ئەم چەشنە ڕامیاریە وا لەهەرێمەکانی ئەڵمانیا دەکات بەبێ هیچ کێشەیەک دەست لەماف خۆبەڕێوەبردن هەڵبگرن و لەچوارچێوەی یەک دەسەڵاتی یەکگرتوودا یەکبگرنەوە



هتلەر لەکاتی بیرکردنەوەدا

ئەوکاتەی بۆچوونەکانی پارتی نیشتمانی سۆسیالیستی بالآدەست دەبێت ئەوکات دەوڵەتێکی ڕەگەزی چیّ دەبێت.

جوداخوازانی کەونارای باڤاریا تۆمەتی یەکلایی کردنەوەی خۆمان لەبۆ کارکردن بۆ بەرلین دەدەنە پاڵمان, سورەکان بە گۆشەگیر و توندڕەو ناومان دەبەن, بەلین دەڵێت ئێوە ڕێگرن لەپێش دەوڵەتی مەرکەزی ئێمەدا!

ئێمەی بزوتنەوەی نیشتمانی سۆسیالیستی هیچ کات بەردەستە و خزمەتکاری بەرژەوەندەیەکانی جواداخوازان و مارکسی و بەرلین نشیان نەبوینە, بزوتنەوەکەی ئێکە بڕوای بەهیچ سنورێك نییە کە لەنێوان ڕەگەزی ئەڵمانی ئاریدا دانرابێت و خۆی یەکلایی کردۆتەوە بۆ دروستکردنی ئەڵمانیایەکی یەکگرتووی خاوەن یەك نەتەوە و ڕەگەز, کەبەردەوام بەرەو سەرکەوتن هەنگاوبنێت لەئاست ناوخۆیی و دەرەکەیشدا.

# بەشی بیستەم

## بانگەشە وڕێکخستن

سـاڵی ١٩٢١ بـۆ خـوودی خـۆم و بزوتنـەوەی نیشـتمانی سۆسیالیسـتی واتایـەکی تایبەتی هـەبوو. بەچەند مانگێك پاش لە تـەقڵ بوونم بۆ نێو بزوتنـەوەی کرێکارانی ئـەڵمانی کـاری بانگەشـەکردنم بۆپـارت لەئەسـتۆگرت، هەرلەیەکـەم سـاتەوە هەسـتم بەوەکرد کە کاری من لەڕێکخستن قورسترە، بەوەی ڕێکخستن کارێکی خۆویستانە و پـلان بۆدارێـژراوە و هـەمان بیرۆکـە بڵاودەکاتـەوە، کـاری بانگەشـە پـێش لـە ڕێکخستنەوەیە و دەبێت بیرۆکەکانی پارت بەزۆرترین خەڵکی بگەیەنرێت لەڕێگەی بانگەشەوە ئەوکات دەتوانرێت ڕێکخستن بکرێت. هەروەها باش دەمزانی ڕێکخستنی نـاڕێکخراو نابێتـە هۆکـاری دروسـتبوونی ڕێکخراوێکـی بـەهێز و زینـدوو؛ چـونکە ڕێکخراوەکـان بـوونی خۆیـان لـە بوونـەوەرێکی زینـدووەوە دەبیننـەوە کەبەشـێوەیەکی چاوەنواڕ نەکراو بەردەوام لەگەشەدابێت.

ئەودەمـەی دەسـتەیەك دەبنـە خـاوەنی یـەك بیرۆکـە حـەزی ڕێکخسـتیان لادروسـت دەبێت لەبۆ پێکهێنـانی ڕێکخـراو یـان پارتێـك، ئـەم هەسـت و پەلکێشـانە بـەهای خـۆی هەیـە، زۆرجـار یـەکێك لـەنێو ئەمانـەدا دیاردەکـەوێت کەلـەوان بـەهێزترە بـۆ بـوون بەسەرکردە و دۆخەکە لەبەرژەوەندی خۆیـدا هەڵدەچەرخێنێت، ئـەم چەشـنە هـەنگاوە

بەر لە تەواوکردنی کاری ڕاستەقینەی بزوتنەوەکە نابێت هەنگاوی ڕاستەقینەی بۆ بنرێت، ئەگینا دژخەکە هەمووی تێکدەدات.

لێرەوەش پێویستی بڵاوکردنەوەی بیرۆکەی پارتەکە دەبێتە ئەرکی سەرەکی و دەبێت هەوڵی کۆکردنەوەی زۆرترین کەس بدرێت لەدەوری بزوتنەوەکە. لەبۆ دۆزینەوەی ئەو کەسانەی بەڕاستی توانای بوون بەسەرکردەیان هەیە، ئەمەش دوای ئەزموواندنی ئەو کەسانە دەبێت. ئەوانەی واهەست دەکەن ئەو کەسانەی تێرن لە زانستی بیردۆزی گونجاوترینن لەبۆ بوون بەسەرکردەی یەکەم و بالاّ ئەوا هەڵە بیردەکەنەوە؛ چونکە گەورەیی بیریار زۆر کەم کاریگەرە لەبواری ڕێکخستندا، مەزنی بیریار تەنها لەداڕشتنەوەی یاساکاندا دەبێت، بەلاّم ڕێکخار پێویستی بە پیاوی ڕاستەقینەی کارکردەیەو پێتڤی بەدەروون زانی مرۆییە، کە بتوانێت کێشەکان لەسەر بنەمای بابەتی چارەبکات، نابێت هیچ کەسێك خاڵە لاوازەکانی مرۆڤ و حەزە ئاژەڵیەکان لەبیربکات ئەوکاتەی دەیەوێت ڕێکخراوەیەکی سەرکەوتوو پونێت بنێت.

کەمجار هەیە خاوەن بیرۆکە بتوانێت ببێتە سەرکردەی ڕاستەقینە، بەزۆری سەرکردەکان لەنێو جەماوەرەوە دێنە بوون کە بەباشی دەروونی جەماوەر شارەزان، ئەمەش بەهۆی تێکەڵاوبوونی خاوەن بیرۆکە و بیریارانە لەوەی گۆشەگیرەبن و نوقمی بیرۆکەی دوور لەخەڵکن، لەبەرئەوەی سەرکردایەتی و ئاراستەکردن پێویستی بە هەست بزواندنی زۆرینەیە، بۆیە تواناداریی بیردۆزی وشەکەکانی خاوەن بیرۆکەکە هەرگیز ناتوانێت کەسی خاوەن بیرۆکە بە ئامانجی بوون بەسەرکردەی بگەیەنێت، چونکە بەزۆری خاوەن بیرۆدۆزەکان کەس گەلێکی کەم دووی ناباشن لە وتاردانداـ دەستەیەکی خەڵك خۆیان بەتاوتوێ کردنی ئەوەوە ماندوو کرد کە ئایا خاوەن بیرۆکە یان جێبەجێکاری بیرۆکە شایەنی دەست خۆشین؟ ئەمانە ئەوەیان لە بیرکردبوو کە بیرۆکە بەبێ جێبەجێ کار مانایەکی نابێت، بۆئەمەش پێویستی بەسەرکردەیەکی ڕەوان بێژی هەست بزوێنەی جەماوەرکێشە، هەروەها باشترین وتاربێژ و سەرکردەش دەستەوەستان دەبێت لەهەمبەر گەیشتن بەئامانجێك کە بیرمەندێك بەجوانی دیاری نەکردبێت، واتە بۆ سەرکەوتنی پارت و بزوتنەوە پێویستمان بە تیۆردارنەر و جێبەجێ کاری بەهێزیشە. خۆزگەر وا ڕێککەوت کەسی خاوەن بیرۆکە سەرکردەیەکی ڕەوان بێژیش بوو ئەوا لەم کاتەدا سەرکردەی ڕاستەقینە دێتە بوونی(فوهرر).

***

وتم پاش لە تەڤل بوونم بۆنێو پارت دەستم دایە کاری بانگەشە، بەجوانی چاوم بڕیبووە دابین کردنی ناوکی کاری بزوتنەوەکەمان، ئەویش زۆرترین لایەنگیربوو. پاش لە دابینکردنی ناوکی کار بنەما سەرەتاییەکانی پارتم دامەزراند یان ڕێکخستەوە، پۆلێنی دوو پۆلمان کرد: پۆلی پشتیوان و پۆلی ئەندامان. بانگەشەکەم بۆ کۆکردنەوەی زۆرترین پشتیوان یان هەواداربوو، خوودی ڕێکخستنەکەشمان لەم کاتەدا هەوڵی کۆکردنەوەی زۆرترین ئەندامی دەدا. جیاوازی لەنێوان پشتیوان و ئەندامدا ئەوەیە کە لایەنگری لەدوورەوە بڕوای بە ئامانج و بنەماکانی کاری بزوتنەوەکەیە و هێشتاکە تەڤلی نەبووە، بەلام ئەندام کۆنە لایەنگرانی پاڵفتەکراون کەئێستا لەپێناو سەرخستنی بیرۆکەکانیدا تێدەکۆشن.

بانگەشە کاردەکات لەبۆ کێشکردنی گشتگیرانەی لایەنگیر، بەلام ئەندام لەم لایەنگیرانەوە ئەندامی نوێ دروست دەکات و پەروەردە دەکات. لایەنگران تەنها داوای بڕوا بوونیان لێدەکرێت بە بەرنامەکانی پارت،بەلام ئەندام پێویستە بە کردار بەرگری لەبیرۆکەکانی پارت بکات و بیتەنێتەوە. ئەمەش وای کردووە ئەندامی بزوتنەوەکان کەمبن بەلام لایەنگرانیان چەند هێندەی ئەندامان زیادتربێت.

بانگەشەکردن بەمن سپێردرابوو لەگەڵ ئاراستەکردن و کۆکردنەوەی زۆرترین لایەنگیری بیرۆکەکەماندا، بۆیە لەم کاتەدا پێویست بوو لەسەر بزوتنەوەکەمان ژمارەی تەواوی ئەنجامانی ژیر لەو لایەنگرانە کۆبکاتەوە و بەپێی کەڵکداری و جۆری کار و توانایی و بڕوانامەیان پۆلێن بەندیان بکات.

***

بانگەشە کاری چاندنی بیرۆکەیەکی تایبەتیە لەناخی جەماوەردا، بەڵام ڕێکخستن تەنها کەسانی بەتوانا لەدەوری خۆی کۆدەکاتەوە، بەتایبەت کەسانی ژیر و بەبازو و نەترسان.

***

بانگەشە دەچێتە مێشکی زۆرینەوە و بەرەبەرە هەوڵی دەرپەڕاندنی بیرۆکە کۆنەکان دەدات لەمێشکیانداو لەبۆ ئامادەکردنی گەل بۆ ڕۆژی سەرکەوتن. بەلام ڕێکخرا پشت

به دەستەیەك لە لایەنگران دەبەستێت كە نەترس و خاوەن ئەزموون و لەهیچ سڵ ناكەنەوە لەبۆ خەبات و تێكۆشان و گەیشتن بەئامانجە دیاری كراوەكە.

***

بەقەبارەی توانادارى بانگەشە بۆ گۆشكردن و كۆكردنەوەی زۆرترین لایەنگیر، ڕێكخستنیش ئەوەندە پێویست و پێتڤی بە كەسانی چالاكە بۆ سەركەوتن.

***

ژمارەی لایەنگران زەبەلاح نابێت جا هەرچەندە لەگەشەكردنیشدابێت. واتە هەرچەندە ژمارەی لایەنگرن لەدەوری بانگەشە كۆببنەوە هێشتاكە كەمە، تا ئەوكاتەی بەتەواوەتی گەل بڕوای پێدێنن، لەم كاتەدا چەند كەسێك لە ڕێكخاران دەتوانن سەركردایەتی هەموو گەل بكەن، هەر هەنگاوێكی سەركەوتوو بانگەشە بیهێنێتە بوونێ ئەوا دەتوانرێت ژمارەی ئەندامان كەم بكرێتەوە و هیچ زیانێكی نابێت، بەڵام لەبانگەشەی ناسەركەوتوودا، پێویستت بەزۆرترین ئەندامی گونجاوە بۆ ڕێكخستن، واتە تاوەكو ژمارەی لایەنگران زیادبكات دەتوانرێت ژمارەی ئەندامان كەمبكرێت، بەڵام بەكەمبوونی لایەنگیر دەتوانرێت ژمارەی لایەنگیران زیادبكرێت.

***

كاری سەرەكی بانگەشە كێشكردنی هاوڵاتیە بۆ تەڤل بوونە نێو لڤینەكەوە، كاری ڕێكخراوی لڤینەكەش كێشكردنی خەڵكە لەڕێگەی بەدواداچوونكردن بۆ بانگەشەكەیانەوە. ئەركی دواتری بانگەشە هەست جوڵاندنی خەڵكە لەبۆ ڕەتكردنەوەی دۆخی ئێستاكانێی وڵات، لەڕێگەی چاندنی بۆچوونی نوێوە لەناخی هاوڵاتیاندا. ئەركی دووەمی ڕێكخراو تێكۆشانە لەپێناو بەهێزبووندا، بەو مانایەی ئەوكاتەی بانگەشە هەوڵی لاوازكردنی دەستەڵات دەدات ئەم ڕێكخراوە هەڵدەستێت بە جێگرتنەوەی دەوڵەت و داڕووخاندنی دەوڵەت.

***

سەركەوتن بۆهەر بزوتنەوەیەكی شۆڕشگێڕی دەنوسرێتەوە گەر توانادارىوو لە پەروەردەكردنی هەموو گەل بەچەمكی نوێی گەردوون و ژیان، یان لەڕێگەی چەسپاندنی ئەم بیرۆكەیە لەكاتی پێویستدا، بەتایبەت لەكاتی بوونی ئەندامی بەهێز لەبۆ سەرداریێتی كردن.

بەمەبەستی زیادە سەرباری شیکردنەوەیی دەمەوێت بڵێم:

هەر بزوتنەوەیەك خاوەنی نامەیەکی وەرچەرخێنەربوو ئەوا دەبێت وتاربێژ و بانگەشەکارانی بزوتنەوەکە بەجوانی بەرنامەکانی بزوتنەوەکەیان شیبکەنەوە ولەمێشکی لایەنگراندا بیچەسپێنن, بەڵام بەلایەنی کەمەوە دەبێت هەوڵبدرێت بیروباوەڕی باوی کۆن بلەرزێنرێت و لەقبکرێت. ئەودەمەی بانگەشە پێتقی بە کوڵەکەی بەهێزە بۆ مانەوە ئەوکات ڕێکخراو دەبێتە ئەم کوڵەکەیەی. دەبێت ڕێکخراو ئەندامانی لەڕیزی لایەنگرانی بانگەشەوە هەڵبژێرێت, تاوەکو ژمارەی لایەنگران زیاد بکات توانا و هێزی ڕێکخراوەکە زیاد دەبێت, ئەوکاتەش ڕێکخراوەکە بەهێزبوو بانگەشەکەش بەجوانتر و پاراوتر و ژیرانەتر دەوروژێت و کاری خۆی دەکات.

***

نابێت ڕێکخراوەکە بهێڵێت ناجۆری و ململانێ لەنێو ئەندامەکانیدا بتەنێتەوە, چون بەم کارەی بزوتنەوەکە لەهەڵوەشاندنەوە دەپارێزێت. نابێت بەخێرایی ژمارەی ئەندامان زیادبکرێت, چونکە دیرۆك نمونەی زۆری لایە لەو بزوتنەوانەی کەخێرا گەشەیان کردوەو خێرا هەڵوەشاونەتەوە, لەبەرئەوەی پاش بڕینی قۆناغە سەختەکان و گەیشتنە ئامانج و سەرکەوتن باوەشی بۆ هەموان کردەوە, ئێستا هەزاران کەس بەئاسانی تەقلی نێو بزوتنەوەکە دەبن و زۆرێك لەمانە ئەوانەبوون کەدژبەری ژێربەژێری خوودی بزوتنەوەکەش بوونە, زۆربەی ئەوانەی پاش لە سەختی تەقلی بزوتنەوەدەبن ترسنۆك و کەم نرخانن, بۆیە گەر ڕوو بەمان بدرێت ئەوا بەتێپەڕبوونی کات ژمارەی ئەم ترسنۆك و مشەخۆرانە زیاددەکات و بەو ئاراستەیەدا بزوتنەوەکە دەبەن کەخۆیان دەیانەوێت, هەربۆیە زۆر بە هۆشیارانەوە لەپێشەنگی یەکەمین سەرکەوتنی بزوتنەوەی نیشتمانی سۆسیالیستی یەوە بە یاوەران ڕاگەیاند, نابێت بەئاسانی باوەش بۆهەموو کەسێك بکەینەوەو بهێڵین ببێتە ئەندامی کارامان, بەڵکو ڕێگەی هێواشی و پوختیمان گرتەبەر لەبۆ گەیشتن بە ئامانجە باڵاکانمان.

***

وەکو وتاربێژی سەرەکی و بەڕێوەبەری بانگەشەی پارت , لەبۆ بەردەستخستنی بیرۆکەی بزوتنەکەمان( نیشتمان پەروەری سۆسیالیستی) کاری تەواوم بۆکرد, لەهەمان کاتدا ئەوپەڕی هەوڵی خۆمم دا لەبۆ خۆ دوورگرتن لەکەسانی مشەخۆر و

ترسنۆك و ڕاڕا لە تەقڵ بوونە نێو لیژنەكانی جێبەجێ كردن و گروپە كاراكانی پارتدا. سەدان كەس لەلایەنگرانی سەرسەختی بزوتنەوەكە سەرباری داننان بە بزوتنەوەكە بڕیاریاندا تەقڵی بزوتنەوەكەنەبن، چون باش دەیان زانی بوون بە ئەنجام لەم پارتەدا ڕەنگە ئاریشەیان بۆ بنێتەوە لەكاتێكدا ئەوان تاقەتی شتی وایان نییە. گەر هاتوو دەروازەی بـوون بـە ئەنـدام بـۆ ئـەم لایـەنگرە ڕاڕایانـە بخەینەسەرپشـت ، ئـەوا لەدەسپێكەوە بزوتەكەمان لەناوبردووە، بۆیە ئێمەش زۆر بە هەستیاریەوە لەم بوارەدا كارمان كرد.

بـەهۆی وەرگـرتن و پـەیڕەوكردنی شـێوازی تێكۆشـانی زیندوانـەوە ئـەم بزوتنەوەیـەمان چەشـنێكی توندڕەوانـەی وەرگـرت، ئەمـەش وای لێكـردین كەسـانی نـەوێر و مشـەخۆر و بێ توانا نـەوێرن توخنمـان بكەونـەوە جگـە لـەپیاوانی بـەهێز و بەتوانا و ژیر و پێشەنگان.

لـەهاوینی ١٩٢١ دا دەستەیەك لـە ڕەگەزپەرەستە بیردۆزیـەكان بەرێككـەوتن لەگـەڵ سـەرۆكی پارتـدا بڕیـاری دەسـتگرتنیان دابـوو بەسـەر پارتەكـەدا و دواتـریش بەلاڕێدابردنی و توانەوەی ئامانجە ڕاستەقینەكانی پارتی لەدواوەبوو، بۆیـە ئێمـەش بەوپەڕی توندڕەوانەوە بەرپەرچمان دانەوەو شكستمان پێهێنـان و دەسـتەی گشتی بـەڕێوەبردنی پـارت منیـان هەڵبـژارد و سـەربەخۆیی ئەنجامـدانی هـەموو كارێكیـان پێسپاردم. لەهـەمان كاتـدا دەسـتەی گشـتی پرۆژەیـەكی پەسـەند كـرد كەتێیـدا مـافی دەسـتەڵاتی ڕەهـا دەدرێتـە سـەرۆكی پـارت و و سـنورێك بـۆ لیژنـە و دامـەزراوەكانی ناوەند دادەنێت. لەپێشدا ناوماڵی پارتم ڕێكخستەوە ئەوكات بـەرەو دەرەوە بڕیـارم دا هەنگاو بنێم، چونكە شێوازی پەیڕەوكردنی بزوتنەوەكە كۆن بوو، دەستەڵات دیـاربوو بـەڵام بەرپرسـیارێتی وون بـوو. لـەماوەی ١٩١٩-١٩٢٠ دا سـەركردایەتی بزوتنەوەكە سپێردرابوو بەلیژنەیەك كە ئەنجومەنی ئەندامان دەست نیشانی كردبوو. ئەم لیژنەیە لـە سـەرۆكی یەكـەم و دووەم، غەزنـەداری یەكـەم و دووەم، نهێنـی گـر و جێگرەكـەی پێكهـاتبوو. سـەرباری لـەخۆگرتنی ئـەم لیژنـە بـە چـەند ئەنـدامێكی تـر و سـەرۆكی بانگەشە و كەسانی دی...

ئەم لیژنەیە وێنەیەکی بچووککراوەی ئەنجومەنی نوێنەران بوو، کە خوودی بزوتنەوەکە دژایەتی ئەمەی دەکرد، لێرەدا بە ڕای زۆرینە پرسەکان دەبڕانەوە و بەرپرسیارێتی کاری هەڵەش لەئەستۆی کەسدا نەبووە..

ئەم لیژنەیە نهێنی گیر و ئەمیندار و گروپی پەروەردەی ئەندامانی نوێ و گروپی بانگەواز و...هیتری هەبوو..ئەمانە پێکەوە کۆدەبوونەوەو دەنگیان لەسەر کۆتا بڕیارەکان دەدا. ئەمەش وای کردبوو ئەو کەسەی بەڕێوەبەری بانگەشەیە دەنگ لەسەر کێشە داراییەکان بدات و ئەوەی ئەمینداره دەنگ لەسەر شێوازی بانگەشە و ڕێکخستن و...هتد بدات.

ئەوکاتەی تەنها ئەندامێکی ئاسایی بووم ڕەخنەی ئەمەم لێگرتن، بەڵام بەهۆی ڕاسپاردنم بۆ کاری بانگەشە بۆماوەیەك لە کۆبوونەوە پەرلەمان ئاساکەیان دابڕام، ڕێگەم بەهیچ ئەندامێکی لیژنەی باڵای پارت نەدەدا دەست بخەنە نێو کارەکانمەوە و بەهەر بیانوویەك بێت.

ئەوکاتەی دەستەی گشتی پارت وەکو سەرۆکی پارت هەڵیان بژاردم و دەسەڵاتی ڕەهای پێدام، ئەوکات دەستم دایە ڕێکخستنی نێو پارت و نەهێشتنی ئەو بێسەری وبەرییە، زۆرترین ئەرك و بەرپرسیارێتیم خستە ئەستۆی خۆم. لەمانگی گەلاوێژی ۱۹۲۱ وەکو سەرۆکی بزوتنەوەکە ئەرکەکانم دابەش کرد: چالاکی هەموو ئەندامانی لیژنە دەست نیشان دەکرێت و کەس دەست وەرناداتە کاری هیچ کەسی دیکەوە، هەریەکێك لەنێوە بەرپرسیارە لەئەنجامی کارەکانی . ئەمەش وای کرد هەموو ئەندامانی بزوتنەوەکە بەخێرایی لەگەڵ ئەم چەشنە دەسەڵاتە ڕەهاییە ڕابێن. ئەو چەند ئەندامەش بەم دۆخە نوێیە ناقایل بوون و بڕیاری دەرکردنیانمدا و ئەمجار ئەم بۆچوونەم بەسەر هەموو مەکۆکانی بزوتنەوەکانمدا گشتاند و دژی بۆچوونی زۆرینە وەستامەوە و بڕیارمدا ئەو ئەندامەی حەزی بۆ زۆرینەیە دەبێت لە بزوتنەوەکە دەربکرێت و چیتر وەرنەگیرێتەوە، لەژێر ئەودروشمەی: هەر لڤینێك بیەوێت دژی ئەنجومەنی نوێنران بوەستێتەوە دەبێت لەپێشدا ئەو بەرنامانە لەنێو خۆیدا پەیڕەو نەکات کە ئەوان پەیڕەوی لێدەکەن.

لەگوتارێکمدا لە دەستەی گشتی ئەندامانمدا گووتم: ئەم بزوتنەوەیە لەچەرخێکدا دەستی داوەتە جوڵانەوە کە بنەمای زۆرینە باوە، بەڵام گەر بەرپرسیارێتی هەمووی

بەفوهرر بدرێت ئەوکات ئەم بزوتنەوەیە توانای ڕامالینی هەموو ئەوانەی دەبێت کەلەپێشیدا دەوەستنەوە و کۆتاییش بەگەندەڵی و نەهامەتیەکان دەهەنێت.

ئەوکاتەی لە پایزی ۱۹۱۹ دا تەڤلی بزوتنەوەکە بووم ژمارەی ئەندامانی دامەزرێنەر ٦ کەس بوون. پارت نە نوسینگەی هەبوو, نە کارمەند و قەڵەم و کاغەزیش, لیژنەی دامەزرێنەر جاربەجارێك لە یانەیەك یان شوێنێکی دووره دەستدا کۆبوونەوەیەکی ڕێکدەخست, بەڵام هەرلەیەکەم ڕۆژی تەڤل بوونم بۆنێو ئەم بزوتنەوە بەدووی هۆڵێکی شیاودا گەڕاوم بۆ بەستنی کۆنگرەکان تێیدا. دەبوو دۆخی دارایی پارت لەپێش چاو بگرم و خەرجیم زۆر نەبێت. لەشەقامی تال لە یانەی سترنیکر ڕێم لەهۆدەیەکی نوتەك کەوت کە ڕاوێژکارانی (ئیمپراتۆری بومارەك) لە باڤاریا تێیدا بەنهێنی کۆدەبوونەوە لەکاتی پێویستدا.

هۆدەیەکی تاریکەسەلا بوو, یەك پەنجەرەیەکی هەبوو دەیڕوانیە سەر کۆڵانێکی بچوکدا, بەڕاستی لەکۆبوونەوەکانی ڕۆژدا دۆزینەوەی دەرگای ژوورەکە زۆر گران بوو, لەم کاتەدا نەمان دەتوانی جێگەی باشتر بەکرێ بگرین؟ چون لەم دۆخەدا باری دارایی پارتمان لاواز بوو. هەرچەندە ژوورەکەمان باش نەبوو بەڵام دەستکەوتەکانمان باشتربوون, زۆری نەبرد کارە و هێڵی تەلەفۆن گەیەنرایە ژوورەکە و هەندێك لەیاوەرانمان کە باری داراییان باشتر بوو مێزێك و چەند کورسیەك و لۆکەرێکی بچوکیان بۆکڕین.

لەبەر ئەوەی کارمەندمان نەبوو بۆیە پێویستمان بە ڕازدۆزێك بوو, بۆ ئەم کارەش (شۆسلر)مان هەڵبژاردکە هاوڕێی کاتی پێشمەرگایەتیم بوو, کە ڕۆژانە لەش بۆ هەشتی سەرلەبەیانی لەنوسینگەی پارت دەبێت و ئاگاداری ڕەوشەکەمان دەکاتەوە, لەگەڵ فراوانبوونی چالاکیمان ئەرکی شۆسلر زیادی کردو ئەمەش وای کرد شۆسلر واز لەکارەکەی خۆی بهێنێت(سەرچاوەی بژێوی پەیداکاری) و خۆی بۆ پارتمان تەرخان بکات, لەم کارەیدا بەتەواوەتی پشتی بە ئامێرێکی چاپ بەستبوو کە پێشتر هەیبوو, پارتیش لەڕێگەی پارەی ئابوونەوە یان پێبەخشراویەوە ئەم ئامێرەی لێکڕی, لەهەمان کاتدا پارتمان باوەڵێکی ئاسنینیشی کڕی لەبۆ پاراستنی دۆسیە و بەڵگەنامە زۆر گرنگەکان.

لەكۆتايی ساڵی ١٩٢٠ دا نوسینگەیەكی نوێمان بەكرێ گرت كە دەكەوتە سەر شەقامی كۆرنیوس و لەسێ ژوور و هۆڵێكی گەورە پێكدەهات. لە سەرماوەرزی هەمان ساڵدا پارتمان (نیشتمان پەروەری سۆسیالیستی)بڕیاری دەركردنی بڵاوكراوەی((فۆلكیشر بیوباختر))ی دا كە بەوپەڕی تواناوە هەوڵی زیندووكردنەوەی ڕەگەز پەرەستی دەدا.. سێ ڕۆژ جارێك دەرمان دەكرد, لەدەسپێكی ١٩٢٣ دا كردمان بەڕۆژنامە و قەبارەكەیمان گەورەتر كردەوە. بەلاَم لەم كاتەدا ڕۆژنامەی ((فۆلكیشر بیوباختر)) تاكە ڕۆژنامەی ڕەگەزپەرەستی بوو لەوڵاتێكدا زۆرینەی دانیشتوانەكەی لەلایەن جووەكانەوە گاڵتەیان پێدەكرا.هەرلەسەرەتاوە هەستم بەوەكرد كە ئەم ڕۆژنامەیەمان لەچاو بەرەكانی دژبەرماندا كاری خۆی ناكات و لاوازترە, ئەمەش بەهۆی نەبوونی كەسی شارەزای ئەم بوارە و كەمی توانای دارایمانەوە بوو, سەرباری كەمی كەسی شیاو بۆ بەڕێوەبردنی ڕاستەقینەی ئەم ڕۆژنامەیە. هەرلەسەرەتاوە هەوڵی قازانجكردنی ئەم ڕۆژنامەیەم دا بەوەی بتوانرێت لەپاڵ سوودە نەتەوەییەكانیدا سودێكی داراییشی بۆمان هەبێت, پێداگریم كرد تاوەكو ئەندامانی دیكە بەمە قایل بوون, ئەمجار كارمكرد لەبۆ دەست نیشانكردنی بەڕێوەبەری كاری بازرگانی بۆ ((فۆلكیشر بیوباختر)), چارەنووس وابوو لەمێڵی ئاوردا (ماكس ئامان) هاتە سەر ڕێم كە كەسێكی خاوەن ژیریی تەواوبوو لەكاری ڕێكخستندا, لەم كاتەدا پارتمان كێشەی دارایی زۆر هەبوو, بەقۆناغێكی سەختدا تێپەڕدەبوو. داوام لەم كەسەكرد ببێتە بەڕێوەبەری كاری بازرگانی پارت, پاش چەن و چوونی و مقۆمقۆیەكی دوور و درێژ قایل بوو, بەلاَم مەرجی هەبوو لەدەسپێكردن بەم كارەی, ئەویش دروست نەكردنی لەمپەر بوو لەپێش كارەكەیدا, هیچ كەس بۆی نەبوو دەست وەربداتە ئەو كارانەی لە سنوری كاری ئەودا بوو.

ماكس توانی زۆر بەژیرانە هەموو كەسانی لاواز لە ڕۆژنامەكەی دووربخاتەوە, وەكو ئەوەی پارت پرۆژەیەكی بازرگانی بێت بۆئەو, كەدەبوو تێیدا سەركەوتووبێت, تەنانەت لەهەندێك كاریدا پەنای دەگرتە كەسانی دەرەوەی بزوتنەوەكەشمان, بەلاَم لەبەرژەوەندی بزوتنەكەمان كارەكانی دەكرد. هەندێك بەرپرسان لە لیژنەی ئەندامانی بالاَ لەم ڕێڕەوی ماكس نیگەران بوون, بەلاَم ئەوهیچ گوێی پێنەدان, بەبیانووی ئەوەی مەرج نییە تەنها لەنێو بزوتنەوەكەدا كەسانی گونجاو بۆ سەركەوتنی پرۆژەكەی بۆ

دەستەبەربێت. ئەمە لەهەمان کاتدا نەبووە ڕێگر لەبەردەم وەدەرنانی کەسانی بێگانە و جێگرتنەوەیان بەکەسانی بەتوانای نیشتمان پەروەری سۆسیالیستی.
بەهۆی تواناداری بەڕێوەبەری بازرگانی پارتەوە توانیمان پارت و ((فۆلکیشر بیوباختر)) لە کێشە و قەیرانی دارایی وەدەرنێین و ڕۆژنامەکەمان ((فۆلکیشر بیوباختر)) بەرەو بوون بە ڕۆژنامەیەکی سەرکەوتووی بالاری هەنگاوی دەنا.
دوای ئەوەی بووم بەسەرۆکی پارت ماکس بەتەواوەتی دەستی والآکرا و ڕزگاری بوو لەکۆتەکانی دەستەی ئەندامانی پارت, لەبەرئەوەی لەم کاتەبەدواوە کەسی پێویست و گونجاو بۆ شوێنی پێویست و گونجاو دەستنیشان کراو وجگلە لەسەرۆکی گشتی پارت نەبێت کەس مافی لێپرسینەوەی نەبوو لەکەسێکی دیکە کەکارەکانیان لەنێو پارتدا یەکێك نەبێت. ئەودەمەی لە گەلاوێژی ١٩٢٣ دا دەستەلآتی مارکس خوازی بەناو دیمۆکرات هەستا بە هەڵوەشاندنەوەی پارتمان و دەستی گرت بەسەر سەرجەم داهات و سامانەکانماندا جگەلە ڕۆژنامەی فۆاکیشر بیوباختر خاوەنی ١٧٠ هەزار مارکی ئاڵتونی بووین.

# بەشی بیست و یەک

## بزوتنەوەی سەندیکا

گەشەکردنی بزوتنەوەکەمان لەساڵی ١٩٢٢ دا بووە هۆی خستنەڕووی هەڵوێستی بزوتنەوەکەمان لەهەمبەر بابەتێك کە پێشتر نەیتوانی بوو بە چارەسەریگات.

لەساتەوەختی گەڕانمان بەدووی دۆزینەوەی شێوازی دەستەبەر بۆ کردنەوەی ڕێگەمان لەوەی بتوانین دڵی زۆرینە بۆخۆمان ڕابکێشین، لەم ڕێڕەوەتەدا دووچاری لەمپەرگەلێك دەبووینەو کەمیچ خۆلادانێکی نەبوو: نابێت هیچ کرێکارێك یان ڕەنجبەرێك خۆی بداتە دەست هیچ بزوتنەوەیەکی دیکەوە تا ئەوکاتەی نوێنەرانی بەرژەوەندییە ئابوری و پیشەییەکانیی دژبە بۆچوونی ئەو بزوتنەوە نوێیەبن.

واتە بۆهیچ کەسێکی کرێکار یان خاوەن پیشە نییە لەدەرەوەی کاری سەندیکاوە کاری دیکە ئەنجامبدات، لەچوارچێوەی سەندیکادا دەپارێزرێت و مافەکانی بۆ دابین دەکرێت. لەکاتی دیارکەوتنی بزوتنەوەکەی ئێمەدا هەشتا لەسەدی خاوەن پیشە و کرێکاران سەربە سەندیکاکان بوون، لەم بوارەشدا تێکۆشانی زۆر کرابوو لەبۆ بەرزکردنەوەی کرێ و کەمکردنەوەی کاتی کارکردن. لەدەسپێکدا بۆرژواکان چ وەکو تاك یان پارت تەنها لەدوورەوە تەماشای سەندیکایان دەکرد وەکو ئەوەی هیچ پەیوەندیەکی بەئەوانەوە نەبێت، ئەودەمەی سەندیکاکان بەهێزبوون و مارکسیەکان

لەرێگەیەوە داوای سەیرو سەمەرەیان دەخستە روو، لەم کاتەدا بۆرژواکان بەئاگاهاتنەوە بۆ دژبەری کردنی سەندیکا لەئاستی بیردۆزەیی. بۆرژواکان نەیان کرد ئەم کۆمەڵە خەڵکە رەنجکێشە بۆلای خۆیان کێش بکەن، بەڵکو هەستان بەدژایەتی کردنیان. ئەمەش هەلێکی باڵای دابە مارکسیەکان بۆ دەستگرتن بەسەر پێگەکانی دەستەلأتدا لەرێگەی بەکارهێنانی ئەم چینە رنجکێشەوە.

لەبەشێکی لەمەوپێشدا دانم بە ماف چینی رەنجبەردا نا و داوای بەدی هێنانی زۆربەی مافەکانیانم کرد، بەوەی بوهای مرۆڤەکان بەپێی توانایی دارایی لێی نەرواندرێت و خاوەن کارخانەکانیش نابێت چینی رەنجبەر بقۆزێنەوە بۆ خۆ دەوڵەمەندکردن. خاوەن کارخانەکان گۆرانێکی ئەوتۆ بەسەر بۆچونیاندا نەهات لەهەمبەر کرێکار و مافەکانیدا، بۆئەوەی ئێمە بتوانین جێگە بە مارکسیەکان چۆڵبکەین بۆیە دەبوو بەهەر شێوەیەك بێت چینی کرێکار بۆلای خۆمان کێش بکەین بۆئەمەش چەند پرسێکی راستەقینەمان لەپێش بوو:

١-ئایا بوونی خوودی سەندیکا پێویستە؟

٢-ئایا ئەم پارتەی ئێمە باشتر وایە کۆمەڵەیەکی هەرەوەزی بۆخۆی دروست بکات یام ئەندامانی تەقلی سەندیکایەکی دیاریکراو بکات ؟

٣-گەرهاتوو پارتمان سەندیکایەکی تایبەت بەخۆی دامەزراند ئەوکات ئامانج و ئەرکەکانی سەندیکاکە چی دەبێت ؟

خۆم یەك لایی کردەوە ئەوکاتەی بریاری ئەوەم دا کە ئەم پارتەی ئێمە پێویستی بە سەندیکایە، سەندیکا لەپێشەنگی دەزگا کارتێکارەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی نەتەوەوەیە لەروانگەیەکی ئابوریانەوە، لەبەرئەوەی هەموو مرۆڤێك حەزی بە دابینکردنی پێداویستیە زیندەییەکانیەتی، هەر گەلێکیش بۆ زۆرینەی بتوانرێت مافەکانی دارایی و پەروەردەی کۆمەلأیەتی بۆ دابین بکات لەچوارچێوەی دامەزراوە سەندیکاییەکاندا ، ئەوا ئەم گەلە ئەوپەری نەبەردانە دەجەنگێت لەپێناو سەرکەوتن و مانەوەدا.

ناشبێت ئەوە لەبیربکەین کە سەندیکاکان گۆشەیەکی گرنگی ئابوری پەرلەمانن و پێویستە دەوڵەتی رەگەزی ئەم گۆشەیە بخاتە نێو ژووری بازرگانی و ئابورییەوە.

دانـان بـه دامەزرانـدنی بزوتنـەوەیـەکی سـەندیکایی ئـەوکات بابـەتی دووەممـان بـۆ ئاسان دەکات. بزوتنەوەی نازیـت (کەلە سالی ١٩٢٣ وە ئەم ناوەمـان لێنـا) کـه چاوی بڕیبـووە دامەزرانـدنی دەوڵـەتێکی ڕەگـەزی , ڕێگـه نـادات دامـەزراوەی دیکـه ببنـه پاشکۆی ئەو دەوڵەته و ڕۆلی دەوڵەت ببینن لەنێو دەوڵەتدا, بەلکو هەولی تـەقلکردنی هـەموو دامـەزراوەکان دەدات بۆ نێـو خـوودی دەوڵـەت, لەبەرئـەوەی ئـەم بزوتنەوەیـەی ئێمه هەرگیز هەڵەی دەستەلاتدارانی پێشووتر ئەنجام ناداتـەوە و بوونی دامـەزراوەی پاشـکۆ بەدەوڵەتـەوە ڕەتدەکاتـەوە, بۆئەمـەش سەرلەنوێ دەوڵـەت ڕێکدەخاتـەوە. بـۆ سەرکەوتنی ئەم بۆچوونەش لەپێشدا لەپەروەردەوە دەست پێدەکرد و خەڵکانی پێ گۆش دەکرێت, بێگومـان سـەپاندنی بەرنامـەکانی کەسێکی دیکتـاتۆر یـان توندڕەو دەتوانرێت بەسـەر هەموانـدا بسـەپێندرێت, بـەلام بـەبێ بوونی کۆمـەڵێکی بژاردە لـەبۆ بەردەوامی دان بەجێبەجێ کردنی هیچ مانایـەکی نابێـت و کاریگەریـەکانی کـەم سنور دەبێتو ناتوانن بۆچوونەکانی فوهرر بەدی بێنن.

ئێمەی نازی هەڵەی پارتـەکانی سـەردەمی کۆمـاری ئەنجام نادەینـەوە, ئـەم پارتانـه تەنها بڕوایان وابوو ئەگەر دەستورێکی نوێ بێننه ئاراوە ئەوکات ئەمانه توانای بـەدی هێنانی خەونەکانیان دەبێت, بەبێ ئەوەی بزانن که دەستور بێ گیانه بـەبێ جێبەجێ کردن و چەسپاندنێکی نەبەردانە, دیتمان چلۆن دەستورەکەی(فیمار) دەبەخشـنه گـەلی ئەڵمانی و دواتر دیتمان چلۆن ئەو دامەزراوانە دادەڕوخێنێت کە خوودی خۆی لەسـەر ڕونێت ناوەتەوە و دەوڵەتیش بوونی خۆی لێرەوە پیشان بدات.

لەدەوڵــەتی نازیــدا هــەموو دامــەزراوەکان بەشــێوەیەکی کــارا بوونیــان دەبێــت, لەبەرئـەوەی بزوتنـەوەی نیشـتمانی سۆسیالیسـتی لەسـەر خـاکی فشـەڵ دانەمـەزراوە, نازی هەنووکه لەشێوەی دەوڵەتدا خۆی ڕێك دەخات. هـەر دامەزراوەیـەکی نـازی لـەم ڕۆدا دیاربکەوێت یان دابمەزرێت ئەوا دەبێت ناوکرۆکی ئەو دەوڵەتـەی کـه نـازی دای دەمـــەزرێنێت. ئەمـــەش وادەکـــات ئـــەم بزوتنەوەیـــەمان بەهـــەموو ڕێکخـــراو و دامەزراوەکانیەوە شێوەیەك لەدەوڵەت پێکبهێنێت.

بۆئەمەش دەبێت لەسەر بنەمایەکی هەرەوەزیانە نازیەکان خۆیان ڕێکبخەنەوە, واتە ڕێکخراوێکی بەهێزی سـەندیکایی دابمـەزرێنن. دەبێـت لـەم سـەندیکایەدا ڕەنجبـەر و ڕەنجخـۆر پێکـەوە پـەروەردە ببیـنن و بـزانن کـه بەرجەسـتەکردنی مافـەکانی یـەکتر

قازانجی بۆ هەردووبەرە و نەتەوەش هەیە, بەبێ لەیەك نزیك كردنەوەی ئەم بەرە دژبەرەیە هەر هەنگاونانێك بۆ سەندیكا دامەزراندن هیچ قازانجێكی بۆ ئێمە و نەتەوەكەشمان نابێت, وەكو نوسین لەسەر شەپۆلی ئاو وەهادەبێت, پاش چەند چركەیەك وون دەبێت و نامێنێت.

ئێستاش سێیەم بۆچوون مایەوە:

ئامانج لەدامەزراندنی سەندیكا بۆ ئەوە نییە چینێك بەكاربهێندرێت بۆ دژایەتی كردنی چینێكی دیكەی كۆمەڵ, بەڵكو سەندیكا دامەزراوەیەكی پیشەییە و دەوڵەتی نازی دان بەهیچ چینایەتیەكدا نانێت. لەڕووی سیاسیەوە بەتەنها دان بە بۆرژواكاندا دەنێت نەوەك كۆمەڵایەتی و هەموان یەكسان دەبن لەبەردەم یاسا و بەدەست هێنانی مافەكانیان و ئەنجامدانی ئەركەكانیاندا. بوونی دانیشتوانیش مانای بوونی هاوڵاتی خوازراو نییە.

ئێمەی نازی یان نیشتمان پەروەری سۆسیالیستی وای دەبینین كە سەندیكا دەزگایەك نییە بۆ تێكۆشان بەهاوشێوەی ماركسیەكان لەبۆ دروستكردنی ناكۆكی چینایەتی و بەدی هێنانی ئامانجەكان لەم ڕێگەیەوە, هەمدیس پێچەوانەی جووە نێودەوڵەتی خوازەكانین كە سەندیكایان وەكو هۆكارێك بەكارهێنا لەبۆ داڕووخانی ئابوری نەتەوەیی دەوڵەتە سەربەخۆكان بەمەبەستی دەستگرتن بەسەر گەلە ئازادەكەی نێو دەوڵەتەكەدا.

مانگرتن و خۆپیشاندان لای سەندیكا نازیەكان, هۆكار نییە بۆ تێكدانی بەرهەمی نەتەوە, بەڵكو ئامرازی پێشخستنیەتی, ئەمەش لەڕێگەی تێكۆشانەوە دەبێت بۆ دابین كردنی ماف تێگەیشتن لەنێوان كرێكار و خاوەن كار دا دەبێت.

دەبێت بەشێوەیەكی وەها كرێكاری ڕەنجكێشی نازی گۆش بكەین كە وا هەست بكات زیادبوونی بەرهەمی نەتەوەیی مانای باشتربوونی دۆخی ئەوە.

لەهەمان كاتدا خاوەن كارگە نازیەكان دەبێت باش ئەوە بزانن باشی و زۆری بڕی بەرهەمیان بەندە بەدڵنیایی كرێكارەوە لەژیان و باری گوزەرانیان.

لەدەوڵەتی نازیدا لەبواری چالاكیاندا كرێكار و خاوەن كار نوێنەری سەرەكی گەلی ئەڵمانین , تاڕادەیەكی گونجاو خاوەن ئازادی تاكین, لەبەرئەوەی ئەگەر تاك تاڕادەیەك دەستی واڵابكرێت لەو بوارەی كاری تێدەكات بەڕێرانە ئەوكات بەرهەمی زیاد دەبێت.

بێگومان پاش دابینکردنی مافی تاك و خۆشگوزەرانی و زربوونی بەرهەمی نەتەوە دەوڵەتی نازی بەهیچ شێوەیەك ڕێگە بەمانگرتن و خۆپیشاندانی سەندیکایی نادات, بەڵام ئەوکاتەی دەوڵەت نەیتوانی مافەکانی کرێکار و ڕەنجبەر لەخاوەن کارخانە و ڕەنج خۆر وەرگرێتەوە و بۆدابین نەکات ئەوکات مافی مانگرتن پیرۆزترین کاری سەدیکاکانە جا دەوڵەتەکە نازی بێت یام نانازی و ئاسایی.

ئەم کێشمەکێش و بگرە و بەردەیەی ئەمڕۆ ملیۆنان خەڵکی سەرقاڵ کردووە دەبێت چارەسەری بۆ بدۆزرێتەوە و سبەی دامەزراوە پیشەییەکان و پەرلەمانی ئابوری دەبێتە بینە ئەو ناوەندەی کە لەدەوڵەتی نازیدا نوێنەرانی پیشەسازی و بازرگانی و نوێنەرانی سەندیکاش لەخۆ دەگرێت. بەدامەزراندنی ئەم دەزگایانە دەبێت کێشمەکێشی نێوان چینی خاوەن کار و کرێکار لەناوبچێت.دەبێت کرێکارەکان دەست هەڵبگرن لەتێکۆشان لەپێناو بەدەست هێنانی مافەکانیان بۆ نوێنەرەکانیان بۆئەوەی ئەوان داکۆکی لێبکەن و چارەسەری بۆ بدۆزنەوە لەڕێگەی دانیشتن و گفتوگۆکردن لەنێوان هەردوو بەرەکەدا و بەمەرجێك ئەم ڕێککەوتنە دژبەری بەر ژەوەندیەکانی دەوڵەت نەبێت.

لێرەدا پرسێکی گرنگ دێتە بوونێ ئەویش ئایا چلۆن بتوانین ئەو کۆمەڵە هەرەوەزییە دابمەزرێنین کە ئەو مەرجانەی پێشووی تێدابێت بەکارایی ؟

بناغەدانان لە زەوینێکدا پێشتر هەڵنەکۆڵرابێت باشترە لە هەڵکۆڵینی زەوینێك پێشتر بۆ هەمان مەبەست بەخوار و خێچی هەڵکۆڵرابێت, گەر بتەوێت فرۆشگایەك لە شەقامێکدا بکەیتەوە کە چۆڵبێت لە فرۆشگا ئاسانترە وەك لە دانانی فرۆشگایەك لە شەقامێکی پڕ فرۆشگەدا, خۆئەگەر زۆربەی فرۆشگەکان یەك چەشنە کەلوپەلیان هەبێت ئەوا دەبێت دانەیەکیان زۆر بەژیرانە خۆی بسەلمێنێت و ئەوانی تر لەشەقامەکەدا پووچ بکاتەوە.

بەڕاستی دامەزراندنی کۆمەڵێکی هەرەوەزی لەم کاتەدا لەلایەن نازیەوە لەناوەندەکانی کۆمەڵدا بەئاسانی بەرهەم نادات, چون ئەم سەندیکا باوانەی ئێستا مانای میهرەبانی نازانن تانەت لەهەمبەر سەندیکا و دامەزراوە دۆستەکانیشیاندا, هەموو ڕێگەیەك دەگرێتەبەر لەبۆ لەناوبردنی دژبەرەکەی بەو مەبەستەی خۆی ببێتە

پاڵەوانی گۆڕەپان، ئەمەش وادەکات ئەم بزوتنەوەیەمان خۆی لەپێش دوو ڕێیانێکدا ببینێتەوە:

١-کۆمەڵێکی هەرەوەزی دابمەزرێنین بۆ لەناوبردنی سەندیکا ئیش مارکسیەکان یان

٢-دزە کردنە نێو سەندیکا مارکس خوازەکان و چەسپاندنی بۆچوونەکانمان لەڕیزەکانیان و دواتر کێشە خستنە نێو ڕیزەکانی مارکسیەکان.

دۆخی داراییمان بەهێز نەبوو بۆ گرتنەبەری ڕێگەی یەکەم، سەرباری خراپی دۆخی دراوی ئەڵمانی کە ڕێگربوو لەبەرامبەر پارتمان بۆئەوەی ئاماژە بەدەستکەوتی دارایی بکات بۆ کرێکاران و لەو ڕێگەیەوە کێشیان بکات، زێدەباری ئەم فاکتەرە سەرەکیە هۆکارێکی دیکە هەبوو هە هیچ کاریگەریەکەی لەمە کەمتر نەبوو، ئەویش نەبوونی کەسانی تەواو شارەزا بوو لەنێو بزوتنەوەکەمان لەبۆ ڕۆڵگێڕان لە دامەزراندنی سەندیکا. بۆیە گەر توانیمان ئەم کەسایەتیە بدۆزینەوەو بەڕاستەقینە کار بۆ ڕووخانی بزاڤە سەندیکاییە مارکس خوازەکان بکات و سەرکەوتوو بوو ئەوکات دەبێت لەهەموو کونج و کونەلأنێکی ئەم وڵاتەماندا پەیکەرێکی گەورە پیشاندانی بۆ دروست بکەین.

دامەزرێنەرانی سەندیکا مارکسیەکان کەسانی زۆر بلیمەت و ناوازە نەبوون، بەڵکو سەرجەمی دامەزراندنیان ناوازە و نمونەیی بوو، واتە هیچ سەندیکایەکی ڕکابەریان نەبووە لەوکاتەدا، بەڵام ئێمە لەم کاتەی کە دەمانەوێت ئەم بزاڤە دابمەزرێنین دووچاری کۆمەڵەیەکی خۆ جێگیرکردبوو دەبینەوە کە فێربووە چلۆن دەتوانێت خۆی بپارێزێت، بەتەواوەتی متمانەی بەخۆی پەیداکردووە.

قەلأی مارکسی هەرەوەزکاری لەمڕۆدا هەر کەسێکی ئاسایی توانای ئەنجامدانی کاروبارەکانی یان بەڕێوەبردنی هەیە، بەڵام ناتوانرێت بە هێرشێکی ئاسایی ئەم قەلأیەیان تێك بشکێندرێت، بۆیە لەم کاتەشدا پێویستمان بەکەسێکی باڵا و شارەزای ئەم بوارە هەیە، خۆئەگەر نەمان توانی ئەم کەسە بدۆزینەوە ئەوا هەرچی دەیکەین واتا هیچ ناکەین.



هتلەر لەکاتی تێفکرینی ئاڵۆزدا

خۆکشانەوەو دەست هەڵگرتن لە ئەنجامدانی کارێك باشتر نییە لەشکست بەهۆی نەبوونی کەسانی شیاوەوە ؟

سەرباری ئەو هۆکارانەی پێشووتر چەندین فاکتەری دیکە هەبوون کە ڕێگەیان نەدەداین شێوازی یەکەم بەکاربێنین، لەگرنگترینیان بڕوای بوونی تەواومان بەوەی لێدانی ئابوری لەچوارچێوەی تێکۆشانماندا لای خۆیەوە دەبێتەهۆی لاوازی بوونی خوودی بزوتنەوەکەمان. کەواتە باشتر وایە بە بانگەشە بتوانین ئەڵمانیەکان بەوە حاڵی بکەین کە ئەگەر نەختێك دەست بەخۆیانەوە بگرن بەباشی دەتوانن خۆیان دروست بکەن، بۆئەمەش ئەوپەڕی هەوڵبدرێت کە پەنا بۆهیچ سەندیکایەك نەبرێت و ئەندامانیش لەسەندیکاکان دابماڵرێت و ئەو مارکانەی هەیانە نەیخەنە پێش دەستی بەناو سەندیکاکانەوە.

لە کۆبوونەوەکانی پارتماندا بۆچوونم وابوو ئەم پارتەمان هێشتاکە لەدەسپێکدایە و تێکۆشانی دوورودرێژمان لەپێشە، بۆیە باشتر وایە بەر لە ڕووبەڕوو بوونەوەی بزوتنەوە سەندیکاییەکان و دژبەری کردنی مارکسیەکان و هاوپەیمانانیان لەڕووی کۆمەڵایەتی-ئابووری، بزوتنەوەی نیشتمانی سۆسیالیستی هێزی خۆی بۆ ئەم دوو

بواره بەتەواوەتی چڕبکاتەوە و یەك بخاتەوە, بەڵام گەر ئەم هێزانەی دابەشکرد ئەوا لەگۆڕەپانی جەنگدا بەشکست خواردوویی دەردەچێتە دەرێ.

کەواتە تەنها ڕێگای دووەم ماوەتەوە, ئەویش دوو ئاراستە لەخۆ دەگرێت: هانی لایەنگرانی نیشتمان پەروەرانی سۆسیالیستی بدەین خۆیان لە سەندیکاکان بکێشنەوە یاخوود لەوێدا بمیننەوەو لەپێناو ئێمەدا خەبات بکەن؟ ئەگەری دووەمان پەسەندکرد, مانەوە. بەردەوام بڕوام بەوەهەبوو کە خۆ ئاراستەکردن بەرەو بزاڤی سەندیکایی زۆری ماوە, بەوەی پاش لەوەی پارت دەستەڵات دەگرێتە دەست ڕوو لە چارەکردنی کێشە ئابوری و کۆمەڵایەتیەکان دەکات, ئەوکاتەی کودەتا لەپارتماندا ڕوویدا و من بووم بەسەرۆکی ڕەهای پارت, هەموو ئەو بۆچوونانەم هەڵوەشاندەوە لەبایاننامەیەکدا کە باسیان لەدامەزراندنی سەندیکا دەکرد, منیش پێم ڕاگەیاندن کە دامەزراندنی سەندیکا بۆ دژایەتی کردنی خۆمان هیچ مانایەکی نییە, جگەلەمەش بەم دۆخە داراییەمانەوە ناتوانین سەندیکایەکی وەها کارا دابمەزرێنین کە بتوانێت سەندیکای مارکسیەکان لاوازبکات, ئەمەش بەهۆی نەبوونی پەروەردەبینینی کرێکارانی نیشتمانی سۆسیالیستی بە پەروەردەی نازییەوە بوو.

هەروەها لە بڵاوکراوەیەکی دیکەمدا بەجوانی ئەوەشم ڕوون کردەوە کە نەیارانی بزوتنەوەکەمان وای پیشان دەدەن کە بزوتنەوەکەی ئێمە بۆیە سەندیکای جیاواز دادەمەزرێنێت چون حەزی سەرمایەداری هەیە, لەکاتێکدا نازی دژی خوودی دامەزراوەی سەندیکا نییە کە مافی کرێکاران دەپارێزێت , بەڵکو دژی خراپ بەکارهێنانی سەندیکاکانە وەکو هۆکارێك بۆ نانەوەی کێشەی چینایەتی و هەڵوەشاندنەوەی کۆمەڵگە و تۆرانی تەواوی تاکەکان لەیەکتر.

ئەو پارتانەی پاش لە جەنگ دامەزران ئەم بنەمایەیان لەپێش چاوان نەگرتبوو, لەنێوان ساڵانی ١٩١٩-١٩٢٢ شەش سەندیکای ڕاستڕەو و دوو سەندیکای ئازاد دامەزرا, کەیەکێکیان سەندیکای پیشەسازیە سوکەکان بوو, سەندیکاکان تەمەن کورت بوون, لەبەرئەوەی باش ڕێك نەدەخران و نمونەیی باڵاشیان نەبوو, ئەوانەشی دایان دەمەزراند کورت بین بوون لە قەبڵاندنی هێزی مارکسیەکانی دوژمنیان, بۆیە کاتێك هەستیان بەخۆیان دەکرد کەلەلایەن دوژمنەوە ماڵراون و تیاچوون.

# بەشی بیست و دوو

## هونەری هاوپەیمانێتی

لەشێوازی پـەیڕەوی دەرەوەدا دەسـتـەلاتی ڕایـخ ڕێبـازێکی پشـت پـێ ئەسـتوری نەبوو، بنەمایەکی دیاری کراویشی نەبوو کە سەرچاوەی ڕامیارێتیە هاوپەیمانیـەکانی لێوە هـەڵبقوڵێت و بەرژەوەنـدی نیشتمانی لێوە بـەدی بهێنـدرێت. شۆڕش هەلاّیسا و دۆخەکەی بە ئاژاوەداری هێشتەوە؛ چونکە هیچ کاتێك جولەکە و مارکسیەکان نـەیان ویسـتووە دەوڵـەتی ئـەڵمانیا بەهێزبکـەن و لـەناوخۆدا خـۆڕاگر و لەدەرێشـدا بیـانی ڕاوکاربێت، بەڵکو ئامانجی تاوانکارانی خـەزەڵوەری ۱۹۱۸ لـەناوبردنی هێز وتوانـای بەرهـەم هێنـی ئـەڵمانیا و گوێڕایـەڵکردنی وڵاتـە لـەبۆ سـەرمایەداری نێودەوڵـەتی. تاوانکـاران بـاش دەیـان زانـی مانـەوەی ئەمانـە لەسـەر دەسـتـەلاّت بەنـدە بـەتوانای جێبـەجێکردنی ئـەو کـۆت و بەندانـەی کـە پەیماننامـەی ئاشـتی بەسـەر وڵاتـدا سەپاندویەتی، بۆیـە هـەرگیز هـاوڵی دەرهێنـانی وڵاتیان نەدەدا لـەژێر بەندەکانی ئـەو ڕێکەوتننامە ئاشتیەی هاوپەیمانان.

ئەودەمەی گەلێك دەیەوێت بەڕاپەڕین خۆی ڕزگاربکات، هەستی نیشتمان پـەروەری دەگاتـە ترۆپـك، بـاش ئاگـاداری ئەنجامـدراوەکانی کەمـە ئانەتەوەییـەکان دەبێـت،

بەهەمان شێوەش ئەوکاتەی گەلێك دەیەوێت بەرگری لەخۆی بکات یان دووچاری جەنگێك دەبێتەوە و بەهۆیەوە ڕقابەرانی ناوخۆیی لە وڵاتدا سەرهەڵدەدەن, لەم کاتەدا کۆمەڵ دژی هەموو ئەوانە دەوەستێتەوە کەخزمەتکار و جاشی بێگانە خوێن مژەکانن, ئەوانەشی کۆسپن لەپێش گەشەی نەتەوەییدا لەناو دەبرێن.

ئەو مشەخۆرانەی کە هەلی خەزەلومریان قۆستەوە هەستیان بەوەکرد کە پشت بەستن بە هونەرێکی هاوپەیمانێتی کارا لای خۆیەوە دەبێتە هۆی هەست بەهێزکردنی نەتەوەیی و گێرانەوەی متمانە بۆ دەروونی ئەڵمانیەکان, بەمەش دەتوانن دۆخەکە بگێڕنەوە بۆئەو چاڵەی لێوەی دەرهاتووە, ئەمەش نەشیاوی هونەری رامیارێتی دەرەوەمان پیشاندەدات پاش لەجەنگ لەگەڵ شێوازە نابەجێ بەکارهاتوەکەشی, وەگەڵ خراپی دۆخی کارگێڕی وڵات و پشت گوێ خستنی بەرژەوەندیە نەتەوەییە زیندەییەکان.

بەتەنها حکومەت لەم دۆخە بەرپرس نەبوو, بەڵکو ئەوە خوودی پەرلەمان بوو هانی دا بۆ پشت گوێ خستنی بەرژەوەندیەکانی وڵات؛ چونکە زۆرینەی پەرلەمان لەکەسانی نانەتەوەیی پێك هاتبوو, بۆ بەدی هێنانی بەرژەوەندیەکانی خۆیان نەهامەتیەکانیان دەسرەواندە دڵی نەتەوەو کۆمەڵەوە. دەبێت دان بەوەدا بنێین کە پارتمان تاکە پارت بووە گرنگی بە هونەری رامیارێتی دەرەکی دابێت پاش لەجەنگ لەبۆ بەدیهێنانی بەرژەوەندیەکانی نەتەوە و سەلماندنی کارایی پارت. هەنگاوی یەکەمی پارتمان لەم کاتەدا لەناوبردنی هەموو بیانی خوازان بوو لەپێشدا, ئەوجار هەنگاونان بۆ باشترکردنی دۆخی هاوپەیمانێتی و ڕامیارێتی دەرەکی.

ئەوکاتەی باسی پارتمان بەهێز و ژمارەی لایەنگرانمان زۆر بوو, ناچاری دەست نیشانکردنی هەڵوێستمان و خستنەڕووی بوو لەبۆ کاردانەوە دەبڕین لەهەمبەر پەیمان نامە دەرەکیەکانی بەناو ئاشتیدا, پارتمان تەنها لێرەدا نەوەستا, بەڵکو نەخشەی تەواوی ڕامیارێتی دەرەکی بۆ ئەڵمانیا دارشتبوو, بەبێ دوورکەوتنەوە لە نەخشەی گشتی پشت پێبەستراوی پارتمان.

بزوتنەوەکەمان دەبوو لەپێشدا گەل وشیاربکاتەوە, ئاراستەی زۆرینەی گەل و بەرپرسان دەکات لەبۆ پەیرەوکردنی ئەو ڕێوشوێنانەی کە قازانجی هەموو گەلی تێدایە بەمەبەستی بەدی هێنانی ماف و سەروەریەکانی هەموان. هەر چەشنە کێشەیەکی

ڕامیاری دەرەکی دەبێت لەم ڕوانگەیەوە لێی بڕواندرێت: ئایا بەڕاست چارەکردنی ئەو ئاریشەیەی دووچاری گەلەکەمان بووەتەوە لەڕێگەی ئەوپێشنیارانەی ئێمە کێشەکە دەئالۆزکێنێت یان چارەی دەکات؟ ئەی لەئێستا و لەداهاتوشدا خزمەتی بەرژەوەندیەکانی گەلمان دەکات، یاوەکو بەزیان بەسەر گەلەکەماندا دەشکێتەوە؟

ئەمە تاکە ئاماژەبوو کە پێویست بوو لەسەری بوەستین؛چون ئەمە تاکە ڕێگەیە لەسایەیدا دەتوانین هەموو کێشە ئاینی و مرۆڤی و بۆچوونی و ململانێ هەمە جۆرەکان بتوێنینەوە.

***

بەر لەجەنگ دەبوو ڕامیارێتی دەرەکی ئەڵمانی خۆراکی تەواو بۆ گەلی ئەڵمانی دابین بکات لەبۆ پشت ئەستوربوون بۆ گەیشتن بەئامانجەکەی، لەگەڵ دابینکردنی توانا و هێزێکی زێدەبار بۆ ڕایخ بە پەیڕەوی هاوپەیمانێتی کەلە ئەزمونەوە وەرگیرابێ. کارەکان دوای شکستی جەنگ بەم شێوەیە مایەوە، جگە لەم جوداییە کەمە: پێش لەساڵی ١٩١٤ پێویست بوو لەسەر ئەڵمانیا قەوارەکەی خۆی بپارێزێت و هەلەکانی مانەوەی بۆ دابین بکات، پشت بەخۆی ببەستێت بەشێوەیەکی سەربەخۆیانە، بەڵام لەم ڕۆدا دەبێت دەوڵەت بوژانەوە بۆ گەل دابین بکاتەوە، لەڕێگەی بوژانەوەی خوودی دەوڵەتەوە، بەبێ بوژانەوەی خوودی دەوڵەت هیچ چارەیەك نییە بۆ پەیڕەوکردنی ڕامیارێتیەکی دەرەکی کارا و سەرکەوتوو کە دەستەبەری پاراستنی قەوارەکەی و گەل و خۆراك و فاکتەرەکانی گەشەی بێت.

بەشێوەیەکی گشتی پەیڕەوی دەرەوەی ئەڵمانیا لەم ڕۆدا دەبێت گەلی ئەڵمانی هامادەی گرتنەبەری ڕێوشوێن گەلێك بکات کە لێوەی بتوانێت سەربەخۆیی و ئازادی وەربگرێت، بۆئەوانەشی کە ورەی خەڵك دەڕووخێنن نابێت ئەوەیان لەبیربچێتەوە کە مەرج نییە گشتاندنی خاك هۆکاری سەرکەوتنی ڕاپەڕینی ڕزگاربوون بێت، بەڵکو تەنها دیارکەوتنی نیشانەی ڕزگاری لەیەك ناوچەی بچووکی وڵاتدا بەخێرایی دەتەنێتەوە و هەموان دێنەپاڵی بۆ تێکۆشان و بەدەست هێنانەوەی مافەکانیان لەڕێگەی چەکەوە.

بڕوام واسە ئەو گەلەی بڕوای بە ژێردەستەیی هەبێت لەبری دابەشکراوی خاکەکەی ئەو گەلە جگە لە کۆیلەبوونی هیچی دیکەی پێشیاونییە. ئەودەمەی گەلێك کۆمەڵێکی

ڕادەپەڕێت و سەرکەوتوو دەبێت ئەوا بۆ تەنینەوەی پێویستی بە ئامادەکاری پێش وەختە بۆ هەست بزواندنی هەموانی دی کە تائەو ساتەش کۆیلەی ستەمدیدەن, لەم کاتەشدا پێویستە ئەم ستەمدیدانە بەجوانی لەسەر بەکارهێنانی چەکی هزر و چەکی تفەنگی ڕابهێندرێن و هانی هەموان بدرێت لەبۆ یەککگرتن و کارکردن بۆ بەدەست هێنانی ئامانجی هاوبەشیان, کە ڕزگاربوونە لەستەم و کۆکردنەوەی پەرتەوازەبووەکانی نەتەوەیە لەژێر یەك دروشمدا.

ئەو دەمەی ئەم دۆخە پەیوەندی بەوەوە هەبێت کە دەوڵەتێك پارچەیەك لەخاکەکەی داگیرکراوە, دەبێت دەوڵەتی بەش خوراو بەر لەوەی بیر لە گێڕانەوەی پارچەکەی خۆی بکات, بیر لە بەهێزکردنی هەستی نەتەوایەتی لەناوخۆدا بکاتەوە, واتە لەم کاتەدا دەبێت بە بەدیهێنانی کارەگرنگەکەی لەپێشدا باسی زەویە داگیرکراوەکانی نەکات: واتە لەپێشدا پێویستە نیشتمانی دایك لەدەست بێگانە پەرەستان ڕزگاربکرێت, چونکە ئەرکی ڕاستەقینەی ڕزگارکردندەکەوێتە ئەستۆی خوودی ئازادنشینانی دەوڵەتی دایك نەوەك کۆیلە کراوەکانی دەوڵەتی بەناو دایك, بۆئەم مەبەستەش دەوڵەتی دایك دەبێت لەپێشدا خۆی بەتەواوەتی ڕزگاربکات و شمشێرەکەی بەتیژی بخاتە کێلانەوە بۆئەوەی هەرکاتێك پێویستی پێی بوو دەری بێنێت و لەگەردەنی داگیرکاری پارچەکانی دیکەی بدات و ناچاری بکات دەست لەم زەویانە هەڵبگرێت کەلەژێر هەرناوێکدا داگیری کردووە.

ئافراندنی تیغی تۆڵە دژی دوژمنانی نەتەوە ئەرکی سەرەکی دەوڵەتی نەتەوەییە لەناوخۆدا, دابین کردنی کەش و هەوایەکی گونجاو بۆ دروستکردنی تیغی تۆڵە پێتڤی وە هونەری ڕامیارێتی دەرەکی سەرکەوتووە.

لەدەسپێکی ئەم پەرتووکەدا بە سانایی شیکردنەوەی ئەو هۆکارانەمان کرد کە بووەهۆی لە بە لاڕێدابردنی ولآتی ئەڵمان بەر لەجەنگ, لەبۆ پاراستنی کیانی نەتەوەکەمان و دابینکردنی تەواوی خۆراك بۆ گەلەکەمان دەمان توانی یەکێك لەو چوار هۆکارەسەرەکیەی هەبوون وەربگرین, پایە بەدەستانمان هۆکاری چوارەمیان هەڵبژارد لەبۆ بەکارهێنان, بەو مانایەی لەبری ئەوەی دەستەلآتی ولآت لە نێو خودی ئەورووپادا پیادە بکات هەستا بەگرتنەبەری ڕامیارێتیەکی داگیرکاری بازرگانی دەرەوەی کیشوەر, بەو بڕوایەی ئەمە هیچ زیانێکی بۆ گەلی ئەڵمان نابێت, ئینجا

پێویستی بەشەڕ نییە بۆ بەدەست هێنانی ئامانجەکان، لەکاتێکدا فاکتەری سەرەکی هەڵایسانی جەنگی جیهانی بەرفراوان و ناچاری خۆبەدەستەوەدانی ڕایخ لەهەمبەر شکستدا ئەم چەشنە ڕامیارێتیە بوو.

دەبوو ڕایخ لەچوار هۆکارەکە سێیەمیان هەڵبژێرێت، بڵاوبوونەوەی دەستەڵات لەخوودی ئەورووپادا، ئینجا بیرکردنەوە لەبۆ داگیرکاری نەرەوەی کیشوەر، بۆ بەهێزبوونی خوودی وڵاتی ئەڵمانیا و پەلکێشانی لە کیشوەری ئەورووپادا پێتڤی بە لەیەك گەیشتن و مۆرکردنی پەیمان نامەمەیە لەنێوان بەریتانیا و ئەڵمانیادا. یاخوود لەڕێگەی بەهێزکردنی خوودی سوپای دەوڵەتی ئەڵمانیاوە دەبێت وگەیاندنی بە ترۆپکی چەکدارێتی و شیاو بۆ بەکارهێنان لەسەر هیسابی کارەکانی دیکەی وڵات، بەتایبەت واری هزری، بەرام ڕایخ ئەم کارەی ئەنجام نەدا. ئەوانەشی لغاوی شۆڕشی هزریان لەچنگدابوو لەبیریان کردبوو کە ئەم هزرەی ئەوان بنچینەی ئازادی ڕامیارییە، هەر نەتەوەیەك دوودڵ و ڕاڕابێت لەسەر دەست نیشانکرنی چارەنووسی ئەوا ناتوانێت بەرهەمێکی هزری بەهێز بخاتە بوونەوە.ئەو دەمەی دەستەڵات شورا یان سوپای گەورە و جوان گۆشکراو و ڕاهێنراوی بەهێزی هەبوو ئەوکات برەو بەفکر و ڕۆشنبیریش دەدرێت، تەنانەت شۆڕشی هزری لەسەردەمی بیرکلیسدا دوابەدوا جەنگە وێرانکارەکەی گەلی فارس و گریك هاتە بوونەوە و دیارکەوت، ڕۆماش پاش لەوەی لە ئەندێشەی جەنگ و ململانێ دەرباز بوو توانی سەرکەوتنێکی گەورە لەبواری زانست و هونەردا بەدەست بهێنێت.

بەڵام ئایا لەم کاتەدا دەتوانرێت چاوەنواری پێشکەوتنێکی بەرفراوانتربکرێت لە وڵاتێك کە زۆرینەی ئەندام پەرلەمانەکانی زۆربلێن و زۆرینەی دانیشتوانەکەی نەخوێندەوارن، سیاسیەکانی هەڵپەرەست و باری سەربازی نەشیاوە؟! لەم کاتەدا قوربانی دان کەبۆنێکی سەرکەوتنی لێدێت هیچ قازانجێکی بۆ نەتەوە نەبێت؟

بەڵێ دەکرا لەڕێگەی کەسایەتیەکی ژیری وەکو فردریکی گەورەوە بەدی بهێندرێت. ئەم پیاوە لەڕێگەی بەهێزکردنی باری سەربازی و ڕامیارێتی وڵاتەوە هەموو کارێکی ئەنجام دەدا. بەڵام ئەو کەسانەی دەیانەوێت و پێشتر چاوەنواری ئەوە بوون لەم جوورە مارکسیە سورانە کە لەڕێگەی پەرلەمان و دیمۆکراتیەوە خەونەکانیان بۆ بەدی بهێنن ئەوا جگە لە مێشك پووچی زیادتر شایەنی کەسانی بڕوا بوو بەم بۆچوونە نییە.

لەبەرئـەوەی ئـەم ئەنـدام پەرلەمانانـەی وڵات تـەنها شـتێك بیریـان لێـی نەكردبێتـەوە بەهێزكردنی دۆخی ڕامیاری وسـوپایی ڕایخ بوو، ئەمانە ئاوەزیـان بە ئاریمانی جوو فرۆشتبوو، ئەو بۆخۆی بەچ شێوەیەكی بیویستایە ئاراستەی دەكردن.

بـەبێ ئامادەكاری بۆ باری سـەربازی و خـۆراكی و ڕامیـاری وڵاتـی ئـەڵمانیا تـەقلی جـەنگ بـوو، پـاش كارلـەكار تـرازان بەرپرسـان هەسـتیان بەخاڵـە لاوازەكـانی دەستەڵاتەكەیان كرد، تا ئەوكاتـەی مۆتەكەی جەنگ بەرقاپی پێنەگرتبووین بـەدووی هاوپەیمانی ڕاستەقینەدا نەبووین لەبۆ پڕكردنـەوەی كەلێنەكانی وڵات، لـەبری ئـەوەی ئینگلیزەكـان بكەنـە هاوپـەیمانی خۆیـان و پـەلاماری ڕووسـیابدەن یـان ڕووسـیەكان بكەنـە هاودۆسـتی خۆیـان هێرشـی بەریتانیـەكان بكـەن، كەچـی لەیـەك كاتـدا هێرشـی هەردوو بەرەی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوایان پێكردین، بۆیە لـەم كاتـەدا تاكە هاوپـەیمانێك بـۆ ئەڵمانیا مابێتەوە بنەماڵەی هابسبۆرگی نەمسابوو!؟

***

هونـەری ڕامیـارێتی ئـەڵمانیا بـەر لەجـەنگی جیهـانی زۆر بـێ سـەرو بـەری و بـێ ئامانجی پێوە دیاربوو، خۆنەگەر پێش لەجەنگ تاڕادەیـەك دەزانـرا كە وڵات پـەیڕەوی ڕامیارێتی داگیركاری بازرگـانی دەرەكـی دەكـات ئـەوا لـەم ڕۆدا ئـەوەش بـوونی نییـە و نازانین چی دەكەن و دەیانەوێت بەم شێوە حوكمڕانیە سەقەتەیان بەكوێڕابگەن؟

گـەر بـەجوانی لـە بـارودۆخی كۆمـەڵانی ئـەورووپی بكۆڵینـەوە، لەڕوانگـەی هێـز و تواناوە، ئەوا لەم كاتەدا ئەو ڕاستیانەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە.

گەر لە دیرۆك بڕوانین لـە ناوەڕاستی سەدەی حەڤدەوە تـاوەكو ئـەمڕۆ دەبیـنین كە بەریتانیا ڕامیارێتی ناوەندبوون یان هاوسەنگی هێـز لەكیشـوەرەكەدا لەڕێگـەی ئاژاوە نانـەوەوە پـەیڕەو دەكـات، ئەمـەش بۆئەوەیـە بەئاسـانی بتوانێـت لـەدەرەوەی كیشوەرەكەی گەشە بەبواری داگیركاری خۆی بدات، لەدەسپێكی هاتنەسـەر تـەختی ئەلیزابێسی شاژنەوە تـاوەكو ئـەمڕۆش بـەریتانیا ڕامیارێتیـەكی كـۆنی بـەكارهێناوەو دووبـارەش بـەكاری دەهێنێتـەوە، بـەڵام بەپەردەپۆشـراوی ڕەنـگ جیـاواز، ئـەویش نەهێشـتنی دامەزرانـدنی دەوڵـەتێكی بەهێزە لەئـەورووپادا كـە بتوانێـت شـان بەشـانی بـەریتانیا بوەسـتێتەوە یـاخوود كیشـوەرەكە بۆخـۆی ڕام بكـات. بەمەبەسـتی بـەدی

هێنانی ئەم ئامانجە بەریتانیەکان یەك بەدووی یەك ئەوپەڕی هەوڵی خۆیانداوەو هەموو ئامرازێکیان بەکارهێناوە جا هەرچی و چۆنێك بێت، بۆ ئەوەی هیچ بەریتانیەك ناپاکی لە دەوڵەتەکەی بکات.

ئەوکاتەی جەنگێك لە کیشوەرەکەدا هەڵدەگیرسێت هەموو دەوڵەتان بە شکستەوە لێی دەردەچن، بەڵام بەریتانیا بەهێزتر دەبێت! ئەودەمەی داگیرگەکانی لەئەمریکای باکوور بڕیاری سەربەخۆ بوونی دا، بەریتانیا بڕیاری پاراستنی ناوچەکانی پشتەوەی ئەو کیشوەرەی دا، بۆئەمەش دەستی دایە جەنگێن لەبۆ لەناوبردنی دەستەڵاتی هۆڵەندی و ئیسپانیەکان لەدەرەوەی کیشوەرەکە و لێسەندنەوەی توانای دەریاییەکان، دواتر خۆی ئاراستەی فەڕەنساکرد لەوەی دەبێت وانەیەکی ئەمیش دادات و نەهێڵێت دوورگەکانی بکاتە ئامانج و هەنگاو بۆ داگیرکردنی بنێت، بۆئەمەش بەوپەڕی تواناوە هەوڵی لاوازکردنی فەڕەنسا بدات، ئەوکاتەی ناپلیۆن لاواز بوو ئەم کارەی بەئەنجام گەیاند.

بەڵام ئینگلیز لەدژوەستانی بەرزفڕانی ئەڵمانی پەلەی نەکرد؛ چونکە باش دەیزانی لەم کاتەدا نەتەوەی ئەڵمانی یەك دەنگ و یەك مشتن، سەرباری ئەوەی کارەکانی خوودی ئەڵمان لەدەرێدا مەترسیەکی ئەوتۆ نەبوو لەسەر پلانە ماوەدرێژەکانی ئینگلیز، بەڵام لەهەمان کاتدا بەریتانیەکان پێشتر نەخشەی گورز وەشاندنیان لە ئەڵمانیا داڕشتبوو، بۆئەمەش چەشنێکی نوێی ناڕوونی لە ڕامیارێتی لەهەمبەر ئەڵمانەکان بەکارهێنا، سەرباری ئەوەی کاتی زۆری دەویست، بەڵام ئەنجامی باشی دەبێت، ئەم کارەش پێویستی بە بانگەشەکار و وتاربێژی بەهێز هەبوو، وایشی کرد و کارەکەی خۆی ئەنجامدا.

پاش جەنگی (١٨٧٠-١٨٧١) ی ناسراو بەجەنگی حەفتاکان بەریتانیا زۆر بەڕوونی ڕامیارێتی خۆی لەبەرامبەر ئەڵمانیا خستەڕوو، لەم کاتەدا سەرکردەکانمان هەلێکی گرنگیان لەدەستدا کە بەریتانیا لە هاوپەیمانێك دەگەڕا بۆ بەکارهێنانی دژ بەڕووسیای بەرەو گەشەهەنگاونەر، ئەمەش لەڕێگەی هاوپەیمانێتی بەستنی نێوان هەردوو وڵاتەوە دەبوو، وەگەڵ پەیوەندی دروستکردن دەگەڵ دەستەڵاتی ئەمریکای شارنشینی پیشەسازیی، کەهەموو جهانی سەرسام کردبوو. ئەوکاتەی سوپاکەمان گورزێکی کوشندەی لەفەڕەنسا وەشاند دیتمان بەریتانیا بە ناڕوونی لێمان دەنواڕێت

و رامیارێتیە ئەوروپیەکانی بەشێوەیەکی نوێتر دارشتەوە ئەویش: لاوازکردنی ئابوری ئەڵمانیا و ڕێگرتنی لەوەی دەیەویت جهان لەڕووی بازرگانیەوە داگیربکات, لەژێر ناوی پاراستنی ئاشتیدا بەریتانیا هەستا بەکۆکردنەوەی هێزی ولاتانی ئەوروپی دژبەئێمە, هەموو کۆرابوون لەوەی کە بەتەنها توانای گورز وەشاندنیان لە دەولەتی شکۆمەند وخاوەن سەروەری ئەڵمانیایان نییە. بەلام ئەوانەشی بروایان وابوو بەفرت و فێلّ دەتوانن ولاتە ئەوروپیە دژەکانیان هەڵبەخەڵەتێنن ئەوانە گەمژەبوون, ئەوانەشی خۆیان بە زل و زالّ دەزانی لەچەواشەکاران بیّ نرختن و زیانیان لەوان زۆرتربوو, کەر نەشچێتە خانەی ناپکی نەتەوەییەوە.

شۆرشی ئەڵمانیا سنورێکی بۆئەو مەترسیانە دانا کە بەریتانیا هەیبوو, پاش ئەوەی شکستی جەنگ هەموو هێز و توانایەکی لەئەڵمانیەکان سەندبۆوە شتێك نەمابوو بەناوی شکۆمەندی و بالآیی دەرەکی ئەڵمانی و ولاتانی دەوروبەر سلّی لێبکەنەوەو لێی بترسێن. بەریتانیا زۆری سەیر لەوە دەهات چۆن شکستی دەولەتی ئەڵمانیا کە چوار سالّ و چەند مانگێك کاری بۆ دەکرد بووە هۆی تێکدانی نەخشە ماوەدرێژەکانی ئەو و تێکدانی دۆخی ئاسایی کیشوەرەکە؟! بەریتانیا لەسەرەتای جەنگەوە هانی ولاتانی ئەوروپی دیکەی دەدا لەبۆ دارمانەدنی ئەڵمانیا, پاش لەسەرکەوتنی پلانەکەی درکێکی نوێی بۆ دیارکەوت ئەویش فەرەنسابوو, کە هەم هێزی وشکانی هەبوو, هەمیش لەدەریادا تارادەیەك بەهێز بوو.

ئەودەمەی بەریتانیا دووچاری ئەم بارە نەخوازراوە هات, دیپۆماتەکان نەیان دەزانی پیلانی چی و نوێتر دابرێژنەوە, حایرمابوون, چون باش دەیانزانی ئەو بانگەشەیەی چوارساڵە لەدژی ئەڵمانیا ئاراستە کراوە ناتوانرێت لەیەك شەوو رۆژدا دژبە فەرەنسا بابدرێتەوە, بەریتانیا زیانێکی زۆری هەبوو لەجەنگدا لەکاتێکدا فەرەنسا لەو باشتربوو, ئەو دەولەتانەشی پاشکەوتەی بەهێزن بێگومان لەدۆخێکی وەها شوێنی فەرەنسا دەکەوتن دژ بەبەریتانیا گەر هەنگاوێکی دژە فەرەنسا بهاویشتایە.

تاکە ولاتێك توانای سنوردانانی هەبێت لەهەمبەر چاوبرسێتیەکانی فەرەنسادا بەتەنها ئەڵمانیایە, بۆئەمەش بەریتانیا دەبوو سوود لەئەڵمانیا وەربگرێت بۆ لەناوبردنی فەرەنسا , بەلام دوای چی, شکستی جەنگ هەموو شتێکی جوان و

بەهێزی ئەڵمانیای لەناوبرد, ئەڵمانیا شۆڕش و شەڕی ناوخۆی دووچاربوو, لەجەنگ کشایەوەو هیچی دەست نەکەوت جگە لەمیچ, هەموو بەدەوری فەڕەنسادا سەرقاڵی ماستاوکردن و خۆنزیك کرنەوەبوون , بۆیە لەبەریتانیاش بەناچاری دەستی تێکەڵی فەڕەنسا کرد بۆ دابەشکردنی بەرهەمەکانی جەنگ و دوانەکەوتن لەپرۆەوتی پێشکەوتن و داگیرکاری.

ئەودەمەی بەریتانیە بەتەواوەتی دژبەری کردنی خۆی لەهەمبەر ئەڵمانیادا ڕاگەیاند, دۆخی سوپای ئێمەی ئەڵمانی زۆر باش نەبوو, لە ئەوروپادا دوو دەوڵەتی بەهێزی وشکانی هەیە, ئەوانیش فەڕنسا و ڕەووسیایە, هەریەکە لەمانە توانای ڕووبەڕووی بوونەوەی هێزی ئەڵمانیان هەیە بەتەنها جا وەرە لەگەڵ سەردار و ئیمپراتۆریەتی دەری (بەریتانیا)دا یەکبگرن لەدژی ئەڵمان؟ پێگەی ئەمڕۆی فەڕەنسا جیاوازە لە پێگەی دوێنی ئەڵمانیای پێش جەنگ, بەهێزترین دەوڵەتی سەربازییە لە کیشوەرەکەدا, لەم ڕوانگەیەشەوە هیچ چەشنە ڕکابەرێکی ڕاستەقینەی نییە, لەباشوورەوە سروشت پشتی گرتووە لەهەر هێرشێك کە ئیسپانیا و ئیتالیا بەنیازی بن, پاش لەڕووخانی ئەڵمانیاش فەڕەنسا ترسی لە ئەڵمان نەما, سەرباری دەستڕاگەیشتنی بەسەر کەنارەکانی ڕۆژئاوای نزیك لەبەریتانیا کەبەناوەندێکی جەنگی دادەنرێت و هەمیشە دانیشتوانی ئەو ناوچەیە لەژێر میهرەبانی تۆپە دوور مەوداکاندان, سەربازی هێزی ئاسمانی. ژێرئاوییە فەڕەنساییەکان توانای بەرپەرچدانەوەی بەریتانیەکانیان هەیە, لەڕێگەی کەناراوەکانی زەریای ئەتڵەسی و دەریای سپی ناوەڕاستەوە.

بەم کارەش بەریتانیا گەورەترین زیانی لەخۆی دا لەوەی ئەڵمانی دووچاری شکست کردەوە, بەم کارەی هەل تەواوی بەخشیە فەڕەنسیەکان بۆ بوون بەسەرداری ئەوروپا. ئەوکاتەی بەریتانیا هەرێمە یەککگرتوەکانی ئەمریکاشی بە دوژمنی دەریایی خۆی هەژمارد هەڵەی کرد, لەبواری ئابوریشدا بەریتانیا دەستی لەکۆمەڵێك ناوچەی ستراتیژی وەها بۆ هاوپەیمانانی هەڵگرت کە دەستبەری بەرژەوەندی زیندەییەکانی بوون.

بەڕاستی ئامانج و کاری دیپلۆماتە فەڕەنسیەکان هەمیشە پێچەوانەی ئینگلیزە. بەریتانیەکان چاودێری ڕاگرتنی هاوسەنگی هێز دەکەن لەکیشوەرەکەدا, ئەوکاتەی

ولأتێـك نـەختێك سـەنگینتر دەبێـت ئـەوكات بـەگوریزی گورچـكبڕ بـارە قورسـەی پـێ دادەگرێتەوەو سوكی دەكات و ناهێڵێت بەئاسانی سەنگی خۆی بە بەهێزی ڕابگرێت, بـەلأم فەڕەنسـیەكان سـەرباری ئـەوەی هـەمان پلانیـان هەیـە بـەلأم لەچوارچێوەیەكی تەسـكەبەردا ئـەنجام و پـەیڕەوی لێدەكـەن. گـرنگ لەڕوانگـەی هەردووكیانـەوە سـەرپێنەكەوتنی ئـەڵمانیا و دەریانەكەوتنیـەتی وەكـو دەوڵـەتێكی بـەهێز, چون بـاش دەیان زانی گەلی ئەڵمانی یەكگرتوو هێزێك پێكدەهێنێت كەبەئاسانی كەس ناتوانێت بەسـەریدا زاڵبێـت, بۆیـە دیپلۆمـات كاران و پلان داڕێـژەرانیان زۆر بەجوانی چاویان بڕیبـووە چـۆنێتی لاوازكردنـی ولأتەكـەمان, ئەمـەش لەڕێگـەی هانـدانی گروپـە جیاخوازەكانـەوە بۆیـان دێتەبەرهـەم, لەگـەڵ داگیرسـاندنی ئـاگری كێشـە لەولأتـدا بـەجۆرێك دەوڵـەت بـوونی خـۆی بـە مەزیەتـەوە ببینێتـەوە, بـەم كـارەش دەوڵەتۆچكە ئەڵمانیەكمان هەڵدەستن بە لاوازكردنی خوودی ئەڵمانیا و ڕاگرتنـی هاوسـەنگی هێزی ئەورووپی و هێشتنەوەی هێز بۆ بەریتانیا.

***

لەسایەی ئەو ڕاستینانەی خستمانە ڕوو هیچ هاوپـەیمانێك لەبـەریتانیا باشتر نییە بـۆ ئـەڵمانیا, نكـوڵی لـەوە ناكـەم ڕامیـارێتی بـەكارهێنانی سـوپا لەجەنگـدا لەلایـەن ئینگلیزەكانـەوە نەهامەتیـەكی زۆری بـۆ هێنـاین, بـەلأم ڕق لێبـوون لەدەوڵـەتێك كـە ئێسـتاكە قـازانجێكی نـەماوە بـەڵكو زیـانی بەركـەوتووە لەهەمبـەر شكسـت خـواردنی ئـەڵمانیادا كـەڵی چـییە, ئەمـەش دوای ئـەوەی بـەریتانیا بەباشـی چاوبرسـێتی فەڕەنسیەكانی بۆڕوون بوویەوە.

بـەریتانیا و ئـەڵمانیا كـە یـەك دوژمنـی هاوبەشیان هەیـە دەتـوانن بـۆ لـەناوبردنی یەكبگرن, لەهەمان كاتدا نابێت ڕامیاركارانی ئەڵمانیا بـەدووی ئەندێشـەوەبن, وا نـەبن لەهەمبەر سۆزێكی درۆینەی كەسێكی بێگانە خۆیانی بۆ كۆت بكەن, واتـە بـە سـۆز نـا بەڵكو بە ئاوەز كاربكەن. ناشتوانین بڵێین دادپـەروەری ئـەڵمانیا لەڕێگـەی بـەریتانیاوە بـەدی دێـت؟ چـونكە بـەریتانیا هـەر بەریتانیایـە و ئیتالیـا و ئـەمریكاش هـەمان شت, كەواتـە نابێـت بـەهیچ شـێوەیەك لەڕێگـەی سـۆزەوە هەڵبخەڵـەتێنرێین و بەبناغـەی هاوپەیمانێتی بزانین, مەرجنیە لەكاتی بوونی هاوپەیمانێتیدا سۆزی یـەكتر لەبارچاو بگیرێت بەڵكو دەستكەوتی یـەكتر لەپێش چاوان دەگیرێـت, واتـە كەسـێكی ئینگلیزی

دەتوانێت ڕامیارێتیەکی قازانجدار بۆ ئینگلیز و ئەڵمانەکان پەیڕەوبکات لەبری ئەوەی بەتەنها بڵێین: ئینگلیزەکان دەبێت بۆ قازانجی ئێمەی ئەڵمانی کاربکەن.

لەوکاتەی باڵی ئەڵمانیا شکاوەو شاپەڕەکانی فەڕەنسا بۆ فڕین درێژتر دەبێت زۆرێک لەولاَتە ئەورووپیەکان دەترسن, فەڕەنسا واخەریکە لەڕووی سەربازی و ئابوریەوە زۆر بەهێز و بەهێزتر دەبێت, ئێمەی ئەڵمانی تائەم کاتەش خۆمان یەکلایی نەکردۆتەوە لەوەی دوژمنی خۆمان بناسینەوە, کە دوژمنێکی مەترسیدار و بێبەزەییە, ئەویش فەڕەنسیەکانن, جا ئەم فەڕەنسیانە یەعقوبی بن یان بۆربۆنەکان, یان بنەماڵی پۆناپەرت یام دیمۆکراتە بۆرژواکان, کۆمارییە میانگیرەکان یان مارکسیە سور خوازەکان, هەریەکە لەمەمان لەسەر دەستەلاَت بێت ئامانجی سیاسەتی دەرەوەی تەنها دەستگرتن بووە بەسەر ڕینانیا ی ئەڵمانی و پارچەپارچەکردنی ئەڵمانیا بووە.

ئینگلیزەکان پێیان ناخۆشە ئەڵمانیا گەشەی ڕەوان بکات, بەلاَم فەڕەنسیەکان حەزیان لە پاکتاوکردنی نەخشەی ئەڵمانیایە. لەمڕۆدا ئێمەی ئەڵمانی کاربۆ بوون بە دەوڵەتێکی مەزن ناکەین بەڵکو تەنها بەدووی دەستکەوتنی تیکە نانێک بۆ منداڵەکانمانەوەین. گەر بەجوانیش لە هاوپەیمانێتیەکانی ئەورووپامان بنوارین دەبینین تەنها ئینگلیز و ئیتالیا بۆمان بەکەڵك دێن, ئینگلیزەکان ڕقیان لە باڵهاویشتنی فەڕەنسیەکانە لەترسی ئەوەی ڕۆژێك هەڕەشە لەبەرژەوەندیەکانی نەکات, ناشکرێت ئەو کاتەی فەڕەنسا سەرقاڵی داگیرکردنی کانە خەڵوەزەکانی ئەورووپای ڕۆژئاوایە بەریتانیا دەستەوەستان دابنیشێت, چون باش دەزانێت گەر فەڕەنسای هاوپەیمانی دوێنێی ئەم کانە خەڵوزانە هەمووی داگیربکات ئەوکات بەئاسانی دەبێتە خاوەنی سیاسەتی ئاراستەکردنی کیشوەری ئەورووپا و ئابوری جیهان و زۆربوونی دەستەلاَتی فەڕەنسیەکانیش لە کیشوەرەکە تەنها مانای لەناوچوون و بەرتەسکبوونەوەی دەستەلاَتی بەریتانیایە لەم کاتەدا و هیچی تر.

ئیتالیاش زۆر بەمەترسیدارانەوە لە فراوانبوونی دەستەلاَتی فەڕەنسا لە کیشوەرەکە دەنوارێت؟ چون ئیتالیا زۆری حەز بە داگیرکردنی ئاوزێلی دەریای سپی ناوەڕاست و پەلکێشانە بۆ ئەفریقاو داگیرکردنی ولاَتانی ئەو ناوچەیەش کە دەکەونە نزیك دەریای سپیەوە بوو, واتە ئیتالیا بۆئەوە نەچووە جەنگەوە بۆئەوەی فەڕەنسا بەهێزبکات, بەڵکو تەنها بۆ گورز وەشاندن لە نەمسای دراوسێی پۆیشتە جەنگەوە,

بەڵام ئەوەشی لەیاد نەکردبوو کە مەترسی فەڕەنسیەکان هیچ کات لە نەمساویەکانی ڕۆژهەڵاتی کەمتر نییە.

ئەمەش مانای وایە بوونی دەوڵەتێکی بەهێزی ئەڵمانی هیچ زیانێکی کاریگەری نابێت بۆهەریەکە لە بەریتانیا و ئیتالیا، بەڵکو هۆکاریش دەبێت لەبۆ باشتر چەسپاندنی بەرژەوەندیەکانی ئەم دوو دەوڵەتە لەکیشوەرکەدا، واتا قازانجی لە زیانی زیادترە.

ئەوکاتەی سەرقاڵی تاوتوێ کردنی بەستنی هاوپەیمانێتی دەبین لەگەڵ ئیتالیا و بەریتانیادا پێویستە سێ بنەمای گرنگ لەپێش چاو بگرین، کە بنەمای یەکەم پەیوەستە بە خوودی ئەڵمانیایەوەو دووەم و سێیەمیش بە بەرژەوەندیەکانی ئیتالیا و بەریتانیاوە.

بەڵام لەپێشدا ئەبێت ئەوەمان لەیادبێت، ئاخۆ هیچ دەوڵەتێك هەیە بیەوێت هاوپەیمانێتی دگەڵ ئەم ئەڵمانیایەی ئێستا ببەستێت؟ چۆن دەبێت دەوڵەت گەلێکی بەهێز و هێرشبەری خاوەن پلانی ماوەدرێژ دەستبخەنە دەستی دەوڵەتێکی شکست خواردووی جەنگی بێ پلانی وەکو ئەڵمانیاوە! لە ئەڵمانیادا کە بنەماکانی مارکس و جووەکان بەناوی دیموکراتیەوە زۆرینەی نابیناکردووەو هەڵخەڵەتاندووە و نازانن چی دەگوزەرێت، لەم کاتەشدا هیچ دەوڵەتێك ناتوانێت چاوەنواڕی هیچ قازانجێك بکات لە دەوڵەتێکی ملشۆڕی هیچ لەبارە نەبوو، کەتەنانەت توانای بەرگری کردنی لەخۆیشی نییە، ئەم دەوڵەتە هیچ هەنگاوێك نانێت بۆ خۆڕزگارکردن لەو نەهامەتیانەی کە پەیمان نامەکانی ئاشتی بەسەریاندا سەپاندوویەتی، ئەمەش بەهۆی ئەوەوەیە کە خاوەن خێسە پیسە نێودەوڵەتیەکان دەستیان گرتووە بەسەر ئەم وڵاتەدا.

بێگومان هەر دەوڵەتێك بیەوێت بەبەهێزی بمێنێتەوە ئەوا هەنگاو نانێت بۆ هاوپەیمانێتی دروستکردن لەگەڵ ئەم دەوڵەتەی کەلەلایەن خوودی ئەندام پەرلەمانەکانیەوە هەڵدەمژرێت.

ناشبێت ئەوە لەیاد بکەین کە، هەرچەندە مانەوەی ئەڵمانیا بە لاوازی قازانجێکی بۆ ئینگلیزەکان نییە، بەڵام لەلایەن جووە جیهانیەکانەوە بەخێرهاتنی لێدەکرێت، لەگەڵ بەرژەوەندی و پلانەکانیدا بەهاوتای دەزانێت، بەتایبەت ئەوکاتەی دیارکەوت کە پلانە نهێنیەکانی بەریتانیا دژە و پێچەوانە لەگەڵ جووەکاندا، بۆیە جووەکان دەیانەوێت

هـەموو کۆڵەکـەکانی ئـابوری و ڕامیـاری ئـەڵمانیا خواربکەنـەوە بۆئـەوەی خۆیـانی پێبەرزبکەنـەوە، هـەموو هـەوڵێك دەدەن لـەبۆ بـە بەلشـەفی کردنـی ئەڵمانیا، بۆئـەوەی دەست بەسـەر ئـابووری نەتەوەییـدا بگـرن، ئەوکاتەشـی هەستیان بـە کـەم توانـایی مارکسـی ئـەڵمانی کـرد لەهەمبـەر دەسـتەڵاتە نەتەوەییەکەیـدا، ئـاگری جـەنگیان هەڵایسـاند و ئـەڵمانیایان پـێ فرێـدا و لەناوخۆشـدا شۆڕشیان هەڵایسـاند و فـەتارەت بەدووی فەتاریان بەسەر ئەڵمانیادا هێنا.

جـووە جیهانیـەکان ئـەڵمانیایان کـردە ناوەنـدێك بـۆ دارشـتنەوەی پیلانگێـڕی و کۆبوونەوەو دەست نیشانکردنی ئامانجە دوور مەوداکانیان، چونکە بەلشەفیکیەکانی وڵاتەکـەمان، واتـە تێکـدەرانی ویـژدانی نەتـەوەی ئـەڵمانی، ئەوپـەڕی هـەوڵ دەدەن بۆئەوەی هەرچی هێز و توانایەکی وڵاتەکەمان هەیە بیخەنە ژێر دەستەڵاتی دامـەزراوە جوولیـە بانکیەکانـەوە، ئەمـەش هـەنگاوێکی مەزنـە لـەبۆ داگیرکردنـی هـەموو جهـان لەلایـەن جـوەوە. لـە بەڵگەنامـەی (داناکـانی جوولەکـە)-دەسـتوری بزوتنـەوەی جورخوازی-دا هاتووە: ئەڵمانیا دەبێت ببێتـە تـەوەری تێکۆشانی جوولەکە لەپێناو بەدی هێنانی ئامانجە گەورەکەدا، ئەگەر ئەنجامدرا ، ئەڵمانیا خرایە ژێر دەستەڵاتی گەلی بژێردراوەوە، ئەوا لەم کاتەدا کۆسپی گەورەی سەر ڕێگەی خۆی لابردووە لـەبۆ گەیشتن بەئامانجە باڵاکانی.

جووی جهانی زۆر ژیرانە هەنگاو دەنێت، تواناداره بـۆ هەڵخەڵەتاندنی جهان و ڕای گشتی، ژەهراوی کردنی بۆچوونی هـەموو نەتەوەو گەلان، بۆئەمـەش پـەنا دەباتـە بـەر دەزگـا و شـێوازی جۆراوجـۆر، وتوویـژکردن لەگـەڵ هـەموو نەتـەوەکان بـەو شـێوەیەی کاریگەری قوڵیان بەسەرەوە جێبهێڵێت. لە ئەڵمانیا کە خوێن تێکەڵاوییەکی زۆر هەیە جووەکان دیموکراتی بڵاودەکەنەوە، لە فەڕەنسا جووەکان ململانێی نێوان هـاوڵاتی و بێگانـەکان دەقۆزنـەوە، لـەئینگلیز لەسـەربنەمای بەرژەوەنـدی ئـابوری و ئامارەگـەلی ڕامیاری جیهانی ئاوازەکەیان دەژەنن.

لەیـەك دوورکەوتنـەوەی زۆر دەبینرێـت لـە نێـوان چەمکی سیاسەتی نەتـەوەیی و ئامانجـەکانی جوولەکـەی جیهانیـدا لەمەڕیەکـە لـە بـەریتانیا و ئیتالیـا، تێگەیشـتنی تـەواو لەفەڕەنسـیا لـەنێوان نەتـەوە خـوازان و خـاوەن بۆرسـەکاندا هەیـە کـە جـوو خاوەنیانە. ئەم لەیەك تێگەیشتنە مەترسی بۆسـەر گـەلی ئەڵمانی زۆرە، فەڕەنسا بـەم

کارەی دەبێتە سەرسەخت ترین دوژمنی ئێمە کە نابێت بۆ ساتێکیش دەستی لێهەڵبگرین لەبۆ لەناوبردنی. گەلە فەرەنسی کە واخەریکە قۆناغ بەقۆناغ دادەبەزێتە خوارەوە بۆ ئاستی ڕەش پێستان , بەم کارەی مەترسی دەخاتەسەر قەوارەی سپی پێستانی ئەورووپا و ئەگەری توانەوەی ئەورووپا دەکرێت لەم تیانە مەترسیدارەدا.

هیچ فەرەنسیەك درۆناکات گەر بڵێت بەشدارە لەپیسکردنی خوێنی ئەڵمانیەکانی ڕینانیادا, چونکە ئەم گەلە تیاچووە ئارەزووی لە جووەکان کەمتر نییە لەبۆ لەناوبردنی زیندەیی گەلەکەمان و هاندانی ڕەگەزەکانی دەوروبەر بۆ پیاتدن و جووتبوون لەگەڵ ڕەگەزی ئەڵمانیدا, جابەهەر جۆر و شێوەیەك بێت.

بەڕاستی ئەم چەشنە هەنگاونانەی فەرەنسا-کە جوەکان دەسپێکی هەنگاوەکان و دنەدەرین-تاوانێکی گەورەیان لەهەمبەر ڕەگەزی سپی ئەورووپادا ئەنجام دەدەن, ئەوڕۆژە زۆر دوور نییە ئەورووپیەکان پێکەوە بەسەر ئەم خوێن پیسکارانەدا دەچەن و لەناویان دەبەن. ئەمەش بەوە دێتەدی کە ئەڵمانی ڕابردووی شەرئامێزی لەگەڵ بەریتانیا و ئیتالیا پشت گوێ بخات و بەدووی ئاشتیەوە بێت لەگەڵ ئەم دوو وڵاتەدا, بەمەبەستی لاوازکردنی فەرەنسا لەداهاتوودا.

***

بەنەختێك بەدواداچوونکردن بۆ پەیڕەوکراوی سیاسەتی دەرەوەی ئەڵمانیا لە هەڵایسانی شۆڕشەوە تاوەکو ئێستا دووچاری بێ هیوایی دەبینەوە. لە مانگی خەزەڵوەری ١٩١٨ وە تاوەکو ئەمڕۆ [1] دەستەڵاتدرانمان جگە لە قایلکردنی فەرەنسا و گوێڕایەڵی کردنی نەتەوەی باڵا و زیادەڕۆیی کردن لەستایشیان لەوەی میهرەبان و بەسۆزن بۆ ئەڵمانیا هیچی دیکەیان نەکردووە و ئەنجام نەداوە. ئەم چەشنە ڕامیارێتیە بێڕێزی کارە بە گەلی ئەڵمانی لەلایەن کەسانی لغاوبەدەستی پشت پەردەوە بەخێرهاتنی لێدەکرا, چون مانەوەی ئەڵمانی بەلاوازی و ملکەچی بۆ گەلانی دەرێ مانای هاتنە دی ئامانج و سەرگرتنی پلانەکانی جوولەکەیە, بێگومانین لەوەی نێزیك

[1] ) هتلەر لەکۆتاییەکانی ١٩٢٦ دا لەنوسینەوەی پەرتووکی (نەبەردیی من) بووەتەوە و دەستی لێهەڵگرتووە, واتە مەبەست لەئەمڕۆ ڕۆژی نوسینەوەی ئەم لاپەڕەیەی پەرتووکەکەیە لە ساڵی ١٩٢٦ دا.

کەوتنەوەی کۆمار لەفەرەنسا مانای لەدەستچانی هەموو شتە جوان و پەسەندکراوە نەتەوەییەکانی ئەڵمانیایە.

لەو کاتەی کۆما سەرقاڵی داڕووتانەوەی نەتەوەی ئەڵمانی بوون لەهەموو شتەجوانەکان ڕۆژنامە جووخوازەکان بەخۆبەخشانە ڕقیان لەناوخی هاوڵاتیانی ئەڵمانیدا دەچاند لەبەرانبەر ئینگلیزەکاندا, لەگەڵ بانگەشەکردن بۆ دامەزراندنەوەی کەشتی گەلی ئەڵمانی دژبە ئینگلیزەکان و هەوڵدان بۆ گێڕانەوەی داگیرکراوەکانی ئەڵمانیا.

جوولەکە زۆر ژیرانە یاریەکەیان ئەنجام دەدا: جووەکان نەتەوە دڵپاك و ئارەزوو پاکەکەمانی هەڵدەخەڵەتاند, بەئاریشەی ئاسایی چاوبەستیانیان دەکرد, جووەکان پاڵیان بە گەل ئەڵمانیەوە دەنا بۆ خۆپیشاندان دژبە ئینگلیزەکان لەکاتێکدا فەرنسا کەوتبووە ڕیزەی ئەڵمانیەکان و کۆلەکەی سەربەخۆیی ئەڵمانیایان مین ڕێژدەکرد, ڕۆژنامە جووەکان هەستان بە وروژاندنی کێشەی تیرۆل ی باشوور و داوای لە ئەڵمانەکان دەکرد خۆپیشان ئەنجام بدەن و نامەی نارەزایی بە کۆمەڵەی نەتەوەکان بدەن.

تیرۆلی باشوور کە ئێستاکە ئەندامانی نوێنەرانی ئەنجومەنی پەرلەمان بانگەشەی بەدەست هێنانەوەی دەکەن بۆخۆم یەکێك بووم لەوانەی لەکاتی جەنگدا بەرگریم لێکردووە, لەکاتێکدا ئەمانەی ئێستا فرمێسك دەرێژن ئەوانە سەرقاڵی لوغم ڕێژکردنی بەرەی ناوخۆیی وڵات بوون, هانی کرێکارانیان دەدا لەبۆ مانگرتن و بەرهەم نەهێنانی شمەك و تفاقی پێویست بۆ سوپا و دانیشتوان, لەپشتەوە خنجەریان دەدا لەسوپا و سەربازی وڵات, کێشەی نەتەوەییان لە ڕایخدا بەتەواوەتی تێکدا و نەتەوەیان خستنیانە تەنەکەی زبڵی نانەتەوەییەوە.

ئەودەمەی تیرۆلی باشوور ناوەندێکی جەنگی هارەدر بوو, بەبێ تیژکردنی شمشێرەکان نەدەتوانرا بەدەست بهێندرێتەوە. لەم وارەشدا گروپ و دەستەکانی سوپای ئەڵمانیا سەرکەوتنی باشیان بەدەست هێنا, بەردەوام بوو لەسەرکەوتن تائەوکاتەی لەناوخۆوە دەگەی لێدرا و پشتی شکێندرا و یارمەتی لێبڕا. ئەوانەی هۆکاری هەڵایسانی کێشەی ناوخۆیی وڵات بوون ئەمانە قەرداری نەتەوەن بەلەدەستدانی تیرۆلی باشوور و ناوچەکانی دیکەی وڵات. ئەوانەی بڕوایان وایە کە

کێشی تیرۆلی باشوور دەتوانرێت بە خۆپیشاندان و ڕێپێوانی ئاشتیانە چارە بکرێت ئەمانە یان ئەوەتا گەمژەن یان شێتن و بڕوایان بەهەموو ئەوشتانەیە کەپێیان دەگوترێت, باشە کەی هاولاتیانی ئەلمانی لەوە تێدەگەن کە بەدەست هێنانەوەی زەویە لەچنگ دەرکراوەکانیان لەرێگەی بەیان نامە و بروسکە پێشکەش کردن بە کۆمەڵەی نەتەوەکان و خۆپیشاندانی ناوخۆیی ولات وەرناگیرێتەوە, بەلکو لەرێگەی هێزەوە وەردەگیرێتەوە, چونکە زۆربەی بەهێزبراوە, ئەمەش تەنها ئەو رۆژە دێتەدی کە هێزی ڕووبەڕوو بوونەوەو پەلاماردانی دوژمنمان لادەستەبەربێت.

لەهەمووی ناخۆش تر ئەو کەسانەی ئەمرۆ لەدەستدانی تیرۆلی باشور بە هەلەیەکی بەۆجەستە لەقەلەم دەدەن, بەلکو بە بناپاکی لەنیشتمانی ئەژماردەکەن, ئەمانە هیچیان نەکردووە, لەپێناو لەدەست نەدانیدا, جگە لە قسەی قۆڕ و زلی سەرزمان و ڕشتنی فرمێسکی تیمساحانە, گەر ئەمرۆش بانگی ئەمانە بکەیتەوە بۆ هەلگرتنی چەك بەمەبەستی ڕزگارکردنی ئەو خاکەی بانگەشەی خەمباری لەدەستدانی بۆ دەکەن ئەوا لەگۆشەی تایبەتی نوسینگەکەی خۆیانەوە دەدەنیشن و هەرگیز یەك فیشەك لەبەر خاتری نەتەوەو خاك و نیشتمان ناتەقێنن.

ئەوانەی بۆ چارەنوسی تیرۆلی باشوور دەگرین, لەخاوەن دوانگە و قەلەم بەدەستان و داوای گێڕانەوەی دەکەن بۆسەر خاکی نەتەوەی ئەلمانی, هەر ئەمانەبوون تا دوێنێ داوای دەست هەلگرتنیان لە نیگەرانکردنی ولاتانی سەرکەوتوو و بەتایبەت فەرەنسادەکرد و پشتیوانیان لەپەیمان نامەی ئاشتی ڤرسای دەکرد و ڕووخاندنی پردەکانی ڕووهریان لەلایەن تیمەکانی ڕزگاریخوازەوە شەرمەزار دەکرد, بەم جۆرەش یاری دوو ڕوویی ئەمانە زۆر بەباشی دیارکەوت. ئەو کاتەی جوولەکە و کلکەکانیان هەستیان بە دروستبوونی هاوپەیمانێتی دەکرد لەنێوان ئەلمانیا-ئیتالیا بووە کارێکی خوازراو لە ناوەندە ئەلمانیەکاندا , بۆیە کارێکی ئاسایی بوو کە جوولەکە و لایەنگرانیان لە بنەمالەی هابسبۆرگ ڕێگە لەم هاوپەیمانێتیە بگرن بەمەبەستی بەهێز نەبوونی ئەلمانیا لەڕوانگەی نێو دەولەتیەوە.

بەپالنەری ڕقی تەواویان بۆ ئەلمانییە پاکەکان, لەڕێگەی پەیرەوکردنی بەرنامەکانی ناوەزی گەلی هەلبژێردراو لە بۆهتان و درۆوهەلبەستراو, ئەوانەی فرمێسکیان لە بۆ لەدەست دانی تیرۆلی باشوور دەڕش دەستیان دایە تاوانبارکردنی نەتەوەخوازە

پوختەکان و وایان بڵاودەکردەوە کەهۆکاری ئەم شکستە بەهۆی ناپاکی سەربازانی پرۆسیەوە بووە, بۆیە منیش لێرەوە بەم درۆ و هەڵەستکارانە دەبێژم:

هەر هاوڵاتیەکی ئەڵمانی کە توانای چەك هەڵگرتنی هەبوەو لەساڵانی جەنگدا لەترسنۆکی خۆیدا نەیوێراوە چەك هەڵبگرێت و توخنی جەنگ بکەوێتەوە , ئەمانە تاوانباری سەرەکین لە لەدەستدانی تیرۆلی باشوردا...ئەو ئەڵمانیانەی بەشداری شۆرشەکەی خەزەڵوەری ١٩١٨ یان کرد تاوانبارترین و ناپاکترین کەسانێکن کە شیاوی لێپرسینەوە بن لە ناپاکی لەدەستدانی تیرۆلی باشوور.

وەك پێشتر وتم و دەشیڵێمەوە بەدەست هێنانەوەی زەویە براوەکانی ئەڵمانیا هیچ لەرێگەی وتنی وشەی ئاگرینەوە زەوی بە ئاگر داگیرکراو ناگەڕێندرێتەوە, ڕزگارکردنی خاك و نەتەوەو نیشتمان پێتڤی بەزمانی بەهێز نییە, بەڵکو پێویستی بەچەکی بەهێزە, ئەمەش مانای ئەوە نییە من هانی ئەڵمانیەکان بدەم جەنگێکی نوێ هەڵایسێنن لەبۆ ڕزگارکردنی تیرۆلی باشوور, من بڕوام بەوە نییە هەردوو گەلی ئەڵمانی و ئیتالی پێکدا بدەن لەپێناو دووسەد هەزار کەسی ئەڵمانیدا, لەکاتێکدا حەوت ملیۆن کەس و هاوڵاتیمان لە ڕینانیا بەدەست دوژمنەوە گیرۆدەبوونە وکەسیش ناویان ناهێنێت.

خۆزگەر نەتەوەی ئەڵمانی سورە لەسەر نەهێشتنی ئەم ئەرکەی سەرشانی , لەکاتی بەردەوامیدا, بیەوێت لەسەر نەخشەی ئەوروپا بیسڕێتەوە, ئەوا نابێت هەمدیس بکەوێتەوە هەمان هەڵەی پێش جەنگی ڕابردووەو ئەوکاتەی بەیەك هەنگاو هەموو جیهانی لەدژ خۆی ڕاست کردەوە, چونکە نەیزانی بوو چۆن هاوڕێ دروست بکات.دەبێت ئەڵمانیا زۆر بە ڕوونی دوژمنە لەمێژینەکەی دیاری بکات و بەهەردوو دەستی گورزی لێبوەشێنێت, لەگەڵ نەرمی نواندن لەهەمبەر دوژمنانی پلەی دووی, جا ئەم هەنگاوەی هەرچەندە پێویستی بە قوربانی دانیش بووبێت.

پێویستە لەسەر ئێمەی نیشتمان پەروەری سۆسیالیستی ئەو بیرۆکەیە بڵاوبکەینەوە کەدەبێژێت: چەسپاندنی بیرۆکەی ئازادی نیشتمان پێش لە بیرۆکەی گێڕانەوەی زەویە لەدەستدراوەکانە, لەگەڵ بانگەشەکردن بۆ چەسپاندنی بیرۆکەیەکی هاوپەیمانی کەلە بنەمایەکی ئەڵمانی و ئەوروپی پێکەوە گونجاوەوە وەرگیرابێت. ئەودەمەی پەیمان نامەمان لەگەڵ بنەماڵی هابسبۆرگ بەست کوێرانە شوێنی

سۆزكەوتین و لەئەنجامدا شكستمان بەركەوت، بزوتنەوەكەمان لەم كاتەدا رێكە بە رامیاركاران نادات چەشنە رامیارییەكی دەرەكی پەیرەوبكەن كە پێچەوانەی بەرژەوەندیە نەتەوەییەكانی نەتەوەی ئەڵمانی بێت.

***

لێرەوە باسەكە دەگوازەمەوە بۆ تاوتوێ كردنی ئەو ڕەخنانەی كەڕەنگە لەو سێ خاڵە بگیرین كە لەمەش تەنها ئامارەیەكم پێدان، ئەوانیش:

١-ئایا وڵاتەكان بەم دۆخەی ئێستاوە ئامادەی بەستنی هاوپەیمانێتیت لەگەڵیدا؟

٢-ئایا دەگونجێت ئەو دوژمنانەی تا دوێنێ ئێمەیان بەناشیرین ترین وێنە پیشان دەدا ئەم ڕۆ ئاراستەكەیان بگۆڕن و جوان پیشانمان بدەن؟

٣-دەگونجێت هەستی نەتەواریەتی نەتەوەكانی وڵاتەكان، ئەو دەوڵەتانەی دەیانەوێت لەگەڵ ئەڵمانیادا هاوپەیمانی ببەستن زاڵبێت بەسەر ئەو لەمپەرانەی كە ڕەنگە جوو لەم كاتەدا دروستی بكات، لەكاتێكدا جوولەكە دوژمنی هەموو چەشنە ڕێككەوتنێكە كەلە بەرژەوەندی گەلی ئەڵمانیادا بێت.

بێگومان دیسانەوە دەیڵێینەوە، هەر وڵاتێك بیەوێت ڕێزی خۆی بگرێت و خۆی نەكاتە گاڵتەجاڕی وڵاتانی دیكە هەرگیز ئامادە نییە لەگەڵ وڵاتی ئەڵمانیادا هاوپەیمانێتی ببەستێت، كوا دەوڵەتێك هەیە چارەنوسی خۆی ببەستێتەوە بە چارەنوسی دەوڵەتێكی لەرزۆك و جێگەی باوەڕ نەبووی وەكو ئەڵمانیاوە!

كۆمەڵێك هاوڵاتی ساویلكە بەدووی بیانویەكدا دەگەڕێت بۆئەوەی پاساوی كارەكانی حكومەت و داڕووخانی ورەی گەل بداتەوە، ئەم داڕووخاویەی كەلە ورەی كۆمەڵی ئەڵمانیدا دەبیندرێت بەڕاستی بۆ دوژمن جێگەی دڵخۆشی و دەستخۆشیە، دەمێكە گەلی ئەڵمانی خۆی دیلی قەودەر كردووە، هیچ چەشنە بزوتێكی ئەرێیی بوونی نەبوو، ناشبێت ئەوە لەیاد بكەین سەردەمانێك ئەم گەلە نیشانەی نەبەردیی و خەباتكاری نەتەوەكانی ئەورووپابوو، نەتەوەی ئازا و دەست و چاو ڕۆشن و ڕەوشت بەرز، لەدەسپێكی ١٩١٤ ەوە تا كۆتایی جەنگ و چەك دانان هەموان سەیریان دەهات لەو توانا و یەككگرتویەی گەلی ئەڵمانی هەیبوو، هەرگیز بڕواناكەم كەسێك هەبێت لەم ڕۆژدا بتوانێت ئەم وەچە سەرۆڕانەی گەلی ئەڵمانیای ئەمڕۆ و وەچە سەر بەرزەكانی دوێنێی كاتی جەنگ و پێش جەنگ.

ئەوەی لە دەوروخولماندا ڕوو دەدات، ئەو بوختانانەی هەناومان دەهەژێنێت. ئەوەی وا لە دۆستان و دوژمنانمان دەکاتگومانمان لێبکەن، هەموو ئەمانە بەهۆی بەرئەنجامی کارە ئەنجامدراوەکەی خەزەڵوەری ۱۹۱۸ بوو. هۆزانڤان ڕاستی ووت ، ئەوکاتەی گووتی:(لە خراپە و ئەهامەتیەوە تەنها خراپە و ئەهامەتی لەدایك دەبێت و دیاردەکەوێت)، سەرباری ئەمەش دەتوانین بێژین کە هێشتاکە ساوێلکەیی و زوو خەلآتاوی و باشی گەلەکەمان نەپوکاوەتەوە.هێشتاکە لەناخیدا جۆشی خواردووە. جارناجارێك بریسکەیەکی لەناکاو لەدەوروخولی دەدات و ڕووناکی پێدەبەخشێت. ئەو ڕۆژە زۆر دوورنیە ئەڵمانیەکان هەموویان بزانن ئەم بزیسکەیە مانای بوژانەوەی نەتەوە دەگەیەنێت. دەبینین لەو ڕۆژدا هەزاران گەنج ئامادەی خۆکردنە قوربانین، ملیۆنان هاولآتی ئەڵمانی دەبینین کە قاڵن بە کاروباری بەکەڵکەوە. وەکو هیچ کات شۆڕش ڕووی نەدابێت. ئاسنکار لەپێش دەزگاکانیدا وەستاوە، کشتیار لەدوای گاسنەکەوەیەتی. زانا لە خەلوەتەکەی، هەموان ئیشی خۆیان دەکەن. سەبارەت بەو توانجانەی لە گەلە ئەڵمانی دەدرێت. لەوەی بۆچی لەساڵی ۱۹۱۸ دا شکستیان خوارد؟ دەبێت هۆکاری ئەمە لە دەستەلآندارانی پاش ۱۹۱۸ بپرسرێت و داوای وەلآم لەوان بکرێت. ئەو کەسانەی بەڕاستی دڵیان بۆ نەتەوەکەمان دەسوتێت دەبێت بپرسن: ئایا بەڕاست دەستەلآتدران بەرزکردنەوەی وورەی نەتەوەیان ئەزموندووە؟ ئەوی حکومەتی ئەڵمانیا لەساڵی ۱۹۱۸ ەوە تا ئەمڕۆ چییان کردووە لەپێناو مانەوەی هەستی نەتەوایەتی. ئایا هیچ هەنگاوێکی وەهای هاوێژوتوە لەبۆ هوروژاندنی خۆبەگەورەزانی ئەڵمانی و هاندان و تەقاندنەوەی ڕقی پەنگ خواردوویان؟

ئەوکاتەی سەرکەوتوانی جەنگ پەیمان نامەی ئاشتیان بەسەر گەلەکەماندا لەساڵی ۱۹۱۹ دا سەپاند، هەلێکی زێڕینیان بە نەتەوەی ئەڵمانی دالەبۆ دیسانەوە بەهۆش ڕاهاتنەوە. ئەو پەیماننامانەی بەندی قورس و گران بەسەر گەلانی دۆڕاودا دەسەپێنن وا لە هەناوی بەرەی دۆڕاو و شکست خواردوو دەکات زنگی سەربازگرتن لەهەناویانەوە دیاربکەوێت، لەم کاتە دا ڕق لەهەمبەر ناوەندەکانی دوژمندا دروست دەبێت. بەلآم گەل لەم کاتەدا تەنها پێویستی بەکەسێکە چاوانی بکاتەوە، حکومەتیش هیچ کات ئەم خەمە نەتەوایەتیەی لەپێش چاو نەگرتووە، نەشی دەزانی لەوەی خۆی

کردۆتە خزمەتکاری بێگانەکان و گەلیان بۆ دادەشۆ ڕۆژێك دێ دژی دەوەستنەوە و گەلیش مافی خۆیانی لێدەستێنێتەوە.

گەر هکومەتی ژێرانە بیتوانیبایە ئەو شکست و سەپاندنی پەیمان نامە قورسەشی بقۆستایەتەوە بۆ وروژاندنی هەستی هاولاتیان و کێشی خۆی بکردنایە, ئەوکات دەولەت دەیتوانی شەست ملیۆن هاولاتی بوروژێنێت تائاستێك خۆیان گزەنگانێك دەهاتنە وەلام و داوای چەکدار کردنیانیان دەکرد, هەولی خۆ ڕزگارکردنیان دەدا لە ستەمکاری و زولم لێکراوی!

بێگومان, دەتوانرا ئەم پەیمان نامەی ئاشتیە بکرایەتە دەسپێك بۆ پرکردنی پەرداخی ڕق لە هاوپەیمانان, بۆئەمەش پێویستمان بە بەکارهێنانی هەموو چەشنە دەزگاکانی ڕاگەیاندنە, جا ڕۆژنامە و سینەما و شانۆکان بێت یان پەرتووکی تایبەت و بەردەستی فێرخوازانیش بێت, لەهەموو ڕێگەیەکەوە هەولی ڕووناکبیرکردنی جەماوەر بدرێت و ورەیان بەرز بکرێتەوە و لەهەموو نوێژێکی گزەنگ و شێوانیشدا دەبێت بێژین: ( خودایە ئازادیمان بەقسەمەت بکەرەوە) بۆئەوەی نمێژەکان بەجوانی و گەرمی بگەنە ئاسمانەکان دەبێت بێژین : (ئەی خودایەك کە تواناداری بەتەنها لای تۆوەیە سەرچاوەکەی, چەکمان کوشندەو کاریگەر و بەهێزبکە, ورەمان پتەوبکە, سەرمانبخە بەسەر ئەو تاغوتانەی دەمان چەوسێننەوە و ستەممان لێدەکەن) خوایە نزاکەمان لێوەربگریت.

بێگومان بەم شکستە نەتەوەی ئەلمانی سەر شۆڕشدەکرێت, بەلام سەرۆڕی تایبەتە بەهکومەتەوە کە وێتنەیەکی زۆر ناشرینی گەلی ئەلمانی پێشکەشی جیهانی دەرێ دەکات, بەوەی شەڕی ناڕاست و نایەکسان ئەنجام دەدات و دواتر خۆی بەلاوازی دەداتە دەستەوە, بۆئەوەی نەتەوەی ئەلمانی بتوانێت پەیمان نامەی هاوتایی و هاوکاری لەگەلێ نەتەوەکانی خۆ بەگەورە زانەدی ئێستادا ببەستێت باشتر وایە گەورەیی بۆخۆی بگێڕێتەوە, ئەمەش تەنها بەوە دەبێت کە دەستەلاتێك لە ئەلماندا بێتە چێکرن کە ئامارەی ناخبوونی نەتەوەیی بێت و پشت بەستوویێت بە حەزی کۆمەلێکی تونی ئازادی و ڕزگاری لەدەست کۆت و بەند.

لەبەرئەوەی بەهۆی بانگەشەکانی جەنگەوە دیرۆك و هەنوکەی گەل و نەتەوەی ئەلمانی بەناشرینی پیشان دراوە و ئەو دەولەتانەشی تاوەکو دوێنێ ئەم

بانگەشەیەیان دەکرد وا ئەمڕۆ ئێمە دەمانەوێ ببینە هاوپەیمانیان، لەکاتێکدا ئەمە کارێکی ئاسان نییە، سەرکەوتنی ئەم کارە پەیوەستە بە گوێشکردنی هەمو هاوڵاتیانی ئەوڵەتی ڕایخ بە گوێشکردنێکی ئەتەوەیی ڕەهای خۆبە زلزانی هەوڵدەر بۆ خۆسەپاندن لە کیشوەری ئەورووپاشدا، لەهکاتەدا وڵاتانی پێشتر دژبەر لەگەڵمان ئاشت دەبنەوەو بەهاوئاستی خۆیانمان دەزانن لەبۆ بەستنی پەیمان نامە و هەنگاونان بەرەو بەدی هێنانی ئامانجی نوێ، بێگومان ئەمەش کاتێکی زۆری دەوێت، لەم کاتەوەش ئەبێت بەهێمنی و ژیرانەوە کاربکەین لەبۆ دۆستایەتی دروستکردن بەشێوەیەکی کارا لەگەڵ دوژمنانی دوێنێدا، ئەمەش بۆ تێکدانی ئەو شێوە ناشرینەیە کە لەوڵاتی دوژمندا لەبۆ ئێمە کێشراوە، بەو مەبەستەی نابێت جارێکی تر خۆمان لەکاتی ئەگونجاودا بەقەڵب و ناشیرین پیشان بدەینەوەو هەمان ئەنجام بە دوژمنانمان ببەخشینەوە.

لەم کاتەشدا خاڵێکی زۆرگرنگ هەیە، کەشایەنی ئامارژە پێدانە: کاتێکی زۆر دەوێت تاوەکو گەل لە ئاشتی دروستکردن لەگەڵ دۆستی ئەمڕۆ و دوژمنی سبەی تێبگات، ئەمەش بەهۆی ئەوەوەیە کە یام ئەوەتا خوودی حکومەت نایەوێت گەل بەم کارە بزانێت و تێی بگات یان ساویلکەیی خودی گەلە بەهۆی هەڵە پەروەردەکردنیەوە، لەم کاتەدا هیچ هەڵەیەك پێشیاوی قبوڵکردن نییە و نابێت چەکی خۆمان ببەخشینە دوژمنانی ئەتەوە ، واتە نابێت کارێکی وەهابکەین کەسێکی فرەوێژی قسە زلی بێژە تیژ دۆخەکە بقۆزێتەوەو گەلمان لەدژ هەڵسێنێت.

ئەو کەسانەی ئەختێك ژیرییان هەبوو زانیان داواکردنەوەی ئاشتیانەی تیرول باشور و نوێکردنەوەی کەشتی گەلی ئەڵمانی و داواکردنەوەی هەموو ناوچە لەدەستدراوەکانی تر پێکەوە کارێکی گەمژانەی فیتدراوە، بزوتنەوەکەمان زۆر بەهۆشیارانەوە ئاگاداری کاریگەری ئەم شێوە ڕەفتارانەبوو لەهەمبەر دەروونی ئیتالی و بەریتانیاکاندا، بۆئەمەش هەڵمەتێکی وشیارکردنەوەمان دەست پێکرد، هەستمان دەکرد ئەم چەشنە خۆپیشاندانە بێبەرهەمانە تەنها بۆزیادتر دوورخستنەوەی ئەڵمانەکانە لە بەریتانیا و ئیتالیا لەداهاتوودا.

دەزگاکانی ڕاگەیاندنی جوولەکە هەمیشە زۆر بە ژیرانەوە گەمژەیەتی و لاوازی ڕامیارێتی دەرەوەمان و فرەوێژیمانیان دەقۆستەوە و بۆ بەدی هێنانی ئامانجەکانی خۆیان بەکاریان دەخست، لەمڕۆشدا جووەکان هانی وتنەوەی هەمان چەشنە

ئاوازمان دەدەنەوە کە لای خۆیەوە دەبێتە هۆی کێشەی زیادتر بۆمان, کەواتە بەر لەوەی دوژمنانی دوینێ بگەڕێنەوە بێشەی یەکگرتوویی و خۆیان لەدژمان توند بکەن, باشتر وایە هەرچی فیتە و ئاژاوەگێڕ و فەتارەت هێنە لەناوبەرین و پاکتاویان بکەین, لەبیری نەکەین ئەوەش کە ئێمە بەهۆی تورەکردن هەموو خەڵك و خواوەندیشەوە جەنگەکەمان دۆڕاند و شکستمان خوارد, دەبوو وریای دوور و نزیك بین و هەوڵەکانمان بۆیەك بەرە چڕبکەینەوە نەوەك بیترازێنین.

گەر هاتوو بچینە پاڵ ئەو کەسانەی دژبەری بەریتانیان بەهۆی ئەوەی داگیرگەکانمانی لەدەست دەرهێناین, یان لەگەڵ ئەوانەبین کەبەهۆی داگیرکردنی تیرۆلی لەلایەن ئیتالیاوە بانگەشەی دژبەری کردنی ئیتالیا دەکەن, یان لەگەڵ ئەوانەی رقیان لە پۆلۆنیا و چیکۆسلۆڤاکیادەبێتەوە لەبەرئەوەی ئەمانە چیکۆسلۆڤاکیا و پۆلۆنیان, کەواتە لەم کاتەدا لەئەوروپادا جگە لە فەرنسا دۆستێکمان بۆ نامێنێتەوە, کە زۆرینەی نیشتمان پەروەران لەبیریان کردووە ئەمیش ئەلزاس و لۆرینی لێقرتاندوین.

بەراستی دوژمنی راستەقینەمان لەئەوروپادا فەرەنسایە. بەلأم بەریتانیا و ولأتانی دیکەی ئەوروپی تارادەیەك ئێسك سوکترن, دەتوانین ئەمانە بقۆزینەوە و بیان کەین بەدۆست ئەوڕۆژەی گەلەکانیان حەیران دەکەین بە رابوون و زیندەیەتیمان, لەم کاتەشدا ئەلمانیا دەکەینە هاوپەیمانێکی بەنرخ کە ئەوانەی بەدووی هاوپەیمانی باشدا دەگەڕێن لەبەردەرگای دەوەستن و داوای بوون بەهاوپەیمانی لێدەکەن.

***

لێرەوەش هەنگاوی سێیەم ماوەتەوە, ئەویش تواناداری نوێنەرانی بەرژەوەندیە نەتەوەییەکانی دەوڵەتە لەو دەوڵەتانەی کە هاوبەرژەوەندین لەبۆ سنوردارکردنی نەخشەی جوولەکەکان و کەمکردنەوەی کاریگەریەکانی و دواتریش لەناوبردنیان لەرێگەی خۆبزگارکردنی تەواوەوە لەخۆیان ونەخشە و دەستەلأتیان.

ئەو هەنگاوەی وانەمڕۆ ئیتالیای فاشیزمی گرتوویەتیە بەر لەبۆ لەناوبردنی هەرسێ چەکەکەی دەستی جولەکەی جیهانی, بەڵگەی تەواون لەبۆ پیشاندانی تواناداری بزوتنەوە نەوەییە رێکخراوەکانی ئەم بوارە. لەناوبردنی بزوتنەوە نهێنیەکانی جوولەکەی هاوشێوەی دەستە ماسۆنیەکان و هتد, لەناوبردنی رۆژنامە مارکسیەکان پاش هەڵوەشاندنەوەی پارتە راست رەوەکان , چەسپاندنی چەمکی

فاشیستی بەسەر ولاتدا، هەنگاو گەلێکن کە پاڵپشتی ناوەندبوونی حکومەتی ئیتالی دەکەن لەسەر ئاستی نەتەوەیی و لە گۆڕەپانی نێو دەوڵەتیشدا، لەگەڵ دەست وەردانی حکومەت لە پاراستنی بەرژەوەندیەکانی گەلی ئیتالیی جا بەدڵی جوولەکەبێت یان دژی و ڕقیان لێی بێت.

بەڵام دۆخەکە لە بەریتانیا جووداترە وەك لە ئیتالیا. لە ئیشتمانی دیمۆکراتیەتدا، واتە بەریتانیا، کە جووەکان دیکتاتۆریەتی ڕەها پەیڕەو دەکەن، هەمیشە کێشمەکێش لەبووندایە لەنێوان نوێنەرانی بەرژەوەندیە نەتەوەییەکان، بەرژەوەندیەکانی دەوڵەتی ئینگلیز و بانگەشەکارانی دیکتاتۆریەتی جیهانی، کە جوولەکە نوێنەرایەتی دەکات. ئەمەش بەتەواوەتی پاش لێبوونەوەی بەریتانیا لەجەنگ بەدیارکەوت، بەوەی حکومەت و ڕۆژنامە جووخوازەکان پێکدادان لەنێوانیاندا دروست بوو، لەوەی پەیوەندی نێوان بەریتانیا و ژاپۆن دەبێت چۆن بێت؟

پاش گیاندان و مردنی جەنگی فراوان کێشمەکێشە لەمێژینەکەی نێوان ژاپۆن و ئەمەریکا سەری هەڵدایەوە. وەك دەزانرێت لەم دۆخەشدا ولاتانی ئەورووپی دەستە وەستان ناوەستنەوە و نابینە بینەری دووری: لەخۆم دووربێ چی دەبێ بابێ. پێویست بوو لەسەر بەریتانیا برەو بە پەیوەندیە ڕەگەزیەکان و پەیوەندیەکانی دیکە بدات کە بە هەرێمە یەکگرتوەکانی ئەمریکای دەبەستێتەوە، بەڵام هەمدیس ڕاڕابوو لەوەی یارمەتی دانی زیادتری هەرێمە یەکگرتوەکان ببێتەهۆی پتر لاوازکردنی خوودی بەریتانیا، بەڕاستی بەریتانیا تیامابوو لەوەی ئەم یارمەتی دانەی ڕەنگە ببێتەهۆی ئامادەکردنی ئەم پێشتر داگیرگەیەی(ئەمریکا) و بکاتە گەورەترین هێزی سەر ڕووی زەوین و تەنانەت خۆیشی ملکەچی بێت.

بەریتانیا شەیدای دۆزینەوەی هاوکارێك بوو کە بتوانێت بەڕاستی پەنای تێبگرێت لەڕۆژە ناخۆشەکاندا فریای بۆبەرێت، بەتایبەت لەبۆ پاراستنی هێزە دەریاییەکەی داوای یارمەتی لێبکات، ئەمەش وای کرد لە ژاپۆن چاکتری دەست نەکەوێت؟ لەبەرئەوەی باش دەیزانی بوونی دژبەری تەواو لەنێوان تۆکیۆ و واشنگتۆندا دەستەبەری ڕاستگۆیی ژاپۆنە لەوبەڵێنانەی بە بەریتانیای دەدات، کە دەتوانرێت ئەمەش کەڵکی لێ ببینرێت لەبۆ بەهێزکردنی پێگەی فەرمانڕەوای بەریتانی لەهەمبەر فراوانخوازیە کیشوەریەکانی ئەمریکادا.

لەو وەختانەی دەستەلأتی بەریتانی بەو پەڕی توانایەوە کاری دەکرد لەبۆ لەدەست نەدانی هاوپەیمانە ئاسیایەکەی، ڕۆژنامە جوولەکەخوازە بەریتانی و فەڕەنساویەکان هێرشی ئەم چەشنە رامیارێتیەی ئینگلیزیان دەکرد و توانجیان تێدەگرت. جووەکان، دوای یەکلایی کردنەوەی دۆخی ئەڵمانیا لەبەرژەوەندی خۆیان ڕوویان لەژاپۆن کرد، دەوڵەتێکی ئاسیایی زۆر بەهێز و تۆکمە، نەتەوەیەکی ڕابوونی کەناتوانرێت بخرێتە ژێر دەستەلأتیانەوە تەنها بەجەنگ نەبێت، جووەکان زۆر لەوە ژیرتر بوون لەڕێگەی خوێن پیسکردنەوەی ژاپۆن لاوازبکەن وەك چۆن بەریتانیا و فەڕەنسا و ئەمریکایان وەها لێکرد. بۆیە لاوازکردنی ئەم نەتەوە زەردە تەنها یەك ڕێگەی هەیە بۆ سەرکەوتن ئەویش شکست پێهێنانیەتی لەجەنگ؛ چونکە مانەوەی دەوڵەتی ژاپۆنی نەتەوەیی لەنێو کۆمەڵێك دەوڵەتی زەبەلاحدا کە فیتنە جووەکان هەستاوان بە داماڵینی لەهەموو مۆرکێکی نەتەوەیی لەبۆ ئاسانکاری بۆ ئەوەی مارکسیەکان بتوانن دەستی بەسەردا بگرن، مەترسیدارە بۆ بەدی هێنانی بەرژەوەندیەکانی گەلی هەڵبژێردراوی خەون پێوەدیوی بەلشەفیکی، ئەم خەونەشی بەدی نایات گەر تاکە دەوڵەتێك لەجهاندا مابێت لەڕێگەی بیرۆکەی مەزنی نەتەوایەتیەوە ستەم لەناوبەرێت.

ڕۆژنامە جووەکان لەجیهان بەگشتی و بەریتانیا بەتایبەت، هەوڵی گورجکردنەوەو هاندانی ولأتانی هەیە لەدژی یابان لەکاتێکدا ئەم کارەی پێشتر دژبە ئەڵمانیا ئەنجام دا، ئەمەش وای کرد بەرگری کردنی خوودی دەستەلأتی بەریتانیا لەبۆ هێشتنەوەی هاوپەیمانێتیەکەی لەگەڵ ژاپۆندا لاواز و بەرەو نەمان بڕوات و سەرکەوتن بۆبەرەی دژبێت، ئەو ڕۆژەش نزیکە بەریتانیا هەڵمەتی خاچینی دژبە ژاپۆنی بەرز پێشەنگایەتی بکات، بەو بڕوایەی بوون و دیارکەوتنی هەستی نەتەوایەتی ڕاستەقینە لە ولأتی خۆرهەلأتەوە مانای دیارکەوتنی مەترسی ڕاستەقینەیە بۆسەر ئاسایشی جهانی.

لڤینی نیشتمانی سۆسیالیستی خۆی نابورێت لەبۆ وشیارکردنەوەی گەلانی ئاری رەگەز-تەنانەت ئەوانەشی حەزیان بەچارەی گەلەکەمان نییە-لەوەی جوولەکە چی بەلأیەکی بۆئێمە و بۆئەوانیش لای خۆی حەشارداوە، ئەم لڤینەمان نەخشەڕێگەی ڕزگاری بۆ گەلی ئەڵمانی ئەکێشێت بەجۆرێك تێکۆشان لەپێناو دەربازبوون لە ستەمەکانی جوولەکە ببێتە چرایەك لەبەرپێی گەلانی خاوەن هەمان ئامانجدا.

# بەشی بیست وسێ

## هەنگاونان بەرەو ڕۆژهەڵات

پاڵنــەر بــۆ بەســتنی پەیوەنــدی لــەنێوان ئــەڵمانیا-ڕووســیا بــوونی ئــەم دوو دەستەواژەیەیە:

یەکەم: باسکردنی ئەم بابەتە لەڕۆژنامە چەپڕەوەکاندا لەنێوەندی داواکاریەکانیانە, بەوەی بەم چەشنە هاوپەیمانێتیە باسکی ئەڵمانیا بەهێزتر دەبێت.

دووەم:ئاسانی چارەکردنی ئاریشە و بابەتە دەرەکیەکان لەلایەن ناوەندە ڕۆشنبیر و هزرەوانیەکانەوە.

بەم کارەمـان بزوتنەوەکـەمان زۆر هـیلاك نـابێ لـەبۆ سـڕینەوەی ئـەوەی لەمێشـکی چەپەکانداداا لەسایەی بانگەشەکانی مارکسیزمەکانەوە,لەبەرئەوەی ئەم دەستە خەڵکە هیچ کات خـاوەنی پێشبینی نەبوونە لـەوەی مارکسیەکان دەبێت چۆنبن لـە هەمبـەر سیاسەتی دەرەوەی ئەڵمانیادا؟ ئەمەش بەهۆی ئەوەوەیە کەهیچ کەس پێشتر دەستی نـەگرتوون و ڕێگـەی پیشـان نـەداون. هـەزاران لـە چـەپڕەوان بنـەما مەشـقەڵینەکانی خۆیانیان لە بزوتنەوەکەی ئێمـەدا بەدی دەکرد و هەستیان دەکرد ئێمە ڕێگەیان بۆ ئاســان دەکەینەوە,مانــەوەی هەســتی نەتەوایــەتی و حــەزی مانــەوە لای هاوڵاتیــە

چەپرەوەکانمان ئاسانکاری زۆری بۆکردین لەبۆ کێشکردنیان و کردنیان بەلایەنگیری سەرسەختی بزوتنەوەکەمان.

بەڵام ئەم کارەی ئێمە هەر وا بەئاسانی لای ئەو چینەی پێی دەگوترا ڕۆشنبیر وەرنەدەگیرا و ئاسان نەبوو, دەبووچەمکە ڕامیاریەکانمان زۆر ڕوون بوایە بەجۆرێك کەسانی نەتەوە خوازی بەبێ هیچ دوودڵیەك سڕیکردایە و بۆلای خۆی ڕاپێچ کردبا, بەم کارە هەستیان دەجولێندرێت و شکۆمەندی نەتەوەیی و حەزی مانەوەیان پتر بەهێز دەبێت.

لەبەرئەوەی ئەم دەستەیەی هاوڵاتیان وەخت بوو ڕامیارێتی دەرەکی ئەڵمانیا بەرەو نەهامەتی بەرن, هەستم دەکرد ئەرکی منە گرنگترین کێشەی پەیوەست بە ڕامیارێتی دەرەوەی وڵات بۆ ئەندامانی پارت و لایەنگرانی ڕوون بکەمەوە:هەڵوێستی ڕایخ لەهەمبەر ڕووسیا, پێش لەوەی ڕۆبچمە نێو بابەتەکەوە پێشتر تێم گەیاندن کە ڕامیارێتی دەوڵەتی ڕەگەزی لە پەیڕەوی ڕامیارێتی دەرەکیدا دەبێت ئامانجی دابین کردنی بنەماکانی مانەوەی گەل بێت, ئەمەش لەڕێگەی بەستنی پەیوەندی دەرەکی شیاوەوە دەبێت, کە گونجاوبێت لەگەڵ بنەما سروشتیەکاندا, ئەو بڕە خۆراك و تفاقەی دەستەبەر دەکرێت دەبێت گونجاوبێت بەپێی ژمارەی دانیشتوان و زیادکردنی, ڕووبەری زەوی و بەهاکەشی لەلایەکی دیکەوە.

پێشتر ڕوونم کردەوە کە بەهێزترین دەستەبەری ئازادی لەبۆ گەل و مانەوەی بەدەست هێنانی مەودای زیندەیی تەواوە, کە دەستەبەری ئاشتی و بێ مەترسی بوونی ئەم مەودایەش توانایيە و پێویستی بە وڵاتێکی بەهێزە لەڕووی ڕامیاری و سەربازیەوە لەنێو چوار چێوەیەکی جیوگرافی گونجاودا, ئەمەش لەبۆ پاراستن و بەرگری کردنە لە قەوارەی نەتەوەکەی و پاراستنی بەرژەوەندیە زیندەییەکانی گەلەکەشیەتی.

پێویستە لەسەر گەلی ئەڵمانی لەڕوانینی بۆ داهاتوو, وڵاتەکەی خۆی (ئەڵمانیا) بە وڵاتێکی زەبەلاح ببینێت کە ئامادەی ڕۆڵ گێڕان کراوە لەسەر شانۆی جیهانی ڕامیاریدا. ئەڵمانیا بەدرێژایی چەندین سەدە ئەم ڕۆڵەی گێڕاوە, چالاکیەکانی گەلەکەمان هەمیشە بەشێك بووە لەمێژووی دانەبڕاوی. ئەو جەنگەشی کەبەم دواییانە

ئەنجامەمان دا لەبۆ مانەوەمان بوو کە دووژمنان ناوی (جەنگی جیهانی)یان لێنا و بەم کارەیان دانیان بە ڕۆڵگێرانی ئێمەدا نا لەسەر شانۆی جیهانی.

ئەڵمانیا لە ١٩١٤ دا چووە جەنگێکەوە کە جێگەی متمانە نەبووە، کە ئێژم (جێگەی متمانە نەبووە)لەبەر ئەوەیە لە ١٩١٤ دا ئەڵمانیاخۆی بەتەواوەتی ئامادەی جەنگ نەکردبوو لەشێوەی هێزێکی زەبەلاحی جهانی، ڕاستە چەکی هەڵگرت بەڵام ئامادە نەبوو دشمەنەکەی لەناوبەرێت و پەلاماری بدات، خاوەنی کەرەستەی جۆراوجۆری پێویستی یەدەگ نەبووە کە بتوانێت لەسایەدا بۆماوەیەکی زۆر بەرگە بگرێت، زەویەکانی ئەڵمانیا هەرچەندە بەرهەمیان زیاد دەبوو، بەڵام ژمارەی دانیشتوانەکەی زیادتر دەبوو، بۆیە بەرهەمی زەوی هیچ کەڵکێکی ئەوتۆی نەدەبوو، لەبۆ ڕواندنەوەی کێشەکانی زوو، برسێتی و نزمی باری گوزەران.

لەمڕۆشدا ئەڵمانیا هێزێکی جیهانی نییە و ناشبێتە هێزێکی جهانی گەر باری سوپای نەبوژێتەوە، چون لەمپەری پێش جەنگ هەمان لەمپەرانی ئێستان و لانەچوونە، بەڵکو ئەم لەمپەرانە سەخت تر بوون بەتایبەت پاش لەوەی بەشێکی زۆری وڵاتەکەمان لەدەستدا، بەجۆرێك شەست ملیۆن کەس بەناچاری لەسەر پارچە زەویەك کۆبوونەوە کە پتر نییە لە پێنج سەد هەزار کم[٢] ، دەبوو بەم دۆخە خۆیان ڕابهێنن.

گەر لەیەك ڕوانگەوە لەم دۆخەی ئێستا بڕوانین دەبینین کە ئەڵمانیا بەم ڕووبەرەیەوە بە وڵاتێکی ناوەندی دێتە ئەژمارکردن، کە نەتوانکارە لەبۆ گەیشتن بە ئاستی دەوڵەتە زلهێزەکان، ناشکرێت بچووکی زەویەکانی ئینگلتەرا بکەینە نمونەیە، چونکە خوودی بەریتانیا پایتەختی فەرمان فەرمای بەریتانی بەرفراوانی لەبن نەهاتووە، دەشتوانین هەرێمە یەکگرتوەکانی ئەمریکا و چین و ڕووسیا بە دەوڵەت گەلێکی زلهێز بژمێرین، چونکە ڕووبەری خاکی هەریەکە لەمانە بەم دۆخەیانەوە پتر لە دەهێندەی ڕووبەری خاکی ئەڵمانیایە بەم دۆخەیەوە،فەرەنساش وا ئێستا بووەتە زلهێزێکی جهانی، ئەمەش بەهۆی بوونی سوپا بەهێزەکەوەیەتی کەبەردەوام بەهێزتری دەکات و بەردەوامە لەسەر فراوانکردنی ڕووبەرەکەی لەسەر بنەمای توانەوەی تاك لەدەوڵەتدا، جا گرنگ نییە ئەو تاکە کێ و خوێنی چیە و چەندە پاکە، گەر وابڕوات بۆ چەند دەیەی داهاتوو خوودی فەرەنسای ئەورووپی دەتوێتەوە و دەبێتە دەوڵەتێکی ئەورووپی-ئەفریقی تێکەڵ.

بزوتنەوەی نیشتمانی سۆسیالیستی زۆر بەڕوونی هەستی بەم دۆخانە کردووە، بۆیە بەتەواوەتی هەوڵی خۆ کۆکردنەوەی دا لەڕێگەی کۆکردنەوەی نەتەوەی پەرتەوازەی ئەڵمانیەوە، توانەوەی بۆچوونەکان لە بۆتەی نەتەوەیی ئەڵمانیدا، لەگەڵ دەرکردنی گەلی ئەڵمانی لەم بازنە تەسکە و فراوانکردنی دەستەڵاتی، چونکە مانەوەی گەلی ئەڵمانی بەم شێوەیەی ئێستای مانای خۆکوشتن و لەناوچوونە یان ملکەچ بوونە لەبۆ ستەمکارانی داگیرکار.

بەڕاستی پارتی نیشتمانی سۆسیالیستی هەرگیز بەم دۆخەی ئێستای ئەڵمانیا قایل نابێت، بەوەی شەست ملیۆن ئەڵمانی لەسەر ڕووبەری پێنج سەد هەزار کلم[٢] بژێت و خڕببێتەوە، بڕوای وایە بومارەکترین کار لەم کاتەدا نەمێشتنی ئەم کەتواری و ڕاستینە تاڵەس، لەگەڵ پڕکردنەوەی ئەو بۆشاییانەی کە ڕامیارێتی دەرەکی ئەم حکومەتی ئێستا هێناویەتە ئاراوە لەنێوان پێشوتری دیرۆکی بومارەکمان و هەنوکەی غەماوی گەلەکەمان.

ئەم بزوتنەوەیەمان هەڵدەستێت بە فێرکردنی گەلی ئەڵمانی بەوەی چۆن گرنگی بەخۆی بدات وەکو توخمێکی نەژاد باڵا، لەڕێگەی خوێنە پاقژەکەیەوە هەنگاو بەرەو سەرکەوتن بنێت و نەهێڵێت دووچاری خوێن پیس بوون بێتەوە، لەگەڵ ئاراستەکردنی بەو چەشنەی کە پێشیاوی تاك بێت لەبۆ هەڵگرتنی ئەو چرایەی کە پێشتر باوانمان هەڵیان گرتبوو.

***

بەدەساڵ پێش لە هەڵایسانی جەنگ ڕامیارێتی دەرەکی ئەڵمانیا هیچ باشتر نەبووە لەم دۆخەی هەنووکە زاڵە، لەو کاتەدا خاوەنی فەرمان فەرمابووین و تاڕادەیەك بەهێزیش بووین، بەڵام هێزی وڵات دەتوانرێت لەڕێگەی بەراوردکردنی هێزی وڵاتانی دەوروبەردا پێوانەی بکەین و بڵێین بەهێزە یان لاوازە، بەڵام ئەڵمانیای پێش جەنگ زۆر کەمتەرخەمانە دەیڕوانیە توانای هێزی دەوروبەری خۆی.

ئێمە کیسەڵ ئاسا بەرەو پێشەوە هەنگاومان دەهاوێت لەکاتێکدا وڵاتەکانی دیکە لەشێوەی پڵنگدا هەنگاویان بەرەو پێشەوە دەنا. هۆکاری بابردنی قوربانیەکانی گەل خراپی بەکارهێنانی تواناکانی گەلە لەبۆ بەدی هێنانی ئامانجە باڵاکان.

گەر بۆ مێژووی ئەڵمانیا بگەڕێینە دواوە و لایەنی سەربازیی بخەینە ژێر ڕاڤەوە و ئەو بەرئەنجامەشمان بۆدیارکەوێت کەلەم ڕێگەیەوە ئەمڕۆی بۆ بەدی هێناوین, ئەوا دەبینین کە لەکۆندا باشتر وەك لەئێستا توانا ئاڵتونیەکانی تاك بەگڕخراوە. لەسایەی ڕامیارێتیە داناییەکانیان گەیشتونەتە ئەم ئەنجامانە:

١-داگیرکردنی ئەو نوچانەی زیندەیی بە گەلەکەمان دەبەخشێت لەبۆ دەستڕاگەیشتن بەرۆژهەلات.

٢-دەستبەراسەردا گرتنی ئەو ناوچانەی دەکەونە ڕۆژهەلاتی ڕووباری ئالپەوە.

٣-سەرکەوتنی بنەماڵەی هوهنزولرن لە دوستکردنی ناوکی ئیمپراتۆریەتەکەیان لەوڕۆژەوەی بنەمای دەوڵەتی پروسیان دانا.

دیرۆك نوسان بەتەواوەتی جەختیان کردۆتەوە سەر هەنگاوی سێیەم (دامەزراندنی دەوڵەتی پروسیا) و بەساردیەوە باسیان لەهەردوو هەنگاوی یەکەم و دووەمیش کردووە. لەکاتێکدا هەنگاونان بەرەو خۆرهەلات گرنگترین کاری باوانمان بووە, خۆئەگەر ئەم کارەشیان نەکردبایە ئەوا ئەو بەشێکی زۆری خاکی ئەڵمانیای ئەمڕۆ بەشێك دەبوون لە ڕووسیا لە خۆرهەلات, یاخوود لەفەرەنسا لەخۆرئاوای ولات. بەڕاستی هەنگاونان بەرەو ڕۆژهەلات هەنگاوێکی جوان و ژیرانە بووە, چون بەم کارە توانرا ڕووبەری زەوی گونجاو بەپێی ژمارەی دانیشتوان دەستەبەر و بگونجێندرێت.

ئەوکاتەی بەتەواوەتی باس لە کشان بەرەو ڕۆژهەلات دەکەم مەبەستم کەمکردنەوە نییە لە دامەزراندنی دەوڵەتی پرۆسی و دواتریش سوپای زلهێزی ئەڵمانی, کە نیشانەی یەکگرتوویی گەلەکەیەتی, لەسایەی ئەم هەنگاوە مەزنەوە بەرگری تاك و خۆم بۆخۆم نەما و گۆڕدرا یەك بۆهەموو هەموو بۆ یەك, واتە سیستمی بەرگری لە بەرگری تاکەوە گۆڕدرا بۆ بەرگری کردن لە نیشتمان, لەم کاتەشدا گەلی ئەڵمانی پێویستی بە پەیڕەوێکی نوێ و وتاربێژێکی بەهێز و وتارێکی یەککگرتوو بووکە لەو کاتەدا نەیبوو.

لوبەرئەوەی ئەو گیانە هەرەوەزیەی لەنێو گەلانی دیکەدا هەیە لەنێو ئێمەدا بوونێکی نییە, ئەمەش تەنها لەڕێگەی ڕاهێنانی سەربازیەوە لەنێو کۆمەڵگەی ئەڵمانیدا بلاوبویەوە, هەربۆیە دەتوانین بڵێین: هەڵوەشاندنەوەی بەزۆر سەربازی کردن کارێکی باش نەبووە بۆ ولاتەکەمان, چون تا ئەوکاتەش ئەم ولاتەی ئێمە لە

حەزی تاکرەوانە ڕزگاری نەبوو بوو، فرە توخمی لەولاتدا یارمەتی جوداخوازی و پەرتکردنەوەی یەکدەنگی ولاتی دەدا.

شایەنی باسکردنە کە گرنگی ئەو سەرکەوتنە رامیاریە ڕاستەقینانەی کە گەلەکەمان لەماوەی هەزار ساڵ لە جەنگ و تێکۆشانی سەختی بەردەوامدا بەدەستی هێنابوو، دوژمنانمان پتر لەخۆمان لێی دەگەن و قەودری دەگرن. لە مۆمبارەك ترین کاری لڤینەکەمان ئاشناکردنی نەتەوەی ئەلمانیە بەو سەرکەوتنە رامیاریە ڕاستەقینانەی دەستکەوتیان هەبووەو ئەو خوێن ڕشتنانەی ژمارەیەکی زۆری هاولاتیانمانی لەناوبردووە. بەبێ داپۆشینی ڕاستیەکان دەتوانین قسەی ڕاست بکەین ، بەبێ ئەوەی ماڤ رامیار بەدەستانی ولاتەکەشمان بخۆین: ئەلمانیا لەهەموو هەنگاوەکانی سەدەی ڕابردوویدا هیچی بەدەست نەهێناوە لە مەیانی رامیاریتی دەرەکیدا، چونکە مەودای زیندەیی ئامانجی سەرەکی رامیاریتیەکانیان نەبووە.

***

فرەن ئەوانەی بڕوایان وایە کە دەبێت رامیاریتی ئەلمانیا لەڕووی دەرەوەیدا بەشێوەیەك بێت نەنگیەکەی ١٩١٨ بشارێتەوە ، بیسەلمێنێت کە چیتر ئەلمانیا ئەوەی پێشووتر نەماوە و هەر هەنگاوێکیش دەینێت بێ دڵ نێشانی دەرودراوسێکانی بێت، بەلام بۆخۆم بڕوام وایە هەولدان بۆ گێڕانەوەی رایخی پێش ١٩١٤ تاوانێکی دەرهەق بە نیشتمان. نالێم سنوری پێش لەجەنگ سنورێکی نمونەیی بووە بۆ گەلی ئەلمانی، بەوپێیەی تا ئەوکاتەش بە ملیۆنان ئەلمانی لەدەرەوەی ئەم سنورەدا ژیاون. زیاد لەمەش هەنگاو دەنێم و دەلێم: سنوری ئەوکاتەی رایخ بەرئەنجامی هەنگاوێکی رامیاری بەهێز نەبووە، کاتی بۆ دانرابوو، چاوەنواڕی بەکۆتا هاتنی کێشمەکێشێکی بوو کە هێشتاکە بەردەوامە، بەلام لەم ڕۆدا وشەی گێڕانەوە زەوی لەدەست دراو منای پتەوکردنەوەی پەیوەندی نێوان دوژمنانی دوێنێی ئەلمانیایە، چون تاکە شتێك ئەوان لەم کاتەدا لێی دەترسێن ژیانەوەی ئەلمانیایە، کە ئەمەش بەیەکڕیزی گەلی ئەلمانیا و یەکخستنەوەی داواکاریەکانیان دێتە بوونێ.

دوژمنانی ئەلمان لە ساڵی ١٩١٤ەوە باشترین ڕێگە بۆ بنەبڕکردنی بوژانەوەی ئەلمانیا دابەشکردنی خاکەکەی بووە لەنێوان خۆیاندا، ئەودەمەی بۆرژوا کالفامەکان باسی گێڕانەوەی زەویەکانی دەرەوە دەکەن کە پێش لە ساڵی ١٩١٤ سنوری

ئێمەبوونە، ئەمە هەمدیس یارمەتی دووژمن دەدەنەوە خۆیان یەك بخەنەوە، لەبەرئەوەی باش دەزانن کە ئەڵمانیەکان یەکیان گرت هەرگیز بەبێ چەك هەڵگرتن لەدژی بەرامبەر ناوەستن و نکوڵی ناکەن لەبەکارهێنانی هەموو ڕێگەیەك لەبۆ گەیشتن بەئامانجی باڵایان.

کەواتە دروشمی گێڕانەوەی زەویەکانمان بۆ پێش ۱۹۱٤ ی بۆرژوا زۆر نابەجێیە لەم کاتەدا، هەروەها ناشتوانرێت بگەڕێندرێتەوە، هیچ هەڵیکی سەرکەوتنی سوپاییش لەم کاتەدا بەدی ناکرێت، هەروەها خوێن ڕشن لەم پێناوەشدا لەم کاتەدا هیچ مانایەکی نییە لای ئەوانەن نەختێك لەبۆرژواکان دووربین ترن؟ لەبەرئەوەی لەڕابردوودا هێزێکی پشتیوانی بەهێز نەبووە و لەداهاتووشدا ئەم هێزەمان بۆ دەستەبەر ناکات، ئەو سنورانە ئێستاکە پێشیاوی دواکردنەوە نین، چونکە سودێکی ئەوتۆیان نابێت لەبۆ پاراستنی یەکڕیزی گەلەکەمان و فاکتەری زیندەیی بەخشینیش نین بە وڵاتەکەمان، کەواتە جارێك ئەمانە بابخرێنە بەرەی دواوەی ئامانجەکانەوە.

بێگومانم لەوەی بەبەدەست هاوردنەوەی زەویە لەدەسدراوەکانی کانی جەنگ کە پێش لە ۱۹۱٤ هەمان بوون، نابێتە هۆی بەهێزبوونمان، ئێمەی نیشتمانی سۆسیالیستی بڕوای تەواویشمان بە زڕێتی ئەو ڕامیارێتیە دەرەکیە هەیە کەئامانجی سەرەکی و باڵای پێدانی ئەو زەویانە نییە کە گەلی ئەڵمانی ڕۆژێك لەڕۆژان لەسەری ئاکنجێ بووە، بەڵام ئەم ڕامیارێتیە لەم کاتەدا بێ بەرهەمە بۆیە ئەنجامدانی دەکەوێتە دوای یەکخستنی دەنگی ئەڵمانیەکان و دروستکردنەوەی سوپاوە. هەنگاونان بەرەو بەدەست هێنانی ئەم ئامانجەش تاکە بیانووە بۆ خوێن ڕشنی ئەڵمانەکان،چونکە وەچەکانمان ئەوانەی کەلەسەر زەویە نوێیەکان ئاکنجێ دەبن بەم بیانووە لە خوێنی باوکانیان لەئێمە خۆش دەبن، بێگومانیان دەکەینەوە ناردنی یاوکانیان لەلایەن ئێمەوە بۆ سەربڕین خانەکان بەمەبەستی دابین کردنی خۆشگوزەرانی بووە بۆ وەچەکانیان.

ڕەنگە نڤیسیارێکی ڕەگەز پەرەست ئەم هەنگاوە بەدژە ( ماف مرۆیی پیرۆز) و دەست درێژی کردنە سەر مافەکانی مرۆڤ بزانێت. من نازانم ئەم کەسە گەمژەیە ئەم بۆچوونە گێژانەی لەکوێوە هێناوە، بەڵام بێگوکانم لەوەی تەشەنەکردنی ئەم بۆچوونانە یارمەتی بەهێزکردنی دووژمنانی دەرەوە و ناوخۆشمان دەدات. دوژمنانی

بەرفراوانکردن و ڕزگارکردن ئەوە لەبیردەکەن کەلە سایەی ماف ئەوانی دیکەوە هیچ گەلێك نامێنێت لەسەر ئەم زەوینەدا بێتە خاوەنی یەك م[2] لەزەوی , ئەمەش بەهۆی بەستنەوەیەتی بە بەرنامە دابەزیوەکان یان دانراوە مرۆییەکان.

مەرزی ولأم لە بەرهەمی کارەکانی مرۆڤە, گۆڕانیشی تەنها مرۆڤ ئەنجامی دەدات, ئەم سنورەی ئەڵمانیاش جگە لە بەرهەمی تێکۆشانێکی ماوەدرێژ کە هێشتاکە تەواو نەبووە هیچی دیکە نییە, بەهەمان شێوەی سنورەکانی فەڕەنسا و پۆڵۆنیا و ئیتالیا و...هتد.

ئەو گەلەی خاکێکی زۆری بەدەستەوەیە مانای تەواوێتی خاوەندێتی کردنی نییە, مانای ئەوەش نادات کە گەلە بەش خوراوەکان ماف ئەوەیان نییە هەوڵی بردنی نەختێك لەم لەتکە زەویە بدەن بۆ خۆیان.

لەمڕۆدا گەلەکەمان باری ژیانی سەخت بووە و وەختە لەنێو چوارچێوەی ئەم زەوینە تەنگەدا دەخنکێت, ئەوی ئێمە گلەیی لێدەکەین فەرمانی قەودەر نییە, وەك ئەوەی تکاکاران بانگەشەی بۆدەکەن, تێکۆشانیش لەبۆ سنوردانان لەبۆ ئەم دۆخە یاخی بوون نییە لەقەودەر. باوانمان ئەو زەویانەی هەیان بووە ڕاستەوخۆ لەلایەن ئاسمانەوە بەدیاری پێیان نەبەخشراوە, بەڵکو لەڕێگەی شمشێرەوە بەدەستیان خستوە و درەختی ئازادییان بە خوێن ئاوداوە, ئەم مەودا زیندەییەی کە ئێمەی وەچەیان هەژارین لەڕێگەی نازی ڕەگەزپەرەتانەوە بەردەستی ناخەین, بەڵکو لەڕێگەی هێزەوە دەتوانین بۆخۆمانی دابین بکەینەوە.

یەکلایی کردنەوەی سەوداکانمان لەگەڵ فەڕەنسا هیچ ئەڵمانییەکی پاقژ نییە ئەمەی لەبیرنەبێت, بەلأم پێهەنگاوێکی زۆر دەبێت گەر بەم دۆخەوە قایل بین. دەرکێشانی ئەو دڕکەی لەڕۆژئاواوە ئازاری پشتمان دەکات خاڵەی دەسپێکردنی هەنگاوەکانە لەبۆ فراوانکردنی زەویەکانمان. لەپشکی پێشوودا بۆمان ڕوونکردنەوە کە فراوانکردنی زەویەکانمان لەدەرەێی ئەوروپێدا کێشەکانمان چارەناکەن, ملکەچکردنی گەلگەلێکی ڕەنگاوڕەنگ لەبەرامبەر ئەڵماندا ئامانجی ڕەهای ئێمە نییە,بەڵکو ئامانجی بالأمان ڕزگارکردنی زەویە ئەوروپییە ئەڵمان نشینەکانە لەپێشەوە, دواتریش هەموو ئەوروپا. بێگومان ئەم زەوی فراوانکردنە بە کەمکردنەوەی زەوی گەلانی دیکە دێتە ئەنجام دانو ئێمەی ئەڵمان خۆمان لەلۆژێك

گێل دەکەین، درۆ لەگەڵ مێژوودا دەکەین و خۆمان هەڵدەخەڵەتێنین ئەوکاتەی دەڵێین: فراوانکردنی زەویەکانمان بەکەمکردنەوەی زەوی گەلانی تر ستەمە، کارێکی ناڕەواو ئەستەمە! ئەو کاتەی ڕووبەری زەوی لەسەر نیشتەجێ بووی ناوخۆیی بەرتەسك دەبێتەوە هەموو گەلێك مافی فراوانکردنی زەوی تیا نیشتەجێ بووی هەیەی، ئەمەش بۆئەوەیە خۆی نەمرێت و تیانەچێت.

جا ئەڵمانیا زلهێزێکی نێودەوڵەتی بێت یان نا، ئەوا مەرجی سەرەکی لەبۆ گەیشتن بە ئاستی وڵاتانی زلهێز بەدەست هێنانی مەودای زیندەییە کە هەلی مانەوە بۆ گەلی ئەڵمانی دابین دەکات.

***

دەبێت ئێمەی نیشتمان پەروەری سۆسیالیستی ئەو کارە تەواو بکەین کە باوانمان بەر لە شەش سەد ساڵ دەستیان لێهەڵگرتووە، بەتایبەت لە ڕامیارێتی دەرەوەدا. دەبێت ڕێگە بگلایەن لەکشانی جەرمەنی بە ئاراستەی باشوور و ڕۆژئاوا، بەڵکو لەسەرەتادا بەرەو ڕۆژهەلات برۆین.

ئەوکاتەی دەمانەوێت سنوری وڵات و زیندەییەکەمان پتر فراوان بکەین، دەبێت ڕاستەوخۆ بەئاراستە ڕووسیا برین کە دەکاتە ڕۆژهەلات، چونکە لەو ڕێڕەوتەدا زەوی بەپیت و فراوان و کانی کانزای زۆرهەیە.

قەودەر بست بەستی هەنگاوەکانمان ئاراستەی ڕووسیا دەکات، لەوڕۆژەوەی بلشەفیکیەکان دەستیان بەسەر ڕووسیادا گرت چینی بڕیارانیان لێ داماڵی کەپێشتر ئەمان وڵاتیان دامەزراندبوو. بەمەش ڕێکخستنی دەوڵەتی ڕووسیا بەرهەمی کاری سەقڵەکان و توانای داهێنانیان نەبووە، بەڵکو بەرهەمی خوودی کاری ڕەگەزی ئەڵمانی ژێربووە. بەلام ڕووسەکان نەیان زانی چۆن کرۆکی ئەو دەوڵەتە بەجوانی ڕابگرن کە ئەڵمانەکان دایان مەزراند، بۆیە ڕۆژبەدوای ڕۆژ ناوکی وڵات لاواز بوو، لەهەمان کاتدا جووەکان دیارکەوتن لەبۆ ئەوەی دەست بەسەروڵاتدا بگرن لەشێوەی یابوو.

ڕووسیا تاڕادەیەك عەوڵی داوە لەبۆ پاکتاوکردنی جووەکان، بەلام ئامرازەکانی ئەم بوارەی نەشیاو بووە. هەروەها جووەکانیش ناتوانن بۆماوەیەکی زۆر دەست بەسەر وڵاتێکی گەورەی وەکو ڕووسیادا بگرن، چونکە جووەکان بە پونێت نان ڕانەهاتوون،

بەڵکو ڕەگەزێکی ڕووخێنەر و کاولکارن، بۆیە تاماوەیەکی زۆر توانای دەوڵەتدارییان نابێت. بۆیە ئێمەی نیشتمان پەروەری سۆسیالیستی بڕوامان وایە کە ڕووسیای ڕۆژهەڵات لەلێواری مەرگە و کۆتایی هاتنی فەرمانڕەوایەتی جوولەکە لەڕووسیا مانای کۆتایی هاتنی خوودی دەوڵەتی ڕووسیاشە وەکو دەوڵەت. چارەنووس ئێمەی هەڵبژارد لەبۆ دەست نیشانکردن و سەلماندنی ڕاستی بیردۆزە ڕەگەزیەکانمان لەهەمبەر نەژاد و ڕەگەزی مرۆییەوە.

***

بەگشتی ئەمانەوێت بێژین : جولەکە بەوپەڕی هێز و تواناییانەوە دژبەری ئەم چەشنە ڕامیارێتیەی ئێمە دەکەن، چونکە ئێمەڕێك پێچەوانەی تەواوی خۆیان و بۆچوون و ئامانجەکانیانین.مەرکە جوولەکە بەڕووی ئەم چەشنە ڕامیارێتیەی ئێمەدا وەستایەوە ئەوکات ڕاستی بۆچوونەکانی خۆمانمان بۆ دەسەلمێت و هەموو ئەوانەشی نەختێك هەستی نیشتمان پەروەریان تێدا ماوەتەوە دەگەڕێنەوە بۆ ریزەکانمان، ریزی نیشتمان پەروەران، بۆئەوەی بتوانین پێکەوە کاربکەین لەبۆ چەسپاندنی ئەو نەخشانەی کە پارتەکەمان لەم وارەدا کێشاویەتی. ئەفسووس تاوەکو ئێستاش بیرۆکەی کشان بەرەو ڕۆژهەلآت نەبووەتە بیرۆکەیەکی باو لەنێو بۆچوونی ئەوانەی کە خۆیان بەنەتەوە پەرەست لەقەڵەم دەدەن، ئەمانە هەرکە بیانەوەت پاساوی ئەم بۆچوونانەیان بدەنەوە ڕێککەوتنی بسمارك لەگەڵ ڕووسیا بەدەست درێژی نەکردنە سەر یەکتر بەبەڵگە دەخەنەڕوو، بەڵێ بسمارك لەوکاتەدا زۆر ژیرانە ڕەفتاری کردووە، ئەم کەسانە ئەو هەنگاوەی بسمارکیان لەیاد کرد کەبەم کارەی دڵنیایی دەبەخشیە ئیتالیای نیمچە گۆشەگیر بۆئەوەی زلهێزی خۆی بەسەر نەمسادا بسەپێنێت، ئەی ئەوانەی کە سەرسامن بە بۆچوونەکانی بسمارکی دەست پۆلآیین داوای پەیڕەوکردنەوەی هەمان سیاسەتی بسمارك ناکەنەوە لەگەڵ ئیتالیا لەمرۆدا؟ ئەمانە دەڵێن ئەم ئیتالیایە ئەوەی سەدەی نۆزدە نییە، ئەوا ئێمەش بەوان دەڵێینەوە: ئەو ڕووسیایەی بسمارك ڕێککەوتنی لەگەڵدا کردووە هەمان ڕووسیای ئەمرۆکە نییە، بێگومانم لەوەی گەر بسمارك لەم ڕۆژدا زیندووبایە، ئەوکات دەستی یارمەتی بۆئەم ڕووسیایە درێژ نەدەکرد کەزۆری نەماوە تیابچێت.

بەسەرە حەرزی بەسەلگیرکردنی بازاڕ و بازرگانی جیهان بوو. بێگومان بەسەرە ئەوەمان کاتێکا کە کێشەی ڕێکخستنەوەی ناوخۆ و کشانی هێزەکانی بەرەو ڕۆژئاوا چارەسەکرد باشترین ڕێگە بۆسەرکەوتنی ئەم کارانەی ڕێککەوتن بوولەگەڵ ڕووسیادا و ئەم کارەشی سەرکەوتنێکی مەزنە بۆ گەلی ئەڵمانی. بەڵام ئەمڕۆ پێچەوانەی ئەوەیە هەرچیەک لە ڤێرسایدابووە نزیمتی و نزی ڤێرساج

لەساڵی ١٩٢١دا کۆنفرانسێک هەوڵدرا لەبۆ لەیەکتر نزیک کردنەوەی لایەنەکەی ئێمە و بزووتنەوە هاو بۆچوونەکانی تری دونیا. نوێنەرانەکان پێشنیاری دروستکردنی کۆمەڵەی نەتەوە چەوساوەکانیان دەکرد. دوو یان سێ جار لەگەڵ نوێنەرانی وڵاتانی بەلقان و میسر و هیند دا کۆبووینەوە. ئەمانە ئارەزووی یارمەتی کردنەمانیا بۆ دووپات کردینەوە. بەڵام بۆخۆم هیچ گرنگیم بە قسەکانیان نەدا چون باش دەمزانی ئەمانە فرەوێژی بێ ئامانجن.

ئەم ئازانی خوازانە ئەو بزووتنەوەیەیان نیشتەوە کە گرنگی بەکارەکانیان دەدات و هاوبۆچوونیانە تا ڕادەیەکی زۆر. ئەم کەسانە لەبەریزی نەتەوە خوازە ئەڵمانیەکاندا ڕێزێکی زۆر دەگیران و خۆیان بە نوێنەری گەلانی هند و میسر دەزانی. لەکاتێکدا ئەمانە چەند خوێندکارێکی ئاسایی بوون و ئەوەی دەریان دەبڕی تەنها خواستی تایبەتی خۆیان بوو. تەنانەت ئەگەر ڕاستیشیان بکردایە و نوێنەری کۆمەڵێکی زۆر و بەهێزیش بووناییە ئەوکاتیش هەر پرۆژەکە بەرئەنجامەکەی بەکارهێنانی گەلی ئەڵمانی تێدەشکاندەوە بەڵکو زیانی دەکرد.

ئەڵمانیا پێشتر هاوپەیمانێتی دروستکردنی لەگەڵ ئەو وڵاتانەدا تاقیکردەوە کە لاوازن لەڕووی سەربازی و پیشەسازیەوە لەشێوەی تورکیا و نەمسادا. ئەنجامەکەی ئەم شکستەی ئەمڕۆیە. ئەم بەڵگەیە لەلایەن هاوڵاتیانی دۆلەکانی کۆمەڵەی نەتەوە چەوساوەکانەوە لەپێش چاو دەگیرابوو. بەو پێیەی ئەم کۆمەڵەیە توانادار دەبێت لە چەکداماڵینی سەرکەوتوانی جەنگ و بەدی هێنانی ئامانجەکانی خۆیان.

بەڕاستی بەوپەڕی توانامەوە دژایەتی ئەم بیرۆکەیەم کرد. چونکە تواناداری ڕاستەقینە لەگەڵمەکەمان دادەبڕێت و دووچاری خەون و ئەندێشەی نابەجێ و پووچی دەکاتەوە

ئەمڕۆ ئەڵمانیا لەو مرۆڤە دەچێت کە بۆ ڕزگاربوونی تەنانەت پەنابۆ پۆشیش دەبات لەنێو ئاودا. لەنێو دەستەی ڕۆشنبیراندا دەبینین کەس گەلێک هەر هێشتاکە

خەون بە دامەزراندنی (کۆمەڵەی نەتەوە چەوساوەکان)ەوە دەبینن ، یان متمانەیان بە (کۆمەڵەی نەتەوەکان) و هاوجۆرەکانیەتی لەبۆ بەدی هێنانی خەونەکانیان لەڕێگەی گێڕانەوەی مافە زەوتکراوەکانیان, لای دوژمنەکانیان لەبۆ خۆیانی خاوەن بە ساحێب زانیولەڕێگەی سکاڵاو و داواکاریەوە!؟

لەبیرمە بەهۆی ڕووداوێکەوە بۆ چەند مانگێك بزوتنەوە ڕەگەزپەرەستەکەمان سەرقاڵ ببوو, لە لێکۆڵینەوەدا. لە ساڵی ١٩٢١ دا کۆمەڵێك لەکەسانی ڕۆشنبیری هندی هاتنە ئەوروپا و وایان لەئەوروپیەکان گەیاند کە فەرمانفەرمای ئینگلیز وا لەداڕماندایە, چونکە شۆڕش لەهندستان هەڵایساوە و بە لەدەستدانی هند بەریتانیا بەرەو کەناری مەرگ دەڕوات, خەڵکانێکی زۆر بڕوایان بەم چەشنە بۆچوونانە کردبوو, وەکو منداڵێك چۆن چاوەنواڕی خۆرهەڵاتنی ڕۆژی جێژنە دەکات ئاوها زۆرێك لەئەڵمانیەکان بەبیر ساکاریانەوە چاوەنواڕی هەڵوەشاندنەوەی ئیمپراتیۆریەتی بەریتانیایان دەکرد, خۆنەگەر نەختێك شارەزای تەکتیکی جەنگی بەریتانیا بوونایە ئەوکات خەڵکانی ئەڵمانی بەم سادەییەوە بیریان لەڕووداو و قسەکان نەدەکردەوە.

ئەوانەی بڕوایان بە ئەگەری داڕووخانی بەریتانیا کردبوو, دەیان زانی کە بەلەدەستدانی هندستان بەریتانیا یانی نەمان, هند بۆ بەریتانیا ناوچەی زیندەیی سەرەکی بووە, بۆیە ئاخۆ دەبێت بەریتانیا وابەئاسانی ڕێگە بەهندیەکان بدات لەخاکەکەی وەدەری نێن, کەبەبێ هند بەرتانیا ئەڵماسی تاجی سەری لەدەست دەدات؟

نەخێر, بڕوام وانییە ئەمە ڕووبدات, مەگەر بەریتانیا هەست بە هەڵوەشاندنەوەی ڕەگەزی بەریتانی بکات لەهند, یان لەلایەن دوژمنی بەرانبەریەوە گورزێکی زۆر کوشندە لە هێزی بەریتانی بدرێت, بەڵام هەرگیز لەڕێگەی شۆڕشی هندیەوە بڕواناکەم بەریتانیا دابڕمێت, ئەم چەشنە قسانە ڕەنگە بۆ خەڵکانی ئەمریکای باشوور ئاسایی بێت, بەڵام بۆ ئەڵمانییەك کە خۆی بەچاوی خۆی سەرسەختی ئینگلیزەکانی بینیوەو تاقیکردۆتەوە چۆن دەبێت بڕوا بەم قسانە بکات!

ئەو ڕەگەز پەرەستانەی هیوایان بە بزوتنەوەی ڕزگاری خوازی میسری هەبوو ژیر تر نەبوون لەو برایانانەیان بڕوایان بەداڕووخانی ئیمپراتۆریەتی بەریتانیا کردبووو لەئەنجامی شۆڕشی هندیەوە. بەڵام میسریەکان هەرگیز ئامادە نین لەپێناو برا

ئەڵمانەکانیاندا بەگژی بەریتانیادا بچنەوەو خوێنی یەکتر بڕێژن, وەکو ئەوەی هەندێك بڕوایان پێی هەبوو.

ئەوانەی بڕوایان بە چاکێتی تێکۆشانی تێکۆشانی هاوبەشی -تێکۆشانی ئەڵمانی -میسری- هنـدی هەبوو,ساویلکەبوونی خۆیـان پیشـاندا لەهەمبـەر دوژمنێکـی هاوبەشـی زەبەلاحدا, لەکوێڕا بووە سیٚ کەسی پاڵکەوتەی کەم ئەندامبوو بدەن بەسەر دوژمنێکی زل و کەتەی بەهێزدا و لەناوی بەرن و ئەویش دەستەوەستان بێت لەم کاتەدا؟ بۆخۆم وەکـو ڕەگـەز پەرەسـتێك لەڕێگـەی ئاشـنابوون بـە ڕەگـەزەکانی دیکـەوە پێوانـەی ڕەگـەزکانی دیکـە دەکـەم, هـەرگیز بـەوە قایـل نـابم داهـاتووی ڕەگەزەکەم ببەستمەوە بەڕەگەزگەلێکی نزمترەوە.

ئەوەی گوتم لەبارەی ڕووسیاوە لەم ڕۆژدا گەر بەجوانی سەیری نەخشەی سیاسی و بـاری سـەربازی بکـەین, ئەوکاتـەی لەگـەڵ ڕووسـیادا هاوپـەیمان بـین و بمانـەوێت پەلاماری ئەورووپای ڕوژئاوا بدەین پێکەوە ئەوکات ڕووسیا هیچ قازانجێکی بۆئێمەی ئـەڵمانی نابێـت, چـونکە خـاکی ئـەڵمانی دەبێتـە گۆڕەپـانی جـەنگ و کـاول و وێـران دەبێت, جا گەرەنتی نەکشانە دواوەی هێزەکانی ڕووسیا لـەم کاتـە تاڵـەدا دەبێـت چـی بێت, هیچ! بۆیـە هاوپـەمانی لەگـەڵ وڵاتـی ڕووسیای ڕۆژهەڵاتدا قازانجێکی ئـەوتۆی بۆئێمـەی ئـەڵمانی نابێـت, تەنانـەت ئـەو پۆڵۆنیایـەی کـە ڕێگـە لەڕووسـیا دەگرێـت لەکشانی بەرەو ڕۆژئاوا ئەمڕۆ سەربە فەڕەنسایی, بۆئەمەش لەپێشدا دەبێت ڕووسیا لەگەڵ پۆڵۆنیا بەجەنگ بێت , ئەوجا هێزەکانی دەتوانێت بێنـە بەرەی ئێمـەوە لـەدژی ڕۆژئاوا پێکەوە بجەنگین.

لەبیرمان نەچێت لەکاتی هەڵایسانی جەنگدا ئەڵمانیا پێویستی تەواوی بە تەکنیك و ئامرازەکـانی شـەڕکردنە زیـادتر لـەپیاوی شـەڕوان. بەتـەنها خـۆی لەجـەنگی جیهـانی پێشـوودا نەهامەتیـەکانی جـەنگی هڵگـرت بـەهۆی بـیٚ تفـاقی و هەڵـە هەڵبـژاردنی هاوپەمانەوە. ڕووسیاش لەمڕۆدا لەڕووی تەکنیکی جەنگیەوە پشت پێبەستراو نییە, کەواتـە چـۆن بتـوانین پێکـەوە ڕووبـەڕووی ئـامرازە شـەڕکارەکانی ڕۆژئاوابببینـەوە کەلەلوتکەی داهێنان و نوێگەریدان و پێویستی بە جـەنگی ئامرازەکانـە, ئایـا بەڕاسـت ئەڵمانیای دەست بەستراو دەتوانێت ئامێر و تـەکنیکی جـەنگی پێویسـت بۆخۆیـان و هاوپـەیمانانی دابین بکـات؟ بێگومـان, نـەخێر, کەواتـە گـەر بەپشـا بەسـتن بـە ڕووسـیا

بچینە جەنگەوە ئەوا ئەمامەتی لەوەی پێشووتر یەقەمان دەگرێت و دەبینە گاڵتەجاڕی هەمیشە دۆڕاو.

ئەوانەی پاڵپشتی هاوپەیمانی لەگەڵ ڕووسیا دەکەن، دەڵێن: ئەم هاوپەیمانێتیە مانای جەنگ هەڵایسان نییە، ئەمڕۆ با هاوپەمانی لەگەڵدا بوەستین و چاوەنواڕی سبەی بین بزانین چی ڕوودەدات ! منیش بەمانە دەڵێم ئەم هاوپەیمانێتیە هیچ قازانج و سوودێکی نییە و بەتەواو بێکەڵکە. هەرکە دوو یان چەند دەوڵەتێك پێکەوە کۆبوونەوە مانای خۆ ئامادەکرنە لەبۆ جەنگ، گەر ئەمڕۆش خۆمان دابەدەست هاوپەیمانی ڕووسی-ئەڵمانیەوە ئەوا بیست ساڵی دیکەش بێت هەر جەنگ هەڵدەگیرسێت، دووژمنانمان هیچ ڕێگەیەکمان بۆ نامێڵنەوە لەبۆ هەناسە هەڵکێشان و برەودان بە تەکنیکی جەنگی، لەڕابردووی نزیکدا سەلماندیان دەتوانن بەبێ ئەوەی ئێمە خۆمان ئامادەکردبێت پەلکێشی جەنگمان بکەن، دواتریش بەرپرسیارێتی ململانێکەمان بخەنە ئەستۆ.

بۆهەموو ئەمانەش دوو ڕاستی زێدەبار دەبێت:

١-بەرپرسانی ئێستاکەی ڕووسیا بەشێوەیەکی وەها لەهاوپەمانێتیەکان دەنواڕن کەجگە لە چەند پەڕەیەکی نوسراو هیچی دیکە نییە.

لەبیرمان نەچێت ئەم دەستەڵاتدرانەی هەنوکەی ڕووسیا تاوانبار گەلێکی خوێن مژن و خوێن تا بینا قاقایان هاتووە. ئەمانە گەمژەترین مرۆڤەکانن، بەڵام لە کاتێکی کەمدا بەهۆی قەودەرەوە توانیان دەست بگرن بەسەر دەوڵەتی مەزنی ڕووسیادا، دەس و دەم چەندین ملیۆن کەسیان لەناوبرد و زەویەکانیان سوتاندن، بۆئەوەی بتوانن لەسەر پاشماوەی ئەم کارەیان دیکتاتۆریەتێك دروست بکەن. بێگومان گەر نەختێك ژیربین دەزانین دەستەڵاتدرانی ڕووسیای ئەمڕۆ سەر بەڕەگەزێکی دووڕوو و قسە هەڵبەستن، ئەم ڕەگەزە، جوو، وای دەخاتە پێش چاو کە لەلایەن خوداوە داوای لێکراوە دەست بگرێت بەسەر جیهاندا و بیخاتە ژێر دەستەڵاتی خۆیەوە، کەواتە چۆن بتوانین دەستی هاوپەیمانی بۆ گەلێك درێژبکەین کەلەسەر بنەمای کوشتنی دۆستەکانی خۆی پونێت ناوە؟ کێ هەیە داوای هاوپەیمانی بکات لەگەڵ ڕەگەزێك دروشمان تەڵە و گزی و دزی و جەدەیی بێت ؟

٢-ئەو پەتایەی لەڕووسیادا بڵاوبووەتەوە واخەریکە بەتەواوەتی لەئەڵمانیاشدا دەتەنێتەوە و بەهەمان دەردی ڕووسیامان دەبات, ئەو کەسانەی وەکو وشتر مرخ کەنایانەوێت ڕاستیەکان ببینن و سەریان بەژێر لمەوە کردووە, باش بزانن کە بەبەلشەفیك کردنی ڕووسیا هەنگاوێکی زۆر بەمێزە لەبۆ دەستگرتنی جوو بەسەر جیهاندا. جووەکان, وەکو ئەنگلۆسەکسۆنیەکانن, ڕەنگە بۆ کاتێکی نادیار لە پێکانی ئامانجەکەی خۆی وەرچەرخێنێت, بەڵام هەرگیز دەستی لێهەڵناگرێت و بەدووی هەلەوەیە لەبۆپێکانی ئامانجەکەی, ڕێگەی جوولەکەش لەبۆ گەیشتن بەئامانجەکەی تێکەڵاویەتی لەگەڵ خەڵك و پیسکردنی خوێنەکەیەتی, بەردەوام دەبێت تائەوکاتەی دووچاری ئەو هێزە دەبێتەوە کە هەرکەسێك بیەوێت ئاسمان داگیربکات ئەوکەسە دەبێت بخرێتە دۆژەهەوە.

ئەڵمانیا دووەم وڵات دەبێت کە جووەکان ڕینگاوی دەمیانی بەسەردا دەکەن و هەوڵی بەبەلشەفی کردنی دەدەن. هیچ هێزێك ناتوانێت لەم چارەنوسەی قوتاربکات, مەگەر هێزێکی کوشندەی شکۆمەند نەبێت کەپاك دامێنانی ئەڵمانی لەدەوری کۆببنەوەو لەڕێگەی هۆشیارکردنەوەی گەلی ئەڵمانیەوە لەچنگ ئەم گروپە خوێن مژەی قوتاربکەین. ئەوەشی دەڵێت : بۆئەوەی ئەڵمانیا بەمێزتر بێت و بتوانێت لەسەر پێی خۆی بوەستێت, ئەمەش لەڕێگە هاوپەیمانێتی ڕووسیاوە دەبێت, ئەوا ئەم کەسە یان نەزانە یان هەڵە لەیەکی داوەتەوەو بۆچوونی ئاراستە کردووە و کورتبینە. دەبێت بزانین: چۆن دەتوانین چارەنووسی خۆمان بەدینە دەستی نەتەوەیەك کە دوژمنە کوشندەکەمان سالار و دەمراستیەتی؟ چۆن دەبێت لەیەك کاتدا لەگەڵ ڕووسیا هاوپەیمان بین و داوا لەکرێکارە ئەڵمانیەکان بکەین دژی بەلشەفی بن؟ کەواتە چیتر مافی بێزارکردنی هاوڵاتیە بەسوورکراوە ئەڵمانیەکانمان نییە, بەوەی سەرکردەکانی وڵاتی ئەڵمانی دەبنە هاوپەیمانی ڕووسی سور, واتە گەر لەگەڵ ڕووسیادا ڕێککەوتین ئەوا نابێت بەلشەفیك لە ئەڵمانیا قەلاچۆ بکەین, گەر هاتوو ببینە هاوپەیمانی ڕووسیا وەکو ئەوە وەهایە پشت بەئاریەمەن ببەستین لەبۆ وەدەرنانی لایەنگرانی ئاریمەن.

پێشتر پێم ڕاگەیاندن بوون بە هاوپەیمانی بەریتانیا بەئامانجی هەل وەرگرتنە لەبۆ پەلاماردانی ڕۆژهەلات, یاخوود لەگەڵ ڕووسیادا هاوپەیمانی دروستبکەین بۆئەوەی لەیەك کاتدا لەدووبەرەدا نەجەنگین. بەڵام لەمڕۆدا هاوپەیمانی دروستکردن لەگەڵ

ڕووسیادا کەڵکێکی نییە، بۆئەمەش بزوتنەوەکەمان نەخشەی تەواوی کێشاوە لەبۆ گەیشتن بەئامانج و بەرژەوەندییەکانی نەتەوەمان، هیوادارە ڕۆژێك بێت دەستەلاتدرانمان بەرژەوەندییەکانی نەتەوەکانمان بپارێزن لەڕێگەی نەخشەی کێشراوی بزوتنەوەی نەتەوەییمانەوە.

بەلاَم هەنگاوی سەرەکی لێرەدا و بۆئەم چەشنە ڕامیارێتیە بەم شێوەیە دەبێت:

هەرگیز بوار بەدروستبوونی دوو دەوڵەتی گەورەی وشکانی مەدەن لەکیشوەری ئەورووپادا (ڕووسیا، فەرەنسا)، هەرجارێك لەنزیکی سنوری ئەڵمانیاوە هەوڵی دامەزراندنی دەوڵەتێکی زلهێزدرا ئاگاداری خرتان بن، چونکە مەترسی گەورەی بەدواوەیە، دەبێت هەوڵی شکست پێهێنانی ئەم دەوڵەتەبدەن بەبێ سڵکردنەوە لەبەکارهێنانی هیچ ئامرازێك.

لەبیرتان بێت، پێویستە سەرچاوەی هێزی ئەڵمانیا لەئەورووپادا بێت لە خاکی ئەڵمانیاوە هەڵبقوڵێت، ناشبێت دڵنیابینەوە لە دۆخی ڕایخ و چارەنوسی پێش لەوەی بواری زیندەیی بۆ گەلی ئەڵمانی دابین بکەن.

***

دێمەوە سەرباسی هاوپەیمانێتی نێوان ئێمە و بەریتانیا و ئیتالیەکان، لەبۆ تیشك خستنەسەر قازانجەکانی ئەم هاوپەیمانێتیە لەڕووی سەربازیەوە.

بەرئەنجامەکانی ئەم هاوپەیمانێتیە پێچەوانەی بەرئەنجامی هاوپەیمانێتی ڕووسی-ئەڵمانی یە، بێگومان دروستبوونی هاوپەیمانێتی لەگەڵ بەریتانیا و ئیتالیا نابێتە کێشەبۆهیچ لایەکمان، چونکە دووژمنی سەرەکی ئێمە فەرەنسایە. بێگومان لەم کاتەشدا ئەم ولاَتە هیچ هەنگاوێکی شێتانە نانێت و خۆی دووچاری جەنگی ئەم سێ هاوپەیمانێتیە ناکات. هەروەها نزیك بوونەوەمان لەبەریتانی و ئیتالیەکان هەلی تەواومان دەداتێ بۆ خۆئامادەکردن و بوژانەوە، لەچوارچێوەی هاوپەیمانێتی سێ قۆڵیدا، لەبۆ خۆئامادەکرد لەو جەنگە پڕجۆش و خرۆشەی کەدەبێت دژی فەرەنسا بەرپای بکەین، ئەمەش دوای ئەوە دەبێت کە لەڕووی دیپلۆماتی و سیاسیەوە بەدووری دەخەینە لەگۆڕەپانی نێودەوڵەتیش توانای سەربازی لێوەردەگرین.

بەڕاستی ئەم هاوپەمانێتیە گرنگی تایبەتی خۆی هەیەو لەم جارەدا ئەڵمانیا گرفتاری بێ تفاقی و کەلوپەلی جەنگی نابێت, لەبەرئەوەی ئینگلیز و بەریتانیەکان دەتوانن پێداویستی تەواوی خۆیان لەبۆ جەنگ ئامادەبکەن.

هەرچەندە ڕەنگە گرفت بێتە پێش چێ بوونی ئەم هاوپەیمانێتیە سێ قۆڵیە, بەڵام هەر دەتوانرێت ئەنجام بدرێت, چونکە پێشتریش لەسەردەمی ئیدواردی حەوتەمدا سەرباری بوونی دژایەتی و لەمپەری زۆر بەڵام هاوپەیمانێتیەکە هاتە چێکردن. دەتوانین لەو گرێ داخراوە پووچە خۆمان دەربێنین کەوە ساڵێکە لەنێویدا گیرمان خواردووە و ئەو ڕۆژەی لەم ئەندێشەیە قوتار دەبین دەتوانین ببینە خاوەنی ڕێبازێکی ژیرانەی دەرەکی کە دەستمان بەرەو ڕۆژهەڵات بگرێت, پاش ئەوەی توانیویمانە نینۆکەکانی فەرەنسا لەڕۆژئاوا ببڕین.

ئەوکەسانەی تا ئێستا گەمژانە هەوڵی توڕەکردنی دوژمنانی دوێنێ دەدەن, ڕەنگە ئەمە هۆکاری یەکخستنەوەی دوژمنان بێت.ئەوانەشی ڕقیان لە بەریتانیا و ئیتالیایە باوەکو باش بزانن کە هەردەوڵەتێك لەئەورووپادا دژی فەرەنسابێت لایەنگیری ئێمە دەبێت و دەستی هاوپەیمانێتی بۆ درێژدەکەین لەبری دەستی ئاسنینی تیژ, بۆئەمەش دەبێتە هەموو کارێك بکەین لەبۆ کێشکردنی ئەم دەوڵەتانە بەلای خۆمانە, ڕێککەوتن لەگەڵ ئەم وڵاتانەدا لەئامانجە گەورە سەربازیەکەمان نزیکمان دەکاتەوە کە هارینی فەرەنسایە بەدەم ڕێوە.

# بەشی بیست و چوار

## مافی بەرگری کارا

ئەوگەلانەی توانای شەڕکردنیان هەیە و لەناکاو بەچەك دانان خۆیان دەکەنە دیلی دوژمن ئەوا دیرۆك پتر لەبەڵگەیەکی لایە، کەداتر ئەمانە واڕادێن کە دووژمن شەقیشیان تێهەڵبدات زۆر بەلایانەوە ئاسایی دەبێتەوە وەك لەدووبارە چەك هەڵگرتنەوە.

ئەوکەسانی لەپشتی پەردەوە لە١٩١٨ەوە دەستەڵاتی ئەڵمانیایان بەڕەهایی بەدەستە، ئەمانە ئەوپەڕی هەوڵ دەدەن لەبۆ ئەوەی گەلی ئەڵمانی لەسەر سەرۆڕی و بێدەنگی ڕابێنن و چیتر شتێك بەناوی نەتەوەو نەتەوایەتی لەمێشکیاندا نەمێنێتەوە، بێزراوترین شت لەلایەن ببێتە چەك هەڵگرتن لەبۆ بەدەست هێنانی مافەکانیان.

بەڕاستی بانگەشە خراپ و شەڕهێنەرەکانی شۆڕش کاریگەری مەترسی داریان هەبووە لەسەر لاوازکردنی هەستی تاك و سەرکردەکانی ولاتیش لەبەرمبەر هاوپەیمانە سەرکەوتووەکان، بەهۆی ئەوەی لە ١٩١٨ ەوە هەموو ڕامیارێتی دەرەوەی ئەڵمانیا بەدەست جوومکانەوەیە، بۆیە هەرچی هەڵەیەك هەبێت ئەوا ساویلکەیی نییە بەڵکو بەئەنقەستە و لەلایەن جووەوە ئەنجامدەدرێت، ئەم جووانە هەمیشە بەدووی نوێترین

ڕێگەدا وێڵن لەبۆ تەفر و توناکردنی هێزی ئەڵمانی و لەناوبردنی بەیەکجاری, ئەمەش مانای وایە بۆ هەر شکستێك نەخشەیەکی تۆکمەی جووی لەپشتە.

ئەوکاتەی لەساڵی ۱۸۰٦ دا سوپای ناپلیۆن هێزی پروسی تێکشاند, هەموان بڕوایان وابوو چیتر ئەم دەوڵەت ناتوانێت هەستێتەوە, بەڵام لەماوەی حەوت ساڵدا خۆی یەکخستەوەو دژی دوژمن وەستایەوە.

حەوت ساڵ پاش لە پەیمان نامەی ئاشتی ۱۹۱۸ دا تادێت ئەڵمانیای لاوازدەبێت لەبری بەهێزبوون, ئایا دوێنێ نەبوو پەیمان نامەی لۆکارنۆیان بەسەردا سەپاندین؟

ئەوکاتەی ئەڵمانیا تواناداربوو لەبۆ چەك هەڵگرتن کەچی چەکی فڕێدا ! ئەوکاتەی مەرجەکانی سەرکەوتنمان پەسەندکرد هێزمان لەبەر بڕا و نەمات توانی چیتر بەرهەڵستی دوژمنان بکەین و ئەوانیش بەمەوەسی خۆیان سوکایەتیان پێدەکردین, دوژمنانمان زانیان چۆن دەتوانن دەست بگرن بەسەر هەستی خۆ بەزلزانی ئەڵمانەکاندا و سەشۆڕی دەکەن, پەلەیان نەکرد و پلەبەپلە ئیشی خۆیان ئەنجام دەدا, بەم کارەیان لەڕێگەی ئالیکاری حکومەتە خۆبەدەستەوە داوەکەمانەوە کارەکەیان بۆ ئاسان دەکرا, ئەوان بەبێ ئەوەی ڕقمان بوروژێنن یان هەستیان پێبکەین کاری خۆیان ئەنجام دەدا.

بەم ڕێگەیەش سەرکەوتوان بەرەو مۆرکردنی ئەو ڕێککەوتنامانەیان کێش کردین کە دامان دەڕووتێنێتەوە لەهەموو هێز و تواناو پیاوەتیەك, کردمانیان بەکۆیلەی خۆیان, بەجۆرێك سڕیان کردبووین کە هەندێکمان بڕوایان وابوو پرۆژەی دایڤز ڕووداوێکی جوانە و پەیمان نامەی لۆکارنۆش بە سەرکەوتن دەزانن.

***

فەڕەنسا لەکاتی کۆبوونەوەکانی پێش لەجەنگ و پاشی جەنگیش مەرامە ڕاستەقینەکانی خۆی شاردبۆوە. بەڵام ئەم مەرامانەی لە زستانی ۱۹۲۲-۱۹۲۳ دا بەڕوونی بەدیارکەوت. ئەوکەسانەی نەختێك ژیرن و بەڕووکەش هەڵناخەڵەتێن ئەوا باش دەزانن کە فەڕەنسا تەنها بۆ دەستکەوتنی چەند ملیار مارکێك و پارچەیەك لە ئەڵمانیا بەشداری جەنگی نەکرد بۆ ماوەی چوارساڵی ڕەبەق, بەڵکو بەهۆی ئەوەی سەرداریتی فەڕەنسا لەو کاتەدا بەدەست جوولەکەکانەوە بوو بۆیە هەموو هەوڵێکیان دەدا لەبۆ بڕینی شادەمارەکانی ئەڵمانیا و پەکخستنی لەهەموو جوڵەیەك.

فەڕنسا زۆری حەز لێبوو جەنگەکە بگەیشتیابەتە نێو خاکی ئەڵمانیا و ئەوکاتەی هاوپەیمانان پەلاماری دەدەن و پارچە پارچەی دەکەن, چیتر یەك ئەڵمانیای یەکگرتوو دروست نابێتەوە و لەناوی دەبەن.

گەر وەکو ئەوەی فەڕەنسیەکان هیوایان بۆ دەخواست بەرداشی جەنگ لە ڕوهر و لەسەر ڕاین و ئالپ بوایە لەبەرامبەر هانۆفەر و لایبزگ و نۆرمبیرگ و..هتد لەبری ئەوەی چوار ساڵ جەنگی ساتر و چاڵەکان بەردەوام بووایە لە فلاندەر و لەبەرمبەر فرسۆفیا و ڕیگا و کوفنو, ئەوا هاوپەیمانان دووچاری هیچ نەهامەتیەکی گەورە نەدەبوونەوە لە پارچەپارچەکردنی دەمارەکانی ڕایخ ی تازە ئاشنابوو بە فیدراڵی. بەڵکو چاکەی مانەوە و بەرگەکرتنی وڵاتەکەکان لەبەرامبەر نەهامەتیەکانی جەنگدا دەگەڕێتەوە بۆ بەهێزی سوپای ئەڵمانی بەتەنها, هەربۆیە لەم کاتەدا دەتوانین بڵێین کە خوێنی براکانمان لە بەهیچ نەڕژاوە.

ئەوکاتەی لەساڵی ١٩١٨ دا ئەڵمانیا لەناوخۆدا داڕووخا سوپای ئەڵمانیا لەدەرێ زەویەکی زۆری داگیرکردبوو, بۆیە بەرلەهەموو کارێك ەڕەنسا گرنگی دا بە دەرکردنی سوپای ئەڵمانیا بە فەڕەنسا و بەلجیکا, ئەوکاتەی ئەم کارەیان ئەنجام دا, هەناسەکی قوڵیان هەڵکێشا لەبۆ دەستکردن بە هێنانەدی ئامانجە نوێیەکە: دابەشکردنی ڕایخ بۆچەند وڵاتێکی ناوخۆی, بۆیە ئینگلتەرا لەم کاتەدا بەڕوویدا وەستایەوە, چونکە چیتر ئەڵمانیا بە لەمپەر نەما و گەر بیشتوێنرێتەوە ئەوا بەزیانی ئینگلیز دەشکێتەوە, ئەمەش دژبەری خوودی ڕامیارێتی کۆنی بەریتانیایە, چونکە ئەگەر بەتەواوەتی ئەڵمانیا لەناوبچێت ئەوا فەڕەنسا دەبێتە گەورەترین زلهێزی چارنەکراوی ئەورووپا و ئەمەش دژی خواست و بەرنامەکانی ئینگلیزە.

فەڕەنسا بە پێشنیارەکەی بەریتانیا قایل بوو؛ چونکە ناچاربوو, بەڵام کلیمەنسۆ ناخی فەڕەنسای دەربڕی, ئەوکاتەی ڕایگەیاند: " ئاشتی لەڕوانگەی ئێمەوە بەردەوامی جەنگە" , فەڕەنسیەکان بەوپەڕی توانایانەوە کاریان دەکرد بۆ لاوازکردن و پچڕپچڕکردنی وڵاتی ئەڵمانیا, ئەمەش لەڕێگەی دنەدانی جوداخوازەکان بۆ جیاکردنەوەی ناوچەکانیان لە ئەڵمانیای یەکگرتوو و بەکارهێنانی گوشاری ئابووری.

لەزستانی ١٩٢٢-١٩٢٣ کەسە پاقژەکان هەستیان کرد فەڕەنسا بەردەوام دەبێت لەسەر کارەکەی خۆی گەر بەبەردی بەرگری و پێداگیری ئەڵمانەکان لەناونەبرێت, باش

درکیشیان بەوە کردبوو کە، ئەوکاتەی نەتەوەکەمان سواری کەشتی دژە فەڕەنسا دەبێت پێشتر پێویستە لایەنگرانی لەفەڕنسا داماڵیبێت, ئەگینا دژایەتی کردنی فەڕەنسا کۆتاییەکی نەهامەت ئامێزی هەیە.

لەزیادتر لە وتارێك و بەیان نامەیەکدا بانگەشەی ئەوەم کردووە کە تا فەڕەنسا بەم شێوەیە بمێنێتەوە ئەڵمانیاش بەلاوازی دەمێنێتەوە؛ چونکە بەهێزی فەڕەنسا بەستراوەتەوە بە لاوازی ئەڵمانیاوە, بەڕاستی گەر من فەڕنسی بومایە هەمان کارم ئەنجام دەدایەوە لەبەرامبەر ئەڵمانیادا. بەڕاستی پشت بەستن بە دامەزراندنی حکومەتێکی فەڕەنسی میانڕەو لەڕوانگەی منەوە, تلیاکێکی ڕامیاریە و بۆ دەمارە نەخۆشەکانمان دژبەرانی ئەڵمانیا پێمانی دەفرۆشنەوە, بەتایبەت دوژمنانی ناوخۆیی لە جوولەکە و دیمۆکراتی خوازان, چونکە هەموو تاکێکی فەڕەنسی کلیمەنسۆ یان بوانکارایەکە بۆخۆی, هەرگیز ناکەوینە ژێر کاریگەرییە نەرێنیەکانی هەندێك لە ڕەگەز پەرەستانی داواکار بۆ ناتوندوتیژی, چونکە ئەو دوژمنەی لەپێشماندایە ددانی لەجەستەمان بەنزا و پاڕانەوە ناکاتەوە, بەڵکو پێویستی بەکوتەکە.

ئەوەی دەتوانێت لەفەڕەنسامان ڕزگاربکات باسکی بەهێز و هزری ساغمانە, کەی توانیمان فەڕەنسا لە هاوپەیمانانی دابماڵین,ئەوکات دەتوانین باسی پێکهێنانی بەرەی دژە فەڕەنسا بکەینەوە, هەمدیس لەناوبردنی فەڕەنسا هۆکارە بۆ بەدی هێنانی ئامانجە گەورەکەمان: پێویستە پاش لە دەرکێشانی ئەو دڕکەی ئازاری پشتمان دەدات بەرەو ڕۆژهەلات بکشێین, لەبۆ دابینکردنی مەودای زیندەیی پێشیاو بۆ کردنی ئەڵمانیا بە دەوڵەتێکی زەبەلاح و هێزێکی جیهانی.

***

لەسەرماوەرزی ١٩٢٢ دا فەڕەنسا ئاوزێلی ڕۆهری داگیرکرد و بەم کارەی توانی پشتی ئەڵمانیا بشکێنێت, بۆئەوەی چیتر هەوڵی خۆبەهێزکردنەوە نەدات, بەلام ئەمە بەڕاستی دەست پێشخاری بوو لەبۆ زیندووکردنەوەی هەستی نەتەوایەتی ئەڵمانەکان و بەهۆش هاتنەوە لەبەرامبەر ئەڵمانیادا, سەرباری ئەوەی ئەم داگیرکردنە بووە هۆی ورووژاندنی ڕقی بەریتانیا , حکومەت و خەڵکەکەشی؟ چونکە ئەم ناوچەیە دەوڵەمەندە بە خەڵووز و ئاسن, دەستکرتنی فەڕەنسیەکان بەسەر ڕووهەردا مانای تەواو بەهێزبوونی فەڕەنسیەکانە لە ئەورووپا و دەرکەوتنیان وەکو هێزی پلەیەك, لەڕووی

رامیاری و سەربازی و ئابوریشەوە. بەم هەنگاوەی توانای دژبەری کردنی بەریتانیای بۆ دەرەخسێت. جا لەهەر بوارێکدا خۆی بیەوێت. ڕۆژنامەیەکی نیوچە فەرمی بەریتانی نوسیبووی: داگیرکردنی ڕۆهر لەلایەن فەرەنساوە بووە هۆی لەدەستدانی هەموو دەستکەوتەکانی بەریتانیا.

ئەم دەستپێشخارییەی فەرەنسا کاردانەوەی خراپی هەبوو لە ئیتالیا و هەرێمە یەکگرتوەکانی ئەمریکاشدا. ئەمەش بووە هۆی ئەوەی ئەو دەوڵەتانەی تادوێنێ پشتیوانی بوون ئەمڕۆ بەگومانن لێی. ئەگەر هاوپەیمانانی دوێنێ نەبنە دوژمنی سبەی ، وەك ئەوەی لەجەنگی دووەمی بەلقاندا ڕوویدا، ئەوا مانای نەبوونی کەسێکی ژیرە لەوڵاتەکەماندا، لەهاوشێوەی ئەنوەر پاشا، کە بزانێت ناکۆکیەکان بقۆزێتەوە و دەوڵەتانی دژی بەیەکدا بدات.

ئەوکاتەی فەرەنسیەکان دەستیان بەسەر ڕوهردا گرت، هەمووان لەدەستەڵاتی ئەڵمانیایان دەنواڕی، نیشتمان پەروەران هەستیان دەکرد ئەمە کاتێکی هەستیارە بۆ ئەڵمان. هەموو شتێك پەیوەستە بەو چەشنە بڕیارەی کە ئەم حکومەتە دەری دەکات. هیچ گومان لەوەدا نەبوو ، ئەم دەست پێشخارییە فەرەنسیە دژە پەیمان نامەی ئاشتی فەرسای بوو. بووەهۆی تورەکردنی هاوڵاتیانی بەریتانی و ئیتالی، حکومەتی لەندەن لەکۆبوونەوەی گشتی ئەنجومەنی گشتیدا ڕایگەیاند: حکومەتی فەرەنسا ڕێزی هاوپەیمانانی ناگرێت و بەرژەوەندیەکانیان لەپێش چاو ناگرێت، لەڕێگەی داگیرکردنی کانە کانی ئەڵمانی خواروو.

دەبوو لەم کاتەدا حکومەتەکەمان ئەم ململانێیە بقۆزێتەوەو دووبەرەکی بخاتە ڕیزی هاوپەیمانانی دێنی وە، بەڕاستی مەترسیەکانی فەرنسای پاش داگیرکردنی ئەڵمانیای تێکەیاندبان. دەبوو داگیرکردنی ڕووهر هاوشێوەی مۆسکۆ و ناپلیۆن بخاتەڕوو، ئەمەش لەڕێگەی هەستی نیشتمانپەروەریەوە کە ئەم چەڵماسیەی فەرەنسا ورووژاندی.

نەدەتوانرا لەڕێگەی بەکارهێنانی هێزی سەربازی یان وتوێژیشەوە ڕێگە لەفەڕنسا بگرێت لەوەی ڕۆهر داگیر نەکات، وتوویژ لەم کاتەدا هیچ کەڵکی نەبوو؟ چونکە ئەو ئەڵمانیانەی بۆ وتوویژ دەچوون پشت ئەستوور نەبوون بەهیچ، واتە هێزیان لەپشت نەبووە، ئەمەش ئەوەی دەگەیاند هیچ هەنگاوێك نییە بۆ ڕزگارکردنی ڕووهر تەنها پاکژکردنەوەی ناوخۆی وڵات نەبێت لەدەست ناپاکان و تا ئەم کاتەش شەڕی لێدە و

بڕۆ لەگەڵ سوپای فەرەنسادا دەکرێت بۆ نیگەران کردنیان و تێکدانی کارەکانیان، بەبێ ئەوەی ئەم چەشنە هەنگاوانە ڕاستە مەترسی بخاتە سەر پارچە ئازادەکانی ئەڵمانیا, لەم کاتەشدا پێویستمان بە بەدەست هێنانی لایەنگیری و سۆزی ئیتالی و ئینگلیزەکانیشە.

بەڵام چی دەڵێیت, لەکاتێکدا حکومەتەکەی کونوی ڕاوێژکار ڕامیارێتیەکی دیکەی گرتەبەر!

ئەم ڕاوێژکارە بلیمەتە بڕیاری دا لەبەرئەوەی فەرەنسا بۆ دەستگرتن بەسەر کانەکانی ناوچەکەدا هێرشی ئەم ناوچەیەی کردووەو دەستی بەسەرداگرتووە لەبەرژەوەندی خۆی, بۆیە ئەگەر کرێکارەکان مان بگرن, ئەوکات فەرەنسا بەدەستی بەتاڵەوە ناچاردەبێت بکشێتەوە, بۆئەمەش بڕیاری دروستکردنی (بەرەی نیشتمانی)دا, کەلەخۆگرتەی هەموو هێز و بەرەکانی نێو وڵاتی ئەڵمانیابوو, ئەم کارەی هەڵێکی گەورەی بەخشیە مارکسی و جوولەکان کە گیرفانی خۆیان لە قاسەکانی دەوڵەت بەبیانووی بەشدارێتی کارای ئەم کارە پڕبکەن, ئەم بەرەیە لەخۆگرتەی سەرجەم زۆربڵێی و فێڵبازە نێودەوڵەتیەکان و دوژمنانی ناوخۆیی بوو, بەك كارەی کونو توانی (یەکێتی نیشتمانی)بهێنێتە ئاراوە بۆ دژبەری کردنی فەرەنسیەکان, بەڵام ئەمە بەرئەنجامەکەی هیچ بوو, چونکە نەبووە هۆی لاوازکردنی فەرەنسیەکان. ئێمەی نیشتمان پەروەری سۆسیالیستی دژی بەرەی نیشتمانی بووین و گاڵتەشمان بە یەکێتی نیشتمانی دەهات, دوا ئەنجامەکانی ئەم هەنگاوە ئەوەبوو کە ئێمە پێشبینیمان کردبوو.

بەچەند هەفتەیەك پاش لەکانگرتن نیشتمان پەروەرە ڕاستەقینەکان بڕیاری بەکارهێنانی چەکیان دا لەناوچەی ڕووهر دژبە سوپای فەرەنسی, بۆیە داوای هاوکاریان لەکرێکاران کرد, بۆئەوەی بێنە پاڵیان دژبەر فەرەنسیەکان, ئەم هەنگاوە بووەهۆی کۆکردنەوەی ژمارەیەکی زۆری کرێکاری دڵسۆز و دروستکردنی تیمی تیرهاوێژانی بەهێز. بەڵام مارکسیەکان لەڕێگەی کشانەوە لەبەرەی نیشتمانی وەڵامی داخوازی نیشتمان پەروەرانیان دایەوە, زۆری نەبرد ئەمە بە قازانجی فەرەنسا شکایەوە, پاش ئەوەی مارکسی و جوولەکان گیرفانیان پڕکرد بۆی دەرچوون و دەستیان لەهەموو بەڵێن و ئاکارێکی نیشتمانی هەڵگرت.

بەر لەوەی تیرهاوێژە ئازادی خوازەکان بتوانن خۆیان بسەلمێنن بەرەی نیشتمانی هەڵوەشایەوە و دواتریش بەپێی خواستی فەرەنسیەکان لەناوچە کشانەوە, ئەم جۆرە ناپاکیە بووە هۆی کردنەوەی چاوی چەندان ملیۆن ئەڵمانی خەواڵوو, لەسەر گرنگی و ڕاست و دروستی بەرنامەکانی بزوتنەوەی نیشتمان پەروەری سۆسیالیستی و ئامانجە نەتەوەییە مومبارەکەکانی, زانیان کە ڕزگاربوونی ئەڵمانیا لەدەست بێگانەکان و راوانکردنی سنورەکانی بەندە بە تواناکانی ئەم بزوتنەوەیە و گەشەکردنی بەرنامە ڕەگەز پەرەستەکانی.

لێرەدا هیچ کاتی ئەوەمان نییە ڕووداوەکانی پێش لە ٨ ی خەڵوەزەری ١٩٢٣ باس بکەین, کەبەهۆیەوە پارتەکەمان هەڵوەشایەوەو سەرکردە و ئەندامە باڵاکانی خرنە کونجی زیندانەوە, بەڵام لێرەوە دان بەوەدا ئەنێم ئەوەی ئەنجاممان دا بەمەبەستی چێژوەرگرتن نەبووە لەدەستەڵات, وەك چۆن دژبەرانی للێنەکەمان دەیان گووت, ڕووداوەکانی ٨ ی خەڵوەزەری ١٩٢٣ دەربڕی ناخی ملیۆنان ئەڵمانی ڕەسەن بوو, لێرەوە کورتەیەك لەو وتارەم دەخەمە ڕووکە لەدوا ڕۆژی دادگایی کردنی سەرانی پارتمانماندا بەدادوەرەکەم گووت:

" ئێوەی دادوەرانی ئەم وڵاتە دەستەڵاتی ئەوەتان پێدراوە تاوانبارمان بکەن بەو ئەوکارانی کە ئەنجاممان دان, بەڵام خوودی دیڕۆك کە هەناوم پیشان ئەدات ئەم بڕیارەتان دەهاڕێت, هەموومان بێبەری دەکات لەتاوانێك کەئێمە نەمان کردووە".

سەبارەت بە هەڵوێستی پارت و ڕێکخراوەکان لەهەمبەرمان لەپایزی ١٩٢٣ و لەکاتی دادگایی کرنماندا, ئەوا من بە ئیسپەنجێك دەیانسڕمەوە و نامەوێت هەمدیس برینەکانم بکولێنمەوە, چوونکە من بڕوام بەوەهەیە کە ئەوانەی تا دوێنێ دژبەری ئێمە بوون, هەموویان, بەم نزیکانە پەژیوان دەبنەوە لەو هەنگاوانەی پێشتر گرتبویانە بەر بۆ دژایەتی کردنی ئێمە و نەتەوەی ئەڵمانی, ڕێزمان لێدەگرنەوە, چونکە بۆیان ڕوون دەبێتەوە ئەوکارەی ئێمە ئەنجاممان دا و لەڕێگەیدا چەندان کەس بوونە قوربانی, بۆ خزمەتکردنی خۆمان نەبووە, بەڵکو بۆ خزمەتکردنی هەموو هاوڵاتیانی نەتەوەی ئەڵمانی و ئەڵمانیا نشین بووە, بۆ ئەوەی لەناونەچێ.

**کۆتایی**